# کوردو باکووری کوردستان لە دوای شەڕی یەکەمی جیھانەوە

## هەتا دوای شۆڕشی شێخ سەعید لەپیران



بەرگی دووەم

نووسینی
م . ڕەسول هاوار

**٦٠٠٠ تومان**

حکومەتی هەرێمی کوردستان
وەزارەتی ڕۆشنبیری
بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی
زنجیرە (٤٦٨)

# کورد و باکووری کوردستان لەدوای شەڕی یەکەمی جیهانەوە هەتا دوای شۆڕشی شێخ سەعید لەپیران

## بەرگی دووەم

((هەتا دوای شۆڕشی شێخ سەعید لە پیران))

نووسینی: م. ڕەسوڵ هاوار

چاپی دووەم
٢٠٠٦

# کوردو باکوری کوردستان
# لەدوای شەڕی یەکەمی جیهانەوە
# هەتا دوای شۆڕشی شێخ سەعید لەپیران


نووسینی: م. ڕەسوڵ هاوار

بابەت: مێژوویی

کۆمپیوتەر: مەهدی ئەحمەد

نەخشەسازی بەرگ: دیاری جەمال

چاپی یەکەم: ناوەندی چاپەمەنیو ڕاگەیاندنی خاك

تیراژ: (١٠٠٠) دانە

ژمارەی سپاردن: (١٠٩٧)ی ساڵی ٢٠٠٦ی وەزارەتی ڕۆشنبیریی پێدراوە

www.roshnberiekurd.com

## پێشەکی

بەتەمای ئەوە بووم لەدوای تەواوکردنی بەرگی یەکەم کە بریتی بوو تا کۆتایی شەڕی یەکەمی جیهانی، ئەویتر هەتا کاتی شەڕی جیهانی هەمووی بەبەرگێکی تر تەواو بکەم، بەڵام بۆم دەرکەوت باسی مێژووی ماوەی نێوانی هەردوو شەڕی جیهانی، لەگەڵ کورتکردنەوەشی ئەوەندە زۆر بوو ناچاربووم کردم بەبەرگی دوهەم و سێهەم کە لەم بەرگی دوهەمەدا هەتا دوای شۆڕشەکەی پیران و بەرگی سێهەمیش کە پێشنوسەکانیم ئامادەکردووە و ماوەتەوە سەرپاکنوسەکەی ئەگەر مردن مۆڵەت بدات هیوادارم ئەویش بەزووترین کات تەواوبکەم و پاکنووسەکەی ئامادەبکەم بۆ چاپکردنی کە بریتی‌یە لەشۆڕشی ئاگریداغ و دەرسیم و هەندێ ڕووداوی پێش شەڕی دووهەمی جیهانی.

ئەوەی لەپێشەکی ئەم بەرگەدا مەبەستمە لێی‌بدوێم بریتی‌یە لەسەرنجدانێك دەربارەی کێشەیەك کە لەکاتی نوسیندا لەهەموو بەرگەکاندا ڕووبەڕووم دەبوونەوە لەڕووی لەیەکنەچوون و لێکجیاوازی ناوی ناوچە و دێهات و چیا و ڕووبەر و ناوی ئەو کەسانەی هەر سەرچاوەیەك بەشێوەیەك تۆماریکردووە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر هەستم پێکردبێت دەتوانم ئاماژە بۆ ئەو لەیەکنەچوونانە بکەم بەپێی توانا لێیان دواوم کە بێگومان برادەرانی شارەزا بەمێژووی باکووری کوردستان لەمن باشتر هەست بەبوونی ئەو لێکجیاوازیانە دەکەن کە ئەوەندە زۆرن بەلیژنەیەکی تایبەتی نەبێت ئەو شتانە بەتەواوەتی ڕاست ناکرێنەوە و هەروەکو لەهەندێ شوێندا باسیشم کردووە هۆی ئەو لێکجیاوازی و لەیەکنەچوونانە بریتی‌یە لەگەلێك شت کە دوو هۆی سەرەکی بوونەتە هۆی ئەو لێکجیاوازیە کە یەکەمیان بریتی‌یە لەوەی حکومەتی تورك هەر لەکۆنەوە بۆ شوێنەونیی ناوە مێژوویيەکانی کوردی لەباکوردا ئەو ناوانەیان گۆڕین بەتورکی یا بەشتێکی تر کە هیچ پێوەندیەکی بەناوە کوردیەکەوە نەمابێت و هۆی دووهەمیش لەئەنجامی ئەوەوە پەیدابووە نوسەرانی سەرچاوەکان کە ئەو ناوانەیان تۆمارکردووە خەڵکی

ناوچەکان نەبوون و لەم و لەو پرسیاریان کردووە و جگە لەوەش لەکاتی نووسینی سەرچاوە سەرەکیەکەدا لەزمانێکەوە بۆ زمانێکی تر، وەرگێڕ زۆر شارەزا نەبن و بەئارەزووی خۆی ناوی وشەکەی بەو زمانەی پێی وەرگێڕاوە تۆمارکردووە کە تووشی کێشە و ماندووبونێکی زۆربووم و ناچاریش بووم هەروەکو چۆن لەسەرچاوەکانا تۆمارکراون منیش بەو شێوەیە تۆماریان بکەم بەهیوای ئەوەی لەدواڕۆژدا لیژنەیەك یان چەند کەسێکی شارەزا چارەسەری ئەم کێشەیە بکەن.

دووبارە لەم بەرگەشدا سوپاسی ئەو برا و دۆست و خۆشەویست و دڵسۆزانە دەکەم بەپێی توانا گەلێك باس و زانیاری و سەرچاوەیان بۆ ناردووم کە ئاماژەم بۆ هەندێکیان کردووە و داوای لێبوردن دەکەم لەهەر کەموکوڕییەکی ئەم سێ بەرگەدا هەستی پێدەکەن.

هاوار

٢٠٠٠/٣/١٨

لەندەن

# بەشی یەکەم

## هەڵوێست لەدوای شەڕی یەکەمی جیهانی و مۆرکردنی پەیمانی ئاشتی و دامەزراندنی کۆمەڵی گەلان ( عصبة الأمم )

### باسی یەکەم- پەیمانی وەستاندنی شەڕکە بە پەیمانی ( مودراس ) ناسراوە

دەوڵەتی عوسمانی بەر لەساڵی ١٩١٤ توشی داڕزاوی و تەنگوچەڵەمەیەکی زۆر گران بووبوو، بەهیچ شێوەیەك چارەسەری ئەو بارودۆخە ئاڵۆزەی پێنەدەکرا کە بە(پیاوە نەخۆشەکە) ناوبانگی بڵاوبوبووەوە، تاقمی (ژون تورك)کە نەخشەکێشی هاوکاریکردنی دەوڵەتی عوسمانی بوون لەگەڵ ئەڵمانەکاندا و دوای ئەو شکاندنەی بەسەر سوپای تورکدا هات، ژون تورکەکان هەریەکەیان بەشێوەیەك خۆیان دوورخستەوە لەئەرکی ئەو بارگرانیەی بەسەر وڵاتدا هاتبوو، سوپاکانی وڵاتە هاوپەیمانەکان ڕژانە ناو خاکی تورکیاوە و پاشماوەی خەلافەتی عوسمانیان ناچارکرد پەیمانی (مودراس) مۆربکات و بەریتانیا و فەرەنسا و ئیتاڵیا هەریەکەیان دەستی بەسەر ناوچەیەکی تورکیادا گرت بەئەستەمبوڵی پایتەختەوە. دەربارەی پەیمانی مودراس (ریچارد ڕالینسۆن) لەلاپەڕە ١٩ی کتێبەکەیدا سەرچاوە ٢٨ باسی مەرجەکانی ئەو پەیمانەی کردووە کە لە(١٩١٨/١٠/٣٠)دا مۆرکرابوو کە بریتی بوون لە:

١-نەهێشتنی دەسەڵاتی مەرکەزی لەئەستەمبوڵدا بەسەر شوێنەکانی ترەوە.

٢-هەڵوەشانەوەی هێزی سوپاکانی عوسمانی.

٣-ئەو شوێنانەی لەئەفریقادا بەر لەشەڕ لەژێر دەسەڵاتی عوسمانیدا بوون هەمووی دەخرێتە ژێر سایە و دەسەڵاتی دەوڵەتە هاوپەیمانەکانەوە.

٤-سەربەستی هاتوچۆکردن و تێپەڕبوون بەناو تەنگەئاوەکاندا (مضائق)، وە بەکارهێنانیان لەلایەن هاوپەیمانەکانەوە.

٥-دانی دەسەڵاتێکی تەواو بەسوپا و هێزەکانی هاوپەیمانەکان لەهەر شوێن و ناوچەیەکدا کە بەپێویست بزانرێت بۆ دابینکردنی ئاسایش لەجیاتی هێزەکانی تورك (ئەوەی شایانی باسە دەربارەی هەڵوێست بەرامبەر بەکوردستان و مافی

کـــورد، لـــەدوکیومێنتێکی وەزارەتـــی دەرەوەی بـــەریتانیادا ژمـــارە (-NO:١٨٩ FO.٣٧١-٥٠٦٧) ڕۆژی ١٩٢٠/٣/٦ باســـی تلگرافێکـــی شەخســـی و نهێنیکـــراو بـــەژمارەی تلگرافەکـــە (E.٩٧٠-١١) لەهـــەمان ڕۆژدا کـــە لـــەوەزارەتی دەرەوەی بەریتانیاوە نێراوە بۆ (ئـەدمیرال روبیك) کە لەئەستەمبوڵ بووە لـەو تەلگرافـەدا وتراوە.

((تـەلگرافی ژمـارە/١٦٩ تـا لـەڕۆژی ١٩٢٠/٢/٢٧دا، هـیچ بـاس و پێشـنیارێك نەخراوەتـە بـەردەمی کۆنفرانسـی ئاشـتی دەربـارەی ئـەوەی کوردسـتان لـەژێر حیمایەی ئینگلتەرە و فەرەنسادا بێت و باسی دواڕۆژی کوردستانیش نـەکراوە، بـیر لـەوە کرابـووەوە کوردسـتان لـەتورکیا جیابکرێتـەوە و سـەربەخۆ بێـت و بپارێزرێت بەڵام بەجێهێنانی ئەوە هێشتا نەخراوەتە بەرچاو و نەخراوەتە کار، ئەم تەلگرافەشت بۆیە بۆ دەنێرم بۆئەوەی ئەو پڕوپاگەندانە بەدرۆبخرێنەوە کە لەم ڕووەوە بڵاودەکرێنەوە)).

مامۆستا ڕەفیق حیلمی کە خۆی ئاگاداری بارودۆخی ئەو ڕۆژانەی دەوڵـەتی عوسمانی بووە، لەیاداشتەکانیدا بیرەوەریەکانی خۆی دەربارەی هەڵوێستی ئەو ڕۆژانە بەمجۆرە دەربڕیوە:

((لـەدوای تـەواوبوونی شـەڕ، نوسـەر و ئەدیبـە ناودارەکـانی تـورك دەسـتی قەڵەمیان شکابوو، ئەو تورکانەی لەشەڕی جیهانیدا بەتەمای ئەوەبوون بەهاوکاری ئەڵمانـەکان هەلومـەرجێکی وا بێتـە پێشـەوە کـە هـەموو موسـڵمانانی جیهـان لـەئینگلیز ڕاسـت ببنـەوە، بـەڵام کـە شـەڕ بڕایـەوە پایتەختەکـەی خۆیـان کـە ئەسـتەمبوڵ بـوو لێیـان داگیرکـرا و کـەوتبووە ژێـر حـوکمی قەرەقوشـی لەشـکری سوێندخۆرەکانەوە بەتایبەتی هی ئینگلیز، ئەفسەر و سەرکردەکانی تورك بـەرگی سـوپاییان گۆڕیبـوو، وەیـا خۆیـان شـاردبووەوە، سـوێندخوارەکانیش بەرامبـەر بەتورك بەحیکمەت و ژیرانە نەجوڵانەوە، فیز و هـەوای سـەرکەوتن بـەری چاویانی گرتبـوو، زیـاد لەپێویسـت تورکـەکانیان تەنگـەتاو کردبـوو، بەچـاوێکی سـوکەوە دەیانڕوانیـە تێکەیشـتوەکانی تـورك، دەسـتدرێژیکردنیان لادانـی سـەربازەکانیان لەشـەرم و ئـەدەب وردە وردە تـورکی لاواز و بێهـێزی مـردووی زینـدوو دەکـردەوە لەئەنجامی ئەمەدا ئەفسـەر و خوێنـدەوارە بـەرزەکان و نیشـتمانپەروەرەکانی تورك

چاریان نەما و لەیەکتری نزیکبوونەوە و بیریان لەو بەسەرهاتە کردەوە کە توشیان بووبوو، مردنیان لا باشتر بوو لەو چەشنە ژیانە، بۆیە ئەوەندەی پێنەچوو خوێن گەرم و وڵاتپەرستەکانیان بڕیاری بزوتنەوەیاندا بۆ خۆڕزگارکردن، لەگەڵ ئەوەشدا دەیانزانی ئەنجامی ئەو بزوتنەوەیەیان شتێکی سامناکە، بەڵام ژیانی ئەو ڕۆژە ڕەشەشیان تامی تیادا نەمابوو، زۆر لەتورکەکان ئاواتەخوازی مردن بوون.

لەدوای بڕانەوەی شەڕ و دوای (موتارەکە-هودنە) و وەستانی شەڕ، تورکەکان جارێکی تر خۆیان ئامادەکرد بۆ شەڕێکی تر دژی سوێندخۆرەکان هەرچەند دەشیانزانی تەنها و بەبێ یارمەتیدانی دۆستێکی تایبەتی و جێی باوەڕ (بێگومان مامۆستا ڕەفیق حیلمی ئاگاداری ئەو دۆکیومێنتە نەهێنیانە نەبووە کە باسی دۆستایەتی تورك و سۆڤێتی کردووە کە سۆڤێتەکان بەپارە و بەچەك یارمەتیان دابوون کە لەشوێنی خۆیدا باسی ئەو پەیمانی دۆستایەتیەی تورك و سۆڤیەت دەکەین، مامۆستا ڕەفیق حیلمی لەلاپەڕە ٩ی یاداشتەکەیدا لەسەری ئەڕوا و ئەڵێت:

((کارێکی وا لەگەڵ عەقڵ و مەنتیقدا ڕێکناکەوێت، بەڵام زەلیلی و کوێرەوەری میللەت و سوك و سەلیمی لەشکرە ژێرکەوتوەکەیان گەیشتبووە بینەقاقا، لەبەرئەوە پەنایان بردەبەر مردن، ئەوسا فریشتەی بەخت هیوابڕاوەکانی بەئامانج گەیاند)).

بێگومان دەوڵەتە هاوپەیمانەکان لەمێژبوو مرخیان لەوڵاتی عوسمانی خۆشکردبوو، هەریەکەیان ئەگەر بۆی بکرایە هەموو میراتەکەی عوسمانی بۆخۆی دەبرد و بێجگە لەڕوسیای قەیسەری کە بووبوو بەسۆڤیەت و وازی لەو بەشە هێنابوو کە پەیمانی (سایکس پیکۆ) بۆی تەرخانکردبوو، ئەوانیتر وەکو بەریتانیا و فەرەنسا و ئیتاڵیا هەریەکەیان بەشێوەیەك هەڵپەی دەکرد، لەوانە بەریتانیا لەهەموویان زۆرتر توانیبووی مەبەستەکانی خۆی بهێنێتەدی.

دەربارەی هەڵپەی ئەو دەوڵەتانە (Patrick Kimross) لەلاپەڕە ١٣٩ی کتێبەکەیدا سەرچاوە (٨٥)، باسی چۆنیەتی دابەشکردنی بەشەمیراتی عوسمانی کردووە کە وتویەتی: ((لەدوای تەواوبوونی شەڕ، حکومەتی بەریتانیا لەبەردەمی چوار شتی قبوڵکراودا وەستابوو:

یەکەم: ئەو بەشەی بۆ ڕوسیای قەیسەری دانرابوو بەپێی پەیمانی سایکس پیکۆ، دوای ئەوەی سۆڤیەت جێی ڕوسیای قەیسەری گرتەوە و سۆڤیەت وازی لەو بەشە هێنا ئیتر پێویست بەوە نەما باسی ئەو بەشە بکرێت.

دوهەم: بەپێی پەیمانی سایکس پیکۆ دەبوایە بەشی زۆری ولاّتانی عەرەب لەنێوان بەریتانیا و فەرەنسادا دابەش بکرێت و بەپێی ئەوە میسۆپۆتامیا بۆ بەریتانیا و سوریا و ناوچەی کیلیکیا بۆ فەرەنسا دەبوو.

سێهەم و چوارهەم: ناوچەی (ئەدالیا–Adalia) هەتا دەگاتە (کیلیکیا) بۆ ئیتاڵیا دەبێت لەگەڵ دورگەکانی (دودیکانین) و مەڵبەندی (Smyrma-ئەزمیر) لەگەڵ زەویوزارەکانی دەوروبەری.

بەوجۆرە ئەوەی بۆ تورکیا دەمایەوە بریتی دەبوو لەچەند ناوچەیەکی کەم لە(Anatoliy–ئەناتولیا) وە چەند ڕێبازێك کە دەیگەیانە سەر دەریای ڕەش و دەریای ئیجە، بەلاّم لەهەمووی گرنگتر ئەو چاوتێبڕینەی یۆنان بوو کە بەتەمابوو دوای شەڕ دەستگیری بێت و ئەوەبوو لەسەرەتای ساڵی ١٩١٥دا (سێر ئەدوارد گرای) گەلێك ئیمتیازاتی دەستنیشانکردبوو کە بدرێت بەیۆنان و سەرەك وەزیرانی یۆنان (Vanzolos–ڤنزولوس) ئەوەی پەسەندکردبوو کە ئەمیش بەتەمای دروستبوونی یۆنانێکی گەورەبوو کە هەموو ناوچەکانی (Heilenism) بگرێتەوە، لەدواییشدا ڤنزیلوس لە (لوید جۆرج) نزیکبووەوە بەهیوای ئەوەی دەست بەسەر هەموو کەنارەکانی دەریای ئیجەدا بگرێت، لەکاتێکدا بڕیار وابوو ئەو بەشە بدرێت بەئیتاڵیا.

ساتێك شەڕ بڕایەوە، دوای دوو مانگ پاش کۆنفرانسی پاریس، ڤنزیلۆس ئەو داخوازیانەی خستە بەرچاوی (supreme council–ئەنجومەنی باڵا) لەپاریس، لای (لوید جۆرج) ئەو داخوازیەی فنزیلوس شتێکی ڕەوابوو وە بەسوودیش بوو چونکە بەمە یۆنانیەکان دەیانتوانی کارێکی وا بکەن لەناو خاکی تورکیادا ڕێگەیەکی باش و لەبار دابین بکرێت و بپارێزرێت بۆ هاتوچۆکردنی ڕێگەی هیندستان و (لۆرد کرزن)یش لایەنگری ئەم بۆچوونە بوو.

## باسی دوهەم-کۆمەڵی گەلان-عصبة الأمم ( League of Nations )

باسی کۆمەڵی گەلان و چۆنیەتی پێکهاتنی و مەبەست و ئامانجەکانی باسێکی زۆر دووورودرێژە و لەم باسەدا بەکورتی ئاماژە بۆ چەند سەرچاوەیەك دەکەین کە باسی مافی میللەتانیان کردووە بەپێی بڕیارەکانی (عصبة الأمم) کە باسی کوردیشی دەبوایە بگرتایەتەوە. دکتۆر عیسمەت شەریف وانلی لەسەرچاوە (١١٠)دا، لەو باسەی دەربارەی چواردە مادەکەی (ولسن)ی سەرکۆماری ئەمریکادا دەربارەی (کۆمەڵی گەلان) وتویەتی:

((ولسنی سەرۆك کۆماری ئەمریکا پیاوێکی حقوقی بوو، یەکێك بوو لەوانەی بەشداری کردبوو لەداڕشتنی ڕێکخراوی کۆمەڵی گەلاندا و ولسن سێ نمونەی هێناوەتەوە بۆ جێبەجێکردنی، باسی (نەتەوەکان و مافی چارەنوسی گەلان کە لەبەشی پێنجەمدا لەباسی (Mandate-ئینتیداب-چاودێریکردن)دا باسی سێ وڵاتی غەیری تورکی کردووە کە بەپێویست زانرابوو لەئیمپراتۆریەتی داڕووخاوی عوسمانی جیابکرێنەوە و سەربەخۆییان بدرێتێ پاشئەوەی بۆ ماوەیەکی کەم لەژێر چاودێریی کۆمەڵی گەلاندا دەبن کە ئەو سێ وڵاتە بریتین لە:

١-ئەرمەنیا، ٢-کوردستان، ٣-(Arabia-ئارابیا-کە مەبەست لەوڵاتە عەرەبەکانە) کە وتویەتی: ئەمانەی سێهەم بریتین لەجزیرەی عەرەب، سوریا، فەلەستین، لوبنان، ئەردەن، عێراقی عەرەبی (لێرەدا بەئاشکرا وتویەتی عێراقی عەرەبی کە دیارە تەنها مەبەست ناوچە عەرەبنشینەکانی عێراق بووە).

دکتۆر عیسمەت شەریف لەباسەکەیدا لەسەری دەڕوا و دەڵێت: ولسن لەو نەخشە و پڕۆژەیەی بۆ دامەزراندنی کۆمەڵی گەلان ئامادەکردبوو، بۆ کوردیش هەمان شتی باسکردبوو کە بریتی بوو لەدانانان بە(سەربەخۆیی نیشتمانیدا)، بەڵام لەبەرئەوەی بەشی ڕۆژهەڵاتی کوردستان (مەبەستی کوردستانی ئێرانە) بەشێك نەبووە لەدەوڵەتی عوسمانی بۆیە لەپڕۆژەکەی ولسندا باسنەکراوە. دکتۆر عیسمەت شەریف لەکۆتایی ئەو باسەیدا وتویەتی: ((لەدوای شەڕی دوهەمی جیهانی کە (نەتەوە یەکگرتووەکان-United Nations) جێگەی (عصبة الأمم)ی

گرتەوە، لەمادەی دوویدا وتراوە: هاوسانی لەنێو گەلاندا هەبێت و پێویستە هەموو نەتەوەیەك مافی چارەنووسی خۆی هەبێت)).

دەربارەی ڕۆڵی ولسنی سەرەك کۆماری ئەمریکا کە دکتۆر عیسمەت شەریف باسیکردووە، دکتۆر کەمال مەزهەر لەکتێبەکەیدا (چەند لاپەڕەیەك لەمێژووی گەلی کورد، سەرچاوە (٣٩) وتویەتی:

((لەگەڵ تەواوبوونی شەڕی یەکەمی جیهانی، کۆمەڵی گەلان (عصبة الأمم) بوو بەدروشمێکی ڕەخساو، بۆیە ساتێك کۆنگرەی ئاشتی لەڕۆژی ١٩١٩/٩/١٨دا کرایەوە، بایەخیدا بەکۆمەڵی گەلان و لە ٩/٢٥دا جێبەجێکردنی پڕۆژەی (عصبة الأمم)دا بەلیژنەیەکی باڵا (ئەوەی وەکو لەپێشدا باسکراوە دکتۆر عیسمەت (Supreme Council) ناویبردووە، بەسەرۆکایەتی ولسنی سەرۆکی ئەمریکا و دەوڵەتە سەرکەوتوەکان هەریەکەیان دەیویست پرۆگرامی کۆمەڵی گەلان بەشێوەیەك دابڕێژرێ کە لەهەموو سەرێکەوە لەگەڵ ئامانج و بەرژەوەندیەکانی خۆیدا بگونجێت.

دکتۆر کەمال لەسەری ئەڕوا و ئەڵێت: پەیمانی ئاشتی ئەو کارانەی خۆی پێ‌تەواو نەکرا چونکە فریای تەواوکردنیان نەکەوت بۆیە کۆمەڵی گەلان لەساڵی ١٩٢٠دا دامەزرا و هەتا ساڵی ١٩٤٦ مایەوە (وەکو وترا کۆمەڵی نەتەوە یەککگرتوەکان جێگەی (عصبة الأمم)ی گرتەوە.

هنری فۆستەر لەکتێبەکەیدا (The Making Of Modern Iraq) چاپی لەندەن، ساڵی ١٩٣٦، باسی وتارێکی وەزیری دەرەوەی سۆڤیەتی کردووە کە لەڕۆژنامەی (Berliner Tag Blat)دا بلاویکردۆتەوە لەوەدا وتویەتی ولاتی سۆڤیەت بۆیە نەبوو بەئەندام لەکۆمەڵی گەلاندا چونکە ئەو ڕێکخراوەی بەلایەنگری ئاشتی نەدەژمارد. لەڕاستیدا زۆربەی بڕیارەکانی کۆمەڵی گەلان بۆ خواست و مەبەستەکانی ئەو دەوڵەتە زلهێزانە بووە کە لەو کۆمەڵەدا دەسەلاتێکی زۆریان هەبووە وەکو حکومەتی بەریتانیای ئەو ڕۆژانە. شێخ سەلامی شاعیر لەگەڵ ئەوەشدا لێی‌نەبیستراوە شتێکی خراپی وای دەربارەی سیاسەتی ئینگلیز وتبێت، بەلام تێهەڵکێش لەڕەخنەگرتنیا لەکۆمەڵی گەلان لەو شیعرەیدا کە لەگۆڤاری ژمارە

٢ی (هاوار)دا کە لە ١٩٣٢/٧/١دا دەرچووە باسی مستەر ئەندرسنی بەریتانیاشی کردووە کە وتویەتی:

عصبە الامم، کۆمەڵی گەورە
بەپێچ‌وپەنا و بەفێڵ و دەورە
بەجۆش و کوڵ بووی بۆ کوردی هەژار
دەتوت: ئەم قەومە دەکەم ڕستگار
ئەگەر ڕاست ئەکەی هەڵیسوڕێنە
بەس بۆ سیاسەت هەڵمانپەڕێنە
کۆمەڵی دز و جێگەی مەکر و فەن
کوتەکی دەستی (میستەر هەندەرسن)
خۆ تۆ (وەصی) بووی، ئەقوام بوون هەتیو
دەمی کوردت کرد بەتەڵەی تەقیو
چۆن عاجز نابی لەم خوێن ڕشتنە؟!
لەلای تۆ هەڵبەت (حقوق) کوشتنە
تا ترسی مێژوو لەعنەتت بکەن
کوتەکی دەسی (مستەر هەندەرسن)؟!

## بەشی دووهەم

## بارودۆخی باکووری کوردستان لەدوای شەڕی یەکەم و هەڵوێستی دەوڵەتان و میللەتان

### باسی یەکەم- بارودۆخی باکووری کوردستان

ساتێك کاربەدەستانی ئیتحاد و تەرقی لەناو حکومەتی عوسمانیدا بوون بەدۆستی ئەڵمانەکان و بڕیاریاندا هاوکاریان لەگەڵدا بکەن لەشەڕی یەکەمی جیهانیدا دژی دەوڵەتە هاوپەیمانەکان بەئومێدی ئەوەی لەو شەڕەدا سەردەکەون و ڕزگاریان دەبێت لەو هەموو قەرزە زۆرەی بەسەریانەوە بوو، لەئەنجامی ئەو شەڕەدا کورد لەو بەشانەی لەژێر دەسەلاتی دەوڵەتی عوسمانیدا بوو، بەزۆرەملێ ئالێنرانە ئەو شەڕەوە و بەهەزارانیان بەکێشکران بۆ کوڕی شەڕەکان لەژن و منداڵ و ئالێنرانە ئەو شەڕەوە و بەهەزارانیان بەکێشکران بۆ کوڕی شەڕەکان لەژن و منداڵ و پیر بەولاوە لەکوردستاندا هی وای تیادا نەمابوو بتوانێت پاروە نانێك بۆ خێزانەکەی پەیدابکات و قاتوقڕی و گرانی و نەخۆشی و برسێتی هەموولایەکی گرتبووەوە و کورد لەڕۆژهەلاتی کوردستانیشدا ئەگەرچی بەشێك نەبوو لەولاتی عوسمانی، بەلام کە شەڕ دەستیپێکرد یەکەم تەقە لەو بەشەی کوردستاندا دەنگی بەرزبووەوە و ڕوسی قەیسەری لەژوورووەوە و تورك لەخوارووەوە و دەوڵەتە هاوپەیمانەکانیش لەهەموولایەکەوە پەلاماری خاکی عوسمانیاندا و لەئەنجامی ئەو شەڕەدا میللەتی کورد تووشی ماڵ کاولبوونێکی تەواو بوو.

کە ساتێك شەڕیش بڕایەوە و پەیمانی (مودراس) مۆرکرا، خەڵك تۆزێك ئاهی پیادا هاتەوە و ئەوی مابوو بەئومێدی دواڕۆژێکی تازەی پڕ لەئاشتی و تێروتەسەلی بوو، دڵی بەوە خۆشبوو کە ئیتر ئەمە کۆتایی بەسەرهات و کارەساتەکان دەبێت بەتایبەتی کە دەوڵەتە هاوپەیمانەکان هێزەکانیان ڕژانە ناو خاکی عوسمانیەوە میللەتی کورد یەکێك بوو لەو میللەتانەی دڵی بەوە خۆشبووبوو کە تاڕادەیەك کلکوگوێی تورك کرابوو، ئەو زەبر و زەنگەیان نەمابوو، بۆ یەکەمجار هەستیان بەئازادی و سەربەستی دەکرد و کەوتنە خۆیان و هەستی

نەتەوایـەتی پـاڵی پێوەنـان پەلەبکـەن لەهـەنگاونان بـەرەو سـەرگرتنی ئـاوات و مەبەسـتەکانی میللەتـە کلۆڵەکـەیان و لـەناو کۆمـەڵ و ڕێکخـراوە تایبەتیـەکانی خۆیانـدا خۆیـان ڕێکخسـت و دەسـتیانکرد بـەدەرکردنی گۆڤـار و ڕۆژنامـە بـۆ دەربڕینـی ئامـانج و ئاواتـەکانیان کە بەداخـەوە ئـەو ماوەیـە زۆر کەمخایـەن بـوو هەروەکو لەڕووداو و بەسەرهاتەکاندا ئەم ڕاستیە ڕوون دەبێتەوە.

لـەکۆتایی بـەرگی یەکـەمی ئـەم کتێبـەدا کورتەباسـێکی ئـەو سەرچـاوانەمان خستبووە پێش و کە باسی ئەو هەموو کوشتار و زیان و ماڵکاولیەیان کردبوو کە بەسـەر میللـەتی کوردا هـاتبوو، نوسـەرێکی تـر (Robert Tolson) لەکتێبەکەیـدا سەرچـاوە/٨٤ لەلاپـەڕە (١٨)دا باسـێکی بـارودۆخی ئـەو ڕۆژانـەی بـاکووری کوردسـتانی کـردووە کـە کورتەیـەکی دەڵێـت: (کـە شـەڕی جیهـانی دەسـتیپێکرد خـاکی کوردسـتان بـوو بـەکۆڕی ئـەو شـەڕە و زۆربـەی ناوچـەکانی هـەر لـە(سـاروقامیش)ەوە لـەباکووری کوردسـتاندا هـەتا خانـەقین لەباشـووری کوردسـتاندا و لەولاشـەوە هـەتا (ئەرزنجان) لـەژێر بـاری ئـەو شـەڕەدا دەینالأنـد و بەشێکی زۆری کاولکرا).

ڕۆبەرت ئولسون ئامارەی بۆ کتێبەکەی (ئەمین زەکی) کـردووە (مێژووی کـورد و کوردسـتان) کـە وتویـەتی: ((سـوپای یازدەهـەم کـە لـە(Elazig) بـووە و سـوپای دوازدەهەم لەموسڵ کە هـەمووی لـەکورد پێکهـاتبوو لـەم شـەڕەدا بەشداریکردبوو، جگەلەوە زۆربەی ئەفسەر و سەربازەکانی سوپای نۆزدەهـەم کـە لـە(ئەرزڕوم) بـوو لەگـەڵ سوپای دەهـەم لە(سـێواس) ئەمانـەش هـەر لـەکوردەکان پێکهـاتبوو بێجگـە لـە(١٣٥) سـریەی خەیالـەی ئیحتیـات و چـەند جەندرمەیـەك کـە خرابوونـە کـۆڕی شەڕەوە، ئەمانەش هـەر کورد بـوون و بـەلای ئـەمین زەکی بەگـەوە واتـە کـورد لـەو ناوچـانەدا (٣٠٠) هـەزار سەرباز زیـانی پێگەیشـتبوو کـە ئەمـە ئـەوە دەگەیـەنێت نزیکـی ملیۆنێك سـەربازی کـورد لـەو شـەڕەدا بەشـداربووە و لەڕووبەڕووبونـەوەی ڕوس و تورکـدا کـورد زۆرتـرین زیـانی پێگەیشـتووە (لـەکۆتایی بـەرگی یەکەمـدا بەدووروودرێژی ئەو باسەی ئەمین زەکی کـە ڕۆبـەرت ئولسون ئامـارەی بۆ کـردووە باسمانکردووە پێویست ناکات هەمووی دوبارە بکەینەوە).

ڕۆبەرت ئولسون لەباسەکەیدا لەسەری ئەڕوا و دەڵێت: ((ئەو کوردانەی لەناو ئەو هێزەدا بوون کە نێردرابوون بۆ (حلب) لەساڵی (١٩١٦)دا تووشی زیانێکی زۆربوون جگە لەو زیانانەی تر کە بەهۆی برسێتی و نەخۆشی و سەرما و سەهۆڵبەندانەوە تووشی کورد بووبوو.

نوسەر لەلاپەڕە ١٩ی کتێبەکەیدا باسی ژمارەی بەشداربووانی کورد و تورکی کردووە لەهەندێ ناوچەی شەڕدا کە وتویەتی: (لەناوچەی ئەرزڕوم (٧٥) هەزار لەناوچەی وان (٧٢) هەزار لەناوچەی بدلیس (٧٧) هەزار لە(مأمورية العزيز) کە ئیمڕۆ پێی‌دەوترێ (Elazig)، (٩٥) هەزار لەدیاربەکر، لەسێواس (٥٠) هەزار کە ژمارەی هەموویان (٤٦٤) هەزارە کە ئەم ژمارەیە لە (١٦,٣٪)ی دانیشتوانی شەش ویلایەتەکانی خۆرهەڵات دەگرێتەوە، ئەگەر ژمارەی زازا و قزلباشی کورد بخرێتە سەر ژمارەی کوردی بەشداربوو لەشەڕدا گەیشتبووە (٦٨١) هەزار بەرامبەر بە(٦٦٦) هەزاری تورك.

بەوجۆرە دەردەکەوێ ژمارەی بەشداربووانی کورد لەو شەڕەدا وەکو ژمارەی تورکەکان وابن، پاشئەوە (ڕۆبەرت ئولسون) ئاماژەی بۆ تازەترین باسی ( Justim Mecarthy) کردووە دەربارەی دانیشتوانی وڵاتی عوسمانی لەساڵانی (١٩١١) و (١٩١٢) لەوەدا ژمارەی ئیسلامەکانی ئەو شەش ویلایەتەی ڕۆژهەڵاتی (دیارە ژمارەی کریستیانەکانی لێدەرکردووە) و بەم شێوەیە دەستنیشانی کردووە: ئەرزڕوم (٨٠٤٣٨٨)، وان (٣١٣٣٢٢)، بدلیس (٤٠٨٧٠٣)، مأمورية العزيز (٥٦٤١٦٤)، دیاربەکر (٥٩٨٩٨٥)، سێواس (١١٩٦٣٠٠) کە ژمارەی هەموویان (٣٨٨٥٨٦٢) کەس بووە کە بەلای کەمەوە نیوەیان کورد بوون.

ڕۆبەرت ئولسون لیستەیەکەی ژمارەی دانیشتوانی ئەو شەش ویلایەتەی لەساڵی ١٩١٢دا بەراوردکردووە لەگەڵ سەرژمێری ساڵی (١٩٢٢) مەبەست بەر لەشەڕ و لەدوای شەڕ بەچەند ساڵێك کە ئەو لیستەیەی بەمجۆرەی خوارەوەیە:

| ناوی ویلایەتەکان | سەرژمێری ساڵی ١٩١٢ | سەرژمێری ساڵی ١٩٢٢ | جیاوازی نێوانیان |
|---|---|---|---|
| ئەرزرِوم | ٨٠٤٢٨٨ | ٥٥٥٦٩٣ | ٢٤٨٦٩٥ |
| وان | ٣١٣٣٢٢ | ١١٩١٥٥ | ١٩٤١٦٧ |
| بدلیس | ٤٠٨٧٠٣ | ٢٣٨٩٥٥ | ١٦٩٧٤٨ |
| مأموريە العزیز | ٥٦٤١٦٤ | ٤٧٤٨٥٤ | ٨٩٣١٠ |
| دیاربەکر | ٥٩٨٩٨٥ | ٤٤٠٩٤٢ | ١٥٨٠٤٣ |
| هەمووی بێجگە لە (سێواس) | ٢٦٨٩٥٦٢ | ١٨٢٩٥٩٩ | ٨٥٩٩٦٣ |

بەمەدا دەردەکەوێ ژمارەی کەمبوونەوەی ئەو پێنج ویلایەتە (جگە لەسێواس) (٨٥٩٩٦٣) کەس بووە (لەڕاستیدا ئەگەر شەڕ نەبوایە دەبوو ژمارەی ساڵی ١٩٢٢ لەهی ساڵی ١٩١٢ زۆرتر بوایە).

ڕۆبەرت ئولسون لەلاپەڕە (٢٠)ی کتێبەکەیدا باسی سەرژمێرێکی تری کردووە کە لەساڵی (١٩٣١)دا لەسەرژمێری ٢٦ی حوزەیران هەتا ١١ی تەموزی هەمان ساڵدا کراوە لەمەدا گەیشتوەتە ئەم ژمارانە:

ئەرزرِوم (٣٠٠) هەزار، وان (٨٠) هەزار، قارس (٢٠٨) هەزار، مەلاتیا (٣٠٠) هەزار، العزیز (٢٠٠) هەزار، لە (igdim) (١٠٤) هەزار، بەڵام بۆ دیاربەکر و سێواس ژمارەی دانیشتوانی دەستنەکەوتوە، بەمەدا دەردەکەوێ سەرژمێری ساڵی (١٩٣١) دوبارە کەمتر بووە لەساڵی (١٩٢٢)، (بێگومان ئەم جیاوازیە بەهۆی ئەو کوشتارانەوە بووە کە لەکورد کرابوو لەنێوانی ساڵانی ١٩٢٢ هەتا ١٩٣١).

ڕۆبەرت ئولسون لەکۆتایی ئەو باسەیدا دەڵێت: ((بەوجۆرە ڕوونئەبێتەوە نزیکی نیو ملیۆن کورد لەشەڕی جیهانیدا لەباکوری کوردستاندا کوژراوە و ئەگەر کوردە کوژراوەکانی باشووری کوردستان و سوریا و ئێران و ڕوسیای بچێتە سەر ئەوا ژمارەی کوردە کوژراوەکان دەگاتە ملیۆنێك)).

باسی دوهەمی بەشی دوهەم

## هەڵوێستی تورکی پاشماوەی خیلافەتی عوسمانی و کەمالی و هەڵوێستی دەوڵەتان بەرامبەر کورد

### ١-هەڵوێستی تورکی سەر بەخیلافەتی عوسمانی و تورکی کەمالی بەرامبەر کورد

#### أ-هەڵوێستی پاشماوەی خیلافەتی عوسمانی لەئەستەمبوڵ

لەدوای تەواوبوونی شەڕی یەکەمی جیهانی، کورد بەرامبەر بەتورکەکان خۆی بەرامبەر دوو هێز بینیەوە کە بریتی بوون لەکاربەدەستانی پاشماوەی خیلافەتی عوسمانی لەئەستەمبوڵدا کە هێشتا خیلافەت هەڵنەوەشێنرابووەوە، دوهەم تاقمی کەمالیەکان کە جێگەی تاقمی ئیتحاد و تەرەقیان گرتبووەوە.

لەسەرەتادا کاربەدەستانی عوسمانی لەوانەی لەدەوری خەلیفەدا مابوون، خۆیان وا پیشاننەئەدا دژی مافی کورد ئەبن و ڕۆژنامەکانی سەر بەوان بلاویانـدەکردەوە ئامادەن دان بەمافی کوردا بنێن لەچوارچێوەی پاشماوەی خیلافەتی عوسمانیدا بەمەرجێك داوای جیابوونەوە نەکەن. هەتا ڕادەیەك لەناو کوردەکاندا ژمارەیەکیان لایەنگری ئەم بۆچوونە بوون و لایان وابوو مانەوەی کورد لەچوارچێوەی خیلافەتی عوسمانیدا شتێکی پێویست بووە و جیابوونەوە لێی بەشتێکی هەڵە و ناڕەوا داناوە کە سەرکردەی ئەم تاقمە شێخ عەبدولقادری شەمزینی بووە، بەلاّم ژمارەیەکی زۆر لەڕۆشنبیرانی تری کورد بەسەرکردایەتی بنەماڵەی بەدرخانیەکان لەگەڵ ئەو بۆچوونەدا نەبوون و بەپێویستیان زانیبوو کورد حکومەتی سەربەخۆی هەبێت و وابەستەی ئەو پاشماوە داڕزاوەی عوسمانی نەبێت.

دەربارەی هەڵوێستی کاربەدەستانی پاشماوەی عوسمانی، (Robert Olson) لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٨٤ وتویەتی لەدوای وەستانی شەڕ ئەو تورکانەی کاربەدەستی پاشماوەی عوسمانی بوون لەسەرەتادا دژی داخوازیەکانی کورد نەبوون لەبەر دوو مەبەست، یەکەم بۆئەوەی کوردەکان نەبن بەلایەنگری ئینگلیزەکان و دوهەم بۆئەوەی کوردەکان بەکاربێنن دژی نەخشەی دامەزراندنی حکومەتێکی ئەرمەنی کە ئینگلیزەکان زۆر سەرگەرمی دروستبوونی ئەو حکومەتە بوون بۆ ئەرمەنیەکان و لەڕاستیشدا کوردەکانیش لەدروستبوونی ئەو

حکومەتی ئەرمەنیە ترسابوون (لەباسی پەیمانی سیڤەردا بەدووروودرێژی باسی ئەو کێشەیە دەکەین).

دەربارەی هەڵوێستی کاربەدەستانی سەر بەخەلیفە لەئەستەمبوڵ، جەلادەت بەدرخان لەلاپەڕە (٧٩)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٦٠ نوسیویەتی: ((لەدوایئەوەی (کلیمانصو)ی فەرەنسی بەناوی دەوڵەتە ئەوروپیەکانەوە باسی ڕەوشت و خراپەی تورك و جەور و ستەمی بەدووروودرێژی کردبوو، وتبووی بۆمان دەرکەوتوە تورك توانای ئەوەی نی‌یە کاروباری میللەتانی تری غەیری تورك ببەن بەڕێوە، لەبەرئەوە نابێ بەهیچ جۆرێك جارێکی تر ڕێگە بدرێت بەتورك دەسەلأتی بەسەر هیچ میللەتێکی تردا هەبێت و ئەو قسانەی کلیمانصو کە بلأوکرایەوە کارێکی وایکرد کوردەکان بکەونە خۆیان و دەستیانکرد بەچالاکی بۆ دەستگیربوونی مافی خۆیان و لەئەنجامی ئەمەدا (بابی عالی) ترسی ئەوەی لێنیشت کوردستان لەبابی عالی جیابێتەوە، بەرامبەر بەمە ڕۆژنامەکانی تورك دەستیانکرد بەلێدانی بالۆرەی ئیسلامەتی و پێویستی یەکبوون و هاوکاریکردنیان لەگەڵ یەکتردا و بۆ خەڵەفاندنی عەرەب و کورد و میللەتانی تری ئیسلام لیژنەیەکیان پێکهێنا لە(حەیدەری زادە ئیبراهیم ئەفەندی کە شیخ الاسلام بوو) لەگەڵ (عبوق پاشا)ی وەزیری ئەشغال و (عەونی پاشا)ی وەزیری دەریا و چەند ئەندامێکی کۆمەڵی تەعالی کوردستان وەکو (ئەمین عالی بەدرخان کە باوکی جەلادەت خان بووە) و (مراد بەدرخان) و (شێخ عەبدولقادر ئەفەندی-مەبەست شێخ عەبدولقادری شەمزینی‌یە) و ئەو لیژنەیە لەکۆبونەوەیەکدا دوو بڕیاری دەرکرد:

١-دانی مافی سەربەخۆیی ناوخۆ بەمەرجێك کوردەکان قبوڵی ئەوە بکەن لەچوارچێوەی جامعەی عوسمانیدا بمێننەوە.

٢-هەنگاوی پێویست بنرێت بۆ بەجێهێنان و سەرگرتنی ئەو بڕیارەی پێشوو بەدەستوبردی.

جەلادەت بەدرخان لەلاپەڕە (٨١)ی کتێبەکەیدا ئەو نامەیەی کردووە بەعەرەبی کە ئاراستەی ئەو ئەندامانە کراوە کە لەو نامەیەدا وتراوە: ((لەپێناوی بەرژەوەندی ولأتدا پێویستی بەوە هەیە کە سەعادەتتان بەشداری بکەن لەو

کۆبونەوەیەی ئەنجومەنی وەزیران لەڕۆژی شەممەی داهاتوودا دەیکا بۆیە تکایە سەعات دووی پاشنیوەڕۆ لەبابی عالی ئامادەبن.

ئیمزا ئیبراهیم حیدەری

لەبریتی صدری أعظم (سەرەك وەزیران)

نوسەری سەرچاوە/٨١ دەڵێت: ((بەلاّم هەفتە لەدوای هەفتە تێپەڕی.. مانگ بەدوای مانگدا تێپەڕیکرد بەبیّ ئەوەی (صدری اعظم) کە (فەرید پاشا) بوو تاقە هەنگاوێك بنێت بۆ بەجێهێنانی بڕیارەکانی ئەو لیژنەیەی خۆیان پێکیانهێنابوو کە ئەمە بوو بەهۆی بێزاربوون و نیگەرانی کورد و لەئەنجامی ئەمەدا، جەمعیەتی تەعالی کوردستان و جەمعیەتی تەشکیلاتی ئیجتماعی و جەمعیەتی ئیستقلالی کوردستان هەموویان لەناوخۆیانا شەریف پاشا (مەبەست شەریف پاشای فندانە)یان کرد بەنوێنەری کورد لەکۆنگرەی ئاشتیدا بۆئەوەی داوای سەربەخۆیی کوردستان بکات و بەهۆی بەتوانایی و لێهاتوویی شەریف پاشاوە ئەنجام بەوە گەیشت کە: پەیمانێك لەنێوان (شەریف پاشا) و (برغوص نوبار پاشا)ی سەرۆکی وەفدی ئەرمەنی بەسترا لەپاریس بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد و ئەرمەنی بەشێوەیەکی ئاشتی و بۆئەوەی ڕێگە خۆش نەبێت بۆ بێگانە دەست لەکاروباری هەردوولایانەوە وەردات)).

لەڕاستیدا ئەو ڕێکەوتنەی جەلادەت بەدرخان باسیکردووە لەنێوان نوێنەری کورد و ئەرمەنیدا کێشەیەکی زۆر گەورەی لیّپەیدابوو کە تورکە کەمالیەکان سودێکی زۆریان لیّدەستگیربوو وەکو لەباسی پەیمانی (سیڤەر)دا بەدوورودرێژی باسیدەکەین.

## ب-هەڵوێستی کەمالیەکان بەرامبەر بەکورد

هەموو بەسەرهات و ڕووداوەکانی دوای شەڕی جیهانی، لەوانەی تورکە کەمالیەکان تیایدا بەشداربوون، هەر لەسەرەتاوە و بەئاشکرا نیازی ناپاکیی تورکی تیادا دیاربووە ئەگەرچی لەسەرەتادا کە هێشتا خۆیان نەگرتبوو بەهێز نەبووبوون و سوودیان لەهەڵوێست و ناکۆکی نێوان دەوڵەتان دەستگیر نەبووبوو هەڵوێستی خۆیان بەئاشکرا بەرامبەر کورد و مافی کورد ئاشکرا نەکردبوو. دەربارەی هەڵوێستی کەمالیەکان و مەبەستە ئاشکرا و شاراوەکانیان بەرامبەر کورد لەهەندیّ سەرچاوەدا ئەو مەبەستەیان ڕوونبۆتەوە.

پرۆفیسـۆر حەسـرەتیان لەلاپـەڕە (٢٠)ی کتێبەکەیـدا سەرچـاوە/٤٥ باسـی نامەیەکی مستەفا کەمالی کردووە کە لەمانگی ئابی ١٩٢١دا ناردبووی بۆ هەندێ لەئاغا و سەرۆك عەشیرەت و شێخە ئایینیەکانی کورد و لەگەڵ ئەو نامەیەیدا بڕیارەکانی کۆنفرانسی (ئەرزڕوم)ی ناردبوو، لەو نامەیەیدا کە بۆ (عەبدولڕەحمان ئاغای شرناخ)ی ناردبوو وتبووی: ((لام ئاشکرایە و هیواداریشم ڕێگە نەدەن بەئەرمەنیەکان خاکی وڵاتەکەتان گلاوبکەن و داوات لێدەکەم بەدەستوبردی هێزێکی نیشتمانی ڕێکبخەیت بۆ پاراستنی نیشتمان و بۆ دژی خائینەکان)).

حەسرەتیان لەباسەکەیدا دەڵێت: ((کەچی تەنها دوای ناردنی ئەو نامەیە تورکە کەمالیەکان هێرشیانکردە سەر عەبدولڕەحمان ئاغا لەشرناخ بۆ تێکدانی ئەو دامودەزگایەی لەدوای مۆرکردنی پەیمانی ئاشتی بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری ناوخۆ دایمەزراندبوو، لەو هێرشەدا زیانێکی زۆر لەعەبدولڕەحمان ئاغا کەوت بەپێی ئەو ڕاپۆرتی ساڵانەیەی لەلاپەڕە (٨)یدا باسیکردوە کە بریتییە لە (٦٢) لاپەڕە کە وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا ئامادەیکردووە و بەدوورودرێژی باسی ئەو زیانانەی کردووە)).

دەربـارەی ئـەو دامودەزگایـەی عەبـدولڕەحمان ئاغـا کـە حەسـرەتیان باسیکردووە، لەهەمان کاتدا وەکو چۆن تورکەکان بەسەرکردایەتی عەلی شەفیق (یوزدمیر) بنکەیەکیان لەڕەواندز دروستکردبوو بۆ هەڕەشەکردن لەئینگلیزەکان کە بەدوورودرێژی لەلاپەڕە (١٦٧) بەرگی دوهەمی شێخ مەحمودا سەرچاوە/٨٠ باسی ئەوەی (یوزدمیر) کراوە، عەبدولڕەحمان ئاغای شرناخیش کە باوەڕی بەتورکەکان نەبوو، لەناوچەکەی خۆیدا ڕێکخراوێکی وەکو ئەوەی یوزدمیری پێکهێنابوو بۆئەوەی ئەو بۆشاییە پڕبکاتەوە کە لەناوچەکەیدا بەهۆی نەبوونی دەسەڵاتی حکومەتەوە پەیدابووبوو.

پرۆفیسـۆر حەسـرەتیان لەلاپـەڕە (١١)ی هـەمان سەرچـاوە/٤٥دا باسـی هەڵوێستێکی تری مستەفا کەمالی کردووە بەرامبەر بەکورد لەدوای تەواوبوونی شەڕی یەکەمی جیهانی و ئامـاژەی بۆ یاداشتەکانی (س. ی. ئەرلوف)ی باڵیۆزی سۆڤیەت کردووە لەتورکیا کە ئەرلوف باسی تەقەلادانی خۆی کردووە بۆئەوەی مـافی چارەنوسـی گـەلان لەمسـتەفا کـەمال بگەیـەنێت و بـۆی ڕوونبکاتـەوە لەنامەیەکیا بەمستەفا کەمالی وتوە: (تۆ خۆت داوای مافی سەربەخۆیی دەکەیت بۆ تورکیا کەچی دژی مافی کورد و ئەرمەنیەکان ڕادەوەستیت)، کە سەیر ئەوەیە

ئەمە یەکەمجارە لەو ڕۆژانەدا کاربەدەستێکی سۆڤیەت باسی کوردی بەو شێوەیە کردووە.

دەربارەی باوەڕنەکردنی مستەفا کەمال بەمافی هیچ میللەتێکی تر لەتورکیادا بێجگە لەمافی تورك حەسرەتیان دەڵێت: ((لەڕاستیدا مستەفا کەمال و کەمالیەکان نمونەی نوێنەری بۆچوونی بۆرجوازیی تورك بوون و هەر لەسەرەتاوە دژی کورد بوون و مستەفا کەمالی سەرکردەیان لە ١٩١٩/٦/١٥دا لەو تەلەگرافەیدا کە ناردبووی بۆ والی دیاربەکر پێیوتبوو: پێویستە هەرجۆرە ڕێکخراوێك لەئامانج و پرۆگرامەکانیدا بۆنی لێکترازاندن و پچڕاندنی وڵاتەکەمانی لێبێ، بەدەستوبرد ئەو ڕێکخراوە هەڵوەشێنرێتەوە، بۆیە لایەنگری ئێوەم لەتێکدان و لەناوبردنی ((یانەی کورد، زۆربەی سەرچاوەکان بە (Club) ناویانبردوە)).

حەسرەتیان ئاماژەی بۆ تەلگرافێکی تری مستەفا کەمال کردووە لەڕۆژی ١٩١٩/٦/١٨دا ناردبووی بۆ سەرکردەی فەیلەقی یەکەم (لەئەدەنە) و پێی ڕاگەیاندبوو کە دانیشتوانی ناوچەکانی ئەنادۆڵ هاوکاری ئەون و ڕێگاش لەپروپاگەندەی حوکمی زاتیش گیراوە (مەبەستی کوردە) لەژێر سایەی بەریتانیادا، سەیر ئەوەیە لەکاتێکدا مستەفا کەمال ئەو تەلگرافەی ناردووە کە حەسرەتیان باسیکردووە، کەچی مستەفا کەمال بۆ دەسبڕینی ئەو کوردانەی خەڵەتاندبوونی و کردبوونی بەئەندامی کۆنگرەکانی ئەرزڕوم و سیواس (وەکو لەشوێنی خۆیدا بەدوورودرێژی باسی دەکەین) لەکوردەکانی دەگەیاند لەدوای پاککردنەوەی وڵات لەداگیرکەران ئەوسا مافی کوردیش ئەخاتە بەرچاو.

حەسرەتیان لەباسەکەیدا باسی ئەوەی کردووە تورکەکان لەماوەی شەڕی سەربەخۆیی تورکیادا دژی دەوڵەتە هاوپەیمانە داگیرکەرەکان لەنێوان ساڵانی ١٩١٩ بۆ ١٩٢٢دا کە هێشتا تورك لاوازبووە و پێویستی بەهاوکاریکردنی کورد بووە، بەکوردەکانیان دەوت ئێوە برای دینیمانن و ئەم وڵاتە وڵاتی تورك و کوردە و مافی کورد دەبێ ڕێزی لێبگیرێت، لەڕاستیدا تورکەکان هەرچەند بەسەرزاری جاروبار باسی مافی کوردیان دەکرد بەڵام ئەوەی لەدڵ و مێشکیانا چەسپابوو دەربارەی کورد شتێك بوو بەتەواوەتی پێچەوانەی قسەکانیان بوو، بۆ نمونە ئەو نامەیەی ئەنجومەنی نیشتمانی (لەزۆربەی سەرچاوەکاندا بەئەنجومەنی باڵای میللی ناوبراوە) بەنهێنی ناردبووی بۆ سەرکردایەتی (جەبهەی جەزیرە) لەو نامەیەدا وترابوو:

((پێویسته لەسەرمان بەهەموو شێوەیەك دڵی سەرکردە و سەرۆکەکانی کورد ڕابگرین و بیانکەین بەلایەنگری خۆمان بۆئەوەی بڕیارەکانی ئەنجومەنی نیشتمانی پەسەندبکەن و پێویسته کوردەکان هانبدەین دژی فەرەنسیەکان بوەستن و لەعێراقیشدا دژی ئینگلیز بن بۆئەوەی ڕێگە لەهەموو جۆرە هاوکارییەك بگیرێت لەنێوان کورد و ئەو بێگانانەدا.. لەڕاستیدا ئێسته ئێمە جارێ ناتوانین لەدوولاوە شەڕبکەین (مەبەست کورد و بێگانەیە) بۆیە پێویسته زۆر وریای ئەو ڕاستیە بین)).

لەڕاستیدا تورکەکان هەر واشیانکردووە هەروەکو لەباسی بەسەرهات و ڕووداوەکانی داهاتوودا بۆمان ڕووندەبێتەوە، تورکەکان کێشەی خۆیان لەگەڵ کوردا دواخست هەتا ئەوکاتەی لەکێشەی بێگانە ڕزگاریان بوو ئەوسا بەربوونە گیانی کورد کە بەداخەوە کورد لەو قۆناغەدا کورتبین بووە و ساویلکانە بۆ بەسەرهات و ڕووداوەکان چووە و ئەو هەستی ئایینیەی کورد وایلێکردبوو تەنها ئاگاداری ڕووی دەرەوەی ڕواڵەت و درۆودەلەسەکانی تورك بووە کە هێشتا لای کورد خۆیان بەپارێزەری ئایینی ئیسلام دەخستەڕوو.

دەربارەی فرقەیلی کەمالیەکان لەو ڕۆژانەدا، قەدری جەمیل بەگ لەلاپەڕە (٥٨)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٥٧، ئەمیش وەکو نوسەرانی ئەو سەردەمە باسی فرقەیلی کەمالیەکانی کردووە کە چۆن لەئەنادۆڵ و کوردستاندا دوو لقی (کۆمەڵی پاراستنی ماف)یان کردبووەوە بەبڵاوکراوەکانیان خۆیان وا پیشانئەدا دۆستی کوردن و دەیانوت باسی کورد و مافی ڕەوای کورد شتێکی جەوهەریە و لەدوو نامەیاندا کە بۆ لقی ئەو کۆمەڵە و بۆ عەبدولڕەحمان ئاغای مامی عوسمان ئاغای نائیبی ئورفەیان ناردبوو کە ئەندامی (حیزبی شەعب)یش بوو، نوسیبویان دوای پاککردنەوەی وڵات لەداگیرکەران ئەوسا مافی برا کوردەکانیان دەخەنە پێشچاو.

زنار سلوپی ئاماژەی بۆ لاپەڕە (١٠٦)ی یاداشتەکانی (کاظم قەرەپاشا) کردووە کە لەژێر ناوی (شەڕ لەپێناوی سەربەخۆییدا) کە لەو یاداشتەدا باسی فەقەرەی یەکەمی ئەو بڕیارەی کردووە کە لەلایەن (کۆمەڵی پاراستنی ماف)ەوە دەرچووە کە لەو فەقەرەیەدا وتراوە: ((زۆربەی دانیشتوانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی موسڵمانن و بەپێی ڕێکەوتننامەی ئاشتی لەنێوان ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و سوێندخۆرەکان لە (١٩١٨/١٠/٣٠)دا، هەموو دانیشتوان لەیەك

چوارچـــێوەدا دەژیـــن و لەیـــەکتر جیانابنـــەوە چـــونکە ڕێزگـــرتن لەیـــەکتری کۆیکردونەتەوە)).

زنار سلوپی لەلاپەڕە (٦٠)ی کتێبەکەیدا باسی دەستبڕین و کەڵەك و فڕوفێڵی مسـتەفا کـەمالی کـردووە، کـە چـۆن لەسـەرەتادا بـۆ پتـەوکردنی جێـی خـۆی هەوڵیـدابوو خـۆی لـەپیاوە ئایینیـەکان نزیکبکاتـەوە و بـۆ دەسـتبڕینی خـەڵکی ساویلکە (کە بەداخەوە کورد لەو ساویلکانە بووە) جلوبەرگی ئاینی لەبەردەکرد و لای هەندێك کەس وابوو مستەفا کەمال تاقە کەسێك بوو لەو ڕۆژانەدا لەتوانایدا بێ حکومەتی ئیسلامی لەکریستیانە داگیرکەرەکان ڕزگاربکات.

قـەدری جـەمیل بـەگ لەباسـەکەیدا دەڵێـت: ئـەم هەڵوێسـتە پـڕ لەڕووکەشانەی مسـتەفا کـەمال وای لەسـەرۆك عەشـیرەتەکانی کـورد کردبـوو خۆیـانی لێنزیـك بکەنـەوە و ئـەویش تفـەنگی مـاوزەری بـەدیاری و خـەڵات بـۆ دەنـاردن و نـاوی خۆیانیـان لەسـەر قۆنـاغی ئـەو تفەنگانـە دەنوسـرا (لەباسـێکی تایبەتیـدا کـە لەدواییـدا بـۆ ژیـانی مسـتەفا کـەمال تـەرخانکراوە گـەلێك نمونـەی تـری ئـەو دەستبڕینە دەخەینە پێشچاو).

دەربـارەی ڕەفتـار و هەڵوێسـتی کەمالیـەکان بەرامبـەر کـورد، سـەیا بـەدرخان لەلاپـەڕە (٣)ی کتێبەکەیـدا سەرچـاوە/٧٩ چـاپی فلادلیفیـا لەپێشـەکیەکەیدا باسێکی تیادایە کە لەلایەن (Herbert Adams Gibbson) کە پەیامنێری ڕۆژنامەی (NewYork Herald) بووە لـەتورکیا و میسـر و بالقان و فەرەنسا لەساڵی (١٩٠٨-١٩١٨)دا دەربارەی هەڵوێست و ڕەفتار و بیروبۆچوونی تورکە کەمالیەکان لـەڕۆژی ١٩٢٨/١٢/١٥دا بەدووروودرێژی باسیکردووە کە بەپێویستم زانی کورتەیەکی ئـەو پێشـەکیە بخەمـە بەرچاو کە وتویـەتی: (زۆر کـەس لـەوەدا بەهەڵـەدا چووبوون کە لایان وابوو ئەرمەنیەکان و یۆنانیـەکان نـەیانتوانیبوو لەگەڵ بیروبۆچونەکانی ژون تورکدا خۆیان بگونجێنن، بۆیە هەرچیەکیان بەسـەردا هـاتبوو خۆیـان بەلێپرسـراو دەژمێرێن و لەو ڕووداوانەی بەسەریاناهاتبوو).

نوسـەر پرسـیار دەکـات و دەڵێـت: ((ئایـا کـوردی ئیسـلام کـە ئـەوانیش لەگـەڵ تورکەکانـدا هاوئایین بـوون و هـەروەکو ئەوان (سـونی) مەزهـەب بـوون و لەشـەڕی جیهانیـدا شانبەشـانی تـورك خۆیانـدابوو بەکوشـت.. ئایـا دوای ئـەو هـەموو فیـداکاری و خۆبەکوشـتدانە چـۆن پاداشـتیان درایـەوە لەلایـەن تورکەکانـەوە؟! تورکـەکان کـە دەسـتیان ڕۆیشـت هـەموو جـۆرە تاوانێکیان بەرامبـەر کـورد کـرد چ

بەکوشـتنی بەکۆمـەڵ و چ بـەئاوارەکردن و دەربـەدەرکردن و دوورخسـتنەوەیان لـەخاکی خۆیـان، لەگـەڵ ئەوەشـدا تـورك بەشـێوەیەکی گشـتی نیـوەی دانیشـتنی تورکیایان پێکنەدەهێنا کەچی خۆیان بەخاوەنی هەموو شتێك دەزانن و دەیانەوێ هەموو شتێك هەر بەدەست خۆیانەوە بێت.

کورد لەسـەرەتادا گـەلێك بـەڵێنیان پێدرا لەلایـەن تورکەکانـەوە، بـەڵام درۆیـان لەگەڵـدا کـرا و دەرکـەوت ئێسـتەش تـورك هـەر ئـەو تورکەیـە و سیاسـەتی خـۆی نـەگۆڕیوە و نایگۆڕێـت، بۆیـە سـاتێك کـورد بـۆی دەرکـەوت حکومـەتی (ئەنقـەرە) نیـازی توانـەوە و لـەناوبردنی کـوردە لـەناو کۆمـەڵگای تورکـدا، ئیتر چاری نـەما و دەستیدایە چەك و دەسـتیکرد بەشـۆڕش و لەئەنجامـدا نیـوەی دانیشـتوانی کـورد لەلایـەن تورکـەوە یـا کوژرابـوون یـا ئـاوارەکرابوون و لەبەرئـەوەی کوردسـتان شوێنێکی چەپەکە بۆیە شتێکی کەم دەربارەی ئەو تاوانانە دەزانرێـت کـە لـەکورد کرابوو، بۆیە دەنگ و هاواری نەدەگەیشتە دەرەوە.

لەسـەرەتادا مسـتەفا کـەمال توانیبـووی کوردەکـان بـۆ سـوود و مەبەسـتەکانی خۆی بەکاربێنێت، بەڵام ساتێك بۆی دەرکەوت کـوردیش ئـاوات و مەبەسـتی خـۆی هەیـە و بـۆی تێدەکۆشـێت و کۆڵنـادات و واز لەنەتەوایـەتی خـۆی ناهێنێـت و ئـەو کوردەی بـەر لەهـەزاران سـاڵ پـێش هـاتنی تـورك لـەناو خـاکی خۆیـدا ژیـابوو کـە کوردسـتانە شـتێك نـەبوو هـەروا بەئاسـانی واز لەنەتەوایـەتی خـۆی بێنێـت بۆیـە مستەفا کەمال دەستیکرد بەکوشتارکردن و لەناوبردنیان)).

نوسـەری ئـەو پێشـەکیە لەباسـەکەیدا دەڵێـت: ((شـتێکی زۆر باشـبوو سـریا بەدرخان هاتە ئەمریکا (سریا بەدرخان ئەو کتێبـەی لەساڵی ١٩٢٨دا بـەئینگلیزی لـەفلادلڤیا چـاپکراوە)، وە بـەهۆی ئـەوەوە ئێمـە لەخـەبات و تێکۆشـانی کـورد گەیشتین و وادیارە کۆڵنادات و لەخەباتی خـۆی ناکـەوێت و شـتێکی زۆر باشیش بوو کە بۆمـان ڕوونبووەوە و لـەوە گەیشـتین ڕەفتـار و هەڵوێسـتی تـورك بەرامبـەر کـورد وەکـو ڕەفتـاری تورکـەکان وابـووە بەرامبـەر بەیۆنانیـەکان و ئەرمەنیـەکان و کەمە نەتەوەکانی تر)).

## باسی سێهەمی بەشی دووەم
## هەڵوێستی دەوڵەتان بەرامبەر کورد لەدوای شەڕی یەکەمی جیهانی

بێگومان ئەو دەوڵەتانەی لەو ڕۆژانەدا دەسەلأتیان بەسەر ناوچەی ڕۆژهەلأتی ناوەڕاستدا هەبووە کە باکووری کوردستان بەشێك بووە لەو ناوچەیە، هەر دەوڵەتە سیاسەتی تایبەتی خۆی هەبووە بۆ دابینکردن و چەسپاندنی دەسەلأتی خۆی و بۆ دەستگیربوونی سوود و بەرژەوەندیەکانی خۆی، بۆیە بەپێویستم زانی کورتەیەکی ئەو سەرچاوانە باسبکەم کە لەو بارەوە دواون، بەتایبەتی ئەوانەیان لەپەیمانی (سایکس پیکۆ)دا بەشە میراتی خۆی لەدەوڵەتی عوسمانیدا بۆ تەرخانکرابوو.

## یەکەم-هەڵوێستی سۆڤیەت

لەدوای تەواوبوونی شەڕی جیهانی دەوڵەتی سۆڤیەت کە جێگەی ڕوسیای قەیسەری گرتبووەوە، لای میللەتە ماف خوراوەکانی بووبوو بەهێلانەی ئازادی و سەربەستی و بەتەمابوون، ئەو دروشمانەی بەرزیانکردبووەوە دژی ئیمپریالیزم و سەرمایەداران و ئەو بانگەوازانەی گەیشتبووە گوێچکەی میللەتانی بەشخوراو هیوا و ئاواتێکی تازەی پێبەخشیبوون و میللەتی کورد لەهەموان زۆرتر پەرۆشی بەجێهێنانی ئەو دروشمانە بوو بەئومێدی ئەوەی سۆڤیەت لای لێدەکاتەوە و دەبێت بەلایەنگری و ئەو میللەتەی ساڵەهابوو لەژێر جەور و ستەمی توركی عوسمانیدا دەینالأند و لەهەموو مافێکی نەتەوایەتی خۆی بێبەشبوو لەولاشەوە سیاسەتی حکومەتی بەریتانیا لەناوچەکەدا بەرامبەر کورد بریتیبوو لەسیاسەتێکی دووڕوویی و دەستبڕین و هەمیشە داوای کورد پشت بەعەدالەتی حکومەتی بەریتانیا ببەستێت و هیچ شتێك نەکات بەبێ‌پرس‌وڕای حکومەتی بەریتانیا و بۆ سەرگرتنی ئەوە (مێجەر نویل)ی ناردبوو بۆ ناوچەکە کە کورد لای وابوو هاتنی ئەو شتێکی خۆڕایی نەبوو بەڵکو هەنگاوێك بوو بۆ پێکهێنانی حکومەتێکی کوردی بەلأم دەرکەوت ناردنی مێجەر نویل شتێکی تەکتیکی بوو، لەلایەکەوە بۆ ترساندنی تورك بوو لەلایەکی تریشەوە بۆ خەڵەتاندنی کورد بوو کە

هیچ جۆرە بزوتنەوە و جموجوڵێك نەكات دژی توركیا كە لەو ڕۆژانەدا ڕوودانی بزوتنەوەیەكی وا لەگەڵ بەرژەوەندی بەریتانیادا یەكینەدەگرتەوە وەكو لەدواییدا و لەباسەكانی داهاتوودا ئەو ڕاستیەمان بۆ ڕووندەبێتەوە و ئەو هاتنەی نویل لەلایەكی ترەوە بۆ كوردستان شتێك بوو كەمالیەكان توانیبوویان بیكەن بەدەستكەلای پڕوپاگەندەكانی خۆیان لەلایەكەوە دژی (ئینگلیز و لەلایەكی تریشەوە بۆ خۆنزیككردنەوە لەسۆڤیەت كە حكومەتی بەریتانیای بەدەوڵەتێكی ئیمپریالیزم لەقەڵەم ئەدا و سیاسەتمەدارانی ئەو ڕۆژانەی سۆڤیەت لەو ڕووەوە كەوتبوونە گومان لەداخوازیەكانی میللەتی كورد و بەهاندانی بەریتانیای ئیمپریالیزمیان لەقەڵەم ئەدا و ئەنجامەكەی بەوە گەیشت سۆڤیەت هەمیشە سڵی لەهەموو تەقەلادانێكی كورد دەكردەوە ئەگەر بهاتایە داوای دۆستایەتی و یارمەتیدانی لەسۆڤیەت بكات و لەڕاستیشدا هیچ كاتێك كورد وەڵام و بەڵێنێكی ئەوتۆی لەسۆڤیەت دەستگیرنەبووبوو كە هۆی ئەمەش لەشوێنی خۆیدا ڕووندەبێتەوە و توركە كەمالیەكان كە لەو ڕۆژانەدا بۆ ماوەیەكی كاتی خۆیان كردبوو بەدۆستی سۆڤیەت و كارێكی زۆریان كردبووە سەر مێشكی كاربەدەستانی سۆڤیەت دژی تەقەلاكانی كورد بۆ نمونەی ئەم ڕاستیە با باسی یەكێك لەدوكیومێنتەكانی سۆڤیەت بخەینە بەرچاو كە لەلایەن ئەفراسیاب حلمی‌یەوە لەلاپەڕە (٢١)ی ژمارە/١١ی گۆڤاری (گزنگ)ی بەهاری ساڵی (١٩٩٦)دا لەڕووسیەوە كراوە بەكوردی كە ڕاپۆرتێكی تیایە ژمارە/٣٠٠٨ ڕۆژی (١٩٤٦/١٢/١٣) كە بەر لەبیست‌وپێنج ساڵ تێپەڕبوون بەسەر مێژووی ئەو دوكیومێنتەدا چی ڕوویداوە لێرەدا دانی پیادانراوە كە وتویەتی (وەكو خۆی بڵاویدەكەینەوە):

((هەندێ ڕێبەران و ڕێكخراوی كورد سەبارەت بەخەباتیان بۆ سەربەخۆیی گەلێك جار هەوڵیانداوە بەمەبەستی یارمەتی وەرگرتن و درێژەپێدانی خەباتیان پەیوەندی بەنوێنەرانی یەكێتی سۆڤیەتەوە بكەن كە یەكەم هەوڵدانیان دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٩٢٢) كە كۆمیتەی كورد لە(ئەرزڕوم) بڕیاریدا بەیارمەتی و پشتیوانی سۆڤیەت سەربەخۆیی كوردستان وەدیبێنێت، لەم بارەوە (خالید بەگ-كە مەبەستی خالیدبەگ جوبرانە كە لەباسەكانی داهاتوودا لەزۆر شوێندا باسی خالیدبەگ جوبران دەكرێت كە توركەكان لەشۆڕشی پیراندا لەسێدارەیاندا)، مەرجەكانی كۆمیتەی كوردی لەمەڕ كوردستانێكی ئازاد بەنوێنەرانی ئێمە

(مەبەســـت ســـۆڤیەتە) گەیانــد و بــەنیازی یارمەتیــدانی جوڵانــەوەی کــورد و پشتیوانیکردن لەلایـەن سـۆڤیەتەوە، ئاغـای (یوسـف ضـیاء-ئـەمیش هـەروەکو خالیـد جوبران لەلایـەن تورکەکانـەوە لەشۆڕشـی پیراندا لەسێدارەدرا) ڕوویکـردە باڵیۆزخانـەی سۆڤیەت لەئەنقـەرە و بـۆ وەڵامـی ئـەو داخوازیـە لەلایـەن لیژنـەی کۆمیساریای وەزارەتی دەرەوە لەڕۆژی (١٩٢٣/٣/٢٨)دا پێی ڕاگەیـەنرا (مەبەست بەیوسف ضیاء) کەوا: (دەبێ نە لەکوردە جیاخوازەکانی دژی تورکیا پشتیوانی بکرێـت نـە لـەئیمپریالیزمی تـورك لەئاسـت کوردەکـان بـەڵکو تـەنها لەخـەباتی کوردەکان دژی ئینگلیزەکان هاودەردی پیشان بدرێت).

دوکیومێنتەکـە لەسـەری ئـەڕوا و دەڵێـت: سـەرەڕای ئـەوەی مولاقاتـەکانیان (مەبەسـتی نوێنـەرانی کـوردە) لەگـەڵ ئێمـەدا سـەرکەوتوانە نـەبوو، کۆمیتـەی ناوەنــدی کوردســتان تەقــەلای لایــەنگرێتی ســۆڤیەتی درێژەپێــدا و بــەهۆی نوێنەرەکەیـەوە (کـەمال فـەوزی بـەگ) ڕەمز و نامـەی بـۆ کونسوڵی ئێمـە لەتـەورێز نارد کە هاوڕێ (دوبسۆن) بوو. کەمال فەوزی داوایکرد سەرەڕای ئەو بۆچوونەی دەوڵەتی سۆڤیەت بەرامبـەر بەکێشەی کورد، لەگەڵ ئیسماعیل ئاغای سمکۆ کە لەئێراندا بزوتنەوەی کوردەکان ڕێبەری دەکات پێوەندی بکرێت و وە بۆ کۆمیتەی ناوەندی هەلێك برەخسێنێت کە چالاکیەکانی ئیسماعیل ئاغا بەرەو داخوازیەکانی کۆمیتەی ناوەندی تێپەڕ بکرێت.

سـەرەڕای ئـەوەی ئێمـە (مەبەسـت سـۆڤیەتە) لـەگفتوگۆکردن لەگـەڵ کـوردان خۆمـان بـوارد، کۆمیتــەی کـورد ڕایگەیانـد کۆمیتـە و خـەڵکی کـورد لایـەنگیریی هەمیشـەیی خۆیـان لەگـەڵ سۆڤیەت درێژەپێـدەدەن. لەسـاڵی (١٩٢٣)دا کونسوڵی ئێمە نامەیەکی لەلایەن شێخ مەحمودەوە بۆ هـات کە داوای یارمـەتی و پشتیوانی ئێمەی کردبوو بۆ کورد، ڕووداوەکانی دوایـی لەکوردسـتانی تورکیا لەناوچوونی ڕێکخراوەکـانی کـورد لەگەڵ دورخستنەوەی ڕێبـەرانی کـورد ئیمکـانی پەیوەنـدی کوردیان لەگەڵ ئێمەدا بنەبڕکرد، جگـە لـەوەش هەنـدێ دڵسـاردبوونەوەش لەلایـەن کوردەکانەوە لەئاستی ئێمەدا ڕوویاندا، ئێمە نـەك تـەنها پشتیوانیمان لەخـەباتیان نـەکرد، بـەڵکو بزوتنـەوەی ئەوانیشـمان لەچـاپەمەنیەکانی خۆمانـدا پـڕ ڕەنـگ نەکردووە.

دەربارەی ئەو دوکیومێنتەی سۆڤیەت کە باسی هەوڵدانی خالید بەگ جوبرانی تیادا کراوە، ئەحمەد تەقی لەیاداشتەکانیدا سەرچاوە/٦٩ باسـی ئـەو تەقەلادانـەی

خالید جوبرانی بەمجۆرە کردووە: ((کە لەتورکیا بووم چاوم بەخالید بەگ جوبران کەوت و فەرمووی تورك و ئینگلیزی فێلباز هیچیان لێیەیدا نابێت بۆ کورد، لەبەرئەوە دەبێ چاوەڕوانی هەل و دەرفەتێك بکەین و داوای لەمن کرد پەیوەندی بەئیسماعیل ئاغای شکاکەوە بکەم بۆئەوەی لەم ڕاستیە تێبگات و پەیوەندی و هاوکاری خۆشی لەگەڵ ئێمەدا زۆرتر بکات و هەوڵیش بدات لەگەڵ ڕووسەکاندا پەیوەندی بکات بەڵکو یارمەتیمان بدەن.

کە چوومە (باشقەڵا) قسەکانی خالید بەگ و ئەو شفرەیەی خالید بەگ دابووی بەمن دام بەسمکۆ و ئەویش داوای لەمن کرد بەناوی ئەوەوە پەیوەندی بەکونسوڵی ڕوسەوە بکەم لە(ورمیە) و داوای یارمەتیدانی لێبکەم بۆ کوردی ئێران و عێراق و تێشیبگەیەنم کە کوردەکانی هەردوولا چاوەڕوانی ئەوەن وەڵامەکەی ئێوە (هی ڕوس) بگەیەنمەوە بەوان بۆئەوەی بزانن ئایا ڕوسیا ئامادەیە یارمەتی کورد بدات یان نا؟ ئەگەر ڕووسەکان ئەوەش ناکەن با جارێ لەم وەختەدا بمپارێزن لەئێرانیەکان.

ئەحمەد تەقی لەباسەکەیدا لەسەری ئەڕوا و ئەڵێت ساتێك سمکۆ ئەو قسانەی پێڕاسپاردم نامەیەکیشی دابوومێ کە من نوێنەری ئەوم و پیاوێکیشی لەگەڵدا ناردم بۆئەوەی ئەنجامی چوونەکەم بۆ ورمیە بەنامەیەکدا بەهەمان پیاودا بنێرمەوە بۆ سمکۆ. کە چوومە ورمیە و چاوم بەکونسوڵی ڕووس کەوت زۆر بەگەرمیەوە پێشوازیی لێکردم و هەواڵی سمکۆی لێپرسیم و منیش هۆی چوونەکەی خۆمم بۆلای ئەو پێگەیاند و لەوەڵامدا پێی‌وتم دەربارەی ئەمە پێویستە قسە لەگەڵ مۆسکۆدا بکەم، لەبەرئەوە جارێ لێرە بمێنەوە هەتا پاش هەفتەیەك ئەوسا وەڵامەکەی مۆسکۆت پێڕادەگەیەنم، دوای هەفتەیەك چوومەوە لای کونسوڵ و پێی‌وتم: مۆسکۆ داخوازی یەکەمی پێجێبەجێ ناکرێت (مەبەست یارمەتیدانی کورد)، بەڵام لەبەرئەوەی ئێمە کوردمان خۆشدەوێ، نامانەوێ بیانخەڵەتێنین و بەڵێنی درۆیان بدەینێ، هەرچەند دووریش نیە لەدواڕۆژدا هەر ڕێکبکەوین، بەڵام دەربارەی سمکۆ ڕەنگە بتوانین بۆی بکەین و با لەمەودوا ئیسماعیل ئاغا زوو زوو پەیوەندیمان پێوەبکات بۆئەوەی ئاگاداری بکەم لەهەڵوێست)).

## دووەم: هەڵوێستی فەرەنسا بەرامبەر باکووری کوردستان دوای شەڕی یەکەمی جیهان

فەرەنسیەکان بەپێی پەیمانی (سایکس پیکۆ) سوریا و بەشێکی ویلایەتی موسڵیان بۆ تەرخانکرابوو، بەڵام ئینگلیزەکان لەمێژبوو مرخیان لەهەموو میسۆپۆتامیا خۆشکردبوو، ویلایەتی موسڵی پڕ لەنەوت شتێك نەبوو هەروا بەئاسانی دەستبەرداری بن بۆ فەرەنسیەکان کە تا ئەوسا فەرەنسا شارەزای بوونی نەوت نەبوو لەو ویلایەتەدا، ئینگلیزەکان لەپاش ڕاوەڕێوی و فڕوفێڵ و کەڵەك توانیان فەرەنسیەکان قایل بکەن واز لەو بەشەی خۆیان بێنن و لەجیاتی ئەوە ناوچەی کیلیکیایان داواکرد کە بەلای فەرەنسیەکانەوە کیلیکیای نزیك بەسوریا باشتر و لەبارتر بوو، بەوجۆرە بەپێی پەیمانی (سان ڕیمۆ) ئەو بەشەی فەرەنساش خرایە سەر بەشەکەی تری بەریتانیا و لەدواییدا کە فەرەنسیەکان هەستیان بەو هەڵە زلەی خۆیان کرد تازە کار لەکار ترازابوو ڕێگەی پەشیمانبوونەوەیان لێگیرابوو بەڵام ئەم فڕوفێڵەی ئینگلیز لێیکردبوون چووبووە ڕیزی گرێکوێرەکانی تر و ناڕەزایی و بێزاری فەرەنسا بەرامبەر بەهەڵوێست و سیاسەتی بەریتانیا تادەهات پەرەیدەسەند بەتایبەتی لەدوای ئەوەی ئینگلیزەکان یۆنانیەکانیان هاندا پەلاماری ناوچەی (ئەزمیر) بدات، ئیتر بەئاشکرا هەروەکو سۆڤیەت ئەمیش کەوتە ڕقەبەری و بەربەرەکانیکردنی سیاسەتی بەریتانیا و لەزۆر هەڵوێستیان بوون بەلایەنگری کەمالیەکان کە ئەم هەڵوێستە تازەیە لەسودی میللەتی کوردا نەبوو، بەتایبەتی لەباکووری کوردستاندا و زۆری پێنەچوو ئیتاڵیەکانیش لەزۆر هەڵوێستیاندا بوون بەلایەنگری کەمالیەکان.

فەرەنسیەکانیش هەروەکو سۆڤیەتەکان لایانوابوو ئینگلیزەکان بۆ سەرگرتنی مەبەستێکی تایبەتی خۆیان کوردەکانی باکوریان هانئەدا دژی تورکە کەمالیەکان بوەستن کە لەو ڕۆژانەدا ئەو تورکانە بووبوون بەدۆستی سۆڤیەت و بەئاشکرا دژی سیاسەتی بەریتانیا ڕاوەستابوون. دەربارەی ئەو هەڵوێستەی فەرەنسا، دکتۆر وەلید حەمدی لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٢٣ ئاماژەی بۆ ڕاپۆرتی (Ibid) کردووە کە لە(١٩٢٠/٦/٢٣)دا باسی نامەیەکی ئەدمیرال (Robeck) کردووە لەوەدا وتویەتی هەندێ لەبنەماڵەی بەدرخانیەکان بێزاری خۆیان دەربڕیبوو بەرامبەر بەو

هەواڵانەی گوایا (جزیرەی ئیبن عومەر) بەر فەرەنسیەکان دەکەوێت کە سوریایان لەژێر دەستدابووە و داوایان کردبوو ئەو ناوچەیە بخرێتە ناو چوارچێوەی حوکمی زاتی باکوری کوردستانەوە وە یا بخرێتە سەر ویلایەتی موسڵ بۆئەوەی دانیشتوانی ئەم ناوچەیەش سوود لەمادە/٦٤ی پەیمانی سیڤەر وەرگرن)).

بەڵگەیەکی ئاشکرا بۆ لایەنگرێتی فەرەنسیەکان بۆ کەمالیەکان، هەروەکو (مێجەر نویل) لەلاپەرە (٢١)ی ڕاپۆرتەکەیدا سەرچاوە/٢٧دا باسیکردووە کە وتویەتی: ((ئیمرۆ (مێجەر برونۆ)ی فەرەنسی گەیشتۆتە ناوچەکە و لەبەشی (جندرمەری)ی تورك لەناوچەکانی (خەرپوت و سێواس)دا بەناوی (مفتش-پشکێنەر)ەوە کاردەکات، وە بەئاشکرا لایەنگری مستەفا کەمالە و لەزۆر هەڵوێستدا بێپێچ‌وپەنا ئەو لایەنگرێتیەی خۆی ئاشکرا دەکات بەوەی والی ئیهانە دەکات و (تا ئەوکاتە هێشتا والی سەر بەخیلافەتی پاشماوەی عوسمانی بووە بۆیە کەمالیەکان دژی بوون)، والیش بەرامبەر بەو هەڵوێستەی (مێجەر برونۆ) تلگرافێکی ناردووە بۆ حکومەتەکەی خۆی و لەو تلگرافەدا کاربەدەستانی حکومەتەکەی ئاگادارکردووە ئەو پشکێنەرە فەرەنسیە گەیشتۆتە ناوچەکە و بەخەرپوت و سێواسدا دەگەڕێت و بەئاشکرا لایەنگرێتی بۆ مستەفا کەمال دەردەبڕێت و دژایەتی ئێمە دەکات کە ئەمە ئەو ڕاپۆرتەی پێشومان زۆرتر ڕووندەکاتەوە کە وتبوومان فەرەنسیەکان لەژێرەوە لایەنگری کۆنگرەی سێواسن (لەباسێکی تایبەتیدا باسی ئەو کۆنگرەیە دەکەین کە کەمالیەکان بەستبوویان)).

لەڕاستیدا ئەو لایەنگرێتیەی فەرەنسیەکان بۆ کەمالیەکان کە لەو ڕاپۆرتەی پێشوودا باسکراوە، وادیارە سەرەتای دەستپێکردنی لایەنگرێتی فەرەنسیەکان بووە بۆ کەمالیەکان و پاشئەوە ڕۆژ بەڕۆژ زۆرتر پەرەیسەندوە کە لەشۆڕشەکەی شێخ سەعیدی پیراندا هەروەکو لەشوێنی خۆیدا باسیدەکەین بەئاشکرا فەرەنسیەکان ئەو هێڵی شەمەندەفەرەی بەناوچەی دەسەڵاتی ئەواندا تێپەڕیدەکرد ڕێگەی بەتورکە کەمالیەکان دابوو بەئارەزووی خۆیان هێزەکانیان بەو شەمەندەفەرە بگوێزنەوە و بەو هێزە لەپشتەوە لەهێزەکەی شۆڕشگێڕانی شۆڕشی پیران درا، کە هۆی ئەم ڕێگادانەی فەرەنسا بەکەمالیەکان ئەوەبوو لایانوابوو ئینگلیزەکان دەستیان هەبووە لەهاندانی کورد لەشۆڕشی پیراندا، کە لەباسی ئەو شۆڕشەدا بەبەڵگە ئەوە بەدرۆئەخەینەوە و ئاشکرا دەبێت ئینگلیزەکان نەك

هاندەر و لایەنگری کورد نەبوون، بەڵکو حەزیشیان کردووە ئەو شۆڕشەی کورد سەرنەکەوێت.

بێگومان کوردەکانی باکوور ناحەقیان نەبووە کە لەسیاسەتی فەرەنسیەکان سڵەمیبوونەوە و لایان وا باشتربوو ئینگلیزەکان دەسەڵاتداربن بەئومێدی ئەوەی دەبن بەیارمەتیدەری کورد بۆ گەیشتن بەمافەکانیان کە بەداخەوە لەم بۆچوونەشیانا هەر بەهەڵەدا چووبوون. نمونەی ناڕازیبوونی کورد بەرامبەر بەسیاسەتی فەرەنسا لەنامەیەکی مەندوبی سامی بەریتانیا لەئەستەمبوڵدا دەردەکەوێت کە لەدوکیومێنتی ژمارە (FO.٣٧١-٥٠٦١)ی ڕۆژی (١٩٢٠/٣/٢) کە لەوەدا باسی ڕاپۆرتێکی (مستەر ریان)ی کردووە کە لەو ڕاپۆرتەدا وتراوە: ((نیشانە بەتەلگرافی ژمارە/١٦٩ی ڕۆژی ١٩٢٠/٢/٢٧، وا وەرگێرانی یاداشتێکی شێخ عەبدولقادرتان بۆ دەنێرین کە داوای ڕوونکردنەوەی سیاسەتی حکومەتی بەریتانیا دەکات کە وتویەتی: لەوە دەچێت ئینگلیزەکان لەکوردستاندا هەڵوێست دەهێڵنەوە بۆ فەرەنسیەکان و منیش (ریان) لەشێخ عەبدولقادرم گەیاند ئەو ئاڵوگۆڕە تازەیەی ڕوویداوە تەنها هەر پەیوەندی بە(کیلیکیا)وە هەیە و بەرامبەر بەو قسەیەی من شێخ عەبدولقادر دەڵێت: نوێنەری ئێمە (لام وایە مەبەستی شەریف پاشای خندان بووبێت) ئاگاداری کردین فەرەنسیەکان نیازیان وایە سنووری دەسەڵاتیان بگەیەننە (سیڤاس) و (خەرپوت) و هەندێ شوێنی تر و هەوڵی ئەوەش ئەدەن کورد بەلای خۆیانا داشکێنن، بەڵام کوردەکان ئەمەیان پێخۆش نییە چونکە دەیانەوێ لەژێر سایەی بەریتانیادا بن کە دەتوانێت ڕێگە لەتورکە قەومیەکان و بۆڵشەویکی دۆستیان بگرێت.

دۆکیومێنتەکە لەسەری دەڕوا و دەڵێت: بەکورتی عەبدولقادر داوای پشتگیری لەئێمە دەکات کە یارمەتی کورد بدەین و نایەوێ لەژێر سایەی هیچ دەوڵەتێکی تردا بن. بۆم دەرکەوتووە هەرچەند شێخ عەبدولقادر دژی تورکە بەڵام خۆی و تاقمەکەی دەیانەوێ هاوکاربن لەگەڵ حکومەتی خەلیفەدا، بەڵام کاربەدەستانی بەریتانیا لەبەغدا نایانەوێ بایەخ بدرێت بەعەبدولقادر و دەزانم هۆی ئەو مەترسیەی عەبدولقادر لەنامەیەکی شەریف پاشاوە پەیدابووە کە وتویەتی نیاز وایە ژووروی کوردستان (مەبەست باکوری کوردستانە) بۆ فەرەنسیەکان بێت و هی باشووریش بۆ حکومەتی بەریتانیا بێت کە بەپێی ئەمە ناوچەی جزیرە کە هی بەدرخانیەکانە دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی فەرەنساوە لەبەرئەوە عەبدولقادر وای

لاباشە هەموو کوردستان بەتێکڕایی (مەبەستی باکوری کوردستانە) ئۆتۆنۆمی بدرێتێ لەژێر سایەی تورکیادا کە لامواییە کوردەکان لەسەر ئەم پێشنیازەی عەبدولقادر ڕێکناکەون و عەبدولقادر داوای گەرەنتی دەکات بۆ سەرگرتنی ئەم پێشنیازە چونکە بەدرخانیەکان باوەڕیان بەتورك نی‌یە.

ڕاپۆرتەکە لەسەری ئەڕوا و دەڵێت: ئەگەر ئەو حوکمە زاتیە سەربگرێت دەتوانرێ حساب بۆ هەردوولا شێخ عەبدولقادر و بەدرخانیەکان بکرێت و ئەمەیان باشترە لەوەی بخرێنە ژێر سایەی بەریتانیا و فەرەنساوە، چونکە فەرەنسیەکان دەسەلأتیان لەهەر شوێنێکدا هەبێت کێشەیەك لەو ناوچەیەدا پەیدا ئەکەن.

## سێهەم-هەڵوێستی حکومەتی بەریتانیا

لەدوای تەواوبوونی شەڕی یەکەمی جیهانی و مۆرکردنی پەیمانی (مودراس) حکومەتی بەریتانیا یەکسەر سیاسەتەکانی خۆیان بەرامبەر بەناوچەکە ئاشکرا نەکردبوو بەڵکو هەنگاو بەهەنگاو بۆی دەچوون و لەپێشدا دەربارەی کورد لەباشووری کوردستانەوە دەستیان پێکردبوو، ئەو بۆشاییەی بەدەرکردنی سوپای عوسمانی و دەرکردنی کاربەدەستانی تورکەوە پەیدابووبوو ڕێگەیان لەوە نەگرت لەسەرەتادا حکومەتێکی ناوچەیی لەباشووردا پێکبێت بەسەرکردایەتی شێخ مەحمود هەروەکو لەبەرگی یەکەمی سەرچاوە/٨٠دا بەدوورودرێژ باسکراوە و هەواڵی دروستبوونی ئەو دەزگا ئیداریەی لەباشووردا دامەزرابوو گەیشتبووە باکووری کوردستان و لەوێش کە کورد ساڵەها بوو لەژێر جەور و ستەمی حکومەتی عوسمانیدا بوو هیوای ئەوە پەیدابوو کە ئینگلیزەکان بایەخ بەباکووریش دەدەن و ئەوەی کە زۆر دڵنیای کردبوون لەسەر گرتنی ئەو ئاواتەیاندا ناردنی (مێجەر نویل) بوو کە لەدواییدا بەدوورودرێژی باسی هۆی ئەو ناردنەی دەکەین و بۆمان دەردەکەوێت مەبەست لەناردنەکەی تەنها بۆ ئەوە بووە جۆرە هەڕەشەیەك لەتورکەکان بکات کە ئیتر جارێکی تر بەتەمای ئەوە نەبن داوای ویلایەتی موسڵی پڕ لەنەوت و میسۆپۆتامیا بکەنەوە، لەلایەکی تریشەوە دەیانویست بەو ناردنەی (مێجەر نویل) وا لەکوردی باکوور بکەن کە دڵنیابن لەعەدالەتی حکومەتی بەریتانیا و بۆ ئەو مەبەستە داوا لەکورد کرا هیچ جۆرە جموجۆڵێك و ڕاپەڕینێکی چەکدارانە دژی تورکی کەمالی نەکات کە تازە

سەریهەڵدابوو، بەڵکو چاوەڕوانی ئەنجامی پەیمانی سیڤەر بێت کە ئینگلیزەکان لەوەدا لەسەرەتادا خۆیان بەخەمخۆری کورد پیشاندابوو.

دەربارەی سیاسەتی حکومەتی بەریتانیا دوو باس دەخەینە پێشچاو کە لەهەردووکیاندا لەباسەکانی تری داهاتووشدا ڕووندەبێتەوە کە حکومەتی بەریتانیا هیچ نیازێکی باشی نەبووە و نەیویستبوو ئاواتەکانی کوردی باکوور بهێنێتەدی.

لەسەرچاوە/٧٠دا لەلاپەڕە (٢٣٤)یدا باسی ئەوەی کردووە لەسەرەتای کانونی دوهەمی ١٩١٩دا لەکاتی کۆبونەوەی کۆنفرانسی ئاشتیدا، هەندێك لەنوێنەرانی کورد بەسەرۆکایەتی شێخ عەبدولقادری شەمزینی بۆ دیدەنی دەچنە لای (ئەدمیرال کارل ئورب) کە مەندوبی سامی بەریتانیا بووە لەئەستەمبوڵ و یاداشتێکی دەدەنێ کە لەلایەن (جەمعیەتی تەعالی کوردستان)ەوە ئامادەکرابوو دایان بە(مستەر ریان) کە لەجیاتی مەندوبی سامی چاوی بەو نوێنەرانە کەوتبوو، لەو یاداشتەدا بێزاری خۆیان دەربڕیبوو بەرامبەر پشتگوێ خستنی داخوازیەکانی کورد و ئەوەیان خستبووە بەرچاوی کاربەدەستانی بەریتانیا کەوا پەیوەندی کورد لەگەڵ ئەرمەنیەکاندا ئاسایی بۆتەوە و ئەوەی جاران لەنێوانیاندا ڕوویدابوو شتێك بوو هەمووی بەهۆی کاربەدەستانی تورکی عوسمانیەوە ڕوویدابوو، ئەو نوێنەرانە تەرجومانێکی کریستیانیشیان لەگەڵ خۆیاندا بردبوو بۆ ڕوونکردنەوەی ناوەڕۆکی پێشنیازەکە.

ئەو نوێنەرانەی کورد داوایانکردبوو ڕێگە بدرێت کورد نوێنەری خۆی بنێرێت بۆ وڵاتانی ئەوروپا بۆئەوەی لەوێ باسی کێشەی کورد ڕوونبکەنەوە. سەرچاوە/٧٠ لەباسەکەیدا لەسەری دەڕوا و دەڵێت: ئەو یاداشتە لەڕۆژی ١٩١٩/١/٢دا لەلایەن ئەو نوێنەرانەوە درابوو بەباڵیۆزخانەی بەریتانیا لەئەستەمبوڵ کە بەسەرۆکایەتی شێخ عەبدولقادر لەگەڵ خەلیل بەدرخانی سکرتێر و سەید عەبدولای شەمزینی و مستەفا پاشا (مەبەستی مستەفا یامولکیە) و عەبدولعەزیز بابان و مەلا سەعید بەدیع ئەلزەمان و مەلا عەلی ڕەزا ئەو یاداشت و سکاڵایەیان مۆرکردبوو کە بەدووورودرێژی باسی مێژووی دابەشکردنی کوردستانیان کردبوو لەلایەن تورکیا و ئێرانەوە و داوای ئەوەیان کردبوو ئیتر کاتی ئەوە هاتووە میللەتی کوردیش لەچەوساندنەوە ڕزگاری ببێت و

داوایان کردبوو کورد مافی چارەنوسی خۆی هەبێت و بۆ گەیشتن بەو مەبەستە یارمەتی کورد بدرێت.

سەرچاوە/٧٠ لەباسەکەیدا لەسەری ئەڕوا و ئەڵێت: لە ١٩١٩/٥/١٢دا سەردانێکی تری کرد بۆلای (ئەدمیرال وێبی و داخوازیەکانی پێشووی لەحکومەتی بەریتانیا دوبارەکردەوە و داوای ئەوەی کرد یارمەتی ئەو سەدان هەزارانەی کورد بدرێت کە لەکاتی شەڕدا دوورخرابوونەوە هەموویان بگەڕێنەوە بۆ شوێنی خۆیان.

لەدیدەنیەکی تردا شێخ عەبدولقادر چاوی بە(مستەر هوهلەر) کەوت لەباڵیۆزخانەی بەریتانیا و پێی ڕاگەیاندبوو کە کورد خۆی لەهەلومەرجێکی زۆر ترسناکدا دەبینێت و لەوەڵامدا (هوهلەر) وەکو لەو ڕاپۆرتەی دەربارەی ئەو چاوپێکەوتنە ئامادەیکردووە وتویەتی: کاربەدەستانی عوسمانی لەئەستەمبوڵ بەسەرۆکایەتی (فەرید پاشا) بەڵێنی ئۆتۆنۆمی تەواوی داوە بەکورد لەسایەی حکومەتی تورکدا و هوهلەر ئاماژەی بۆ قسەکانی شێخ عەبدولقادر کردووە کە پێی‌وتبوو: ((فەرید پاشا هەتا لەسەر کاربوو بەڵێنی زۆریدا بەڵام هیچیانی بەجێنەهێنا و حکومەتەکەی عەلی ڕەزای دوای ئەویش گفتی دابوو ئیدارەیەکی زاتی بۆ کورد سازبکرێت بەڵام عەلی ڕەزا خۆشی لەهەمان کاتدا تەنگی پێهەڵچنراوە و لەبەرئەوەی مەترسی لەمستەفا کەمال لەزیادبووندایە (دیارە مەبەست دژی حکومەتی خەلیفە بووە لەئەستەمبوڵ) بۆیە حکومەت (مەبەست حکومەتی خەلیفەیە) دەیەوێ پشتیوانی کورد وەدەستبێنێت)).

هوهلەر لەڕاپۆرتەکەیدا لەسەری ئەڕوا و ئەڵێت: سەید عەبدولقادر دەیەوێ هاوکاری تەواو لەگەڵ هاوپەیمانەکاندا بکات بەتایبەتی لەگەڵ بەریتانیادا چونکە لای وایە دواڕۆژی کورد بەسیاسەتی حکومەتی بەریتانیاوە بەستراوە و سەید عەبدولقادر باسی گرنگی ئەو ڕێکەوتنەی کرد کە لەنێوان کورد و ئەرمەنیدا پێکهاتبوو. هەمان سەرچاوە/٧٠ باسی چوونی چەند ئەندامێکی (حیزبی دیموکرات)ی کردووە کە داوایان لەکۆمیسیۆنی (کینگ-کرەین) کردبوو کە چووبووە ئەستەمبوڵ و داوای مافی سەربەخۆیی کوردیان کردبوو.

ساتێك مەندوبی سامی بەریتانیا (مەبەست لەئەستەمبوڵ) لەوەزیری کاروباری دەرەوەی بەریتانیای پرسیبوو ئایا هەڵوێستی حکومەتی بەریتانیا چی‌یە دەربارەی چالاکی و داخوازیەکانی کورد؟ لەوەڵامدا (مستەر ریان) پێی‌ڕاگەیاندبوو

هەڵوێستی ئاشکرای حکومەتی بەریتانیا بەرامبەر بەکورد هەروەکو لەسەرچاوەکان و لەو دوکیومێنتانەی ناو ئەرشیفەکانی خۆیان کە پڕن لەڕاپۆرت و بۆچوونی کاربەدەستانیان ڕوونبۆتەوە، دەریئەخەن حکومەتی بەریتانیا لەپێش هەموو شتێکدا مسۆگەرکردنی سوود و بەرژەوەندیەکانی خۆی مەبەست بووە و گوێیان نەداوەتە بەرژەوەندیەکانی میللەتانی تر و هەرچیەکیشیان لەو بارەوە وتبێت تەنها هەر قسە بووە و بۆ دەستبڕین و بۆ خڵافاندنی ئەو میللەتانە بووە کە سەرکردەکانیان لەڕاستی ناوەڕۆکی سیاسەتی بەریتانیا نەگەیشتبوون و نمونەیەکی زەقی ئەمە لەهۆی ناردنی یەکێکی وەکو (مێجەر نویل)دا دەردەکەوێت کە پاشئەوەی لەساڵی (١٩١٩)دا حکومەتەکەی شێخ مەحمودیان بۆ جاری یەکەم تێکدا کە هەمووی ساڵێك تێپەڕی نەکردبوو بەسەر دامەزراندنیا وەکو لەکۆتایی بەرگی یەکەمی سەرچاوە/٨٠دا بەدووروودرێژ باسکراوە، ئیتر پاشئەوە (مێجەر نویل)یان بۆ مەبەستێکی تر نارد بۆ باکوری کوردستان.

مێجەر نویل لەیاداشتەکانیدا کە وەکو ڕاپۆرتێکی دووروودرێژ ئامادەیکردووە و پێشکەشی کردووە، کاربەدەستانی حکومەتەکەی کە دەقی ئەو یاداشتە لەدوکیومێنتی ژمارە (Fo.٣٥١-١٣٩٤٧) کە بریتی بووە لە (١٤١) لاپەڕە و لەگەشتەکەیدا بەباکوری کوردستاندا لەماوەی (١٩١٩/٦/١٤) هەتا (٢١ی ئەیلول)ی هەمان ساڵ درێژەی کێشاوە و دیمەنی هەندێ شوێنی باکوری کوردستان و وێنەی گەلێك سەرکردە و سەرۆك عەشیرەتی گرتووە و لەهەمان ڕاپۆرتیدا بڵاویکردۆتەوە، بەڵام بەداخەوە فۆتۆکۆپی ئەو دوکیومێنتە دیمەن و وێنەکانی زۆر لێڵ و نادیارن بۆیە سوودم لەوە وەرنەگرت تا هەندێکیان بڵاوبکەمەوە.

لەو دوکیومێنتەدا بەئاشکرا باسی هۆ و مەبەست لەناردنی مێجەر نویل نەکراوە، هەرچەند پرۆفیسۆر حەسرەتیان لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٤٩ باسی ئەوەی کردووە کە نویل خۆی وتویەتی حکومەتی سوڵتان لەئەستەمبوڵ دەسەڵاتی ئەوەی پێدرابوو سەرژمێری کورد و تورك بکات (لەدواییدا لەباسی شۆڕش و ڕاپەڕینی کوجیگری و دەرسیمی یەکەمدا ئەو باسەی حەسرەتیان دوبارە دەکەینەوە). لەڕاستیدا تا ئەوکاتەی هێشتا ئینگلیزەکان بەتەمای ئەوەبوون کورد لەباکوری کوردستاندا بۆ سوودی خۆیان بەکاربێنن و بیانکەن بەدەستکەلایەك بۆ هەڕەشەکردن لەکەمالیەکان و بۆ پوچەڵکردنەوەی بڕیارەکانی

کۆنگرەکـانی ئـەرزڕوم و سـیواس کـە بەئاشـکرا بـۆ پتـەوکردنی دەسـەلأتی کەمالیـەکان بـوون دژی خەلیفـەی سـەر بەحکومـەتی بـەریتانیا دژی سیاسـەتی حکومـەتی بـەریتانیا، خۆشـی دوایئـەوەی ویلایـەتی موسـڵ و میسـۆپۆتامیایان خسـتبووە ژێـر دەسـەلأتی خۆیانـەوە و تـا ئەوسـا کەمالیـەکان هـەردوولایان هـەر بـەهی خۆیـان دەزانـی و بەتـەمابوون دەسـتیان بەسـەردا بگرنـەوە و ئـەو میسـاقە میللیـەی لـەو دوو کۆنگرەیـەدا بڕیاریـان لەسـەردابوو یـەکێك لـەمادە گرنگـەکانی بریتی بووە لەوەی کە ویلایەتی موسڵیان هـەر بەهی خۆیـان زانیوە و بەئـەرکێکی پیرۆزی سەرشانی خۆیان زانیوە دەستیانبکەوێتەوە.

ئەوەی بەتەواوەتی سەرودڵی ئینگلیزەکانی گرتبوو بریتیبوو لەبەشداربوونی ژمارەیـەك لەسـەرۆك عەشـیرەت و ناسـراوانی کـورد لـەو کۆنگرەیـەدا بۆیـە ئینگلیزەکان بەپێویستیان زانیبوو دڵی کوردەکان ڕابگرن بەئومێدی ئەوەی نەچنە ژێر باڵی کەمالیەکانەوە و بەو بەڵێنە پڕ لەدرۆ و خەڵەتاندنەی ئەوان باوەڕ نەکەن و بـۆ زۆرتـر دڵنیـاکردنی کـورد لـەنیازی پاکیـان. لەسەرچـاوە/٤٠دا ئامـاژە بـۆ باسـێکی دکتـۆر ئەحمـەد عوسمـان کـراوە کـە لـەگۆڤاری (الثقافـة)دا وتویـەتی لەسەرەتای ساڵی (١٩٢٠)دا حکومەتی بەریتانیا وا خۆی پیشاندابوو کە دەیەوێ بایـەخ بەکێشـەی کـورد بـدات و (لویـد جـۆرج)ی وەزیـری دەرەوەی بـەریتانیا لەکۆبونەوەیەکی پارلەمانی بەریتانیادا وتبووی: کورد مافی ڕزگاربوون و ئازادی هەیە و کوردەکانیش بەرامبەر بەدەربڕینی ئەو هەستە ڕێکخراو و کۆمەڵەی کورد تەلگرافێکی سوپاسنامەیان لە ١٩٢٠/٢/٢٦دا ناردبوو بۆ حکومەتی بەریتانیا.

دەربـارەی ئـەو قسـانەی (لویـد جـۆرج) و ناردنی ئـەو تەلگرافـە بـۆ حکومـەتی بەریتانیا کە دکتۆر ئەحمەد عوسمان باسیکردووە لـەدوکیومێنتی ژمـارە (Fo.٣٧١-٥٠٦٨) ڕۆژی (١٩٢٠/٣/٢٤) باسـی ئـەو کەسـانەی تیـادا کـراوە کـە تەلگرافەکـەیان نـاردووە لەگـەڵ نـاوەڕۆکی تەلگرافەکـە. ئەوانـەی تەلگرافەکـەیان نـاردبوو بریتـی بوون لە:

١-ئەمین عالی بەدرخان-بەناوی (Kurdish Association)ەوە (لەسەرچاوە/١١١دا وتراوە معاون رئیس جمعیة تعالی کردستان).

٢-سەلیم بەکر-بەناوی سکرتێری پارتی دیموکراتی کوردستان.

٣-صبری-بەناوی ڕێکخراوی قوتابیانی کوردستانەوە.

٤-بەکر-بەناوی نەشری معارف (لەکتێبەکەی مالمیسانش، وەرگێڕانی شکور مستەفا ناوەکە بەباقی هاتووە).

٥-کەمال فەوزی-بەناوی ڕۆژنامەنوسەکان، کە وتبویان: ((ئێمە کە ناومان لەخوارەوە نوسراوە، بەناوی ڕێکخراوە سیاسیەکانی کوردستانەوە سوپاستان دەکەین بۆ ئەو قسانەی بۆ یەکەمجار لەپارلەمانی ئێوەدا لە (١٩٢٠/٢/٢٥)دا دەربارەی ئازادی کورد کردبووتان و هیوادارین لەسایەی دەوڵەتە هاوپەیمانەکاندا و بەپشتگیری و یارمەتیدانی حکومەتی بەریتانیاوە وڵاتەکەمان بەرەو پێشەوە بڕوات و گۆڕینێکی باش بێتە کایەوە)).

دەربارەی گەشتەکەی (مێجەر نویل) هەروەکو خۆی باسیکردووە، لەپێشدا چۆتە دیاربەکر و لە (١٩١٩/٦/١٤)دا لەوێوە چۆتە حەلەب و لەوێ چاوی بە(وڵسن)ی حاکمی گشتی بەریتانیا کەوتوە و وڵسن پێی ڕاگەیاندوە کەوا پێشنیازی کردووە کوردستانێکی سەربەخۆ لەژێر سایەی حکومەتی بەریتانیادا لەناوچەکانی (وان، بدلیس، دیاربەکر، معمورة العزیز) پێکبێت و داوای لەنویل کردووە بچێتە ئەستەمبوڵ و چاوی بەکوردە ناسراوەکان و بنەماڵەی بەدرخانیەکان بکەوێت و ئەو پڕوپاگەندانە بەدرۆبخاتەوە کە کەمالیەکان بڵاویانکردبووەوە گوایا بەریتانیا نیازی وایە بەشێکی زۆری ناوچە کوردنشینەکان بخرێتە ناو چوارچێوەی ئەو حکومەتەی بۆ ئەرمەنیەکان دروست دەکرێت و تەقەلاکانی مستەفا کەمال و تاقمەکەی بەدرۆبخاتەوە کە بۆ ڕواڵەت خۆیان وا پیشان دەدەن بۆئەوە تێدەکۆشن گیان و ڕۆحی ئیسلامەتی و خیلافەت بکەنەوە بەگیانی ئیمپراتۆرە نەخۆشەکەیاندا.

نویل لەباسەکەیدا لەسەری دەڕوات و دەڵێت: ((کە چوومە ئەستەمبوڵ لەپێش هەمووانـدا چاوم بەشێخ عەبدولقادر کەوت لەگەڵ هەندێ لەبنەماڵەی بەدرخانیەکان و داوام لێکردن وەفدێك لەناو خۆیاندا پێکبێنن بۆئەوەی لەگەڵ مندا بچینە ناوچە کوردیەکان، شێخ عەبدولقادر لەوە ترسابوو ئەگەر خۆی لەو وەفدەدا بەشداربێت تورکەکان بەتاوانباری دەزانن، بۆیە قایل نەبوو بەشداری بکات و ئەمین عالیش قبوڵی نەکرد لەگەڵماندا بێت بۆ گەڕان. نویل لەباسەکەیدا دەڵێت: لەڕاستیدا من ئەوەی شێخ عەبدولقادرم نەگرتە دڵ، هەرچەند پیاوێکی ڕووخۆش بوو، بەڵام زۆر کەللەڕەق و ڕەشبین بوو بەڵام بەڕاستی حەزم دەکرد ئەمین عالی بەدرخانم لەگەڵدا بێت، چونکە جگە لەوەی مرۆڤێکی سادە و ڕووخۆش

و کراوه بوو، مرۆڤێکی زۆر ئاغر و سەنگین و لێهاتووی بەشان‌وشەوکەت بوو، خاوەنی هەست و بیر و بۆچوونی خۆی بوو، ئەو مەرجە سەرەکیانەی تیادابوو وەکو سەرکردەیەك بتوانێت سام و هەیبەت و دەسەلاتی خۆی بەسەر بەرامبەرەکەیدا بچەسپێنێت)).

نویل لەیاداشتەکەیدا باسی ئەوانەی کردووە کە لەگەشتەکەیدا لەگەڵیا بوون کە بریتی بوون لەجەلادەت بەدرخان و کامەرانی برای (کە هەردووکیان کوڕی ئەمین عالی بەدرخان بوون) و ئەکرەمی جەمیل پاشای دیاربەکری و (سەید معین) کە زاوای شێخ عەبدولقادر بوو لەگەڵ (سەید ئیبراهیم) کە یەکێك بوو لەناسراوەکانی دەرسیم.

دەربارەی مەبەستی ئینگلیزەکان لەناردنی مێجەر نویل بۆ باکوری کوردستان، پرۆفیسۆر حەسرەتیان لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٤٩ وتویەتی: ((ئەو ڕۆژانەی نویل چووبوو بۆ کوردستان، تورکەکان هەوڵێکی زۆریان دابوو بۆئەوەی بیروڕای خەڵکی ناوخۆ و دەرەوە وا لێبکەن کە لایان وابێت نویل بۆیە نێردرابوو بۆ کوردستان هەتا زەمینەیەك خۆشبکات بۆ دامەزراندنی حکومەتێکی کوردی، بەلام لەڕاستیدا شتەکە بەوجۆرە نەبوو.. حەسرەتیان لێرەدا ئاماژەی بۆ کتێبەکەی (مس بیل) کردووە کە سکرتێرەی باڵیۆزخانەی بەریتانیا بوو لەبەغدا لەکتێبەکەیدا (مەبەست ئەو کتێبەی مس بیل بەناوی فصول من تاریخ العراق القریب کە جعفر خیاط لەبەیروت چاپیکردووە بەعەرەبی) بەئاشکرا دانی بەوەدا ناوە مەبەستی سەرەکی ناردنی مێجەر نویل ئەوەبوو لەلایەکەوە ئەگەر بەریتانیا ویستی ئەوا کوردەکان دژی کەمالیەکان هانبدات و لەلایەکی تریشەوە بۆئەوەی وا لەکوردەکان بکات کارێکی وا نەکەن هیچ شتێك بێڕەزامەندی بەریتانیا بکەن کە ببێتە هۆی پشێوی و ئاژاوەیەك کە سوودی بەریتانیای تیادا نەبێت، ئەوەبوو لەمایسی ١٩١٩دا لە(کاختا) ئەو مەبەستەی خۆیان بۆ کوردەکان دەربڕیبوو)).

بۆ بەڵگەی ڕاست بۆچوونی حەسرەتیان دەربارەی هەڵوێستی ئینگلیز بەرامبەر کورد کە نەیاندەویست کورد لەو ڕۆژانەدا هیچ جۆرە بزوتنەوە و شۆڕشێك دژی تورك بکات، مێجەر نویل خۆی لەیاداشتی ڕۆژی (١٩١٩/٩/٧)دا و لەلاپەڕە (٢٠)ی دوکیومێنتەکە باسی نامەیەکی والی تورکی کردووە (ئەو والیە سەر بەئەستەمبوڵ بووە نەك کەمالیەکان) کە ناردویەتی بۆ وەزیری ناوخۆی

تورکیا لەو نامەیەدا وتویەتی: ((مێجەر نویل دڵنیای کردم بەهیچ جۆرێك ڕێگە بەوە نادات دەسەڵاتی حکومەتی تورك لاوازبکرێت یا زیانی پێبگات)).

بەڵگەیەکی تریش بۆ دووڕوویی ئینگلیز لەهەڵوێستیدا بەرامبەر بەکورد، ئیسماعیل شاوەیس کە خۆی لەکۆڕی ڕووداو و بەسەرهاتەکانی ئەو ڕۆژانەدا بووە و کۆنە ئەفسەرێك بووە لەسوپای عوسمانیدا لەگۆڤاری (ڕۆژی نوێ)ی ژمارە (٩)ی مانگی یەکەمی ساڵی (١٩٦٠)دا بڵاویکردۆتەوە کە وتویەتی: ((ئینگلیزەکان هەمیشە دژی چالاکیەکانی کۆمەڵی (کوردستان تعالی و تعاون جمعیتی) دەوەستان و ڕێگەی ئەو جەمعیەتەیان نەدەدا چالاکیەکی ئەوتۆ بنوێنن ببێتە هۆی بەهێزبوونی دەسەڵاتیان و ڕێگەیان لەوە دەگرت چاپەمەنیەکانی ئەو کۆمەڵە لەباکوری کوردستانەوە بگاتە باشوری کوردستان (لەباسی کۆمەڵ و ڕێکخراوە کوردیەکاندا جارێکی تر دەچینەوە سەر ئەو باسەی ئیسماعیل شاوەیس)).

پرۆفیسۆر حەسرەتیان لەباسەکەیدا لەسەری ڕۆیشتووە و وتویەتی: ((هەرچەند تورکەکان پروپاگەندەیان دژی نویل بڵاودەکردەوە و بەوە تاوانباریان دەکرد کە بۆئەوە هاتبووە باکوری کوردستان هەتا حکومەتێکی کوردی دروستبکات، بەلأم هەندێ دوکیومێنتی تورك هەرخۆیان ئەو پروپاگەندەیەیان بەدرۆخستەوە و ناوەڕۆکی ئەو دوکیومێنتانەی تورك کە ئەو درۆودەلەسانەیان پوچەڵ دەکردەوە لەلایەن هەندێ کەسی دیموکراتیەوە توانرابوو لەئەرشیفەکانی تورکیاوە بیبەنە دەرەوە و بەهۆی ئەمەوە ڕاستیەکان ئاشکرابوون کە ماوەیەکی زۆر بوو تورکەکان ڕێگەیان نەدەدا بەهیچ بێگانەیەك دەستیان بگاتە ئەو دوکیومێنتانە)).

حەسرەتیان لەکتێبەکەیدا باسی نامەی وەکیلی حکومەتی بەریتانیا کردووە کە بۆ وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیای ناردووە و لەو نامەیەدا وتویەتی: ((لەگەڵ شێخ عەبدولقادر و هەندێ کوردی تردا قسەم کرد و داوام لەشێخ عەبدولقادر کرد بچێتە کوردستان (لەو ڕۆژانەدا شێخ عەبدولقادر لەئەستەمبوڵ بووە) بۆئەوەی دەسەڵاتی خۆی بەکاربهێنێت، ئێمە دەمانەوێ تورکەکان بخەڵەتێنین، بەلأم لەگەڵ ئەمەشدا نابێ بڕوا بەکوردەکان بکرێت ئەگەرچی هاندانیان دژی تورك لەم ڕۆژەدا شتێکی بێسوود نیيە)).

هەمان وەکیل هەروەکو حەسرەتیان باسیکردووە، لەڕاپۆرتێکی تری ساڵی (١٩١٩)دا وتویەتی: هێشتا کوردەکان دژی مستەفا کەمال ڕانەپەڕیون، بەڵام ئومێدەوارین نویل بتوانێت ئەو مەبەستەی هەمانە بەئەنجامی بگەیەنێت (لامواپە ئەم باسە لەگەڵ هەندێ بۆچوونی کاربەدەستانی ئینگلیزدا یەکناگرێتەوە کە زۆربەیان لەوە دواون کە کورد نابێ هیچ بزوتنەوەیەك بکات) بێجگە لەو سەرنج و باسەی پرۆفیسۆر حەسرەتیان لێی‌دواوە بلەچ شێرکۆش لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٦٠ باسی هەڵوێستی ئینگلیزی کردووە کە چۆن ڕێگەی هەموو جۆرە بزوتنەوەیەکیان لەکوردی باکور گرتبوو کە وتویەتی: ((لەکاتی گفتوگۆی پەیمانی ئاشتیدا بەشەریف پاشا (مەبەست شەریف پاشای خەندانە) وترابوو بێدەنگبوونی کورد و جموجۆڵ نەکردنی لەم ڕۆژانەدا مەرجێکی سەرەکیە و هەموو بزوتنەوەیەکی کورد زیان بەکورد دەگەیەنێت و (جەنراڵ ماك ئەندرۆ) سەرکردەی هێزەکانی بەریتانیا بەیانێکی بەزمانی کوردی بلأوکردبووەوە، لەو بەیانەدا وتبووی: بۆ مسۆگەرکردنی چارەنوسی ئەو ناوچانەی زۆربەی دانیشتوەکانیان کوردن، پێویستە ئەوانە بەئارام بن و دان بەخۆیاندا بگرن و هیچ جموجۆڵێك نەکەن و پشت بەعەدالەتی حکومەتی بەریتانیا ببەستن و تەنها لەڕێگەی ئەوەشەوە مافی خۆیان دەستگیردەبێت.

هەر لەو ڕۆژانەدا (میرئالأی بێل) کە سەرۆکی موخابەراتی بەریتانیا بوو لەحەڵەب ڕێگەی لەسریا بەدرخان گرت و نەیهێشت بەیانێك بلأوبکاتەوە بۆ دەستخستنە ڕووی فروفێڵەکانی مستەفا کەمال کە لەو ڕۆژانەدا هەندێ کوردی فریودابوو، لەخشتەی بردبوون و بەلای خۆیدا ڕایکێشابوون و کردبوونی بەئەندام لەڕێکخراوەکانیدا (مەبەست لەکۆنگرەی ئەرزڕوم و سیواسە) و بەسریا بەدرخان وترابوو کورد پێویستە جاری بێدەنگ بێت و هیچ نەکات و ساتێك (بیل) بۆی دەرکەوت جەلادەت بەدرخان و کامەرانی برای و ئەکرەمی جەمیل پاشا کە نوێنەری کۆمەڵی (تعالی و ترقی کوردستان) بوون خەریك بوون لەچیاکانی (کاختە) هێزی کوردیان کۆدەکردەوە بۆ ڕووبەڕووبونەوەی هێزی کەمالیەکان کە لەو ڕۆژانەدا هێزی کەمالیەکان بەئاشکرا خۆیان بۆئەوە ئامادەکردبوو پەلاماری کورد بدەن، ئا لەو هەڵوێستەدا (بیل) بەناوی حکومەتی بەریتانیاوە داوای لەجەلادەت بەدرخان کرد (لەنوسەری باسەکە خۆی) کە پێویستە ئەو هێزەی کورد

بـلاوەی پێبکرێـت بـەبیانووی ئـەوەی هـەر جموجـوڵێکی کـورد دەبێتـە مایـەی ناڕەزایی و بێزاربوونی دەوڵەتە ئەورووپییەکان.

نوسەر ئەڵێ: بەڕاستی کوردەکان زۆر بەباشـی لـەنیاز و مەبەستی کەمالیـەکان گەیشتبوون، کەچی بەداخەوە گوێیان بۆ ئینگلیزەکان شلکرد و بێدەنگ بوون (بەر لەمە حەسرەتیان باسی ئەو هەڵوێستەی ئینگلیزی کردووە دەربارەی ئەو هێزەی کورد کە لەمایسی ١٩١٩دا لەکاختا کۆبووبوەوە). ئەوەی شایانی باسە تورکە کەمالیەکان لەهەموو هەڵوێستێکی ئینگلیزەکان بەرامبەر کورد سڵەمیبوونەوە و لەگەڵ ئەوەشدا لەوە گەیشتبوون ئینگلیزەکان نیازیان نەبووە کارێکی وابکەن کورد شۆڕشێك بەرپابکات بەڵام بەشێوەیەکی گشتی چ ئەوان و چ تورکەکانی سەر بەخەلیفەش لەئەستەمبوڵ بەچاوێکی ناڕەزاییەوە سەیری گەشتەکەی نویلیان کردووە.

نویـل لەلاپـەڕە ٢٢ی یاداشـتەکەیدا ئامـاژەی بـۆ تـەلگرافێکی جـەودەت بـەگی فەرماندەی سەربازخانە و کەتیبەی سیازدەهەم کردووە کە وتویەتی ئەو جـەودەت بەگـەی بەرەگـەز عەرەبـە لەتەلگرافەکەیـدا کـە ناردویـەتی بـۆ ناوچـەکانی ژێـر دەسـەڵاتی وتویـەتی: ((ئـەو تاقمـەی ئەفسـەرە ئینگلیزەکە (کە مەبەست مێجەر نویل)ە سەرۆکێتی، لەم دواییەدا گەیشتونەتە (مالاتیا) و گەلێك پڕۆژە و نەخشەی شـەیتانیان بەدەسـتەوەیە دژی وڵاتـی باوباپیرانمـان و نویـل دەسـتیکردەوە پیلانگێڕان و ئاژاوەنانەوە و دوو مانگ لەمەوبەر چۆتە دیاربەکر و بەئاشکرا دژی حکومەت دەدوێ و پڕوپاگەندەی خراپ بڵاودەکاتـەوە و پـارەوپولێکی زۆری داوە بەسەرکردەی عەشیرەتی (میللی) و ئەویش بەرامبەر بەمە بەڵێنی پێداوە لەماوەی شەش هەفتـەدا هـەموو کاربەدەست و موچەخۆرە تورکـەکانی ناوچەکە دەربکات، بەڵام لەگەڵ ئەم هەموو بەڵێنانەشدا هێشتا هیچی دەستگیر نەبووە.

تەلگرافەکـەی جـەودەت بـەگ باسـی خەفـەتی خـۆی دەکـات بەرامبـەر بەوانـەی خەڵـەتێنرابوون و بـەڵێنی سـەربەخۆییان پێـدرابوو هـەروەکو چـۆن کـاتی خـۆی ئەلبانەکانیش لەشـەڕی بالقانـدا خەڵـەتێنرابوون، ئـەوا ئێسـتەش خـەریکی ئـەوەن کوردیش هانبدەن (مەبەست کوردی باکوورە) هـەروەکو چۆن لەسلێمانیش شێخ مەحمودیان لەخشتەبرد کە ئێستە ئەو شێخە ڕووبەڕووی ئینگلیـزە داگیرکـەرەکان بۆتەوە)).

ئـەوەی سەرنجڕاکێشـــەرە لـەو تەلگرافـەی جـەودەت بەگـدا کـە لـەڕۆژی ١٩١٩/٩/٩دا نێـردراوە، ئەوەیـە لەکاتێکـدا کـە وتویـەتی شـێخ مـەحمود ئێسـتە ڕووبـەڕووی ئینگلیـز بۆتـەوە، شـێخ مـەحمود ماوەیـەك بـوو گیرابـوو لـەڕۆژی ١٩١٩/٧/٢٥دا درابـوو بەدادگایـەکی سـوپایی ئینگلیـز لەبەغـدا وەك لەبـەرگی یەکـەمی سەرچـاوە/٨٠دا بەدوورودرێـژ باسـکراوە. تەلگرافەکـەی جـەودەت بـەگ لەسەرینەڕوا و ئـەڵێت: ((دوو مـانگ بـەر لەئێسـتە ئەفسـەرێکی تری ئینگلیـز کـە لەقـەفقاس بـووە، بەموتەسـەریفی (بایەزیـد)ی ڕاگەیانـدبوو کـەوا لەبەرئـەوەی سـنجاقی بایەزیـد دراوە بەئەرمەنیـەکان بۆیـە پێویسـتە حکومـەتی تـورك چـۆڵی بکـات. تەلگرافەکە دەپرسێت و دەڵێـت: ئەگـەر ئینگلیزەکـان بەڕاسـتی دەیانـەوێ کوردەکان سەربەخۆبن ئاخۆ دەبێ ئەو هەموو شۆڕش و ڕاپەڕینانەی دژی دەکرێت هۆی چی بێت (مەبەستی شۆڕشەکەی شێخ مـەحمود بووە) کەواتـە ئـەی خەڵکینـە خوا پشتیوانتان بێت و نەکەن بەقسەی لوس و بەدرۆودەلەسە فریـو بخۆن چونکە کورد و تورك برای یەکن و جیابوونەوەیان لەیەکتر دەبێتەهۆی لاوازبوونی ئیسلام، تورك دەتوانێت بەبێ کورد بژی، بەڵام کورد بەتەنها کە دراوسێی عـەرەب و فـارس و ئەرمەنین چۆن دەتوانن بەتەنها بژین و بمێننەوە؟ ئەگەر وریا نـەبن (بطریـارك)ی ئەرمەنی لەئەمریکا هەمووتان دەکات بەنۆکەری ئەرمەنی)).

نویل لەیاداشتی ڕۆژی ١٩١٩/٩/١٠دا باسی تەقەلای تورکەکانی کردووە (کە مەبەستی ئەوانە بووە کە سەر بەخەلافەتی عوسمانی بوون) کە هەوڵیاندابوو خۆی و تاقمەکـەی بگـرن و بەدوورودرێـژ باسـی ئـەوەی کـردووە چـۆن خۆیـان ڕزگـارکردبوو. لەیاداشـتی ڕۆژی ١٩١٩/٩/١١دا وتویـەتی: ئیمـرۆ والی (مەبەسـتی والی سـەر بەئەسـتەمبوڵ بـووە) ئاگـاداری کـردم کـەوا سـوڵتان فـەرمانێکی پێڕاگەیانـدوە هەوڵبدات لـەو کوردانـەی جێگـەی بـاوەڕن هێزێکـی سـوارەی کـورد ئامادەبکـەم و بینێرمـە سـەر مستەفا کـەمال لەسێواس، بـەڵام بەمـەرجێك لـەدوای سەرکەوتن بەسەر کەمالیەکاندا ئەو سوارانەی کورد وازیان لێبهێنرێت و بڵاوەیان پێبکرێت چونکە ئەو کوردانەی ئیمڕۆ دەنێردرێن بۆ سەرکوتکردنی یاخیبووەکان لە(سێواس) هەموویان لەئێمەش یاخیدەبن و لێمان هەڵدەگەڕێنـەوە و داوای مافی نەتەوایەتی خۆیان دەکەن.

نویـل دەڵـێ: منـیش بـەوالیم وت: کوردەکـان زۆر بـاش لەوەدەگـەن ئەگـەر بنێردرێن بۆ سەرکوتکردنی تورکە یاخیبووەکان، لـەو کارەیان هیچیان دەستگیر

نابێت بۆ سوودی نەتەوایەتی خۆیان بۆیە کوردەکان ئەمە بەکارێکی خۆڕایی و بێسوود دەزانن. نویل لەسەرینەڕوا و دەڵێت: بەقسەکانی والیدا بۆم دەرکەوت هەڕەشەی گرتنمان بەنیازی ئەوە بووە کارێکی وابکەم کوردەکان قایل بکەم ئەو هێزەی والی باسیکردبوو ڕێکیبخەم بۆئەوەی پەلاماری سێواس بدەن (دیارە کاتی بەستنی کۆنگرەی سێواس بووە)، بەڵام من ڕەپوڕەوان لەوالیم گەیاند بەهیچ جۆرێك نامەوێ خۆم بخەمە ژێر باری کێشەیەکی واوە.

نویل لەلاپەڕە (٢٤)ی یاداشتەکەیدا باسی چوونی وەفدێکی کردووە کە چووبوو بۆلای (حاجی بەدرئاغا)ی سەرۆکی عەشیرەتی (رشوان) بۆئەوەی بیکەن بەلایەنگری خۆیان و یەکێك لەئەندامانی ئەو وەفدە کە (Haji Kya–حاجی کیا) بوو لەکوشتارەکەی (مەلاتیا)دا دەستێکی باڵای هەبووە و لەئەنجامی ئەمەدا حکومەتی ناوەندی (مەبەست ئەوەی ئەستەمبولّ)ە بڕیاری گرتنی دابوو، ئەویش پەنای بردبووە بەر شاخەکان و ئێستە بووە بەدەمڕاست و لەناو کەمالیەکاندا پلەوپایەیەکی بەرزی هەیە.

نویل لەیاداشتی ڕۆژی ١٩١٩/٩/١٧دا باسی پیاوێکی پیری کردووە لەگوندی (بیزیك) و لێیپرسیبوو تۆ حکومەتی تورکت خۆشناوێت کە حکومەتێکی ئیسلامە؟ لەوەڵامدا کابرای پیرە بەنویل دەڵێت: تۆش دەتەوێ من تورکم خۆشبوێت؟؟ من چۆن یەکێکم خۆشدەوێ چاوی دەرهێنابم و کوێری کردبم؟!.. هەناسەیەکی درێژی هەڵکێشا و وتی: ماوەیەکی زۆرە منداڵ و خێزان و کێڵگە و گارگوتاڵی خۆم نەدیوە!!.

ئەوەی شایانی باسە، لەدوکیومێنتێکی ناو ئەرشیفی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیادا ژمارە (C.C.٧٣٠-٢٨)ی مانگی مارتی ١٩٢٢، یەعنی دوای پتر لەدوو ساڵ تێپەڕبوون بەسەر گەشتەکەی نویلدا، بەئاشکرا باسی ئەوە کراوە کە حکومەتی بەریتانیا بەباشی نەزانیبوو یارمەتی کوردی باکوور بدات لەکێشەی نێوان تورك و کوردا، بۆیە ئیتر پێویستی بەمانەوەی نویل نەمابوو لەتورکیا بۆیە کۆتایی بەگەشتەکەی هێنرابوو.

مس بیل لەکتێبەکەیدا (فصول من تأريخ العراق القريب–ترجمة جعفر خياط لەساڵی ١٩٧١، بیروت)، بەئاشکرا لەو کتێبەیدا وتویەتی: ((ئەو کارەی بەمێجەر نویل سپێردرابوو لەناو کوردەکانی تورکیادا تەواویکرد و بەسەرکەوتویی گەڕایەوە)).

ئەوەی مس بیل باسیکردووە دەربارەی کارە سەرکەوتوەکەی نویل لەهەندێ شوێنی تریشدا باسی نەکردووە کە بریتی بووە لەخاوکردنەوەی کورد لەباکووری کوردستاندا بۆئەوەی هیچ جۆرە جموجوڵێك نەکەن ببێتە هۆی ئەوەی کارێکی وا ڕووبدات ئینگلیزەکان بەناچاری خۆیانی تێوەبئاڵێنن و بێجگە لەوە بارودۆخێکی واش بێتە پێشەوە گیانی کریستیانەکانی ناوچەکە بپارێزرێت بێجگە لەکۆکردنەوەی زانیاریەکی زۆر لەلایەن نویلەوە دەربارەی هەڵوێستی کوردی ناوچەکە و دەستنیشانکردنی دەسەلأتدارانی کورد بۆئەوەی حکومەتەکەی لەژێر تیشکی ئەو زانیاریانەدا لەدواڕۆژدا سوودی لەبارودۆخی ناوچەکە دەستگیرببێت.

بێجگە لەمێجەر نویل چەند کاربەدەستێکی تری حکومەتی بەریتانیا وەکو (راولنسن) و (لورنس) هەریەکەیان بەشێوەیەك بەشێك لەنەخشەی حکومەتەکەی خۆیان بەجێهێناوە ئەگەرچی ئەو پێشنیازانەی ئەمانە دەربارەی کوردستان پێشکەشیان کردبوو هیچیان لەلایەن کاربەدەستە بەرزەکانی بەریتانیاوە پەسەند نەکرابوو بەلأم دوبارە هەر بریتی بووە لەجۆرە ئامادەکردنی چەند زانیاریەك دەربارەی باکووری کوردستان.

بۆ نمونە (راولنسن) یەکێك بووە لەو ئینگلیزانەی هانی حکومەتەکەی خۆی دابوو یارمەتی کورد بدات بۆئەوەی دژی تورك شۆرش بکەن، لەراپۆرتێکیدا باسی ئەوەی کردووە ئەگەر یارمەتی (ئەیوب پاشا) بدرێت لەناوچەی (Olti–ئولتی)، دەتوانێت دەستبگرێت بەسەر (Karakiis–کاراکلس) و بایەزیدا و کوردەکانی بایەزید کە چەکدارن دەتوانن ئەرزنجان بگرن (مێجەر نویل لەگەشتەکەیدا چاوی بەو ئەیوب پاشایە کەوتوە و وێنەیەکی گرتووە).

راولنسن پێشنیازیکردبوو لەکاتی بزوتنەوەی کوردا ئەگەر یۆنانیەکان لەدەریای ڕەشدا بکەونە جموجوڵ ئەو ئامانجانەی بەتەماین بێتەدی بەمە سەردەگرێت، بەلأم هەروەکو (پرسی کۆکس) و (شیك بۆرگ) باسیانکردووە ئەو پێشنیازانەی (راولنسن) پشتگوێخرا چونکە وەزارەتی موستەعمەرات ئەوانەی بەباش نەزانیبوو (لەدواییدا لەباسی بزوتنەوەی کەمالیەکاندا و لەباسی هۆی سەرنەگرتنی پەیمانی سیڤەردا دەچینەوە سەر باسی چالاکی و پێشنیازەکانی تری راولنسن بۆ کارکردن دژی کەمالیەکان).

(لورنس)یش باسی ئەوەی کردووە کە لەو ڕۆژانەدا ڕاپەڕینێکی کوردی بەباش زانیوە دژی کەمالیەکان و خستویەتە بەرچاو هەروەکو چۆن بەهاوکاریکردن و

یارمەتیدانی بەریتانیاوە بەشەش پاپۆڕ و پەنجا سەربازی بەریتانیا و شەش ملیۆن پاوەنی ئینگلیزی، عەرەبەکان توانیان ئامانجی خۆیان بەجێبێنن و ئەگەر بۆ کوردیش شتێکی وا بکرایە ئەوا ئەوانیش بەهەمان مەبەست دەگەیشتن، (پرسی کۆکس) هۆی یارمەتینەدانی حکومەتی بەریتانیای بۆ کورد بەم شێوەیە باسکردووە:

١-ڕاپەڕینی چەکدارانەی کورد دژی تورکەکان بەهاوکاری بەریتانیا دەبووە هۆی نیگەرانی و تووڕەبوونی هەموو وڵاتە ئیسلامیەکان.

٢-پارە و خەرجیەکی زۆرتری دەویێ وەك لەوەی لۆرنس بۆ عەرەبەکانی دابینکردبوو.

٣-ئەگەر بەریتانیا یارمەتی کورد بدات و لەنیوەیدا وازیان لێبێنێت، ئەوا کوشتارێکی ئێجگار زۆر لەکورد دەکرێت کە ئەنجامەکەی دەخرێتە ئەستۆی حکومەتی بەریتانیاوە، بۆیە باشترین شت ئەوەیە کێشەی حکومەتی بەریتانیا لەگەڵ تورکەکاندا بەئاشتی چارەسەر بکرێت (کە لەڕاستیدا ئینگلیزەکان هەرواشیان کرد و توانیان تورکەکان ناچاربکەن لەلایەکەوە دەستبەرداری ویلایەتی موسڵ ببێت و لەلایەکی تریشەوە کەمالیەکانیان والێکرد واز لەدۆستایەتی سۆڤیەت بێنن و بیخەنە ژێر ڕکێفی دەوڵەتە سەرمایەدار و ئیمپریالیزمەکانی ئەو ڕۆژانە)، بێجگە لەو دوو تەقەلادانە سەرنەگرتووەی (راولنسن) و (لورنس)، مێجەر نویل لەیاداشتەکانیدا کە وەکو ڕاپۆرتێك ناردویەتی بۆ کاربەدەستانی حکومەتەکەی باسی بارودۆخی ئەو ڕۆژانەی هەندێ لەناوچەکانی باکووری کوردستانی کردووە بەهیوای ئەو سەرنجانەی ئەو خستبوونیە بەرچاو و حکومەتەکەی خۆی، ببنە هۆی ئەوەی حسابێکیش بۆ بوونی کورد بکەن بەرامبەر بەتورك، بەڵام وادیارە تەقەلاکانی ئەمیش هەروەکو ئەوەی راولنسن و لورنس بێسوود بووە و کاریگەر نەبووە.

بۆ نمونە ئەو تەقەلادانەی مێجەر نویل، چەند سەرنجێکی ئەخەینە پێشچاو کە لەراپۆرتەکەیدا تۆمارکردووە، لەلاپەڕە (٦)ی یاداشتەکەیدا وتویەتی: ((کوردەکان دەڵێن ئێمە کوردین و ئێرە نیشتمانی ئێمەیە و هی خۆمانە. بەڵام بۆ نەگبەتی و چارەڕەشی توشمانبووە بەتوشی ئەم تورکە ئێسکگرانانەوە کە شتێکی زۆر نارەوایە، هەروا لەژێر چنگی ئەوا نامێنینەوە بۆیە هیواداریین بتوانین خۆمانیان لێڕزگاربکەین)).

لەلاپەرە (١٨)ی ڕاپۆرتەکەیدا باسی نەیاری و دوژمنایەتی کورد و تورکی کردووە و وتویەتی: ((ئەم ناکۆکی و دوژمنایەتیە لەگەڵ تورکەکاندا شتێکی تازە نیە و ئەوەی وای لەکورد کردووە لەکۆنەوە زۆر ڕقیان لەتورک بێت بریتی‌یە لەوەی تورکەکان خۆیان زۆر بەزل دەزانن و لوت بەرزن و بەچاوێکی سووك و بێڕێزیەوە سەیری میللەتانی تر دەکەن و لەبەرئەوە لەشەڕی جیهانیدا کوردەکان هەتا بۆیان بکرایە ڕێگایان بەکاروانە سەربازیەکانی تورك دەگرت چونکە سەربازەکانی ئەو کاروانانە دەستدرێژیان دەکردە سەر کوردی سەرەڕێی هاتوچۆکردنیان)).

نویل لەیاداشتی ڕۆژی ١٩١٩/٩/٤دا دەڵێت: ((کەمالیەکان کەوتونە خۆیان بۆ شەڕکردن لەگەڵ یۆنان و ئەوانەی بەداگیرکەری وڵاتی خۆیان دەزانن و بۆ ئەم مەبەستە بەزۆرەملێ دەستیانکردووە بەسەربازگرتن لەکوردەکان و دەیاننێرن بۆ کۆڕی شەڕ و لەدێهاتەکانی ناوچەی (کورجیك) بەهەزاران کوردیان گرتووە و کردویانن بەسەرباز و لەترسی ئەم کارەی تورك ژمارەیەکی زۆری کورد ڕایانکردووە خۆیان شاردۆتەوە و (ئەنوەر پاشا) فەرمانێکی دەرکردووە کە ئەوانەی ڕایانکردووە لەسەربازی پێویستە تاڵانبکرێن و ماڵەکانیان کاولبکرێت)).

(لەباسی شەڕی تورك و یۆناندا باسی هەڵویستی کورد ئەکەین کە چ ڕۆڵێکی گرنگیان هەبووە لەسەرکەوتنی تورکدا).

نویل لەیاداشتی هەمان ڕۆژدا نوسیویەتی: ((هەستی کوردەکانم بەتەلگراف نارد بۆ کاربەدەستان و بۆم ڕوونکردنەوە کورد لەناوچەکانی (عینتاب) و (مەلاتیا)دا هەستێکی بەرزی نەتەوایەتیان تیادایە و ڕقێکی زۆریان لەتورکە و پێویست بەوە ناکات کەس هانیان بدەن چونکە خۆیان داخ لەدڵن و لەسەرپێن و هاکا جموجوڵ و ڕاپەڕین لەو ناوچانەدا دەستپێبکرد و هەستیش ناکەم هیچ جۆرە ناحەزیەکیان بەرامبەر بەئێمە هەبێت)). نویل لەلاپەرە (١٩)ی ڕاپۆرتەکەیدا باسی نامەیەکی (خالید بەگ)ی فەرمانەدەی کەتیبەی سیازدەهەمی تورکی کردووە کە لەدیاربەکرەوە ناردبووی بۆ (Abidin–عابدین) کە فەرمانەدەی کەتیبەی سوارە بووە لە(مەلاتیا) و لەو نامەیەدا ڕووندەبێتەوە هەستی کوردایەتی لەدیاربەکردا چەند بەهێزە.

نویل کورتە باسێکی نامەکەی خالید بەگی خستۆتە پێشچاو کە خالید بەگ وتویەتی: ((من بەتەواوەتی چوومەتە بنج‌وبناوانی ئەو مەبەستەی لەژێر پەردەی داخوازیەکانی خەڵکی دیاربەکردا ئامادەکراوە و ئەوەی لەمێشکی ئەوانەدایە

هەموویم خوێندۆتەوە و بەباشی لەوە گەیشتبووم لەژێر پەردەی نەتەوایەتی کوردا تەقەلای ئەوە دەدرێت بچنە ژێر ڕکێف و دەسەلاتی ئینگلیزەوە و لاوەکانی کورد هەواڵی وا بلاودەکەنەوە کە هەستی نەتەوایەتی دانیشتوان بووروژێنرێت و لەبەڵگە نهێنیەکانەوە بۆم دەرکەوتووە ئەمانە بۆ بەرژەوەندی ئینگلیزەکان کاردەکەن، والی تازە گەیشت و زۆر باش لەهەڵوێست گەیشتووە بۆیە (یانە-Club)ی داخست)).

نویل لەیاداشتی ڕۆژی ١٩١٩/٩/٧دا لەلاپەڕە (٢٠)ی ڕاپۆرتەکەیدا نوسیویەتی: خەلیل بەگی متصرف (برای ئەمین عالی بەدرخان بووە کە کاربەدەستی حکومەتەکەی ئەستەمبوڵ بووە)، هەندێ تەلگرافی پیشاندام کە لەنێوان والی تورك و وەزیری ناوخۆدا بۆ یەکتریان ناردبوو، ئەمەی خوارەوە یەکێکە لەو تەلگرافانە کە وەزیری ناوخۆ ناردبووی کە وتویەتی: ((ئاگاداری ئەوەین گرتنی بەدرخانیەکان (مەبەست ئەوانەیە کە لەگەڵ نویلدا بوون لەگەشتەکەیدا) زیانێکی گەورەی دەبێت بۆ تورکیا، لەلایەکی ترەوە ئەو شتانەی لەڕاپۆرتەکانی کەتیبەی سیازدەدا باسکراون وا دەگەیەنن پڕوپاگەندەی نەتەوەپەرستەکانی کورد مەترسیەکی زۆر لەوە زیاتری لێپەیدا دەبێت کە چاوەڕێمان دەکرد، تکایە ئێوەش بۆچوونی خۆتانمان بۆ بنێرن)).

نویل باسی وەڵامەکەی والی بۆ وەزیری ناوخۆ بەتەلگرافێك ناردووە کە وتویەتی:

((١-مێجەر نویل دڵنیای کردم بەهیچ جۆرێك هانی کورد نادات کارێکی وابکەن دەسەلاتی حکومەتی پێ لاوازبێت (بێگومان مەبەستی حکومەتی ئەستەمبوڵە نەك هی کەمالیەکان).

٢-پڕوپاگەندەی بەدرخانیەکان کارێکی ئەوتۆی نەکردۆتە سەر ئێمە ئەگەر بەراورد بکرێت لەگەڵ ئەو باسانەی لەڕۆژنامەی (سەربەستی)دا دەردەچێت کە لەلایەن یانەی کوردەوە دەردەچێت و هەتا ئێستە ئێوەش هیچ شتێکتان بەرامبەر بەو ڕۆژنامەیە نەکردووە.

٣-گرتنی بەدرخانیەکان دەبێتەهۆی ئانەوەی ئاژاوە و بەرەڵلایی لەناوچەکاندا و ئەگەر شتی وا بکرێت دژیان لەڕاستیدا توانای ئەوەمان نیە چارەسەری ئەو کێشەیە بکەین.

٤-بەپێی بۆچوونی خەم، پڕوپاگەندەی بەدرخانیەکان بایەخێکی ئەوتۆی نیە بتوانێت کاربکاتە سەر ئێمە و شتەکە بەو شێوەیە نیە کە کەتیبەی سیازدەهەم لەئێوەی گەیاندووە و دەیەوێ شتەکە بەخۆڕایی زلبکات)).

بێجگە لەو بۆچوون و سەرنجانەی لەلایەن (راولنسن) و (لورنس) و (مێجەر نویل)ەوە باسمانکردون، لەچەند دوکیومێنتێکی حکومەتی بەریتانیادا باسی هەندێ هەڵوێستی حکومەتی بەریتانیایان تیادا تۆمارکراوە، بەپێویستم زانی لەکۆتایی ئەم باسەدا کورتەی هەندێکیان بخەمە پێشچاو:

–لەدوکیومێنتی ژمارە (Fo.٣٧١-٥٠٦٧)ی ساڵی ١٩٢٠)دا باسی پێشنیازێکی کردووە دەربارەی ئۆتۆنۆمی بۆ کورد کە لەلایەن (Mr.C.Garabett–مستەر گەرەبێت)ەوە ئامادەکراوە.

–لەدوکیومێنتێکی تردا ژمارە (CF.No.٥٦)ی ڕۆژی ١٩٢٠/١٢/٣١ تەلگرافێکی ئەدمیرال (DeRobeck)ی تیادایە، ژمارە (٨٦١) ڕۆژی ١٩٢٠/٧/٢٨ کە لەئەستەمبوڵەوە ناردوویەتی، لەفەقەرە (٣٣)ی ئەو تەلگرافەدا داواکراوە عەشایرەکانی کورد دژی تورکە نەتەوەییەکان هانبدرێن (مەبەست کەمالیەکانە) و وەڵامی ئەو تەلگرافە بەتەلگرافی ژمارە (٢٥٤) لەلایەن لۆرد کرزنەوە دراوەتەوە ئەوە دوبارەکراوەتەوە کە حکومەتی بەریتانیا نەیویستووە لەپێناوی دەستگیربوونی مافی کوردا خۆی تووشی هیچ گێچەڵێك بکات.

لەسەرچاوە (٤٠)دا ئاماژە بۆ باسێکی دکتۆر ئەحمەد عوسمان کراوە کە لەگۆڤاری (الثقافة)دا بڵاوکراوەتەوە کە دکتۆر ئەحمەد عوسمان باسی تەلگرافێکی (ئەدمیرال. دی ڕۆبیك)ی کردووە لەڕۆژی ١٩٢٠/٣/٢٩دا ناردویەتی بۆ لۆرد کرزنی وەزیری دەرەوەی بەریتانیا، دەربارەی ئەوەی لەلایەن کۆمەڵی ئیستقلالی کوردەوە بڵاوکرابوەوە کە وتبوی شەریف پاشا بەنوێنەری هەموو کورد ناژمێردرێت، بۆیە حکومەتی خاوەنشکۆ ئامادە نییە گوێڕایەڵی ئەو سەرکردانەی کورد بێت کە لێرەوە دەنێررێن.

ئەدمیرال دی. ڕوبیك وتویەتی: ((من وای بۆ دەچم و وام لاباشە لەگەڵ فەرەنسیەکاندا ڕێکبکەوین بۆئەوەی لەدواڕۆژدا تووشی کێشە نەبین لەگەڵیاندا، خۆ ئەگەر هات و کوردیش سەربەخۆیی دەستگیربوو ئەوا چاکەکەی هەر دەگەڕێتەوە بۆ حکومەتی بەریتانیا)).

## بەشی سێهەم

### چـالاكی سیاسـی و ڕۆشـنبیری كـورد و كۆمـەڵ و ڕێكخراوەكـان و ڕۆژنامـە و گۆڤارەكانی باكوری كوردستان

لەبەر گرنگی ئەم باسە بەپێویستم زانی باسەكانی ئەم بەشە بەم شێوەیەی خوارەوە بخەمە بەرچاو:

١-چالاكی سیاسی و ڕۆشنبیری لەلایەن كورد و بنەماڵە چالاكەكانەوە.
٢-كۆمەڵ و ڕێكخراوەكان.
٣-ڕۆژنامە و گۆڤارەكان.

### باسی یەكەم: كوردە چالاكەكان و بنەماڵە ناسراوەكانی باكوور

لەدوای تەواوبوونی شەڕی یەكەمی جیهانی و بلاْوكردنەوەی چواردە مادەكەی (ولسن)ی سەرەك كۆماری ئەمریكا كە لەمادە دوانزەیدا دەربارەی مافی گەلان و مۆركردنی پەیمانی ئاشتی و مادەكانی پەیمانی (سیڤەر) و جموجۆڵی هەندێ لەكاربەدەستانی بەریتانیا كە لەسەرەتادا وا خۆیان پیشاندەدا خەمخۆری میللەتی كوردن، ئەمانە هەمووی هیوایەكی بەهێزی بەخشیبوو بەمیللەتی كورد بەشێوەیەكی گشتی و بەكوردی باكوری كوردستان بەتایبەتی كە ئیتر نۆرەی ئەوە هاتووە كوردیش بەئاواتی خۆی بگات و لەجەور و ستەمی داگیركەر ڕزگاری ببێت، لەئەنجامی ئەمەدا ڕۆشنبیر و سیاسەتمەدارانی كورد هەریەكەیان بەپێی توانا و بەشێوەی خۆی دەستیكردبوو بەچالاكی و تا ئەو ساڵە دوای شەڕی جیهانی بەدواوە ئەو كۆسپ و بەرهەڵستیانەی جاران خرابووە بەردەمی باكووری كوردستان تاڕادەیەك نەمابوو، كاربەدەستانی ئەستەمبوڵ وەكو ماری سڕیان لێهاتبوو، كەمالیە ملۆزمەكانیش كە تازە سەریانهەڵدابوو هێشتا ئەو تین‌وتاوەیان نەبوو بەتوندوتیژی بەرهەڵستی چالاكیەكانی كورد بوون و ڕۆژنامەكانی ئەستەمبوڵ بۆ خاوكردنەوە و ساردكردنەوەی جۆشی نەتەوایەتی كورد بلاْویاندەكردەوە كە ئامادەن كورد بخەنە پێشچاو و دەستیانكردەوە بەلێدانی بالۆرە كۆنەكەیان و دەیانوت كورد میللەتێكی پاك و ئاینپەرستە و بەقەد و بالاْی

کوردیانـــدا هەڵئـەدا و هانیانئـەدان بـبن بـەهاوکاریان لەدامرکاندنـەوەی ئـەو یاخیبوونـــەی تورکـــە نەتەوەییـــەکان بەســـەرکردایەتی مســـتەفا کـــەمال دەستپێکردبوو.

ئەنقـەرەیان کردبـوو بەبنکـەی خۆیـان کـە لەدواییـدا پایتـەختی حکومـەتیان لەئەستەمبوڵەوە گواستەوە بۆ ئەوێ، ئا لەو بارودۆخەدا کورد خۆی لـەنێوانی دوو هێزدا دەبینیەوە کە هەردوولاشیان دوژمنی بوون و هەریەکەیان بەشێوەی خۆی ڕەفتـاری لەگـەڵ کـوردا دەکـرد و تورکـەکانی سـەر بەخیلافـەتی ئەسـتەمبوڵ دەیانویسـت کـورد ببێـت بـەهاوکاریان دژی ئـەو یاخیبووانـە و کەمالیـەکانیش دەیانویست وەکو تەکتیکێك بۆ گەیشتن بەو ستراتیجەی نەخشەیان بۆ کێشابوو، بـۆ کـورد دەیانلاوانـەوە و فرمێسـکی ئـەوەیان بـۆ کـورد دەڕشـت کـە دەوڵەتـە هاوپەیمانـەکان بەدەستیانەوەیە ئەو حکومەتە ئەرمەنیەی بڕیاربوو پێکبهێنرێت بەشێکی زۆری خاکی کوردستانیش دەگرێتەوە و کورد ئەو خاکە پیرۆزەی خۆی لەکیسدەچێت و بەهۆی ئەم پڕوپاگەندانەوە ژمارەیـەکی زۆری کورد لەڕۆشنبیران و سـەرۆك عەشـیرەتەکانیان کردبـوو بەلایـەنگری خۆیـان و کردبوویـانن بەئەنـدام لـەکۆنگرەکانی ئـەرزڕوم و سێواسـدا وەکـو لەشـوێنی خۆیـدا بەدوورودرێـژی باسـیدەکەین و لەگێـژاوی ئـەم ڕووداوانـەدا بەداخـەوە کـورد نـەیتوانیبوو سـتراتیجێکی تایبـەتی بـۆ خـۆی دەستنیشـان بکـات و هەرچـەند لەسـەرەتادا هـەموویان لـەناو ئـەو ڕێکخـراو و کۆمەڵـە تازانـەی لـەدوای شـەڕ پێکیانهێنـابوو بەتایبـەتی لـەڕێکخراوی (کۆمەڵـەی سـەربەخۆیی کـورد) بەسـەرکردایەتی شـێخ عەبدولقادری شەمزینی و جێگرەکەی ئەمین عالی بەدرخان بۆ مەبەستێکی گشتی تێدەکۆشـان، بـەلام زۆری پێنەچـوو مـاکی شـێرپەنجەی لەشـی کـورد دوبـارە سـەریهەڵدایەوە و دوبـەرەکی و نـاکۆکی لەنێوانیانـدا پەیـدابوو وەکـو لەدوایـدا بەدوورودرێژی ڕووندەبێتەوە.

بەرلـەوەی بچینە سـەر باسی کۆمـەڵ و ڕێکخراوەکـان و ڕۆژنامـە و گۆڤارەکان لـەباکووری کوردسـتاندا بەپێویسـتم زانـی کورتـە باسـێکی چـالاکی هەنـدێ لەڕۆشـنبیران و سیاسـەتمەدارانی ئـەو کوردانـەی لـەباکوری کوردسـتاندا لـەدوای شـەڕی یەکـەمی جیهـانی لـەڕووداو و بەسـەرهاتەکاندا ناویـان هـاتووە بیانخەمـە پێشچاو، بێگومـان لـەتوانادا نی‌یـە باسـی هـەموویان بکرێـت بۆیـە تـەنها ئەوانـەیان

دەخەینە پێشچاو کە ڕۆڵێکی گرنگیان هەبووە لەچالاکی ڕۆشنبیری و کاروباری کۆمەڵ و ڕێکخراوەکاندا.

### أ-بنەماڵەی شێخانی شەمزینی

لەدوای تەواوبوونی شەڕی جیهانی شێخ عەبدولقادری شەمزینی کە بەر لەشەڕیش یەکێك بووە لەکوردە دەسەلاًتدار و ناسراوەکانی کورد کە لەدوای شەڕ لەشاری ئەستەمبوڵدا نیشتەجێبوو، وەکو سەرکردە و مرۆڤێکی ئاینی و پیاوێکی ناسراوی ناو کۆمەڵگاکانی کورد لەلایەن زۆربەی کوردەوە جێگەی ڕێزلێگرتن بووە وەکو لەدواییدا باسیدەکەین بەزۆرینەی دەنگ کرابوو بەسەرۆکی گەورەترین ڕێکخراوی کورد لەباکوری کوردستاندا.

شێخ عەبدولقادر کوڕی شێخ عوبەیدوڵلاّی نەهری بووە کە شێخ عوبەیدوڵلاّی باوکی دوو شۆڕش و ڕاپەڕینی لەئێران و تورکیادا کردبوو، شێخ عەبدولقادر وەکو سەرۆکی ئەو ڕێکخراوە کوردیە چالاکیەکی زۆری هەبووە بۆ دەستگیربوونی مافی ڕەوای کورد و هەوڵیداوە پەیوەندی بەهەرلایەکەوە بکات کە هیوای ئەوەی پێیان هەبووبێت یارمەتی کورد ئەدەن و لای وابووە ئینگلیزەکان بەتواناترین هێز و دەسەلاًتداری ئەو ڕۆژانە بوون بتوانن یارمەتی کورد بدەن بۆیە بارەها پەیوەندی پێوەکردوون و داوای لێکردون یارمەتی کورد بدەن بۆئەوەی ڕێگە لەسەرکەوتنی تورکە قەومیەکان بگیرێت و لاشیوابووە باشترین سەرەنجام بۆ کورد ئەوە بووە دۆست و هاوکاری پاشماوەی خەلافەتی عوسمانی بێت کە بەناو لەئەستەمبوڵدا مابووەوە لایوابوو ئینگلیزەکان مەبەستیان بووە ئەو دەسەلاًتە کەمەی خەلافەت کە مابوو لاواز نەکرێت و بتوانێت بەرگەی تەقەلای کەمالیەکان بگرێت کە بووبوون بەدۆست و هاوکاری سۆڤیەت.

کەمالیەکان بوون بەتاقە دەسەلاًتداری وڵات و کورد ناچاربوو بەرگری لەخۆی بکات لەشۆڕشی پیراندا بەسەرۆکایەتی شێخ سەعیدی پیران لەگەڵ ئەوەشدا شێخ عەبدولقادر بەشداری نەکردبوو لەو شۆڕشەی شێخ سەعیددا بەلاًم لەلایەن دادگای ئیستقلالی کەمالیەکانەوە گیرا و بەناڕەوا لەگەڵ چەند کوردێکی تێکۆشەری کورددا لەسێدارەدران وەکو لەباسی شۆڕشی پیراندا باسیدەکەین.

وینەی ئەمین عالی بەدرخان

### ب-بنەماڵەی بەدرخانیەکان

لەکاتی نوسینی بەرگی یەکەمی ئەم کتێبەدا کە لەسەرەتای ساڵی (١٩٩٥)ەوە خەریکی بووم، هەتا ئەوکاتە سەرچاوەیەکی ئەوتۆم دەستگیر نەبوو بەدوورودرێژ باسی سەجەرەی بنەماڵەی بەدرخانیەکان بکات، بۆیە لەکاتی باسکردنی ژیانی بەدرخان پاشادا کورتە باسێکی هەندێ لەو بنەماڵەیەم کردووە کە بەناو ناوی (١١) کەسم لێهێنابوون بەئومێدی ئەوەی لەبەرگی دوهەمدا زانیاری ترم دەستکەوێت دەربارەی ئەو بنەماڵەیە و ڕۆڵی ئەندامە چالاکەکانی ئەو بنەماڵەیە لەدوای شەڕی یەکەمی جیهان و بەداخەوە کتێبەکەی مامۆستا (مالمیسانژ)یشم نەدیبوو کە لەساڵی ١٩٩٤دا لەسوید چاپیکردووە تا ئەوکاتەی برای بەڕێزم مامۆستا محەمەدی مەلا کەریم دانەیەك لەوەرگێڕانی ئەو کتێبەی (مالمیسانژ) بۆ عەرەبی لەلایەن مامۆستا (شکور مستەفا)ی بۆ ناردم کە توانیم فریای هەندێ باسی بکەوم لەم بەرگی دوهەمەدا:

١-لەو کتێبەی (مالمیسانژ) و لەسەرچاوەکانی تردا وەکو باسدەکرێت ئەمین عالی بەدرخان لەدوای تەواوبوونی شەڕی یەکەم ڕۆڵێکی سیاسی و ڕۆشنبیری ئێجگار گرنگی هەبووە لەڕووداو و بەسەرهاتەکانی باکوری کوردستاندا و ئەمین

عالی بەدرخان بێجگە لەوەی وەك سیاسیەکی کورد دەوری خۆی هەبووە، مرۆڤێکی ڕۆشنبیر و شاعیریش بووە و (مالمیسانژ) لەلاپەڕە (١٢٠)ی کتێبەکەیدا دوو پارچەی شیعری ئەمین عالی بەدرخانی بڵاوکردۆتەوە کە لەڕۆژنامەی (کردستان) کە لەمیسر ساڵی (١٨٩٨) دەرچووە بڵاویکردۆتەوە بەناوی (لاوی شێخ فەتاح)ەوە کە وتویەتی جەلادەت بەدرخانی کوڕی لەو ڕۆژانەدا ئەمین عالی بەدرخانی باوکی لەئەستەمبوڵەوە ناردبووی بۆ ئەو ڕۆژنامەیە، کە ئەمە دوو دێڕی سەرەتای ئەو شیعرەیە:

| | |
|---|---|
| پیرۆز تەڕا هەزار جارا | ئەڤ دەنگە نەوێل ناڤ یارا |
| مزگێنی یاڤێ جەریدەیا قەنج | شاباش دبتن چتا هەبن گەنج |

پارچە شیعرێکی تریشی وتوە بەبۆنەی مردنی کوڕێکی کە تەمەنی ساڵ و نیوێك بووە لەو ڕۆژانەدا کە خۆی و خێزانەکەی ئاوارە و دەربەدەرکرابوون بۆ قەڵای (عەکا) کە وتویەتی:

| | |
|---|---|
| بنڤە خوەشی یا دل و دوو چاڤان | دادێ ژ تەرە هەر ڕۆژ نگەهبان |
| دا زوو تەمەزن ببی بەدرخان | بنڤە کە زەبا من، بنڤە لۆلۆ |

ئەمین عالی بەدرخان لەنێوانی ساڵانی (١٨٥١) هەتا (١٩٢٤) ژیاوە بەپێی کتێبەکەی (مالمیسانژ)، بەڵام سریا بەدرخان لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٧٩ کە لەفلادلفیا لەساڵی ١٩٢٨دا چاپیکردووە لەدوهەمین لاپەڕەی پێشەکیەکەیدا نوسینی (محەمەد ئوزون) وتویەتی: ئەمین عالی بەدرخان خۆی و ژنەکەی و کچەکەی چۆتە میسر بۆلای (سریا)ی کوڕی و لەوێ لەساڵی ١٩٢٦دا کۆچی دوایی کردووە، ئەوەی شایانی باسە کەمالیەکان حوکمی هەڵواسینی ئەمین عالی بەدرخان و (سریا)ی کوڕیان دابوو بۆیە ناچاربوون ڕوویانکردە میسر لەباسی گەشتەکەی مێجەر نویلدا باسی پەیوەندی مێجەر نویل و ئەمین عالی بەدرخان بەکورتی کراوە پێویست ناکات لێرەدا دووبارەی بکەمەوە.

٢-لەدوای ئەمین عالی بەدرخان کورتە باسێکی ژیانی (سریا)ی کوڕی دەکەین کە لەنێوان ساڵانی (١٨٨٣-١٩٣٨)دا ژیاوە و یەکێك بووە لەکوردە ڕۆشنبیرەکانی ئەو بنەماڵەیە چ لەڕووی بەشداربوونی لەڕێکخراو و کۆمەڵە کوردیەکاندا و چ لەڕووی ڕۆشنبیری و ڕۆژنامەگەریەوە ڕۆڵێکی زۆر گرنگی بینیوە لەناو کۆمەڵگای کوردا و چالاکیەکانی لەسەرچاوە/٧٩دا کە لەئەمریکا لەفلادلفیا چاپکراوە و لەو

پێشەکیەی ئەو کتێبەدا لەچاپی دوهەمیدا کە لەساڵی (١٩٩٤)دا جارێکی تر بڵاوکراوەتەوە ئەو پێشەکیەی (Prelinde) باسی چەند بەرهەمێکی بەنرخی سریا بەدرخانی تیادا کراوە، بۆ نمونە لەکۆنگرەی شازدەهەمینی (ئەنثرۆپۆلۆجی جیهانی)دا لەساڵی ١٩٣٦دا لەبرۆکسل بەسترابوو باسێکی گرنگی دووورودرێژی بڵاوکردۆتەوە بەناوی ( LeFemme Kurdet Somrol Social ١٦th World Anthrologi Congress)، بێجگە لەوە چەند بەرهەمێکی تریشی چاپکردووە وەکو (Cities Campagnes Kurdistan) کە لەساڵی ١٩٣٦دا دوبارە لەبرۆکسل چاپیکردووە و دوبارە کتێبێکی تری بڵاوکردۆتەوە لەژێر ناوی: (Lali Tterature Popularieet Classique Kurde XVI ٢N Congress international d Anthropologi)، بەر لەو بەرهەمانە هەروەکو لەپێشەکیەکەی (Perlinde) و ئەوەی (محەمەد ئوزون) باسیانکردووە، سریا بەدرخان کتێبێکی تری بەناوی (The Kurdish Case- Qadiyyahl Kurdiyah) بڵاوکردۆتەوە و سریا بەدرخان خۆشی لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٧٩ باسێکی تری خۆی پیشانداوە دەربارەی کوشتاری ئەرمەنیەکان لەلایەن تورکەکانەوە لەژێر ناوی (The declaration of Femme Kurde)، وە لەپێشەکیەکەی (Prelinde)دا ئامارەی بۆ دەرکردنی ڕۆژنامەیەك کردووە کە لەلایەن سریا بەدرخانەوە لەقاهیرە دەریکردووە (لەباسی ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا باسی ئەو ڕۆژنامەیە دەکەین).

### ٣-جەلادەت بەدرخان

باسی ژیانی جەلادەت بەدرخان و چالاکیەکانی باسێکی زۆر دووورودرێژە بۆیە هەوڵئەدەین کورتەیەکی باسبکەین بەپێی ئەو سەرچاوانەی لێیدواون وەکو (مێجەر نویل) لەگەشتەکەیدا بۆ باکوری کوردستان جەلادەت بەدرخان و کامەرانی برای لەگەڵیابوون لەوەدا وتویەتی جەلادەتی کوڕی ئەمین عالی بەدرخان تەمەنی (٢٥) ساڵە کە گەشتەکە لەساڵی ١٩١٩دا بووە، بەپێی ئەوە دەبێ جەلادەت بەدرخان لە(١٩١٩-٢٥-١٨٩٤)دا لەدایك بووبێت و لەو ژنە (چەرکەس)یە بووە کە ناوی (سینحە خانم) بووە و لەساڵی ١٩٣٥دا (ڕۆشن بەدرخان)ی کچی میر ساڵح بەدرخانی مارەکردووە.

بێجگە لەجەلادەت گەلێك نوسەری تر باسی ژیانی جەلادەتیان کردووە وەکو دکتۆرە ناهیدە ڕەفیق حیلمی و سادق بەهائەدین و (کۆنێ ڕەش)،

ئەنسكلۆپیدیای بەریتانی چاپی ساڵی ١٩٨٦ و (پیر روندو) و گەلێك نوسەری تر. بەپێی ئەو باسەی (کۆنیْ ڕەش) لەیادی چلەی کۆچی دوایی جەلادەت بەدرخاندا بلأویکردۆتەوە لەژمارە/٨ی گۆڤاری هیوای ساڵی ١٩٢٢ کە ئەنیستیوتی پاریس دەریکردووە، جەلادەت لەساڵی ١٨٩٣دا لەدایکبووە کە ئەمە ساڵێك جیاوازی هەیە لەگەڵ ئەو حسابەی مێجەر نویل لەگەشتەکەیدا تۆماریکردوە کە لاموایە مێجەر نویل زانیاریەکەی لەجەلادەت خۆیەوە وەرگرتووە بۆیە دوور نییە حسابەکەی نویل شتێکی ڕاست بێت و دووریش نییە هۆی ئەو جیاوازیانە چەند مانگێك بووبێت، بەپێی سەرچاوەکان لەدوای بەهێزبوونی کەمالیەکان و پاشگەزبوونەوەیان لەو بەڵێنانەی بەکوردیان دابوو، ئیتر کورد لەباکوری کوردستاندا کەوتە ژێر جەور و ستەمی کەمالیەکانەوە و زمانی کوردی و چاپەمەنیە کوردیەکان هەموو قەدەغەکران و ڕێکخراو و کۆمەڵە کوردیەکان یاساغکران و بڕیاری سزادانی ژمارەیەکی زۆری کورد دەرچوو کە بنەماڵەی بەدرخانیەکان لەهەموویان زۆرتر بەر ئەو خەشم و قینەی تورکە کەمالیەکان کەوتن و بڕیاری حوکمی ئیعدامی ئەمین عالی بەدرخان و کوڕەکانی کە سریا و جەلادەت و کامەران بوو دەرچوو، ئیتر ناچاربوون ڕوویانکردە دەرەوەی وڵات و کامەران و جەلادەت ڕوویانکردە ئەڵمانیا و کامەران دکتۆرا و جەلادەت لیسانسی وەرگرتووە.

کۆنیْ ڕەش لەو باسەی کە بەر لەمە لێیدواین وتویەتی: جەلادەت بەدرخان لایەنگری شۆڕشەکەی شێخ سەعیدی پیران بووە، بەڵام کە ئەو شۆڕشە تێکشکا بەنائومێدی کوردستانی بەجێهێشت و لەئەنجامدا چووەتە میسر و لەوێوە بۆ بەیروت کە ئەوسا ماڵی (خەلیل بەگ رامی) لەویْ بووە و لە ١٩٣٠/٨/٢٥دا چۆتە شام و لەشام بووە بەمیوانی ماڵی (عەلی ئاغای زیلفۆ) و لەویْ ماوەتەوە و لەو ماوەیەدا هەتا کاتی کۆچی دوایی لە ١٩٥١/٧/١٥دا ماوەیەك مامۆستای زمانی فەرەنسی بووە لەدانیشگای (شام) و ماوەیەکیش پارێزەری کۆمپانیای (ریشری) بووە کە کۆمپانیایەکی توتنی فەرەنسیەکان بووە و لەساڵی ١٩٥٠دا بەهاندانی (حسێن بەگ) کە زەویوزارێکی زۆری هەبووە لەشام جەلادەت لەزەویەکانی ئەو بنەماڵەیەدا دەستیکردووە بەکشتوکاڵ و لۆکەی چاندووە، ئەو زەویوزارانە بەناوی بیرێك ناودراون کە دەڵێن جەلادەت بەدرخان خۆی ناوی لێنابوو (بئر القدر)، لەڕۆژی ١٩٥١/٧/١٥دا لەکاتی تەواوکردنی بیرەکەدا جەلادەت لەقەراغیا

ڕادەوەستێت و لەوکاتەدا کەسی لانابێت بیرەکە دەتەپێت و جەلادەت دەکەوێتە ژێر خۆڵ و بەردەوە، بەڵام هەتا فریای دەرهێنانی دەکەون گیانی دەردەچێت.

دەربارەی ئەو باسەی جەلادەت بەدرخان کە چۆن کۆچی دوایی کردووە من لەساڵی ١٩٩٠دا ڕێمکەوتە شام و لەوێ بەدوای ئەو سەرچاوانەدا دەگەڕام کە پەیوەندیان بەباکوری کوردستانەوە هەبێت لەوێ بەهۆی برادەرێکەوە بۆ نانخواردنی نیوەڕۆ بانگکراین بۆ ماڵی کوڕێکی ئەو (حسێن بەگ)ە کە لەلاپاڵی چیای (قاسیون)دا بوو، لەگەڵما هات بۆ سەر گۆڕەکەی بەدرخان پاشا و جەلادەت کە لەبەرگی یەکەمدا وێنەی ئەو گۆڕەم بڵاوکردۆتەوە، خانەخوێکەمان هۆی کۆچی دوایی جەلادەت بەدرخانی بەم شێوەیە بۆ باسکردم: ((جەلادەت بەدرخان لەکۆتایی ساڵانی ژیانیا زۆر خەمبار بوو دەربارەی ئەو هەموو کارەسات و بەسەرهاتانەی بەسەر کورد و کوردستاندا هاتبوو، سەریکردبووە سەر خواردنەوەیەکی بێتام و ئەو ڕۆژەی کە کۆچی دوایی کرد زۆری خواردبووەوە و چووبوو سەری لەبیرەکە دابوو کە لەکێڵگەکەدا کرابوو، دیاربوو لەنگەری تێکچووبوو کەوتبووە خوارەوە و کاتێك پێیزانرا و بەئوتومبیل بردیان بۆ خەستەخانە لەڕێگا کۆچی دوایی کردبوو)).

لەڕاستیدا چالاکیە ڕۆشنبیریەکانی جەلادەت بەدرخان و بەرهەمە چاپکراوەکانی لەو ڕۆژانەدا کە کورد زۆر کەم چالاکبووە لەڕووی بڵاوکردنەوەی کتێب و گۆڤار و چاپەمەنیەکاندا، ئەوەی جەلادەت کردوویەتی بۆشاییەکی تەواوی پڕکردبووەوە. جەلادەت بەدرخان کە لەشام بووە لەسەرەتادا لە ١٩٣٢/٥/١٥دا یەکەم ژمارەی گۆڤاری (هاوار)ی دەرکرد و ژمارە/٢٦ی لە ١٩٣٥/٨/١٨دا دەرکرد و دوای ژمارە/٢٦ کە بۆ ماوەیەك وەستا، ژمارە/٢٧ی لەڕۆژی ١٩٤١/٤/١٥دا دەرچووە و دواژمارەی ئەم قۆناغەشی لە ١٩٤٣/٨/١٥دا لەڕۆژی یەکشەمەدا دەرچووە، بەڵام گۆڤاری (ڕوناهی–Runahi) ڕۆژی چوارشەمەی ڕێکەوتی ١٩٤٥/٤/١ دەرکردووە کە بەهەمووی (٢٨) ژمارەی لێدەرچووە.

جەلادەت بەدرخان وەکو سەرچاوەکان باسیانکردووە زمانی فەرەنسی و تورکی و عەرەبی و ئەڵمانی و ئینگلیزی زانیوە بێجگە لەزمانەکەی خۆی کە کوردی بووە و زۆرجار نوسینەکانی بەنازناوی: هرکول عزیزان، باڤی جەمشید (کە کوڕی بووە)، سترانڤان و هاواری هاوار و هەندێ نازناوی ترەوە بڵاوکردۆتەوە. یەکێك لەکارە گرنگە زمانەوانیەکانی جەلادەت ئەو ئەلف‌وبێیە

بووه كه بەشێوەپیتی لاتینی بۆ نوسینی كوردی بەشێوەی كرمانجی ژووروو ئامادەیكردووە. هەروەكو دكتۆرە ناهیدە ڕەفیق حیلمی باسیكردووە و ئاماژەی بۆ باسێكی (پیر روندو)ی فەرەنسی كردووە كە خاوەنی گەلێك بەڵگەنامە بووە لەتوێژینەوەی ئیسلامدا، لەنامەیەكیدا بەفەرەنسی كە لە(١٩٥٢/٦/٢٦)دا (دیارە بەبۆنەی یادی كۆچی دوایی جەلادەتەوە نوسیویەتی) بەدووروودرێژی باسی ژیانی جەلادەت و خۆماندوكردنی كردووە بۆ خزمەتی ڕۆشنبیری و زمانی كوردی و بەبوژێنەرەوەی زمانی كوردی داناوە و وتویەتی بەر لەو كەس بەوێنەی ئەو بەرهەمی بەسوودی پێشكەش نەكردووە دەربارەی زمانەوانی.

دەربارەی بایەخدانی جەلادەت بەدرخان بەدانانی ئەلف‌وبایەكی تایبەتی بەپێی لاتینی بۆ نووسینی زمانی كوردی، جەلادەت بەدرخان لەو گەشتەیدا كە خۆی و كامەرانی برای و ئەكرەمی جەمیل پاشای دیاربەكری بەشداریان كردبوو سەرنجی دابووە مێجەر نویل كە چۆن ئەو ستران و چیرۆكە كوردیانەی لەگەشتەكەیدا دەیبیست و مەبەستی بوو تۆماریان بكات هەر بەزمانی كوردی ئەو ستران و چیرۆكانەی بەپیتی ئینگلیزی تۆماركرد و ئەمە و تەقەلاكانی توركەكانیش بۆ وازهێنان لەنووسینی زمانی توركی بەپیتی عەرەبی و داهێنانی پیتی لاتینی بۆ بەكارهێنانی لەنووسینی زمانی توركیدا ئەمانە هەموویان جەلادەتیان هاندابوو ئەویش بیر لەبەكارهێنانی پیتی لاتینی بكاتەوە بۆ نووسینی زمانی كوردی و بەمە ئەو كێشەیەی لەگرانی نووسینی هەندێ دەنگی كوردیدا كە بەپیتی عەرەبی نەدەتوانرا بنوسرێت ئەو بەپیتی لاتینی ئەو بۆشاییەی پڕكردەوە و بوو بەبناغەی نووسینی زمانی كوردی بەشێوەی كرمانجی ژووروو، لەدوای ئەویش وەكو سەرچاوەكان باسیانكردووە (موركولوف) هەمان تەقەلایدا و توانی بۆ كوردەكانی ئەرمینیا پیتی لاتینی بەكاربهێنێ هەرچەند لەدواییدا ئەو پیتە لاتینیەی (موركولوف) گۆڕرا بەپیتی ڕوسی و (ڕێیا تازە)ی پێ بلاّودەكرایەوە.

لەساڵی (١٩٣٣)شدا مامۆستای زمانەوان تۆفیق وەهبی بەگ هەمان تەقەلایدا بۆ نووسینی زمانی كوردی و نامیلكەیەكی بەناوی (خوێندەواری باو)ەوە بلاّوكردەوە و دكتۆر جەمال نەبەزی شارەزاش بەزمانی كوردی و زمانەوانی هەوڵێكی تری دا و هەندێ گۆڕینی لەئەلف‌وباكەی جەلادەت بەدرخاندا كرد و كتێبێكی بۆ هەمان مەبەست دانا بەناوی (نوسینی كوردی بەپیتی لاتینی) و

**گیــوی موکریــانیش لەســاڵی ١٩٧٢دا تەقەلایــەکی وای دا و شــتێکی بــەناوی (ئــەلف‌وبێی کــوردی وێنــەدار)ەوە بڵاوکــردەوە. لــەکۆتایی باســی تەقــەلاکانی جــەلادەت بەدرخانــدا باســـی ئــەو بەرهەمانــەی دەکــەین کــە سەرچــاوەکان باســـیانکردووە کــە بــریتین لــەم بەرهەمانــە هــەروەکو سەرچــاوەکان چــۆنیان تۆمارکردووە بەو شێوەیە دەیخەینە پێشچاو:**

١-رێزمانا ئەلف‌وبێیا من (لەچاپخانەی هاوار چاپیکردووە).

٢-رووپەلێن ئەلفا بێی، تفتشا دویەدین هژمارا (٢).

٣-بیشیا پیغمبر بەکوردیيا (دوملی) بەدیباجا جەلادەت هژمارا (٥)، لەکتێبخانا (هاوار) هاتیە چاپکرن.

٤-مکتوب ژ مستەفا کەمال پاشیرا (دین هژمارا ٦)، کتێبخانا هاوار هاتیە چاپکرن.

٥-گرامیر کوردی-ئانکو رێزمانا کوردی بزمان فەرەنسی، ساڵی ١٩٤٣.

٦-ژمە مەلا کوردستانی دین هژمارا (٨).

٧-گیرامیر کورد-ئانکو کوردی بەزمان فەرەنسی، لەساڵی ١٩٧٠دا لەپاریس چاپکراوە بەناوی (ئەمیر جەلادەت و لیتکو).

٨-فرهنگا کوردی-فەرەنسی، دستنڤیس یاکو کابانی (ڕۆشن بەدرخان کە خێزانی میر جەلادەت بووە).

**ئەوەی شایانی باسە ڕۆشن بەدرخانی خێزانی میر جەلادەت کە کوڕێك و کچێکیان بووە، جەمشیدی کوڕی و سینم خانمی کچی، ڕۆشن بەدرخانیش لەشامدا مامۆستا بووە و گەلێك بەرهەمی هەبووە و سێ ڕۆمانی لەتورکیەوە وەرگێڕاوە و هەروەکو دکتۆرە ناهیدە ڕەفیق حیلمی باسیکردووە، دوو یاداشتی هەبووە یەکێکیان یاداشتی ئافرەتێك و ئەویتریان یاداشتی مامۆستایەك لەژێر ناوی (غرامی و آلامی-دڵداری و ئێش‌وئازارم) و کتێبێکیش بەناوی (صفحات من الأدب الكردي) کە لەکوردیەوە کردویەتی بەعەرەبی.**

**بەڕاستی جەلادەت خۆی و خێزانەکەی و سرپای برای جێگەی شانازین و بەداخــەوە ئێمــە تــەنها نــاوی ئــەو بەرهەمانــەمان خوێندۆتــەوە و ئاگــاداری ناوەڕۆکــەکانیان نــەبووین بۆیــە لامواپــە ئــەرکی ئەنســتیوت و کۆمــەڵ و مەڵبەنــدە ڕۆشنبیریەکانی کوردە لەناوەوەی وڵات و لەدەرەوە چەند لیژنەیەك پێکبهێنن بۆ پشــکنینی کتێبخانــەکان بۆئــەوەی ســەرلەنوێ هــەموویان چــاپبکرێنەوە و ئــەو**

بەرهەمە بەنرخانە لەناونەچن. بێگومان لەو ڕۆژانەدا گەلێك كوردی تر بێجگە لەكوردەكانی ئەو دوو بنەماڵەیە چالاكیان هەبووە لەڕێبازی ڕووداو و بەسەرهاتەكانی هەرسیٚ بەرگی ئەم كتێبەدا خوێندەواری بەڕێز ناوی زۆریانی دێتە بەرچاو وەكو بنەماڵەی جەمیل پاشای دیاربەكری و بابانەكان و گەلێكی تریش.

## باسی دووەمی بەشی سێهەم

## کۆمەڵ و ڕێکخراوە کوردیەکان لەباکوری کوردستان

لەبەرگی یەکەمدا لەبەشی نۆزدەدا باسی ئەو کۆمەڵ و ڕێکخراوانەمان کرد کە لەباکوری کوردستاندا پێکهاتبوو، کە شەڕی جیهانی دەستیپێکرد ئەو ڕێکخراوانە هەموو داخرابوون و هەموو جموجوڵێکی نەتەوایەتی کورد لەماوەی ئەو شەڕەدا نەما و ساتێك شەڕ بڕایەوە سوپاکانی دەوڵەتە هاوپەیمانەکان دەستیان بەسەر تورکیادا گرت بەئەستەمبوڵی پایتەختیشەوە، کورد ئا لەو بارودۆخەدا خۆی لەهەڵوێستێکی تازەدا بینیەوە و سیاسەتمەداران و زانایان و ڕۆشنبیرانی کورد کەوتنە خۆیان بۆئەوەی سەرلەنوێ کۆمەڵ و ڕێکخراوی تازە دامەزرێنن و لەئەنجامدا چەند کۆمەڵ و ڕێکخراوێك پێکهات و ئەندامەکانیان دەستیانکرد بەچالاکی، بەڵام بەداخەوە زۆری پێنەچوو کێشە لەنێوان ئەندامانی کۆمەڵگای کورددا لەباکور پەیدابوو کە بوو بەهۆی سەرەتای لێکدابڕان و ناکۆکی و ئەوەی زیانی پێگەیشت میللەتی کوردبوو کە هەل و دەرفەتێکی مێژوویی زۆر لەباری لەکیسچوو.

نوسەرانی خۆمانە و بێگانە، ئەوانەی بایەخیان بەچۆنێتی پێکهاتنی ئەو کۆمەڵانە و سەرەنجامەکانیان داوە، ژمارەیەکی کەمیان ڕووداوەکانی ئەو سەردەمەیان لەکاتی خۆیدا تۆمارکردووە و ئەو نوسەرانەش کە لەدواییدا بەدوای بەڵگە و نوسینە کەمەکانی ئەو ڕۆژانەدا گەڕابوون، بەتایبەتی نوسەرانی بێگانە لەتۆمارکردنی ناوی کۆمەڵ و ڕێکخراوەکاندا بەتایبەتی بەهۆی وەرگێڕانی دوکیومێنت و بەڵگەکان لەزمانێکەوە بۆ زمانێکی تر یا هەر لەناو کوردیشدا لەشێوە زمانێکەوە بۆ شێوە زمانێکی تری کوردی توشی هەندێ هەڵەی زەق و ئاشکرا بوون کە ئێمەی ئەم سەردەمە ناچارین ئەو باسانەی تۆمارکراون کتومت هەروەکو خۆیان بنووسم کە بەهۆی ئەمەوە زۆرجار نوسەر توشی لەیەکنەچونێکی ئاشکرا دەبێت لەزنجیرەی ڕووداو و بەسەرهاتەکاندا، بۆیە منیش ناچارم وەکو ئەمانەتێکی مێژوویی ئاماژە بۆ زۆربەی ئەو سەرچاوانە بکەم و بەپێی توانا هەوڵبدەم بیروبۆچوونی خۆم دەربارەی ئەو جیاوازی و لەیەکنەچوونانە دەرببڕم وەکو هەموو نوسەرێکی تر کە ناچار دەبێت هەر هەمان ڕێباز بگرێتەبەر.

دکتۆر عەبدولسەتار تاهیر شەریف لەباسێکی دوورودرێژیدا، سەرچاوە/٤٠ کە بۆ کۆمەڵ و ڕێکخراوە کوردیەکانی باکوری تەرخان کردووە لەلاپەڕە (٢٩١)دا وتویەتی: ((لەدوای مۆرکردنی پەیمانی وەستاندنی شەڕ (کە مەبەستی پەیمانی مودراسە) یەکەم کۆمەڵێك کە دامەزرا بریتی بووە لەکۆمەڵی سەربەخۆیی کورد لەئەستەمبوڵ بەسەرۆکایەتی شێخ عەبدولقادری شەمزینی))، بۆئەوەی باسی کۆمەڵ و ڕێکخراوەکانی باکوری کوردستان بەزنجیرە بخەینە پێشچاو لەسەرەتادا بەو کۆمەڵەی ئەو بەحیزبی (استقلال-کە سەربەخۆیی دەگرێتەوە) دەستپێدەکەین:

**١-کۆمەڵی-حیزبی (أستقلالی کورد)**

دکتۆر عەبدولسەتار لەپەراوێزی لاپەڕە (٢٩١)دا وتویەتی: جاری وا هەبووە پێی‌وتراوە (یانەی کوردی) و جاری واش هەبووە پێی‌وتراوە (حیزبی سەربەخۆیی کورد) یا (حیزبی دیموکراتی کورد)، هەروەها وتویەتی دکتۆر ئەحمەد عوسمان ئەبوبەکر ئەم ناوانەی لەبەڵگە نهێنیەکانی بەریتانیاوە وەرگێڕاوە بۆ زمانی عەرەبی وەکو لەگۆڤاری (الثقافة)دا ژمارە (٢)ی ساڵی ١٩٨٧دا باسیکردووە. دەربارەی ئەو ناوە جۆربەجۆرانەی دکتۆر عەبدولسەتار ئاماژەی بۆ کردووە لەڕاستیدا هیچیان لەگەڵ ئەو دوکیومێنتەی ناو ئەرشیفی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیادا یەکناگرێتەوە ژمارە (Fo.٣٧١-٥٠٦٨) ڕۆژی ١٩٢٠/٣/٢٤ کە لەم دوکیومێنتەدا تەنها بەناوی (جمعیتی تعالی کوردستان) ناویبردووە، هەرچەند لەچەند دوکیومێنتێکی تردا بە(Club-یانە) ناوی هاتووە.

بەپێی باسەکەی دکتۆر عەبدولسەتار ئەم کۆمەڵە لەدواییدا لەناو خۆیاندا تێکچوون (بەر لەتێکچوونی ئەو کۆمەڵە سەرۆکی کۆمەڵەکە شێخ عەبدولقادر بووە و ئەمین عالی بەدرخان جێگری بووە)، دکتۆر عەبدولسەتار ناوی ئەندامانی ئەو کۆمەڵەی کە پێی‌وتوە کۆمەڵی سەربەخۆیی کورد نەهێناون و ڕۆبەرت ئولسون لەلاپەڕە (٢١)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٨٤ ناوی ئەو کۆمەڵەی بەم شێوەیە ناوبردووە: (Kurd Terraki Ve Taaven Jemiyti) وە وتویەتی لەئینگلیزیدا ئەم ناوە بەرامبەرەکەی (Kurdish Society Progress and Mutual) دەگرێتەوە کە بەسەرهەڵدانەوەی (جمعیتی کورد تعالی و ترقی) دەگرێتەوە کە (اتحاد و ترقی) لەساڵی ١٩٠٨دا دایانخستبوو، بەلام ئەمەی ئەمجارە گەلێك لەپیاوە عەشایرەکانیش تیایدا بەشداربوون و باسی لیژنەی ئەو جەمعیەتەی کردووە کە

میرئالای کۆلۆنێل خالد خەڵکی دەرسیم (لەهەندێ سەرچاوەی تردا بەخەلیل بەگی دەرسیمی ناوی هاتووە و ئەگەر مەبەستی میرئالای خالد بەگی جوبران بووبێت ئەو خالد بەگە بەجوبرانی ناوبراوە نەك دەرسیمی).

ڕۆبەرت ئولسون جگە لەمیرئالای خالد باسی ئەمین عالی بەدرخان و محەمەد ئەمین بەگی سلێمانی (کە مەبەستی ئەمین زەکی بەگە کە ئەفسەرێکی پایەبەرزی خانەنشین بووە لەو ڕۆژانەدا) و لەپیاوە ئاینیەکانیش (عەلی ئەفەندی) و (شەفیق ئەفەندی-خەڵکی ئەرواس) و گەلێکی تری وەکو فوئاد بەگی بابانزادە، فەیزوڵلا بەگی بازرگان، شوکری محەمەد (مەبەست محەمەد شوکری سەگبانە کە لەشوێنی خۆیدا باسیدەکەین چۆن لەکوردایەتی لایدابوو) و (عەلی شان بەگی خەڵکی کوجیگری لەناوچەی دەرسیم) کە وتویەتی نەخشەکێشی ڕاپەڕین و یاخیبوونی ساڵی (١٩٢٠) بووە (لەدواییدا باسێکی تایبەتیمان بۆ ڕاپەڕینی کوجیگری تەرخانکردووە).

دەربارەی ئەوەی (ڕۆبەرت ئولسون) باسیکردووە، دکتۆر عەزیز شەمزینیش لەلاپەڕە (٧٩)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٤٢ وتویەتی: لەدوای شەڕی جیهان، حیزبی تەعالی کوردستان پێکهات کە ئەندامەکانی بریتی بوون لە: ١-شێخ عەبدولقادری شەمزینی، ٢-ئەمین عالی بەدرخان، ٣-خەلیل رامی، ٤-کامەران بەدرخان، ٥-محەمەد عەلی، ٦-جەنراڵ فوئاد پاشا (زنار سلوپی لەسەرچاوە/٥٧دا وتویەتی: کوڕی سەعید پاشای خەندانی وەزیری دەرەوەی عوسمانی بووە، لەکاتێکدا وەکو بەر لەمە باسکراوە ڕۆبەرت ئولسون باسی فوئاد بەگی بابانزادەی کردووە)، ٧-سەعید عەبدوڵلا (کە کوڕی شێخ عەبدولقادر و باوکی دکتۆر عەزیز شەمزینی بووە)، ٨-میرئالای خەلیل بەگی دەرسیمی (کە ئەمە خالد بەگەکەی ڕۆبەرت ئولسون ڕاستدەکاتەوە)، ٩-شێخ سەعید، ١٠-ڕەمزی بەگ، ١١-ئەکرەمی جەمیل پاشازادە، ١٢-نەجمەدین حسێن کەرکوکی، ١٣-مەمدوح سەلیم، ١٤-حەسەن حامد، ١٥-حسێن عەونی، ١٦-میرئالای محەمەد عەلی بەگ، ١٧-ئەمین زەکی بەگ، ١٨-مەحمود نەدیم پاشا، ١٩-جەنراڵ مستەفا پاشای سلێمانی (مەبەست مستەفا یامولکییە)، ٢٠-جەنراڵ حەمدی پاشا، ٢١-ئەمین زەکی، ٢٢-شێخ عەلی شێخ شەفیق خێزانی و هەندێکی تر.

دکتۆر عەبدولسەتار تاهیر شەریف لەلاپەڕە (٢٩٢)ی گۆڤاری کۆڕی زانیاریدا سەرچاوە/٤٠، لەباسی جیابونەوەی ئەندامانی ئەو کۆمەڵەی بە(کۆمەڵەی سەربەخۆیی کورد) ناویبردووە وتویەتی بەپێی بەڵگەنامەی بەریتانی لەڕۆژی ١٩٢٠/٥/٣٠دا لەژێر ناونیشانی هەڵبژاردنی یانەی کورد لەو دوکیومێنتەدا باسی

دوو لیستەی کردووە، لیستەی بەدرخانیەکان کە لەگەڵ تاقمی شێخ عەبدولقادردا ناڕێکبوون ئەم تاقمەش (کۆمەڵەی تەشکیلاتی کۆمەلآیەتی کوردیان پێکهێنابوو کە بریتی بوون لە (بێگومان سەرۆکەکەیان ئەمین عالی بەدرخان بووە لەزنجیرە/٦دا ناوی هێنراوە):

١-دکتۆر عەبدوڵلا جەودەت بەگ-خەڵکی خەرپووت، نوشدار (پزیشك) و نوسەر بووە.

٢-شوکری بەگ بابان-خەڵکی دیاربەکر، نوسەر بووە (ڕەنگە لەدیاربەکر لەدایکبووبێت).

٣-شوکری محەمەد بەگ-خەڵکی دیاربەکر بووە و نوسەر بووە (ئەگەر مەبەستی محەمەد شوکری سەگبان بێت ئەوا جگە لەوەی نوسەر بووە پزیشکیش بووە).

٤-جەلادەت بەگ بەدرخان-خەڵکی دیاربەکر، نوسەر.

٥-ئەکرەمی جەمیل بەگ (مەبەست زنار سلوپی نوسەر، سەرچاوە/٥٧ کە نازناوی خۆی کردووە بەزنار سلوپی).

٦-ئەمین عالی بەگ-خەڵکی دیاربەکر، پشکێنەری دادگەری پێشوو.

٧-حسێن حاجی بەگ-خەڵکی ئورفە، پارێزەر بووە.

٨-مەمدوح سەلیم-خەڵکی وان، نوسەر لەڕۆژنامەی (ژین).

٩-نەجمەدین حسێن بەگ، خەڵکی کەرکوك، مامۆستای علوم.

بارەگای کاتی ئەم کۆمەڵە لەمەکتەبی (ژین)دا بووە لەشەقامی (ابو السعود) لەڕێگای (الباب العالی) هەروەکو دکتۆر ئەحمەد عوسمان ئەبوبەکر لەگۆڤاری (الثقافة)دا باسیکردووە، بەلآم ئیسماعیل شاوەیس کە خۆی لەو ڕۆژانەدا لەئەستەمبوڵ بووە و هێشتا نەگەڕابووەوە بۆ باشوری کوردستان، لەدواییدا لەباسێکیدا لەلاپەڕە (٢٤)ی سەرچاوە/٨٧دا دەربارەی کۆمەڵ و ڕێکخراوەکانی کورد لەباکوری کوردستاندا لەو ڕۆژانەدا وتویەتی لەدوای شەڕی یەکەمی جیهانی لەباکوری کوردستاندا پێنج ڕێکخراو هەبوون کە بریتی بوون لە:

١-کۆمەڵی تعالی و تعاون جمعیتی

کە بەکۆمەڵی بەرزی کوردستانیش ناویبردوە و وتویەتی شێخ عەبدولقادر سەرۆکی ئەم کۆمەڵە بووە کە لەمەدا لەگەڵ ئەوەی ڕۆبەرت ئولسون و دکتۆر عەزیز شەمزینیدا یەکدەگرێتەوە، (لەڕاستیدا ئەم کۆمەڵە بووە کە لەدواییدا تاقمی شێخ عەبدولقادر و بەدرخانیە لێکجیابوونەوە و هەرلایەك کۆمەڵێکی تایبەتی دروستکردووە).

### ٢-كۆمەڵی ئیستقلالی كوردستان

وەكو ئیسماعیل حەقی شاوەیس باسیكردووە ئەم كۆمەڵە لەلایەن بنەماڵەی بەدرخانیەكانـەوە سـەركردایەتی كرابـوو كـە ئەمـە لەگـەڵ ئـەوەی دكتـۆر عەبدولسـەتاردا یەكناگرێتـەوە كـە لەلاپـەڕە (٢٩١)ی سەرچـاوە/٤٠دا وتویـەتی: لەدوای موتارەكە (مەبەستی پەیمانی موودراس)ە، ئەم كۆمەڵە (مەبەستی كۆمەڵی ئیسـتقلال)ە بەسـەركردایەتی شـێخ عەبـدولقادر دروسـتبوو، ناسـراوترین دامەزرێنەری ئەم كۆمەڵە (سریا بەدرخان) بوو.

ئەگـەر دكتـۆر عەبدولسـەتار مەبەسـتی لـەو كۆمەڵـە بووبێـت كـە لەسـەرەتادا بەسەركردایەتی شێخ عەبدولقادر پێكهاتبوو كە ئەمین عالی بەدرخان جێگری بوو، ئەوا زۆربەی سەرچاوەكان ئەو كۆمەڵەیان بە(تعالی و تعاون جمعیتی) ناوبردووە نەك بە(كۆمەڵی استقلال) ئەگەر مەبەستیشی ئەو كۆمەڵە بێت كە لەكۆمـەڵی (تعالی و تعاون جمعیتی) جیابووبووەوە ئەوا دەبێ ئەم كۆمەڵە تازەیە (استقلالی كورد) بەسەرۆكایەتی بەدرخانیـەكان بووبێـت و نـاوی ئـەوەی تـاقمی شـێخ عەبـدولقادر دروستیانكردبوو نـەهاتووە، بەڵگـەش بۆ ئەمـە ئەوەیـە شـێخ عەبـدولقادر لـەپێش جیابوونـەوە و لێكترازانـی (تعـالی و تعـاون جمعیتـی) بـەهیچ شـێوەیەك لایـەنگری سەربەخۆیی كوردستان نـەبووە كـە ئـەمـە هۆیـەكی سـەرەكی بـووە لەجیابوونـەوەی هـەر ئـەو تاقمـە لەیـەكتری هـەروەكو لەباسـی كێشـەی نـاوخۆدا لەسـەر پـەیمانی (سیڤەر) ئەم ڕاستیە زۆرتر ڕووندەبێتەوە.

### ٣-كۆمەڵی دیموكراتی كوردستان

بەسـەركردایەتی لاوان و ڕۆشـنبیرانی كـورد. (ڕۆبـەرت ئولسـون لەكتێبەكەیـدا سەرچـاوە/٨٤ وتویـەتی: ئەنـدامانی ئـەم كۆمەڵـە بریتـی بـوون لـەتاقمێك لاوانـی ڕادیكاڵی).

### ٤-كۆمەڵی كوردستان سۆشیالیستی و تەرەقی پەروەران

كـە بریتـی بـوون لـەقوتابیانی كـورد لەدانشـگاكاندا وەكـو (مەمـدوح سـەلیم). ئەوەی شایانی باسە دەربارەی ئەندامێتی مەمدوح سەلیم، دكتۆر عەزیز شەمزینی وتویـەتی ئەنـدامی حیزبـی تـەعالی كوردسـتان بـووە و دكتـۆر عەبدولسـەتار تـاهیر شەریف وتویەتی ئەندامی كۆمەڵەی استقلال بووە، بەڵام قەدری جەمیل بەگ (زنار سلوپی) لەكتێبەكەیدا سەرچاوە/٥٧ وتویـەتی مەمـدوح سـەلیم ئەنـدامی كۆمەڵـەی (الـرابطـة الاجتماعیـەی كـوردی) بـووە هـەروەكو لەوەرگێڕانـە عەرەبیەكەیـدا باسكراوە.

**٥-جەمعیەتی بوژانەوەی کورد**

وەکـو ئیسـماعیل شـاوەیس باسـیکردووە و زنـار سلوپیش لەلاپـەڕە (٥٠)ی کتێبەکەیـدا سەرچـاوە/٥٧ وتویـەتی: ئەنـدامانی جـارانی (هێڤـی-کـە لەبـەرگی یەکەمـدا لـەحیزب و ڕێکخراوەکـانی بـەر لەشـەڕی جیهـانی بەدووروودرێـژی باسمـانکردووە)، هـەموویان لەمزگـەوتی (قـەرەحاجی) لەدیاریـەکر کۆبوونـەوە و ڕێکخراوێکیـان دروستکرد بـەناوی (جمعیتـی بوژانـەوەی کـورد) و خـەڵکێکی زۆر پشـتیوانیان لێکرد وەکو بنەماڵـەی جـەمیل پاشازادە، قاسم بـەگ و بەکر سدقی بەگی نـەقیبی ئەشـراف، شێخ ئەحمـەدی گوڵشـێنی، خوجـە حـاجی ئەفەنـدی و لەکۆبونەوەیەکدا بێزاری خۆیان دەربڕی بەرامبەر بـەوقارێکی وەك (عەلی کـەمال)ی وەزیـری نـاوخۆی تـورك کـە وتبـووی: ((دەوڵەتـە ئەوروپاییـەکان دەیانـەوێ خـاکی کوردستان بکەن بەدیاریەکی دەستی خۆیان و بیدەن بەئەرمەنیەکان)).

بـەپێی کتێبەکـەی زنـار سـلوپی، ئـەکرەمی جـەمیل پاشـا کرابـوو بەئەنـدامی سـەرۆکایەتی بـەڕێوەبردن کـە ئـەو سـەرۆکایەتیە جگـە لەئـەکرەمی جـەمیل پاشـا، جەرجسـزادە کـەریم بـەگ، چـەرخی زادە فیکـری بـەگ، غـەنی زادە ڕەشـادبەگ، جـەمیل پاشـازادە عومـەر بـەگ بـوون و مامۆسـتایانی قوتابخانـەکان بووبـوون بەئەنـدام و ژمـارەی ئەنـدامانی یانـە لەدیاریـەکر گەیشـتە هـەزار کـەس و چـەند لقێکیش لەشارەکانی دەوروبەریدا کرایەوە و غەنیزادە کە لەئەستەمبوڵەوە هاتبوو لەگەڵ فوئاد بەگدا ئەوانیش بوون بەئەندام.

لـەدوای هەڵبـژاردنی دەسـتـەی بەڕێوەبـەر جـەمیل پاشـازادە قاسـم بـەگ هەڵبژێردرا بۆ سەرۆکایەتی و دکتۆر غـەنیزادە بەجێگری سـەرۆك و جەرجیسزادە کەریم بەگ بەلێپرسراوی پارە و خوجە حاجی ئەفەندی بەموستەشاری سـەرۆك و ئەندامەکانی تری دەستەی بەڕێوەبەر بریتی بوون لە: عومەر، ئەکرەم، فیکری.

زنار سلوپی لەسەریئەڕوا و دەڵێت: ((ئەم جەمعیەتەی دیاربەکر پەیوەندیـەکی بـەهێزی هـەبوو لەگـەڵ جەمعیـەتی بوژانـەوەی کـورد لەئەسـتەمبوڵ و لیژنەیـەکی ڕاگەیاندنیان پێکهێنا لە: محەمەد ئەفەندی محامی (باقی توزە) و فـەوزی ئەفەنـدی زادە جەمیل بەگ و عەلی ئەفەندی خەڵکی (لیجی) و دەستکرا بەنووسین و خوێندن بەزمانی کوردی و زۆربەی خەڵکی دیاربـەکر بوون بەهاوکاری ئەو کۆمەڵـە، تـەنها هـەر بنەماڵـەی (بیرنجیـق) بـوون کـە دژی پێکهێنـانی حکومـەتێکی کـوردی بـوون ئـەوانیتر هـەموویان لایـەنگری بـوون. لەلایـەن جەمعیـەتی بوژانـەوەی کـوردەوە

پارمەتیـەکی زۆری ئـەوەی دیاربـەکر درا و چـاپکراوەکانی ئەسـتەمبوڵیان بـۆ دەنارد)).

بـەپێی باسـەکەی ئیسـماعیل شـاوەیس ئـەو کۆمەڵانـە دوو ڕۆژنامـەیان دەردەهێنا: یەکەمیان (ژین) بوو کە تورکەکان پێیاندەوت (جن-یەعنی جنۆکە)، ئـەویتریان ڕۆژنامـەی کوردسـتان بـوو. سـادق شـەرەفکەندی لەلاپـەڕە (٦٥)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٧١ باسی دوو ڕێکخراوی ئەو سەردەمەی کردووە: یەکەم کۆمەڵی استخلاصی کوردستان (کە هەندێ سەرچاوەی تر بەکۆمەڵی بوژانەوەی کورد ناویانبردووە)، کە لەلایەن سەید عەبدوڵلاّ (مەبەستی باوکی دکتۆر عەزیز شەمزینیە) پێکهاتبوو (کە ئەمە یەکەم سەرچاوەیە باسی سەید عەبدوڵلاّ شەمزینی بەو جۆرە کردبێت)، دوهەم کۆمەڵی سەربەخۆیی کورد (استقلال) کە وەکو شەرەفکەندی باسیکردووە ئەمە لەقاهیرە پێکهاتبوو بەسەرۆکایەتی سریا بەدرخان (لەڕاستیدا استقلال لەئەستەمبوڵ پێکهاتبوو ئەوەی قاهیرە لقێکی ئەوەی ئەستەمبوڵ بووە).

ئیسماعیل شاوەیس لەباسەکەیدا سەرچاوە/٨٧ بەدووردرێژی باسی چالاکی سریا بەدرخانی کردووە کە چۆن ئەو لقەی استقلالی لەقاهیرەدا دامەزراندبوو، دەربارەی ئەوە وتویەتی: ((لەساڵی ١٩١٨دا سریا بەدرخان لەقاهیرە لقێکی کۆمەڵی استقلالی دامەزراندبوو، لەکاتی شەڕی جیهانیدا ژمارەیەکی زۆر لەئەفسەرانی کوردی ناو سوپای عوسمانی لەلایەن سوپاکانی هاوپەیمانەکانەوە بەدیل گیرابوون و برابوونە کامپەکانی (قاهیرە) و (ئەسکەندەریە) و (سەید بەشیر) و کە شەڕ تەواوبوو سریا بەدرخان توانی پەیوەندیان پێوەبکات بۆئەوەی بچنە ڕیزی خەبات و تێکۆشانەوە لەپێناوی مافی نەتەوەی کوردا، بێجگە لەوانەی لەمیسردا بوون لەو شەڕەشدا کە لەباشوری عێراقدا لەنێوان هێزی عوسمانی و سوپای ئینگلیزدا کرابوو، ژمارەیەك لەئەفسەرانی کوردی ناو سوپای عوسمانی بەدیل گیرابوون.

(مەبەستی ئەو شەڕەیە کە بەشەڕی شوعەیبە ناسراوە و لەلاپەڕە (٣٤٥)ی بەرگی یەکەمی سەرچاوە/٨٠دا باسی هاوکاریکردنی کوردی تیادایە لەناو سوپای عوسمانیدا)، ئەو دیلانە نێردرابوون بۆ هیندستان و پەیوەندی بەوانەشەوە کرا بۆئەوەی بەهەموویان کۆنگرەیەکی کورد لەئەوروپا ببەستن بۆ داواکردنی مافی کورد و لەئەنجامی ئەمەدا ئەو بەدیلگیراوانەی لەهیندستاندا بوون بڕیاریاندا سریا بەدرخان بکرێت بەنوێنەری کورد لەو کۆنگرەیەدا و

پەیوەندیش بەحاکمی گشتی بەریتانیاوە کرا لەهیندستان بۆئەوەی بەڵێنی یارمەتیدان بدرێت بەکورد، بەڵام لەوەڵامی ئەو داخوازیەدا حاکمی گشتی بەو کوردە دیلانەی وتبوو ئامادە دەبێت بیاننێرێت بۆ حیجاز بۆئەوەی لەوێ لەگەڵ شەریف حسێندا هاوکاری بکەن کە لۆرانس سەرپەرشتی شەڕی دەکرد دژی تورکەکان، بەڵام ئەفسەرە کوردەکان ئەم پێشنیازەیان پەسەند نەکردبوو (بەر لەمە لەبەشی دوهەمدا بارودۆخی کوردستان، باسی گەلێك هەڵوێستی تری حکومەتی بەریتانیای تیادا کراوە کە لەهیچیاندا ئینگلیزەکان ئامادەنەبوون بەهیچ شێوەیەك یارمەتی کورد بدەن کە ئەمەی ئیسماعیل شاوەیس لێرەدا باسیکردووە نمونەیەکی ترە لەو هەڵوێستەی حکومەتی بەریتانیا، کەچی ناحەزانی کورد هەمیشە بزوتنەوەکانی کوردیان لەو ڕۆژانەدا بەوە تاوانبار کردووە کە بەهاندانی حکومەتی بەریتانیا بووە).

دەربارەی چالاکی سریا بەدرخان کە ئیسماعیل شاوەیس باسیکردووە، باسیل نیکتین لەلاپەرە (١٨٩)ی سەرچاوەی ژمارە (٥٤)دا وتویەتی سریا بەدرخان هەر لەدوای مۆرکردنی پەیمانی مودراسەوە ئیتر دەستیکردووە بەدامەزراندنی لیژنەی سەربەخۆیی کوردستان (مەبەست کۆمەڵی أستقلالی کوردستانە)، جگە لەو کۆمەڵ و ڕێکخراوانەی بەر لەمە باسمانکرد، لەشۆڕشی (پیران)دا باسی (کۆمەڵە-حیزبی ئازادی) دەکەین و پێویست ناکات لێرەدا دوبارەی بکەینەوە و لەشۆڕشی ئاراراتیشدا باسی کۆمەڵی (خۆیبون) دەکەین، ئەوەی شایانی باسە، دکتۆر عەبدولسەتار تاهیر شەریف لەلاپەرە (٤٦)ی سەرچاوە/٤٠دا بەشی عەرەبیەکەی بەدووردرێژی باسێکی گرنگی بڵاوکردۆتەوە دەربارەی (جمعیة التعالی لنساء الکورد-کۆمەڵی بەرزی ئافرەتانی کورد) کە تاقە سەرچاوەیەکە هاتبێتە بەرچاوم باسی کۆمەڵێکی وای کردبێت بەو شێوەیە کە وتویەتی: ئەو کۆمەڵە لەساڵی ١٩١٩دا لەئەستەمبوڵ پێکهاتووە و لەلاپەرە (٤٧)ی باسەکەیدا پرۆگرام و پەیڕەوی ئەو کۆمەڵەی باسکردووە کە بریتی بووە لە (٤٧) مادە کە کاتی خۆی بەزمانی تورکی لەچاپخانەی (قادینلار دنیاسی) لەشەقامی (دیوان یولو) چاپکراوە و دکتۆر عەبدولسەتار هەموو مادەکانی لەتورکیەوە کردوە بەعەرەبی کە بەڕاستی کارێکی باشی کردووە.

روهات ئالاکوم لەسەرچاوە/٧٨دا دەربارەی کۆمەڵی ئافرەتان کە دکتۆر عەبدولسەتار باسیکردووە وتویەتی ئەمینە خانمی ژنی شەریف پاشا سەرۆکی کۆمەڵی پێشکەوتنی ژنانی کورد (قادینلەر-ئافرەتان) بووە.

## باسی سێهەمی بەشی سێهەم

## ڕۆژنامە و گۆڤارەکان

بەپێی ئەو سەرچاوانەی دەربارەی گۆڤار و ڕۆژنامەکانی باکوری کوردستان دواون، کوردەکانی باکور بەهاوکاری ئەو کوردانەی تر کە لەباشوری کوردستان و لەڕۆژهەڵاتیەوە لەکوردستاندا مابوون کە زۆربەیان لەئەستەمبوڵدا نیشتەجێبوون، بەهەموویان شانبەشانی ئەو چالاکیانەی لەڕێکخراو و کۆمەڵەکانیاندا کردبوویان بایەخێکی زۆریشیان دابوو بەدەرهێنانی ڕۆژنامە و گۆڤار لەگەڵ ئەو هەموو کەم دەرامەتیەی دەستەی ڕۆشنبیر لەدوای تەواوبوونی شەڕی جیهانیدا لەناو کۆمەڵگاکانی کورددا هەبوو، لێرەدا بەکورتی ئاماژە بۆ هەندێ ڕۆژنامە و گۆڤار دەکەین:

١-ڕۆژنامەی کوردستان

لەبەرگی یەکەمدا بەدووروودرێژی باسی دەرچوونی ڕۆژنامەی کوردستانمان کردووە لەخولی یەکەمیدا کە دواژمارەی بریتی بووە لەژمارە (٣١) کە لەنیسانی ١٣١٨ی کۆچیدا لەجنێڤ دەرچووە، هەروەکو محەمەد ئەمین بوز ئەرسەلان لەسەرچاوە/٧٦دا باسیکردووە و فۆتۆکۆپییەکانی بڵاوکردۆتەوە کە بەڕاستی بەمە کارێکی زۆر باشی کردووە.

هەروەکو دکتۆر کەمال فوئاد لەسەرچاوە/١٠٨دا باسیکردووە، لەدوای ئینقیلابی عوسمانی ساڵی ١٩٠٨دا جارێکی تر لەلایەن (سریا بەدرخان)ەوە ڕۆژنامەیەکی تر لەئەستەمبوڵ هەر بەناوی کوردستانەوە چاپکراوە و وتویەتی: بەداخەوە هەتا ئێستە هیچ ژمارەیەکی ئەم دەورەمان بەرچاو نەکەوتوە (کە بەخولی دوهەم ناویبردووە، بەڵام لەخولی سێهەمدا جارێکی تر لەساڵانی (١٩١٧-١٩١٨)دا دوبارە دەرچوەتەوە کە یازدە ژمارەی لێدەرچووە. دکتۆر کەمال فوئاد لەسەرچاوە/١٠٨دا فۆتۆکۆپی هەر یازدە ژمارەکەی بڵاوکردۆتەوە کە ژمارەی یەکەمی لە١٥ی (ذی القعدة) ١٣٣٥ی کۆچیدا بەرامبەر ١٩١٧/٩/١٢ وە ژمارەی یازدەهەمی لە١٥ی (ربیع الثانی) ساڵی ١٣٣٦ی کۆچیدا بەرامبەر ١٩١٨/١/٢٨ لەچاپخانەی (ابی الهول) لەقاهیرە چاپکراون.

لەڕاستیدا دکتۆر کەمال فوئاد بەر لەمە لەساڵی ١٩٨٠دا لەگۆڤاری (چریکەی کوردستان)دا ژمارە (٣) کە مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد لەلەندەن دەریدەکرد

دەربارەی ژمارەکانی خولی سێهەم شتێکی نوسیبوو لەژێر ناوی (ڕۆژنامەی کوردستان-دەوری سێهەم) بەڵام دیارە تا ئەوسا هەموو ژمارەکانی کە یازدە ژمارە بوون دەرفەتی ئەوەی نەبووە باسی هەموویان بکات هەتا لەم دواییەدا لەساڵی ١٩٩٨دا هەموو ژمارەکانی فۆتۆکۆپی کردووە و لەسەری نوسیوە و باسەکەی پێشکەش کردووە بەشەهیدی جوانەمەرگ (نەجمەدین بیوکاریا) لەگەڵ بڵاوکردنەوەی وێنەیەکی ئەو شەهیدە جوانە مەرگە و لەساڵی ١٩٧٦دا ئەو یازدە ژمارەیەی پێشکەش کردووە بەدکتۆر کەمال فوئاد و دکتۆر کەمال لەپێشەکیەکەدا وتویەتی: ((نەجمەدین لەباکوری کوردستاندا بە(نەجۆ) ناسراوە و لەساڵی ١٩٤٣دا لەگوندی (قەرەهان)ی سەر بەویلایەتی (ئورفە) لەدایکبووە و هەر لەسەرەتای لاویەوە لەبزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورددا بەشداربووە و لەساڵی ١٩٧١دا لەئەستەمبوڵ کۆلیجی حقوقی تەواوکردووە و بەوپەڕی دڵسۆزیەوە لەپێناوی شۆڕشی کورددا خۆی بەختکردووە تا لەساڵی ١٩٨٢دا دەستگیرکرا و لەلایەن جەندرمە خوێنڕێژەکانی جەنگیزخان و هۆلاکۆوە لەزیندانی دیاربەکردا لە ١٩٨٤/١/٢٢دا شەهیدکراوە)).

بەپێی فۆتۆکۆپیەکانی ئەو ژمارانەی سەرچاوە/١٠٨ دەردەکەوێت هەموویان چوار لاپەڕەیی بوون بەقەوارەی (٢٨,٥سم×٤١سم)، کە بەشێوەی کرمانجی و بەپیتی عەرەبی چاپکراون و شێوەی کرمانجیەکەی هەرهەمان شێوەی نوسین و قسەکردنی شێوەی جزیرە و بۆتانە کە کاتی خۆشی ڕۆژنامەی کوردستانی خولی یەکەمی (١٨٩٨-١٩٠٢) هەر بەم شێوەیە چاپکراوە. لەکۆتایی هەموو ژمارەیەکدا نوسراوە مدیر مسئول (ئازیزی احمد-کە مەبەست سریا بەدرخان بووە) و لەژێر هەموو ژمارەیەکیدا نوسراوە: (پازدە ڕۆژا جارکی دەردیکەڤیت قنجیا کرمانجا رەدێخە پتێت)-جریدەیی کرمانجە بە......... وە بەتورکی لەژێر ئەمەدا نوسراوە: (کردلرك منافعنی مدافعه و اون بش کونده بر انتشار ایرد کرد غزته سیدر).

هژمار ١
جیی ئیداره‌یی
مصر القاهره علك بوسته‌یی ٥٨٠
جریده‌کی ١ قریه
سالیانی ١٥٠ شش مهیانی
٨٠ قریه

کردستان

پانزده روژا جارکی دەردیکه‌ ایت فعلیا کرماجاره وبجه چیت
جریده‌یا کرماجانه
کردلرك منافعنی مدافعه واوبش کرددر انتشار ایدر کرد غزته سیدر

عدد ١
محل اداره‌سی
مصر القاهره پوسته قوطوسی ٥٨٠
نسخه‌سی ١ غروشدر
سنه‌لك آبونه‌سی ١٥٠ آلتی آیلغی
٨٠ غروشدر

١٥ ذی القعده ١٣٣٥

**ژمارەی یەکەمی ڕۆژنامەی کوردستان خولی سێهەم**

**٢-گۆڤاری کوردستان**

دەربارەی ئەم گۆڤارە چەند سەرچاوەیەك باسیانکردووە، مامۆستا فەرهاد پیربالْ لەلاپەڕە (٢٠١)ی سەرچاوەی ژمارە/١٠دا بەدووروودرێـژی باسی پێنج ژمارەی ئەم گۆڤارەی کردووە کە بریتین لەژمارەکانی (٢، ٣، ٤، ٥، ٦) کە وتویەتی هەر پێنج ژمارەکەی لەکتێبخانەی زمانە ڕۆژهەڵاتیەکانی پاریسدا کە بەکتێبخانەی (لانکرو) ناسراوە دۆزیوەتەوە. بەپێی بۆچونەکەی کاك فەرهاد پیربالْ نوسەری گۆڤارەکە (محەمەد شەفیق ئەرواسی‌زادە) بووە و خاوەنی ئیمتیاز (محەمەد مەهدی) بووە و هەفتەی جارێك دەرچووە کە بەزمانی کوردی و فارسی و عەرەبی بووە و نرخی هەر دانەیەکی پێنج قروش بووە.

کاك فەرهاد ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە دکتۆر مارف خەزنەداریش لەگۆڤاری ڕۆژی کوردستان ژمارە (٤٣، ٤٤)دا باسی ژمارە (٨، ٩)ی گۆڤاری کوردستانی کردووە و (کاك مەحمود لەوەند)یش ژمارە (١٩)ی دیوە و مامۆستا عەلائەدین سوجادی لەمێژووی ئەدەبی کوردی و کاك جەمال خەزنەدار لەلاپەڕە (٢٢)ی سەرچاوە/١٤دا هەردووکیان وتویانە (٣٧) ژمارەی لێدەرچووە (کە لەوەی جەمال خەزنەداردا بەڕۆژنامەی کوردستان ناوی هێناوە).

کاك فەرهاد کارێکی زۆر باشی کردووە کە ناوەڕۆکی ئەو پێنج ژمارەیەی دیونی بڵاویکردۆتەوە و ئاماژەی بۆ ئەو باسەی دکتۆر کەمال مەزهەریش کردووە کە لەلاپەڕە (٢٣٣)ی تێگەیشتنی ڕاستیدا وتویەتی گۆڤاری ڕۆژی کوردستان (سەید حسێن) ناوێك لێپرسراوی بووە و ڕۆژنامەکە بەپێنج زمان: (کوردی، تورکی، عەرەبی، فارسی، فەرەنسی) وتاری تیادا بڵاوکراوەتەوە و گەلێك ژمارەی ئەو گۆڤارە بەوێنەی ناودارانی کورد ڕازێنراوەتەوە.

دەربارەی ئەو بۆچوونەی دکتۆر کەمال، کاک فەرهاد پیربالْ وتویەتی ئەو ژمارانەی لای ئێمەن (کە خۆی باسی پێنج ژمارەی کردووە)، لەو دوو ژمارەیەی دکتۆر مارف خەزنەداریش باسیکردووە لەهیچ ژمارەیەکیاندا ناوی (سەید حسێن) نەهاتووە و هیچ وتارێکیش بەزمانی فەرەنسی تیادا نیە و لەهیچ ژمارەیەکیاندا وێنەی هیچ ناودارێکی کوردیشی تیادا نییە. ئەوەی شایانی باسە، مامۆستا محەمەدی مەلا کەریمیش لەو باسەیدا کە لەدواییدا باسیدەکەین ئەویش باسی وێنەی ناودارانی کورد و نوسینی بەزمانی فەرەنسی نەکردووە لەو گۆڤارەدا.

هەروەها کاک (مالمیسانژ)یش لەگەلْ کاک مەحمود لاوەندی کە (مالمیسانژ) لەلاپەڕە (٧٦)ی سەرچاوە/١٠٠دا لەو گۆڤارە دواوە، گومانی خۆی پیشانداوە لەبوونی گۆڤارێك توانای ئەوەی هەبووبێت بەپێنج زمان باس بلأوبکاتەوە، بەلأم (مالمیسانژ) و مەحمود لاوەندی لەگەلْ دکتۆر کەمال مەزهەردا لەمەدا یەکیانگرتۆتەوە کە (محەمەد میهری) خاوەنی ئیمتیاز بووە و (سەید حسێن) بەرپرسیار بووە و ئەرسوزی زادە محەمەد شەفیق سەرنوسەری گۆڤارەکە بووە و هەمووشیان وتویانە گۆڤارەکە لەچاپخانەی (نجم استقبال مطبعەسی) چاپکراوە.

بەرلەوەی بچینە سەر باسەکەی مامۆستا محەمەدی مەلا کەریم دەربارەی ئەو لەیەکنەچوونانەی کاك فەرهاد پیربالْ و (مالمیسانژ) و مەحمود لاوەندی، سەرنجێك دێتە پێشەوە کە بریتی‌یە لەوەی هەر لایەیان تەنها ئەو چەند ژمارەیەی لابووە کە باسیکردووە و بەپێی سەرچاوەکان گۆڤارەکە (٣٧) ژمارەی لێدەرچووە کە هیچ دوور نی‌یە لەوانەی لای دکتۆر کەمال مەزهەر باسیکردون ئەو ژمارانە نەبن کە فەرهاد پیربالْ و ئەوانیتر باسیانکردووە و لامواییە هەتا نوسەرێك هەموو ژمارەکان نەبینێت ناتوانیْ بلْێت بۆچوونی چ لایەك ڕاستە.

مامۆستا محەمەدی مەلا کەریم لەژمارەکانی (٧٤، ٧٥)ی گۆڤاری ڕەنگیندا کە لەبەغدا دەردەچێت بەناونیشانی دۆزینەوەی ڕۆژنامەیەکی تری (کوردستان)ەوە باسێکی بلأوکردۆتەوە، بەلأم لەژمارە (٧٩)ی هەمان گۆڤاردا کە لەئایاری ١٩٩٥دا بلأوکراوەتەوە بەو بۆچوونەی پێشوویدا چۆتەوە و وتویەتی ڕۆژنامە نەبووە بەلْکو گۆڤار بووە و لەم باسەی دواییدا باسی کاك سەلأح سەعدەللأ و کاك شەعبان مزوری کردووە کە هەریەکەیان سەرنجی خۆیان بەرامبەر باسەکەی ژمارە (٧٤، ٧٥)ی گۆڤاری ڕەنگین دەربڕیوە و کاك شەعبان بۆی ڕوونکردۆتەوە کە گۆڤاری کوردستان لەقەوارەی گۆڤاری ڕەنگیندا بووە و یەکەم ژمارەی لە ٢٨ی ربیع الاخری سالْی ١٣٣٧ی کۆچیدا بەرامبەر (٣٠ی کانونی دوهەمی سالْی

١٣٣٥ی ڕۆمیدا دەرچووە (کە ئەمە یەکەم سەرچاوەیە باسی کاتی دەرچوونی ژمارەی یەکەمی کردووە) و لەو ژمارەیەدا لەدوو شوێنی جیاوازدا لەلاپەڕەی بەرگی یەکەم و لەلاپەڕەی یەکەمی ناوەوە (دوای ئەو بەرگە) لەهەردووکیاندا نوسراوە: لەسیاسەت بەولاوە هەر بابەتێك و بەهەر زمانێك بلأوئەکاتەوە و هەفتەی جارێك دەردەچێت و هەر وتارێك لەگەڵ ڕێبازیدا بگونجێت بەخۆشحاڵیەوە بلأوینەکاتەوە (لاموایە شێوە کرمانجیەکەی گۆڤارەکە لەلایەن کاك شەعبان مزوریەوە کراوە بەشێوەی کرمانجی خواروو لەو سەرنجەیدا کە بۆ مامۆستا محەمەدی مەلا کەریمی ناردووە).

دەربارەی گۆڤارەکە مامۆستا محەمەدی مەلا کەریم وتویەتی سەرنووسا (ئەرواسی زادە محەمەد شەفیق) و خاوەن ئیمتیاز (محەمەد مەهدی) بو دەربارەی محەمەد مەهدی، مامۆستا محەمەدی مەلا کەرد  تویەتی خەڵ (سنە)یە و کاتی خۆی ڕێی کەوتۆتە ئەستەمبوڵ و لەسا  ی ١٩٥٢-١٩٥٤دا مامۆستا گۆران لەسلێمانیەوە ڕۆژنامەی (ژین)ی بۆ دەنارد و لەژمارەیەکی (ژین)دا پارچە شیعرێکی محەمەد مەهدی بلأوکردۆتەوە، بەلأم کاك فەرهاد پیربالْ لەباسەکەیدا سەرچاوە/١٠دا وتویەتی محەمەد مەهدی لەساڵی (١٨٨٩)دا لەگوندی (دشە)ی سەر بەناوچەی (جوانڕۆ) لەدایکبووە و لە(١٩٥٧/٤/١٩)دا کۆچی دوایی کردووە.

فەرهاد پیربالْ دەربارەی چۆنیەتی گەیشتنی محەمەد مەهدی بۆ ئەستەمبوڵ وتویەتی: ((لەهەڕەتی گەنجێتیدا ڕوویکردۆتە (فارس) و لەوێوە چۆتە ئەرزڕوم و لەساڵی ١٩١٢دا گەیشتۆتە ئەستەمبوڵ و لەوێ تێکەڵ بووە بەڕووناکبیران و شۆڕشگێڕانی کورد لەئەستەمبوڵ و ئاشنایەتیەکی زۆری لەگەڵ ئیسماعیل حەقی باباندا هەبووە کە وەزیری مەعاریفی حکومەتی عوسمانی بووە و بەیارمەتی ئیسماعیل حەقی بابان توانیبووی کۆلیجی حقوق تەواوبکات و لەساڵانی پەنجاکاندا لەگۆڤاری (هەتاو)دا کە لەهەولێر دەردەچوو شتی بلأودەکردەوە (مەبستی گۆڤاری هەتاوی گیوی موکریانییە).

٣-ژین

ژین، چ ڕۆژنامە بووبێت یا گۆڤار، یەکێك بووە لەو چاپەمەنیە گرنگانەی لەدوای تەواوبوونی شەڕی جیهانی لەئەستەمبوڵ لەلایەن ڕۆشنبیرانی کوردەوە دەرچووە. دەربارەی ژین، کاك جەمال خەزنەدار لەسەرچاوە/١٤دا-ڕابەری ڕۆژنامەگەری دوجار باسی ژینی کردووە: لەلاپەڕە (٢١)دا باسی (گۆڤاری ژین)ی کردووە کە وتویەتی گۆڤارێکی نیومانگی بووە لەساڵی ١٩١٦دا لەقاهیرە لەلایەن

(سـريا بـەدرخان)ەوە بـەزمانی کـوردی و عـەرەبی و تـورکی دەرچـووە کـە سەرچاوەکەی بۆ ئەم بۆچوونەی بریتی‌یە لەوتارێکی (محەمەد تۆفیق وردی) کە لەڕۆژنامەی (ڕووناکی) ژمارە (٢)دا بڵاویکردۆتەوە.

لەلاپـەڕە (٢٤)یشـدا باسـی (ڕۆژنامـەی ژیـن)ی کـردووە کـە وتویـەتی: ڕۆژنامەیەکی ئەدەبی، کۆمەڵایەتی بووە لەشاری ئەستەمبوڵدا بەزمانی کوردی لەلایەن مەمدوح سەلیم بەگ و کەمال نوری،.... بێگومان هەڵەی چاپەمەنیە و ڕاستیەکەی لەلایەن (کەمال فەوزی)یەوە دەرچووە، یەکەم ژمارەی لەساڵی ١٩١٩دا دەرچووە کە سەرچاوەکەی بۆ ئەمە مێژووی ئەدەبی کوردی مامۆستا عەلائەدین سوجادیە.

دەربارەی ژین، مامۆستا محەمەد ئەمین بۆز ئەرسەلان، هەروەکو چۆن کارێکی گرنگ و باشی کردبوو بەبڵاوکردنەوەی ژمارەکانی ڕۆژنامەی کوردستان ساڵی (١٨٩٨-١٩٠٢) کە لەبەرگی یەکەمدا باسمانکردووە، بەو جۆرەش کارێکی تری باشی کردووە دەربارەی (ژین) کە لەچەند جلدێکدا ژمارەکانی فۆتۆکۆپی کردووە و لەهـەموو ژمارەکـانی دواوە گـەلێك سـەرنجی بـەنرخی خـۆی دەربارەیـان باسکردووە کە دوبارە برای بەڕێز و خۆشەویستم دکتۆر عومەر شێخ موس ئەو فۆتۆکۆپیانەی بۆ ناردم.

بەپێی ئەو فۆتۆکۆپیانە کە لەژمارەی یەکەمیەوە کە لەڕۆژی ٢٧ی تشرینی دوهەمی ساڵی ١٣٣٤ی کۆچی بەرامبەر بەساڵی ١٩١٨، هەتا ژمارە (٤)ی لەژێر هەموو ژمارەیەکیدا بەتورکی نوسراوە (هفتەلق غزتە) و لەژمارەی پێنجەم بەدواوە کـە لـە ١٢ی کـانونی یەکـەمی ١٣٣٤ی کۆچـی بەرامبـەر بەسـاڵی ١٩١٨ هـەتا دواژمـارەی (٢٥)ی لـەجیاتی ئـەو (هفتـەلق غزتـە)یـە نوسـراوە (حیـات.. ) کـە بەداخەوە بۆم ڕوون نەبووەوە مەبەست لەمە چی‌یە.

لەهەموو ژمارەکانیدا لەسەر بەرگەکەی نوسراوە: (دین، ادبیات، اجتماعیات و اقتصـادیاتن، بحـپ ایلـدر،... تورکجـە، کوردجـە مجموعـەدر،...) و لەهـەموو ژمارەکانیـدا نوسـراوە لەچـاپخانەی (نجـم اسـتقبال مطبعـەسـی) لەئەسـتەمبوڵ چاپکراوە. بەپێی پێشەکیەکەی مامۆستا محەمەد ئەمین بوز ئەرسەلان، لەیەکەم ژمارەوە هەتا ژمارە (٢٠) وتراوە: لێپرسراوی گۆڤارەکە (حەمزە بەگی موکس) بووە کە یەکێك بووە لەئەندامانی (کۆمەڵی پێشکەوتنی کوردستان) کە ڕۆژنامەی (ژین) ئۆرگانی ئەم کۆمەڵە بووە، بەڵام لەژمارە (٢١) و بەدواوە (مەمدوح سەلیم) بووە بەلێپرسراو.

ژوبر ١ — سالا عولي — عدد ١

تعجبي كاغدك في ديكه
دفي ديكث ده‌مري مز
ناف خويني جريده‌يي
لاو بدرخان پاشا
مقداد مدحت بكي
هرجار دوهزار جريده‌يا
بي پره ازسے دبكم
كردستاني ده‌بدين خلكي
پازده روژا جاركي تيت
نفيساندن

# كردستان

١٣١٥

❁ كردلري ايقاظ وتحصيل صنايعه تشويق ايچون نشر اولنور ❁

❁ اون بش گونده بر نشر اولنور كردجه غزته‌در ❁

عنوان
مصرده «كردستان» غزته‌سي
صاحب ومحرري بدرخان
پاشازاده
❁ مقداد مدحت ❁
هر ... كردستان
ولايتلري ... ارسال ... دن ... له
... اولنه‌جقدر

كردستان خارجنده هر بر
ايچون سنه‌لك ابونه بدلي
٨٠ غروشدر
كردستان داخلنده مخصوصي
ابونه ... كونده‌ريلور

❁ روژا پنجشني‌ده ٣٠ ذوالقعده سنه ١٣١٥ پنجشنبه‌في ٩ نيسان سنه ١٣١٤ ❁

بسم الله الرحمن الرحيم

صد هزار شكر وحمد ژ خدى تعالى‌ره آم مسلمان خلق كرن. وطالبنا علم ومعرفتيره هش وزكا دامه. دز حقا علمادنا علم ومعرفتيره گلك آيتين جليله واحاديث شريفه هنن دنيايده چقاس مسلمان هين گوند وبازيرين حباوه مكتب ومدرسه وجريده هنن دنيايده چه دبه بيه نابه جريده دنفيسن. حيقاس نيت ژ كرداره كرد ژ گلك اوما زيده‌تر خويي هش وزكانه جابرن دبين خووده راست وقربه خورتن ودپسا وكه قومين دي نه خوندانه نه‌دواهدن دنياپده چه دبه جيران وان مسقوف چاوه‌به وي چه نكه ظان اوما دبلخديده من آف جريده باها نفيسي پاذنا خدى تعالى باش نهو هر پازده روژاده جاركي آزي جريده‌كي بنفيسم. ناف في من كريه ( كردستان ) في جريده‌يده آزي بحنا فنجيا علم ومعرفتا بكم

لكوداري مروف دغله لكودري مدرسه ومكتبين قنج هنه ازي نيشا كردا بكم لكودري چه شر دبه دولتين معظم چه دكن چاوه شر دكن تجارت چاوه دبه ازي حيا حكات بكم حتى نهو كسي جريده‌كي عولي نفيسي‌يه آف جريده‌يا مناها يا عولي‌يه لوما وي گلك كيايي هبين. ازهيفي دكم كيايا جريده‌يي زمنره بنفيسن حي بتشت وكي نو چه دبن ركين باشي رهنكي دچه دكوزه ريده آفه ايدي آزي دست مقصدى بكم. ( ومن الله التوفيق )

حضرت پيغمبر عليه الصلوة والسلام گوتي‌يه «العلماء ورثة الانبياء» انكو علما وارثين انبيانه ژ طرف خدبده مامورن وعظ ونصيحتي بدن خلكي ريا قنج نيشا وان بكن لوما گلي علمايين كردا چاوه اون وعظ ونصيحتا بيژى ددن ول دفي اون مير وآغا وكرمانجين وناسن وان تشويقا طالبنا علم ومعرفتي بكن ريا قنج نيشا وان بكن. هكي اون وي نكن گنهي حميا سطوي‌وه‌يه

ژماره (١)ى ڕۆژنامەى كوردستان

(ئەوەی محەمەد ئەمین بوز ئەرسەلان فۆتۆکۆپی بلأوکردۆتەوە)

بێجگە لەو باسەی محەمەد ئەمین بوز ئەرسەلان، مامۆستا (مالمیسانژ)یش لەلاپەڕە (٨١)ی سەرچاوە/١٠٠دا بەدوورودرێژی باسی (ژین)ی کردووە و پرسیاری کردووە: ئایا ژین لەژمارە (٢٥) بەدواوە (کە دوا ژمارەی فۆتۆکۆپییەکەی محەمەد ئەمین بوز ئەرسەلانە) کە لە(١٩١٩/١٠/٧)دا دەرچووە بووە بەگۆڤار یا هەر لەژمارە (٣٦)ەوە کە لە ١٣٣٦/٦/٢١ی کۆچی کە دەکاتە حوزەیرانی ١٩٢٠ کە هەشت مانگ و نیویان بەین بووە، بووە بەگۆڤار؟ لەسەرچاوە/١٠٠دا (مالمیسانژ) فۆتۆکۆپی ژمارە (٣٦)ی بلأوکردۆتەوە کە لە ٢١ی حوزەیرانی ١٣٣٦دا دەرچووە.

فۆتۆکۆپی ژمارە (٣٦) کە (مالمیسانژ) بلأویکردۆتەوە جیاوازییەکەی لەگەڵ ئەو بیستوپێنج ژمارەیەی محەمەد ئەمین بوز ئەرسەلان بلأویکردۆتەوە ئەوەیە لەمەی ژمارە (٣٦)دا وتراوە: (کورد وحدت و حقوق ملیە سنك... سیاسی، علمی،... هفتەلق غزتە)، ئەدرەسەکەشی وەکو ئەوەی ژمارەکانی پێشوو نییە.

دەربارەی حەمزە بەگی موکس کە محەمەد ئەمین بوز ئەرسەلان ئاماژەی بۆ کردووە کە وتویەتی هەتا ژمارە (٢٠) لێپرسراوی ژین بووە، مالمیسانژ باسی خەبات و تێکۆشانی حەمزە بەگی کردووە کە وەختی خۆی لەساڵی ١٩١٤دا لەماردین خەباتی کردووە و لەسەر ئەوە گیراوە و حوکمی ئیعدامی بەسەردا دراوە و هەموو تاوانەکەشی ئەوە بووە لەناو کۆڕێکدا وتبووی هەموو میللەتانی جیهان بەمافی خۆیان گەیشتون،... ئیتر ئایا بۆچی دەبێ کورد لەو مافەی خۆی بێبەش بکرێت؟!، حەمزە بەگ کە گیراوە لەزیندانندا ئەشکەنجە دراوە و شەهیدکراوە، سادق شەرەفکەندیش لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٧١ باسی گرتن و ئیعدام کردنی حەمزە بەگی کردووە.

بێجگە لەو ڕۆژنامە و گۆڤارانە، لەدوایئەوەی بنەماڵەی بەدرخانیەکان لەژێر فشاری تورکە کەمالیەکاندا ناچارکران وڵات بەجێبێڵن و وەکو لەباسی ژیانی جەلادەت بەدرخاندا باسمانکردووە گۆڤاری (هاوار) و (ڕوناهی) دەرکردووە و هەروەکو (منذر الموصلی) لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٢٥ باسیکردووە (ڕوناهی) بەکرمانجی و بەپیتی لاتینی دەرچووە و هەروەکو پاشکۆیەکی وێنەدار (ملحق مصور) وابووە بۆ گۆڤاری (هاوار). (منذر الموصلی) باسی دەرکردنی (ڕۆژی نوێ)ی کردووە کە لەساڵی ١٩٣٤دا لەلایەن جەلادەت بەدرخانەوە لەبەیروت دەرچووە، بەڵام تەنها ڕێگە بەدەرچوونی یەکەم ژمارەی دراوە و دوایئەوە داخراوە.

# بەشی چوارەم

## ەیمانی سیڤەر

پەیمانی سیڤەر بەیەکێك لەڕووداوە گرنگەکانی مێژووی کورد دەژمێرێت و بۆ یەکەمجار وەکو دوکیومێنتێکی نێودەوڵەتان ناوی میللەتی کورد و باسی مافی کورد و دامەزراندنی حکومەتێکی کوردی لەباکوری کوردستان و ڕێگەدان بەکوردی باشوری کوردستان لەگەڵ ئەو حکومەتەی کورددا یەکبگرێت، بەڵام بەداخەوە هەڵوێستی دەوڵەتان و بەرژەوەندیەکانی هەندێکیان لەلایەك و ئەو ناکۆکی و تێکچونەی کە لەنێوان کوردەکانی باکوردا ڕوویدا بوو بەهۆی ئەوەی کورد نەگات بەو ئامانجە پیرۆزەی و ئەو ئاواتەی لەمنداڵدانی سیڤەردا چەکەرەی کردبوو لەبارچوو لەگۆڕستانی لۆزاندا زیندەبەچاڵکرا.

لەبەر گرنگی ئەم باسە هەوڵئەدەین بەدووروودرێژی لێیبدوێین بۆئەوەی بۆ ئەوەی تازە ڕوونببێتەوە و میللەتەکەی چ هەلێکی ڕەخساوی لەکیس خۆیدابوو، بۆئەوەی لەبەسەرهات و ڕووداوەکانی ئیمڕۆ و دواڕۆژدا دەرس و پەند وەربگرێت. بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم باسە هەوڵئەدەین بیکەین بەم چوار بەشەی خوارەوە:

یەکەم: چالاکی ڕۆشنبیران و سیاسەتمەدارانی کوردی ئەو ڕۆژە و تەقەلای کۆمەڵ و ڕێکخراوەکان بەر لەپەیمانی سیڤەر و لەکاتی کۆبونەوەکانی سیڤەردا.

دوهەم: ئەو مادانەی لەم پەیمانەدا پەیوەندیان بەکورد و بەمافی کوردەوە هەبووە.

سێهەم: هەڵوێستی حکومەتی بەریتانیا و هۆی سەرگەرمی کاربەدەستانی ئینگلیز لەمۆرکردنی ئەو پەیمانەدا لەسەرەتادا و ساردبوونەوە و پاشگەزبوونیان لەپشتگیریکردن بۆ سەرگرتنی پەیمانەکە لەئەنجامدا.

## باسی یەکەم

## چالاکی ڕۆشنبیرانی کورد

ڕۆشنبیران و سیاسەتمەدارانی کورد تاڕادەیەک هەتا ئەوکاتەی لەناوخۆیاندا تێکنەچووبوون و نەبووبوون بەدوو بەشەوە لەچالاکیدا بوون و لەباسەکانی داهاتوودا چالاکی هەندێکیان ڕووندەبێتەوە، لەژووررووی هەموانەوە شەریف پاشای خەندان کە کۆمەڵ و ڕێکخراوەکان لەسەرەتادا بڕیاری ئەوەیاندابوو شەریف پاشا وەکو نوێنەری میللەتی کورد لەکاتی گفتوگۆکردنی پەیمانی سیڤەردا کاربکات. گەلێك سەرچاوە باسی ڕۆڵی شەریف پاشایان کردووە لەچەسپاندنی ئەو مادانەی لەپەیمانی سیڤەردا بۆ کورد تەرخانکرابوو.

وێنەی شەریف پاشا بەپێی کتێبەکەی روهات ئالاکوم

میر بەسری لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٢ (اعلام الكرد) وتویەتی شەریف پاشا کوڕی سەعید پاشای کوڕی حسێن پاشای کوڕی ئەحمەد ئاغای خەندان کە خەڵکی سلێمانی بووە، حسێن پاشای باوکی سەعید پاشا لەزەمانی بابانەکاندا

نائیبی (جێگری) ئەحمەد پاشای دوامیری بابان بووە لەدوای ڕووخانی ئەمارەتی بابان حسێن پاشا چۆتە ئەستەمبوڵ و سەعید پاشای کوڕی لەگەڵ خۆیدا بردووە و سەعید پاشا لەوێ خوێندویەتی و بووە بەئەفسەر و ماوەیەك وەزیری دەرەوەی دەوڵـەتی عوسمـانی بـووە و لەگـەلێك كاروبـاری تـردا كـاریکردووە تـا لەسـاڵی (١٩٠٧)دا کۆچی دوایی کردووە.

بەپێی کتێبەکەی میر بەسری، شەریف پاشا لەساڵی (١٨٦٥)دا لەئەستەمبوڵ لـەدایکبووە، (لەسەرچـاوە/٧٨دا روهـات ئـالاکوم وتویـەتی لەسـاڵی ١٨٥٦دا لەدایکبووە کە لاموایە ئەمەیان هەڵەی چاپەمەنی بووبێت). میر بەسری وتویەتی شـەریف پاشـا لەسـاڵی ١٨٩٠دا (ئـەمیرە ئەمینـە)ی کچـی محەمـەد عەبدولحـەلیم پاشای کوڕی محەمـەد عـەلی پاشـای میسـری مـارەکردووە (ئەمیرە ئەمینـە لەسـاڵی ١٨٢٦دا مردووە) و لەنێوان ساڵانی (١٨٩٨-١٩٠٩) وەزیری مفەوەزی حکومـەتی عوسمانی بووە لەستۆکهۆڵم.

(کریس کۆچـرا) لەکتێبەکەیـدا سەرچاوە/٤١ وتویـەتی شـەریف پاشا لەسـاڵی ١٨٩٠دا کـراوە بەباڵیۆز، روهـات ئالاکوم لەسەرچاوە/٧٨دا (کـە ئـەو کتێبـەی بۆ ژیـانی شـەریف پاشـا تـەرخانکردووە) بەدووروودرێـژی باسـی شـەریف پاشـای کـردووە و دەربـارەی ئـەو ماوەیـەی لەسـتۆکهۆڵمدا بـووە وتویـەتی: ((لەشـارانی ئۆپسالا و ستۆکهۆڵم سەرم لەگەلێك کتێبخانە و ئەرشیفی مۆزەخانە داوە و گەلێك بابـەت کـە دەربـارەی شـەریف پاشا نوسـرابێت یـا ئەوانـەی خـۆی نووسـیونی زۆر بەباشی و بەوریاییەوە لەو دەزگایانەدا پارێزراون)).

ئـەو خـانووەی شـەریف پاشـا تیایـدا ژیـابوو لەسـتۆکهۆڵم لەسـەر شـەقامی (Kommendor/ ژمـارە ٣٢) هێشـتا هـەرماوە و دوایئـەوە چـۆتە خانوویـەکی تـر کـە ژمارەکـەی (٣٥) بـووە لەهـەمان شـەقامدا، ئەمەشـیان هێشـتا هـەرماوە (روهـات ئالاکوم لەو کتێبەیدا گەلێك وێنەی شـەریف پاشای لەکتێبەکەیـدا بڵاوکردۆتـەوە)، شـەریف پاشـا زمـانی فەرەنسـی زۆر بـاش زانیـوە بۆیـە نوسـینەکانی بـەم زمانـە نوسیوە و لەسوید گـەلێك خـەڵاتی وەرگرتووە، یـەکێك لەوانـە ئـەو خەڵاتـە بـووە لەڕۆژی ١٨٩٩/٩/١٢دا کە بریتی بووە لەشمشێرێك لەپاشای سوید کە (ئۆسکاری دوهەم) بووە وەریگرتووە و ئەمینە خانمی ژنی شـەریف پاشا سەرۆکی کۆمەڵەی پێشـکەوتنی ژنـانی کـورد (قادینلـەر-ئـافرەت) بـووە، (لەباسـی دوهـەمی بەشـی سێهەمدا-کۆمەڵ و ڕێکخراوەکان-باسی ئەو کۆمەڵە کراوە).

ئەوەی شایانی باسە لەبەشی شازدەهەمی بەرگی یەکەمدا لەباسی ژۆن تورك و اتحـاد و تەرەقیـدا ئاماژەیـان بـۆ هەڵوێسـتی تـاقمی (اتحـاد و ترقـی) کردبـوو بـۆ شـکاندن و زڕانـدنی نامـەی شـەریف پاشـا کـە گەیشـتبووە ئەسـتەمبوڵ کـە لەئەنجامـدا لەسـاڵی ١٩٠٩دا کـە بـوون بەدەسـەڵاتدار توانیبوویـان شـەریف پاشـا لەکارەکـەی لابـەن لەسـتۆکهۆڵم و (روهـات ئـالاکوم) لەکتێبەکەیـدا بەدووورودرێـژی باسـی ئـەوەی کـردووە کـە ئێمـەش لـەو بەرگـەدا کورتەیـەکی باسـەکەی (روهـات ئالاکوم)مان بلاوکردەوە لێرەدا پێویست ناکات دوبارەی بکەینەوە.

لەدواییـدا هـەروەکو سەرچـاوە/٧٨ باسـیکردووە کـە شـەریف پاشـا دوای تـەواوبوونی کارەکـەی دەیـەوێ بچـێت بـۆ میسـر بـۆ سەرپەرشـتیکردنی ئـەو زەوی‌وزارانـەی لـەباوکی خێزانەکەیەوە بۆی مابووەوە، لەڕێگایـدا ساتێك دەگاتـە پـاریس بـیری خـۆی دەگۆڕێـت و لـەوێ دەمێنێتـەوە و دەسـتدەکات بەخـەبات و تێکۆشـان دژی (اتحـاد و ترقـی) و لـەپاریس ڕۆژنامەیـەك دەردەهێنێـت بـەناوی (مشـروتیە) و ڕێکخراوێکـی سیاسـیش دادەمـەزرێنێت (ئەمـەی روهـات ئـالاکوم دەربـارەی ئـەو ڕۆژنامـە و ڕێکخـراوەی شـەریف پاشـا هـیچ سەرچـاوەیەکی تـر باسینەکردون، کاشکی روهات ئالاکوم باسی ئەو سەرچاوەیەی بکردایە کە لـەوە دواوە وە یـــا فۆتۆکۆپیـــەکی ئـــەو ڕۆژنامەیـــەی بلاوبکردایەتـــەوە ئەگـــەر دەستیکەوتبێت.

هەروەکو روهات ئالاکوم باسیکردووە تاقمی (اتحاد و ترقی) لـەماوەی ساڵانی (١٩٠٩-١٩١٤)دا هـەوڵێکی زۆریـان دابـوو بـۆ لـەناوبردنی شـەریف پاشـا و (عـەلی جـەواد)یـان نـاردبوو بـۆ کوشـتنی، کـە سـاتێك لـەپاریس بـووە و لەکاتێکـدا لەئوتومبێلەکەیـدا دەبـێ لەگـەڵ سـاڵح بـەگی زاوایـدا و لەگـەڵ ئیسـماعیل حـەقی پیاویـدا ئـەو عـەلی جـەوادە پـەلاماری شـەریف پاشـا دەدات و شـوفێرەکەی کـە فەرەنسی دەبێت بریندار دەکات بەڵام ساڵح بەگی زاوای دێتەدەست و عەلی جەواد دەکوژێت.

دەربـارەی ئـەو عـەلی جـەوادەی روهـات ئـالاکوم باسیکردووە، دکتـۆر ئاریـان ئـەوزاد بـەکر لـەگۆڤاری (سـەنتەری لێکۆڵینـەوەی سـتراتیژی ژمـارە (١٨)ی ڕۆژی ١٩٩٧/٥/٢٠ لەلاپـەڕە (٤٨)دا وتویـەتی ئـەوەی ناردبوویـان بـۆ کوشـتنی شـەریف پاشا لەپاریس ئەفسەرێکی سوارە بووە لەسوپای تورکدا بەناوی (کەمال) ناوەوە کە ساڵح بەگ توانیبووی بیکوژێت. دەربـارەی شـەریف پاشا لـەپاریس، روهـات

ئالاكوم ئاماژەی بۆ ڕۆژنامەی (Svenska Dag Bladet) کردووە کە لەساڵی ١٩١٩دا وتارێکی دەربارەی شەریف پاشا بڵاوکردۆتەوە و لەو وتارەی ئەو ڕۆژەدا وتراوە ئێستا شەریف پاشا لەپاریس دەژی و نوێنەری نەتەوەی کوردە و بەناوی میللەتی کوردەوە لەوتووێژەکانی پاریسدا بەشداریکردووە.

دیارە تورکەکان بەوە وازیان نەهێنابوو بەڵکو هەوڵێکی زۆریاندابوو ناوی شەریف پاشا بزڕێنن و هەندێ تەلگرافی پڕ لەدرۆودەلەسەیان بەناوی چەند کەسێکەوە لەشارەکانی کوردستانەوە ناردبوو بۆ گەلێك شوێن دژی شەریف پاشا کە یەکێك لەو تەلگرافانە نێردرابوو بۆ باڵیۆزخانەی سوید لەئەستەمبوڵ، بەلام لەدواییدا هەروەکو سەرچاوە ( Riks Arkivet Konsultsrapport,Fram Konstantino ١٩١٢-١٩٨٥) باسیکردووە و ڕوهات ئالاکوم ئاماژەی بۆ کردووە، دەرکەوتووە ئەو هەموو تەلگرافانە هەمووی لەلایەن کاربەدەستانی تورکەوە بۆ سوکایەتی کردن و ناوزڕاندنی شەریف پاشا بووە.

بێجگە لەو هەوڵدانەی بۆ کوشتنی شەریف پاشا سەرینەگرتبوو، وە ئەو تەلگرافە پڕ لەدرۆودەلەسانەی کە بەپێی ئەو سەرچاوەیە هەمووی بەدرۆخرابووەوە، تورکەکان هەوڵێکی تریان دژی شەریف پاشا دا و بەوە تاوانباریانکرد کە شەریف پاشا دەستی هەبووە لەپیلانی کوشتنی (مەحمود پاشا شەوکەت)ی (صدری أعظم) و بڕیاری لەسێدارەدانی شەریف پاشا لەلایەن تورکەکانەوە دەرچوو ئیتر لەوساوە نەیتوانیبوو بگەڕێتەوە بۆ تورکیا. لەپێشەکی کتێبەکەی سریا بەدرخاندا سەرچاوە/٧٩ لەو پێشەکیەی کە بەپێنوسی (Perlinde) نوسراوە، باسی پەیوەندی نێوان شەریف پاشا و سریا بەدرخان کراوە لەساڵی (١٩٢٧)دا کە لەوەدا باسی چالاکیەکانی شەریف پاشای کردووە لەدانانی ناوەڕۆکی پەیمانی سیڤەردا.

دەربارەی کۆچی دوایی شەریف پاشا، (میر بەسری) لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٢ بەهەڵە وتویەتی شەریف پاشا لەساڵی ١٩٤٤دا کۆچی دوایی کردووە و دکتۆر فوئاد حەمەخورشیدیش لەگۆڤاری ڕەنگینی ژمارە (٨٩)ی ساڵی ١٩٩٦ لەلاپەڕە (٦٠)یدا وتویەتی شەریف پاشا لەساڵی ١٩٤٤دا کۆچی دوایی کردووە و ڕوهات ئالاکومیش لەگۆڤاری مامۆستای کوردی ژمارە (٨٩) ساڵی ١٩٩٦ لەلاپەڕە (٦٠)یدا کە لەستۆکهۆڵم دەرچووە ئەویش هەروەکو میر بەسری و دکتۆر فوئاد حەمەخورشید وتویەتی شەریف پاشا لەساڵی ١٩٤٤دا کۆچی دوایی کردووە و

دکتۆر ئاریان نەوزاد بەکریش لەو سەرچاوەیەی بەرلەمە باسمانکردووە هەر وتویەتی شەریف پاشا ساڵی ١٩٤٤ کۆچی دوایی کردووە، بەڵام لەڕاستیدا شەریف پاشا لەساڵی ١٩٥١دا کۆچی دوایی کردووە، بەڵگەشم بۆ ئەمە بریتییە لەو دوکیومێنتەی ئەرشیفی بەریتانیا ژمارەی دوکیومێنت (-Fo.٣٧١-٩١٢٥٢ ١٣٢٩٦٩) کە لەگۆڤاری (گزینگ)ی ژمارە (١٠)ی ساڵی ١٩٩٦دا لەسوید بڵاوکراوەتەوە کە لەو دوکیومێنتەدا باسی یاداشتێکی تیادایە کە لەساڵی ١٩٤٧ لەلایەن چەند کوردێکەوە مۆرکراوە کە لەو مۆرکردنەدا شەریف پاشا یەکێك بووە لەوانە لەساڵی ١٩٤٧دا درابوو بەکۆبوونەوەی شورای وەزیرانی دەرەوەی وڵاتان و لەهەمان دوکیومێنتدا وتراوە هەمان ئەو کەسانە لەساڵی ١٩٤٨دا یاداشتێکی تریان داوە بە(امم متحدە-یونایتید نەیشن) و دوبارە هەر ئەو تاقمە لە ١٣ی سیپتەمبەری ساڵی ١٩٥٠دا نامەیەکی تریان ناردووە بۆ (یونایتید نەیشن) لەوەدا بێزاری خۆیان دەربڕیوە بەرامبەر دەستدرێژیکردنی حکومەتی ئێران بۆ سەر (جوانڕۆ)ییەکان.

لەڕۆژنامەی (تایمس)ی ڕۆژی ١٩٥٠/١/٧دا گفتوگۆیەکی تیادا بڵاوکراوەتەوە کە لەگەڵ کامەران بەدرخاندا کرابوو، لەوەدا وتراوە: شەریف پاشای خەندان کە لەساڵی ١٩٤٨دا سەرۆکی وەفدی کوردی بووە، چۆتە لای نەتەوە یەککگرتووەکان بۆ باسی کێشەی کورد کە ئەم باسە لەلایەن کامەران بەدرخانەوە بڵاوکراوەتەوە لەژێر ناوی: (Bulletin Mensuel du Centre Be Etudes Kurds) کە لەپاریس چاپکراوە لەژێر زنجیرەی دەهەمدا کە دیارە بریتی بووە لەزنجیرە بڵاوکراوەکانی کامەران بەدرخان و دکتۆر فوئاد حەمەخورشیدیش لەگۆڤاری (ڕەنگین)ی ژمارە (٨٩)ی ساڵی ١٩٩٦دا باسی هەمان دوکیومێنت و هەمان گفتوگۆی کامەران بەدرخانی کردووە.

کریس کۆچرا لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٤١ لەباسی شەریف پاشادا وتویەتی ئینگلیزەکان شەریف پاشایان خۆشنەدەویست، کریس کۆچرا نەیوتوە هۆی ئەمە چیبووە بەڵام دکتۆر فوئاد حەمەخورشید وتویەتی: ((سەیر ئەوەیە هەردوو دەوڵەتە دەسەڵاتدارەکەی ئەو ڕۆژانە (کە مەبەستی بەریتانیا و فەرەنسا) بووە بیروبۆچوونیان بەرامبەر شەریف پاشای نوێنەری کورد بەمجۆرە بووە: ئینگلیزەکان شەریف پاشایان بەپیاوێکی (فرانکوفیلی-واتە سەر بەفەرەنسا) لەقەڵەم ئەدا (واتە سەر بەفەرەنسیەکان بووە)، کەچی فەرەنسیەکانیش

بەپێچەوانەی ئەمە شەریف پاشایان بەلایەنگری سیاسەتی بەریتانیا دەژمارد و وایان دانابوو کە شەریف پاشا پشتگیری بەرژەوەندیەکانی بەریتانیا دەکات لەناوچەکەدا، بۆیە هەردوو دەوڵەتەکە هەڵوێستێکی ئاشکرا و ڕاستەقینەیان بەرامبەر بەکورد نەبوو، کە لەگێڕاوی ئەم ڕووداوانەدا شەریف پاشا ڕۆژی ١٩٢٠/٤/٢٧ دەستی لەنوێنەرایەتی کورد هەڵگرت، واتە بەر لەمۆرکردنی پەیمانی سیڤەر بەمانگ‌ونیوێك)).

لاموایە دەستهەڵگرتنی شەریف پاشا لەنوێنەرایەتی کورد تەنها لەبەر ئەو دوو هەڵوێستە جیاوازەی ئینگلیز و فەرەنسا نەبووە، بەڵکو هەروەکو لەدواییدا ڕووندەبێتەوە کێشەی نێوان تاقمەکەی شێخ عەبدولقادر و بەرخانیەکان و ئەو ناڕەزاییەی بەرامبەر شەریف پاشا دەربڕابوو لەپەیوەندیکردن بەئەرمەنیەکانەوە بەسەرۆکایەتی (بوغوص نوبار پاشا) هۆی سەرەکی بووە بۆ دەستهەڵگرتنی شەریف پاشا، دوایئەوەی بۆی دەرکەوتبوو هەردوولایان لەگەڵ بۆچوونەکەیدا نەبوون.

دەربارەی ئەو بۆچوونەی دکتۆر فوئاد حەمەخورشید وتویەتی ئینگلیزەکان شەریف پاشایان بە(فرانکوفیلی) دەزانی، بێگومان شەریف پاشا کە ماوەیەك لەپاریسدا مابووەوە کە لەساڵی ١٩٠٩دا لەستۆکهۆڵمەوە بۆی چووبوو، لەوێ هەرچۆنێك بووبێت ئاشنایەتی لەگەڵ فەرەنسیەکاندا پەیداکردووە و لەدوای تەواوبوونی شەڕی جیهانی بەئاشکرا کێشەیەکی قورس هەبووە لەنێوان فەرەنسیەکان و ئینگلیزەکاندا لەسەر چۆنیەتی دابەشکردنی بەشەمیراتی عوسمانی بەپێی پەیمانی (سایکس پیکۆ)، بۆیە ئینگلیزەکان لەوە ترسابوون بەهۆی شەریف پاشاوە پەیوەندی کورد و فەرەنسا پەرەبسێنێت و فەرەنسیەکان هەوڵبدەن دەسەلأتیان بەهێزبکەن لەکوردستاندا و بەڵگەشم بۆ ئەمە ئەوەیە ئینگلیزەکان بلأویاندەکردەوە شەریف پاشا بەنوێنەری کورد ناژمێردرێت چونکە ماوەیەکی زۆرە لەکوردستان دوورکەوتۆتەوە و پەیوەندی بەکوردەکانەوە نیيە و لەو ڕووەوە (ویلسن)ی حاکمی گشتی بەریتانیا لەکێبەکەیدا (Mesopotamia ١٩١٧- ١٩٢٠ چاپی لەندەن/١٩٣٠ وتویەتی شەریف پاشا ماوەیەکی زۆرە لەکوردستان دوورکەوتۆتەوە بۆیە بەنوێنەری کورد نازانرێت.

دەربارەی ئەم بۆچوونەی (ویلسن) بەرامبەر بەشەریف پاشا گەلێك بەڵگە هەیە کە بۆچوونەکەی بێبناغە بووە:

١–ویلسن لەگەڵ ئەوەشدا وتویەتی شەریف پاشا بەنوێنەری کورد نازانرێت، هەرخۆی لەهەمان کتێبیدا وتویەتی: (پێشنیازەکانی شەریف پاشا لەلایەن کوردەکانەوە پەسەند دەکرا، ئەگەر شەریف پاشا پەیوەندی بەکوردەوە نەبووبێت چۆن پێشنیازەکانی پەسەند دەکرا.

٢–لەدوکیومێنتی ژمارە (Fo.٣٧١-٥٠٦٦)ی ساڵی ١٩٢٠ لەلاپەڕە (١٦٧)دا باسی پەیوەندی شەریف پاشای کردووە بەپارتی لاوانی کورد لەئەورووپا و لەئەستەمبوڵ کە نوێنەرەکەیان لەسویسرا بووە و لەو دوکیومێنتەدا وتراوە شەریف پاشا لەگەڵ ئەو نوێنەرەدا کۆبۆتەوە بۆ گفتوگۆکردن دەربارەی کورد.

٣–لەبەرگی دوهەمی کتێبەکەی شێخ مەحموددا سەرچاوە/٨٠ لەلاپەڕە (١٠)دا باسێکی دوورودرێژم دەربارەی شەریف پاشا بڵاوکردۆتەوە و باسی پەیوەندی شەریف پاشا و کوردەکانی باشوری تیادا کراوە کە چۆن شێخ مەحمود مەزبەتەی بەرۆشنبیران و دەسەڵاتدارانی ئەو ڕۆژە کردۆتەوە و بەپێی ئەو مەزبەتەیە شەریف پاشای خەندان کرابوو بەنوێنەر و وەکیلی کورد و مافی ئەوەی پێدرابوو بتوانێت بەناوی کوردەوە لەکۆنگرەی ئاشتی و پەیمانی سیڤەردا داوای مافی کورد بکات کە ژمارەیەکی زۆر لەسەرکردەکانی کوردی ئێرانیش ئەو مەزبەتەیان مۆرکردبوو، شێخ مەحمود مەزبەتەکەی بەدوو نوێنەری خۆیدا ناردبوو بۆ شەریف پاشا و هەروەکو مامۆستا ڕەفیق حیلمی باسیکردووە سازکردنی مەزبەتەکە لەماڵی شێخ مەحموددا ئامادەکرابوو، جگە لەوانەی مۆریانکردبوو، لەکۆبونەوەکەدا (مێجەر نویل)ی نوێنەری حکومەتی بەریتانیا لەشاری سلێمانی و ئینگلیزێکی تر (ڕەفیق حیلمی لەیاداشتەکەیدا وتویەتی ناوەکەیم لەبیرنەماوە).

هەموو ئامادەبوون و ساتێك ئەو نوێنەرانە مەزبەتەکەی شێخ مەحمودیان برد بۆ شەریف پاشا، بەڕاسپاردەی ئینگلیزەکان کاربەدەستانی فەرەنسا لەحەڵەب هەردوو نوێنەرەکەیان گرت کە بریتی بوون لەڕەشید کابان و سەید ئەحمەدی بەرزنجی (لەمەوە سەید ئەحمەد بەمەرەخەس ناسراوە) و دران بەکاربەدەستانی ئینگلیز لەبەغدا بەخۆیان و مەزبەتەکانەوە و کاربەدەستانی ئینگلیز بەوەش نەوەستان بەڵکو کۆپیەکی ئەو مەزبەتەیەیان ناردبوو بۆ حکومەتی ئێران بۆئەوەی سزای ئەو کوردانەی ئێرانیش بدرێت کە مەزبەتەکەیان مۆرکردبوو، چونکە داوایانکردبوو کوردستانی ئێران بلکێنرێت بەباشوری کوردستانەوە و حکومەتی ئێران سزای ژمارەیەکی زۆری ئەو کوردانەیدا وەکو لەسەرچاوە/٨٠دا باسکراوە.

٤-دەربارەی چالاکی شەریف پاشا، (مس بیل) لەکتێبەکەیدا وەرگێڕانی جعفر الخیاط، چاپی بەیروت، ساڵی ١٩٧١ وتویەتی: ((شەریف پاشا لەشاری مارسیلیا لەفەرەنسا لەساڵی ١٩١٨دا (ویلسن)ی حاکمی گشتی بەریتانیا لەعێراق دیبوو (هەمان ویلسن کە فەرموویەتی شەریف پاشا پەیوەندی بەکوردەوە نەبووە)، هەوڵێکی زۆری لەگەڵ دابوو ڕازیبکات کارێکی وا بکرێت ئۆتۆنۆمی بدرێت بەکورد و شەریف پاشا خزمەتێکی گەورەی ئێمەی کرد (مەبەست بەریتانیایە) بەوەی هەوڵێکی زۆری دابوو کوردەکانی باشوری کوردستان لەتورکەکان بپچڕێنرێت و بەلای ئێمەدا دایانشکێنێت، بەڵام ئەوسا ئێمە پەیوەندیمان بەکوردەوە نەبوو، بۆیە نەمانتوانی داخوازیەکانی شەریف پاشا پەسەندبکەین)).

پرۆفیسۆر حەسرەتیان لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٤٩ لەباسی شەریف پاشا وتویەتی: لەگەڵ ئەوەی شەریف پاشا لەکۆنگرەی (ڤارسای)دا نوێنەری حکومەتی تورك بوو (مەبەست لەخەلافەتی پاشماوەی عوسمانی‌یە لەئەستەمبوڵ) بەڵام وازی لەوەهێنا و دەستیکرد بەپەیوەندی و وتووێژکردن لەگەڵ وەزیری دەرەوەی ئێراندا بەهیوای ئەوەی ببێت بەلایەنگری دروستبوونی حکومەتێکی سەربەخۆی کورد. یەکێك لەچالاکیە گرنگەکانی شەریف پاشا ئەو دوو یاداشتە بووە کە بەئینگلیزی و بەفەرەنسی دابووی یەکەم لە ٢٢ی ئازاری ساڵی ١٩١٩دا بەکۆنگرەی ئاشتی و دووهەمیان لە ١٠ی مارتی ساڵی ١٩٢٠دا بەئەنجومەنی باڵای کۆنگرە کە مامۆستا ڕەفیق حیلمی لەیاداشتەکانیدا باسی یاداشتەکەی کە بەفەرەنسی نوسرابوو کردووە لەژێر ناوی (Memorendon sur Les Revendiction due People Kurd) و دکتۆر فوئاد حەمەخورشید لەسەرچاوە/١٩دا باسی هەردوو یاداشتەکەی کردووە و ئەو یاداشتە فەرەنسیەی کە دکتۆر فوئاد باسیکردووە لەفەرەنسیەوە کراوە بەعەرەبی و لەگۆڤاری (کاروان)ی ژمارە (١)ی ساڵی ١٩٩٣دا بڵاوکراوەتەوە و هەمان یاداشتە فەرەنسیەکە لەگۆڤاری (ڕابوون)ی ژمارە (٢)ی ساڵی ١٩٩١ کە لەستۆکهۆڵم دەرچووە کراوە بەکوردی.

دکتۆر فوئاد حەمەخورشید لەهەمان باسیدا باسی ئەوەی کردووە لەکاتی بەستنی کۆنگرەی ئاشتیدا لەپاریس (١٩١٩-١٩٢٠)، جەمعیەتەکانی کوردی ئەو ڕۆژانە وەکو (جمعیتی تشکیلاتی اجتماعیە) و (جمعیتی استقلالی کوردستان) لەکۆبونەوەیەکیاندا شەریف پاشایان هەڵبژارد بەنوێنەری کورد لەکۆنگرەی ئاشتیدا.

دەربارەی ئەو ڕێکەوتنەی لەنێوان شەریف پاشا و بوغوص نوبار پاشادا مۆرکرابوو، دکتۆر فوئاد لەباسەکەیدا وتویەتی: ((شەریف پاشا بۆ ڕەزامەندی گشتی دەوڵەتە هاوپەیمانەکان لە(١٩١٩/١٢/٢٠)دا و لەپێناوی کردنەوەی لاپەڕەیەکی مێژوویی تازە لەگەڵ ئەرمەنیەکاندا (کە کورد بەوە تاوانبارکرابوو بەشداربووبوو لەو کوشتارانەی عوسمانیەکان لەئەرمەنیەکانیان کردبوو) لەگەڵ بوغوص نوبار پاشای ئەرمەنیدا لەکۆنگرەی ئاشتیدا ڕێکەوتننامەیەکیان مۆرکرد و ئەوە بوو بەهۆی پەیدابوونی کێشەیەکی گەورە، کە ئەو کێشەیە لەوەوە پەیدابووبوو، ئەو ڕێکەوتنە بوو بەهۆی ئەوەی لەپەیمانی سیڤەردا گەلێك لەناوچە کوردنشینەکان خرابوونە ناو چوارچێوەی ئەو دەوڵەتەی بۆ ئەرمەنیەکان دەستنیشانکرابوو)).

بەپێی باسەکەی دکتۆر فوئاد حەمەخورشید تورکەکان ئەو ڕێکەوتنەیان قۆستەوە و بەهەلیان زانی و بۆ تێکدانی کورد لەناو خۆیدا لەلایەك و بۆ سەرنەگرتنی پەیمانی سیڤەر لەلایەکەوە، لەدوو ڕۆژنامەدا دەستیانکرد بەپروپاگەندە یەکەمیان لەڕۆژنامەی (پەیامی صباح) بوو لەڕۆژی ١٩٢٠/٣/٢٤دا کە لەئەستەمبوڵ دەردەچوو. دوهەم ڕۆژنامەی (LeTemps کات) لەڕۆژی ١٩٢٠/٣/١٠دا کە لەپاریس دەردەچوو.

بەرامبەر بەو پروپاگەندانەی تورك، هەروەکو دکتۆر فوئاد باسیکردووە، شەریف پاشا لە ١٩١٩/٣/٢٢دا یەعنی بەر لەساڵێك لەبڵاوکردنەوەی ئەوەی (پەیامی صباح) و ئەوەی (کات)، یاداشتێکی ناردبوو بۆ بەرهەڵستیکردنی ئەو شوێنە کوردنشینانەی خرابوونە ناو چوارچێوەی ئەو حکومەتەی نیازبوو بۆ ئەرمینیا پێکبێت و پاشئەوەی تەقەلاکانی بۆ ئەو مەبەستە سەرینەگرتبوو لەڕۆژی ١٩٢٠/٤/٢٧دا بەنامەیەك وازهێنانی خۆی ڕاگەیاندبوو لەنوێنەرایەتی کورد و بەوازهێنانی شەریف پاشا لەنوێنەرایەتی کورد لەکۆنگرەی پاریس شانۆی نێودەوڵەتی لەنوێنەری کورد بێبەش بوو.

لەڕاستیدا دەربارەی هەڵوێستی شەریف پاشای خەندان لەچۆنیەتی مۆرکردنی ئەو پەیمانەی لەگەڵ بوغوص نوبار پاشادا کە بوو بەهۆی تێکچوونی کورد لەناو خۆیدا لەلایەکەوە و پروپاگەندەی تورك بۆ بەکارهێنانی ئەو ڕێکەوتنە بۆ سوودی خۆی، دکتۆر فوئاد حەمەخورشید لەژمارە (٨٩)ی گۆڤاری (ڕەنگین)ی ساڵی ١٩٩١دا بۆ ڕوونکردنەوەی هەڵوێستی شەریف پاشا وتویەتی: ((ئەو یاداشتەی لە

١٩١٩/٣/٢٢دا بەزمانی ئینگلیزی دابووی بەکۆنگرەی ئاشتی، لەوەدا وتبووی هەموو شتێك لایەن بەکوردە کە دەوڵەتێکی سەربەخۆی خۆی هەبێت و بەتوندیش ناڕەزاییمان سەبارەت بەداواکانی ئەرمەنی لەکوردستاندا دەردەبڕین و بەپێی ئەو نەخشەیەی لەگەڵ ئەم یاداشتەدایە دەبێ ناوچەکان هەروەکو خۆیان بمێننەوە لەکاتی دیاریکردنی سنووری وڵاتی کورددا)).

وادیارە لازاریف وەکو ئەرمەنیەك لەگەڵ ئەوەشدا هەمیشە لەباسەکانیدا لایەنگری مافی کورد بووە بەڵام لەشێوەی ناوەڕۆکی ئەو نامەیەی شەریف پاشا بێزاربووە، هەروەکو دکتۆر ئاریان نەوزاد بەکر لەلاپەڕە (٥١)ی گۆڤاری سەنتەردا کە بەر لەمە باسمانکردووە لەوەدا ئاماژەی بۆ باسێکی لازاریف کردووە کە وتویەتی: ((دژایەتیکردنی ئەرمەنی لەو یاداشتەدا نیشانەی کرچوکاڵی بۆچوونی سیاسەتی شەریف پاشای پێوە دیارە کە کابرایەکی کەم ئەزموون بووە چونکە زۆربەی بەشداربووانی کۆنگرە هەوڵیانئەدا لەگەمەی دبلۆماسیدا دەربارەی تورکیا کەڵك لەکارتی ئەرمەن وەربگرن نەك هی کورد)).

لەگەڵ ئەوەشدا ئەو ڕێکەوتنەی نێوان شەریف پاشا و بوغوص نوبار پاشای ئەرمەنی کە ئەو هەموو هەرا و کێشەیەی لێ‌پەیدابوو، لەلاپەڕە (٢٣٧-٢٣٨)ی سەرچاوە/٧٠دا کتێبی کورد و عەجەم باسی ناوەڕۆکی ئەو پەیمانەی کردووە کە باسی هیچ جۆرە ڕێکەوتنێکی وای تیادا باسنەکراوە کە دانی بەوەدا نابێت بەشێکی زۆری ناوچە کوردنشینەکان بخرێنە ناو چوارچێوەی دەوڵەتە ئەرمەنیەکەی بەتەمای پێکهاتنی بوون و بەپێی سەرچاوە/٧٠ ئەو ڕێکەوتنەی لە٢٠ی تشرینی دوەمی ساڵی ١٩١٩دا مۆرکرابوو بریتی بووە لە: ((ئێمە کە لەخوارەوە مۆرمانکردووە و نوێنەرانی گەلی کورد و ئەرمەنین، شەرەفی ئەوەمان پێبڕاوە کە کۆنفرانسی ئاشتی ئاگادار بکەین کە داوای ئەوەی لێدەکەین بڕیاری دامەزراندنی حکومەتی ئەرمینیای یەکگرتووی سەربەخۆ و کوردستانی سەربەخۆ بدات بەیارمەتی دەوڵەتە گەورەکان)).

لێرەدا تەنها هەرئەوە باسکراوە بەڵام ئاخۆ جگە لەم ڕێکەوتنە، ڕێکەوتنی تریش مۆرکرابوو لەنێوان شەریف پاشا و بوغوص نوبار پاشادا کە شایانی پەیدابوونی ئەو کێشەیە بووبێت، بەداخەوە سەرچاوەکان باسی ئەوەیان نەکردووە.

هەروەها دکتۆر فوئاد دەربارەی یاداشتی دوهەمی شەریف پاشا کە ئازاری ١٩٢٠دا ناردبووی لەوەدا بەزمانی فەرەنسی وتویەتی: ((ئەم نیشتمانە نابیٚ بۆئەوەی لەئیمپراتۆریەتی عوسمانی جیابکریٚتەوە بۆئەوەی بخریٚتە ژیٚر دەسەلاٚتی غەیری کوردەوە (کە مەبەستی ئەرمەنی بووە)، بۆیە داوا لەکۆنگرە دەکەین لیژنەیەکی نیٚودەولٚەتی پیٚکبیٚنیٚت بۆ دیاریکردنی سنوور و بەپیٚی پەیوەندیە نەتەوەییەکان دەستنیشان بکریٚت بەمەرجیٚك هەموو ئەو ناوچانەی زۆربەی دانیشتوانی کوردن بگەریٚتەوە بۆ کوردستان)).

دکتۆر فوئاد دەلٚیٚت: ((ئەوەی شایانی باسە جەنرالٚ شەریف پاشا ئەو دوو یاداشتەی لەدوای مۆرکردنی ریٚکەوتنەکەی خۆی و بوغوص نوبار پاشا پیٚشکەش کردبوو کە ئەمە نیشانەی پەسەند نەکردنی ئەو مەرجانەیە کە لەریٚکەوتننامەکەدا هاتووە بۆیە سەرنجی دەولٚەتانی راکیٚشابوو)). لەم روونکردنەوەیەی دکتۆر فوئاددا چەند سەرنجیٚك دیٚتە پیٚشەوە:

یەکەم: بەداخەوە هیچ سەرچاوەیەك ناوەرۆکی ئەو ریٚکەوتننامەیەی نیٚوان شەریف پاشا و بوغوص نوبار پاشای باسنەکردووە تا بزانریٚت لەسەر چی ریٚککەوتبوون، ئایا شەریف پاشا لەوەدا دانی بەوەدا ناوە ئەو ناوچە کوردنشینانەی لەپەیمانی سیڤەردا لەجیاتی ئەوەی بخریٚنە ناو چوارچیٚوەی کوردستانەوە بریاری لەسەر درابوو بخریٚتە ناو چوارچیٚوەی سنووری ئەرمەنیەوە یا تەنها لەسەرئەوە ریٚککەوتبوون کە کورد و ئەرمەنی هەردوولایان پیٚکەوە هاوکاری بکەن بۆ مسۆگەرکردنی مافی نەتەوەکەیان.

دوهەم: شەریف پاشا هەرچەند نویٚنەری کورد بووە بەلاٚم ریٚگەی ئەوەی نەبووە لەچۆنیەتی داڕشتنی سنووری ئەو دوو حکومەتەی بۆ کورد و ئەرمەنی دەستنیشانکرابوو بکەویٚتە باس و گفتوگۆکردن لەگەلٚ ئەندامانی سیڤەردا و ئەوەی دەمڕاستی هەموولایەك بووە حکومەتی بەریتانیا بووە کە بۆ مسۆگەرکردنی بەرژەوەندیەکانی خۆی نەخشەی تایبەتی کیٚشابوو، کە دەریشکەوتووە لایەنگریٚتی بەریتانیا بۆ کورد شتیٚکی تەکتیکی بووە لەبەر ئەو هۆیانەی بەر لەمە لیٚی‌دواییین کە بووبوو بەسەرگەرمی بەریتانیا لەمۆرکردنی پەیمانی سیڤەردا و دەریشدەکەویٚ چۆن لەپەیمانی لۆزاندا خۆی لەو لایەنگریٚتیەی کورد کیٚشابووەوە. بەو جۆرە ناتوانریٚ بووتریٚت شەریف پاشا

بەرپرسیار بووە لەچۆنیەتی دەستنیشانکردنی هەندێ لەو ناوچە کوردیانەی خرابوونە ناو چوارچێوەی سنووری ئەرمەنیەکانەوە.

بێجگە لەچالاکیەکانی شەریف پاشا، کریس کۆچرا باسی (نەجمەدین حسێن)ی کردووە، دکتۆر عەبدولسەتار تاهیر شەریف لەسەرچاوە/٤٠دا وتویەتی سەرۆکی (کۆمەڵی تشکیلاتی اجتماعیە) بووە، کە لەئەستەمبوڵ لەگەڵ مەندوبی سامی بەریتانیا لەئەستەمبوڵ دەربارەی مافی کورد گفتوگۆی لەگەڵدا کردووە و کریس کۆچرا ئاماژەی بۆ یاداشتێکی ئەمین عالی بەدرخان کردووە و داوای لەفەرەنسیەکان کردبوو بەشێوەیەکی دۆستانە بێن بەلایەنگری کورد و میللەتی کورد بخەنە ژێر سایە و پارێزگاری خۆیانەوە، (سەرچاوەی کۆچرا بۆ ئەمە وەکو خۆی باسیکردووە بریتی‌یە لەدوکیومێنتی ژمارە (٣١١-٣١٣) ڕۆژی ١٩٢٠/٦/١٦ لەئەرشیفی وەزارەتی دەرەوەی فەرەنسا).

کریس کۆچراش هەروەکو (مالمیسانژ) باسی نامەیەکی کامیل بەدرخانی کردووە کە لەشاری (تەفلیس)ەوە لەمانگی کانونی دوهەمی ساڵی ١٩١٨دا ناردبووی بۆ حکومەتی بەریتانیا بۆئەوەی کارێکی وا بکرێت لەهەموو کوردستاندا لەئێرانەوە هەتا دیاربەکر شۆڕشێکی کوردی بەرپابکرێت و ئامادەیی خۆی پیشاندابوو بۆ بەشداریکردن لەو کارەدا و (مالمیسانژ) لەلاپەرە (١٥١)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/١١١ وێنەی گۆڕەکەی کامیل بەدرخانی بڵاوکردۆتەوە لە(تەفلیس) کە لەوێ کۆچی دوایی کردووە.

## باسی دووهەمی بەشی چوارەم

## ماددەکانی پەیمانی سیڤەر

ماددەکانی پەیمانی سیڤەر ئەوەی پەیوەندی بەکوردەوە هەبووە بریتی بووە لەماددەکانی (٦٢،٦٣،٦٤). ئەوەی شایانی باسە رەشنووسی هەموو ماددەکانی پەیمانی سیڤەر بەرلەوەی لەلایەن ئەندامانەوە مۆربکرێت لە (١٩٢٠/٨/١٠)دا کە لەدوکیومێنتی ژمارە (Fo.٣٧١-٥٠٦٨) رۆژی ١٩٢٠/٤/١٣دا دەقەکەی باسکراوە وەکو پێشنیازێکی تایبەتی حکومەتی بەریتانیا بۆ لێکۆڵینەوە و پەسەندکردنی و هەرئەوەی لەو رەشنووسەدا تۆمارکراوە بووبوو بەبڕیاری کۆنگرەکە کە ئەمە نیشانەی ئەوە بووە ئینگلیزەکان چۆنیان ویستبێت بەو شێوەیە ماددەکانی سیڤەر دارێژراوە و پەسەندکراوە. گەلێك سەرچاوە باسی ماددەکانی پەیمانی سیڤەریان کردووە و مامۆستا رەفیق حیلمی لەلاپەڕەکانی (١٩-٢٢)ی یاداشتەکانیدا سەرچاوە/٦٥ ماددەکانی (٦٢، ٦٣، ٦٤)ی بەم شێوەیەی خوارەوە کردووە بەکوردی هەروەکو خۆی بلاّویدەکەینەوە:

### بەندی (٦٢)

(لەهەندێ سەرچاوەدا بەبەند و لەهەندێکی تردا بەمادە باسکراوە)، کۆمیسیۆنێك (لیژنەیەك) لەئەستەمبولْ پێکدێت لەسێ ئەندام کە بریتین لەنوێنەرانی بەریتانیا و فەرەنسا و ئیتالْیا بۆئەوەی لەدوای بەجێهێنانی ئەم پەیمانە بەشەش مانگ پڕۆژەی موختاریەتیەکی ناوچەیی (Local) ئامادەبکات بۆ ئەو ناوچانەی دەکەوێتە رۆژهەلاّتی (فورات) و باشووری خۆرئاوای سنوورێك کە لەدواییدا دەکێشرێت بۆ ئەرمەنستان و باکووری، سنوورێك لەتورکیا و سوریا و میسۆپۆتامیا جیادەکاتەوە کە نەژادی کوردی تیادا زۆرینەبن.

بەپێی رێنماییەك کە لەبەندەکانی (٣`,٢`-١١-٢١)دا باسکراوە، ئەگەر لەسەر باسێك پێکهاتن سەرینەگرت ئەندامەکانی کۆمیسیۆن ئەبێ هەریەکەیان دەنگ لەحکومەتی خۆی بگێڕێتەوە، ئەمجۆرە پێکهاتنە پێویستە رێبدا بەدەرخستنی ئەوەی کە کەمەکانی (اقلیات)ی (قەومی) و (مەزهەب)ی وەکو نەستوریەکان ( Les Assyro-Gbaldeeses–مەبەست کلدانی و ئاشووریە)، وە ئەوانیتر کە لەم هەرێمەدا دەژین بەتەواوی دلْنیابن کە لەژێر بالْی ئەمینی و پارێزگاریدا ئەبن، بۆ ئەم مەبەستە کۆمیسیۆنێك لەئەندامانی بەریتانیا و فەرەنسا و ئیتالْیا و ئێران و کورد

ئەگەڕێت بۆ پشکنین و بڕیاردانی ڕاستکردنەوەکە ئەگەر پێویست بوو بکرێت لەو سنوورانەدا کە بەپێی ئەم پەیمانە بۆ تورکیا دانراوە و ئەنووسێت بەسنووری ئێرانەوە.

بەندی/ ٦٣

حکومەتی عوسمانی گفتئەدا کە لەمێژووی ڕاسپێری و پێوتن بەخۆی تا سێ مانگ بەڵێنی بەجێهێنانی ئەو بڕیارانە بدات کە لەلایەن ئەو کۆمیسیۆنەوە ڕائەسپێردرێت کە لەبەندی/ ٦٢ی سەرەوەدا باسکراوە.

بەندی/ ٦٤

ئەگەر لەماوەی ساڵێك دوای مێژووی دەستپێکران بەبەجێهێنانی ئەم پەیمانە لەو هەرێمانەدا کە لەبەندی/ ٦٢دا ناوبراوە، قەومی کورد موراجەعەت بەکۆمەڵی ئەقوام (عصبة الامم) بکەن و تێیانبگەیەنن کە بەشی زۆری کوردە دانیشتوانەکانی ئەم هەرێمە ئەیانەوێ لەتورکیا جیابنەوە و سەربەخۆ (مستقل) بن و لەحاڵێکدا کە کۆمەڵی ئەقوام لەو باوەڕەدا بێ کە کوردەکان هەڵدەگرن سەربەخۆییان بدرێتێ و ڕاسپێری ئەمە بکات، تورکیا هەر لەئێستەوە بەڵێنئەدا بەم ڕاسپێریە و بەدانی ئیستقلال بەقەومی کورد و بەدەستهەڵگرتن لەهەموو (حقوق) و (تقالید-عنعنات)ێکی کە بەسەر ئەم هەرێمانەوە هەیەتی.

ئەم هاتنەخوارەوەی حکومەتی عوسمانی لەحقوق و تەقالیدی خۆی بەدوورودرێژی لە(مذکرات-گفتوگۆ)یەکی تایبەتیدا و لەبەینی هێزی سوێندخوارەکان و تورکیادا باسئەکرێت، دوای ئەم هاتنەخوارەوەیەش (تنازل) کە باسکرا، هیچ جۆرە بەرهەڵستیەك ناخرێتە پێشەوە بەرامبەر بەمەیلی کوردەکانی ویلایەتی موسڵ لەلایەن خستنی بەشی کوردستانی موسڵ بۆ سەر کوردستانی تورکیا و ئەو حکومەتە کوردەی کە لێی دروست ئەکرێت.

## باسی سێهەمی بەشی چوارەم
## هۆی مۆرکردنی پە یمانی سیڤەر

بەرلەوەی بچینە سەر ئەم باسە، بەپێویستم زانی چەند پرسیارێك بخەمە بەرچاو:

یەکەم: هەروەکو ڕوونبۆتەوە لەسەرەتادا ئینگلیزەکان زۆر سەرگەرمی مۆرکردنی ئەم پەیمانە بوون، ئایا هۆی ئەم سەرگەرمیەیان لەسەرەتادا چیبووە و هەتا چ ڕادەیەك ویستبوویان ئەو پەیمانە سەربگرێت؟

دوەم: ئەگەر ئینگلیزەکان لەسەرەتادا وا سەرگەرم بوون بۆ دەستنیشانکردنی ئەو مادانەی بۆ کورد تەرخانکرابوو، ئایا لەدواییدا هۆی ساردبوونەوەیان چیبووە؟

سێهەم: لەو ڕۆژانەدا هێشتا کەمالیەکان دەسەلاتێکی ئەوتۆیان نەبووە و حسابی ئەوەیان بۆ نەکرابوو لەگفتوگۆکانی سیڤەردا بەشداری بکەن بەڵکو پاشماوەی خەلافەتی عوسمانی لەئەستەمبوڵ بەنوێنەری تورکیا زانرا و ئەوان بەناوی تورکیاوە ئەو پەیمانەیان مۆرکردبوو، کەمالیەکان لەناو کۆبوونەوەکانی سیڤەردا ڕێگەی ئەوەیان نەبووە کۆسپ بخەنە بەر ئەو ماددانەی پەیوەندی بەکوردەوە هەبووە، ئایا کورد لەو ماوەدا کە پەیمانەکە دەستنیشانی کردبوو بۆ دامەزراندنی حکومەتێکی ناوچەیی (Local) بۆچی کەمتەرخەمی کردبوو، کە ئەو کەمتەرخەمیەی بوو بەهۆی سەرنەگرتنی هەنگاوەکانی ئەو پەیمانە لەو قۆناغانەی بۆ دامەزراندنی حکومەتێکی یەککرتووی کورد دەستنیشانکرابوو؟

چوارەم: بێجگە لەکەمتەرخەمی کورد خۆی، ئایا ئەو هۆیانەی تر چیبووە کە بووبوو بەسەرنەگرتنی ئەو پەیمانە و لەئەنجامدا ڕێگە بۆ پەیمانی لۆزان خۆشکرا کە جێگەی پەیمانی سیڤەر بگرێتەوە، کە لەمەیاندا باسی کورد و مافی کورد پشتگوێخرا؟

لەبەرئەوەی وەڵامەکانی هەرچوار پرسیارەکە بەیەکەوە گرێدراون، بۆیە پوختەی هەرچواریان لەم باسەدا و لەباسی چوارەمی بەشی چواری سیڤەردا کە لەدوای ئەمە بەدوورودرێژی باسیدەکەین بەباشی ڕووندەبێتەوە، مامۆستا جەلال تاڵەبانی لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٢٢ دەربارەی هۆی سەرگەرمی بەریتانیا

لەمۆرکردنی پەیمانەکە لەسەرەتادا وتویەتی: ((حکومەتی بەریتانیا لەدوای شەڕی یەکەمی جیهانی، نە بەشێوەیەکی نەزەری و نە بەشێوەیەکی ڕەسمی دژی ئەوە نەبووە حکومەتێکی کوردی لەکوردستانی مەرکەزیدا (کە مەبەست باکووری کوردستانە) پێکبێت، هەرچەندە بەدڵیشی نەبووە ئەو حکومەتە سەربگرێت چونکە ئەگەر مەبەستی سەرگرتنی بوایە دەیتوانی کارێکی وابکات دەمودەست مەبەستەکانی ئەو پەیمانە بەجێبهێنرێت، بەتایبەتی کورد خۆشی ئامادەی ئەوە بووە ئەو مەبەستە سەربگرێت ئەگەرچی ئەو حکومەتە کوردیە لەژێر چاودێری حکومەتی بەریتانیاشدا بوایە.

مامۆستا جەلال تاڵەبانی لەباسەکەیدا لەسەری ڕۆیوە و وتویەتی: دەتوانرێ هۆی ئەو دژنەبوونەی بەریتانیا لەمۆرکردنی پەیمانەکە لەسەرەتادا لەچوارچێوەی ئەم ڕاستیانەدا بخرێتە بەرچاو:

١-ئەو بەشەی کوردستان کە بەپێی پەیمانی سایکس پیکۆ بۆ ڕووسیای قەیسەری دانرابوو، دەربارەی ئەو بەشە لەکاتی پەیمانی سیڤەردا هیچ جۆرە ڕێککەوتنێك لەلایەن دەوڵەتە هاوپەیمانەکانەوە پێکنەهاتبوو بەتایبەتی لەنێوان بەریتانیا و فەرەنسادا، لەبەرئەوە ئینگلیزەکان لەدوای شەڕ و لەکاتی مۆرکردنی (پەیمانی ڤێرسای)دا دەیانزانی ئەو بەشەیان بەئاسانی بۆ قووتناچێت و پێشبڕکێی فەرەنسا و ئیتاڵیەکان لەگەڵ بەریتانیادا شتێك نەبووە کە بەریتانیا بتوانێت بەئاسانی کارێکی وابکات ئەو بەشە یەکسەر بۆ خۆی ببات، بۆیە بەریتانیا ویستی بەهۆی لایەنگرێتی کورد بۆ خۆی کارێکی وابکرێت دەسەڵاتی بەسەر کوردستاندا هەبێت بەتایبەتی ئینگلیزەکان مەترسی هەڕەشەکردنی تورکیان خستبووە بەرچاوی کوردەکان لەو ڕووەوە.

٢-باسی مافی کورد و ئەرمەنی لەسەردەمی بەستنی کۆنگرەی ئاشتیدا لەپاریس دوای ئەو هەموو پڕوپاگەندانەی دەوڵەتە هاوپەیمانەکان گوێچکەی دنیایان پڕکردبوو دەربارەی مافی چارەنوسی گەلان بەتایبەتی مافی ڕزگاربوونی ئەو نەتەوانەی لەژێر جەور و ستەمی تورکدا بوون و بڵاوبوونەوەی چواردە ماددەکەی ولسنی سەرۆك کۆماری ئەمریکا کە بەتەواوەتی مافی ڕەوای میللەتی کوردیشی دەگرتەوە لەگەڵ چالاکی وەفدی کورد بۆ پەیوەندیکردن لەگەڵ ئەرمەنیەکاندا و هاوکاریکردنیان بۆ پێشکەشکردنی پرۆژەیەکی یەکگرتوو لەگەڵ بەرهەڵستیەکی زۆری تورکەکان، لەم ڕووەوە ئەمانە بەهەموویان دەوڵەتە

ئیمپریالیزمەکانیان ناچارکرد لەپەیمانی سیڤەردا ئەو ماددانە دەستنیشان بکرێت کە پەیوەندی بەمافی گەلی کوردەوە هەبووە.

٣-سیاسەتی بەریتانیا لەو ڕۆژانەدا بریتیبووە لەلاوازکردنی دەسەلأتی تورکیا بۆئەوەی ڕێگەی نەبێ وەکو دەوڵەتێکی بەهێزی ناوچەکە خۆی بنوێنێت، بۆیە لای بەریتانیا وا باشبوو ئیمپراتۆریەتە کۆنەکەی تورك هەڵوەشێنرێتەوە و بەش بەش بکرێت بەجۆرێکی ئەوتۆ لەگەڵ داخوازیەکانی میللەتاندا دەربارەی مافی چارەنوسی خۆیان یەکبگرێتەوە کە بەمە ویستبووی هەروەکو لایەکی مرۆڤخواز و خەمخۆری میللەتان خۆی پیشانبدات.

٤-حکومەتی بەریتانیا بەدانانی ئەو ماددانەی سیڤەر کە پەیوەندیان بەکوردەوە هەبووە دەیویست تورکیا و ئێران و کۆنەپەرستەکانی عەرەب بترسێنێت و وایان لێبکات مل بۆ خۆی کەچبکەن و ئینگلیز لای وابوو ئیتر بەمە ڕێگە لەپیلانی دەوڵەتە ئیستعماریەکانی تر دەگرێت ئیتر چاونەبڕنە ئەو ناوچەیە.

٥-ئینگلیزەکان ویستیان ئەو ماددانە (مەبەست ٦٢، ٦٣، ٦٤) بۆ سوودی تایبەتی خۆیان بەکاربێنن لەچەسپاندنی دەسەلأتی خۆیان بەسەر میسۆپۆتامیادا و بەسەر باشووری کوردستاندا و بۆ ڕێگەگرتن لەهەموو جۆرە داخوازیەکی تورك بۆ دەستگرتنەوە بەسەر ویلایەتی موسڵدا کە تورکەکان بەڵگەیەکی بەهێزی ئەوتۆیان بەدەستەوە نەبوو بیکەن بەبیانووی داواکردنەوەی ئەو ویلایەتە پڕ لەنەوتە و ئینگلیزەکان لەمەدا بیریان لەوەش کردبووەوە ئەگەر هات و ناچاریش بوون دەستبەرداری ئەو پەیمانە ببن، ئەوا دەتوانن بەرامبەر بەو دەستبەرداربوونەیان تورکەکانیش والێبکەن واز لەهەندێ داخوازی خۆیان بێنن بەرامبەر بەحکومەتی بەریتانیا و لەڕاستیدا بەریتانیای ئیمپریالیزم توانی سوود لەو پەیمانە وەربگرێت و بەکاریبێنێت بۆ سەرگرتنی نەخشەکانی خۆی.

تا ئێرە بریتی بوو لەبۆچوونی مامۆستا جەلال تالەبانی دەربارەی هۆی مۆرکردنی پەیمانی سیڤەر لەلایەن حکومەتی بەریتانیا و وەلأمیشە بۆ هەندێ لەو پرسیارانەی لەسەرەتای ئەم باسەدا لێیدواوین، بەلأم بێجگە لەوانەی ئەو باسیکردون ڕوونیکردونەتەوە هەندێ هۆی گرنگی تریش هەبووە وای لەحکومەتی بەریتانیا کردبوو لەسەرەتادا بایەخ بەو پەیمانە بدات کە دەتوانین کورتە باسێکی ئەو هۆیانە بخەینە پێشچاو.

بێگومــان پــەیمانی ســیڤەر شانبەشــانی ئــەو ماددانــەی بــۆ کــورد تیایــدا تەرخانکرابوو حسابێکی تایبەتیش بۆ ئەرمەنیەکان کرابوو کە بەپێی ئەو حسابە بڕیاری دامەزراندنی حکومەتیش درابوو بۆ ئەرمەنیەکان و لەدەستنیشانکردنی چوارچێوەی سنووری ئەم دەوڵەتەدا هەندێ لەناوچە کوردنشینەکانیشی تیادا بووە (بەداخەوە ئەو سەرچاوانەی ئێمە دەستگیرمان بووە دەربارەی سیڤەر تەنها باسی ئەو مادانەیان تیادا کراوە کە بۆ کورد تەرخانکرابوو، هیچیان باسی ئەو مادانەیان نەکردووە کە بۆ چۆنیەتی دامەزراندنی ئەو حکومەتە ئەرمەنیە بڕیاری لەسەردرابوو، تەنها لەهەندێ سەرچاوەدا وتراوە بەشێکی زۆری ناوچە کوردنشینەکان خرابوونە ناو سنووری ئەو حکومەتە ئەرمەنیەوە کە نەمانزانیوە ئەو شوێن و ناوچانە کامە بوون.

هەرچەند وەکو بەرلەمە باسکراوە هاوکاریکردنی شەریف پاشا لەگەڵ بوغوص نوبار پاشای ئەرمەنیدا تەنها بۆ هاوکاریکردنی هەردوولا بووە کە هەرلایەیان مافی خۆی دەستگیربێت، بەڵام نەخشەکێشەکانی مادەکانی سیڤەر لەم ڕووەوە بەلای ئەرمەنیەکاندا دایانشکاندبوو، وە بەهەڵە وا لێکدرابووەوە کە ئەو ڕێکەوتنەی شەریف پاشا و نوێنەرە ئەرمەنیەکە کە مۆرکرابوو بووبوو بەهۆی ئەو لاسەنگیەی لەنێوانی ناوچە کوردنشینەکان و ئەرمەنیەکاندا لەپەیمانی سیڤەردا پەیدابووبوو، بەڵگەش بۆ ئەمە ئەو یاداشتە بووە کە شەریف پاشا دابووی بەکۆنگرەی ئاشتی کە ناڕەزایی خۆی دەربڕیبوو دەربارەی خستنی ناوچە کوردیەکان و دەستنیشانکردنی ناوچە کوردنشینەکان لەناو سنووری ئەو حکومەتەی نیاز وابوو بۆ ئەرمەنیەکان تەرخان بکرێت کە هیچ گومان لەوەدا نییە ئینگلیزەکان بۆ مەبەستێکی تایبەتی نەخشەی ئەوەیان کێشابوو وەکو لەدواییدا ئەم ڕاستیە ڕووندەبێتەوە.

کە یەکێك لەو هۆیانەی ئینگلیزەکان لەنەخشەی دامەزراندنی حکومەتەکەی ئەرمینیادا هەڵوێستی ئەمریکای خستبووە بەرچاو کە ئەویش لەدوایئەوەی نهێنیەکانی پەیمانی (سایکس پیکۆ)ی بۆ ئاشکرابووبوو ئەمریکاش کەوتبووە خۆی و هەوڵێکی زۆری دابوو ئەویش ناوچەیەکی تایبەت بەخۆی هەبێت کە بیکات بەشوێنی ژێر دەسەڵاتی خۆی و چەندین جار بەڵێنی بەئەرمەنیەکان دابوو ئامادە دەبێت حکومەتێکی ئەرمەنی دروست ببێت و ئەو سەرپەرشتی بکات وەکو ئەو شوێنانەی بەریتانیا سەرپەرشتی دەکرد و بڕیاری (ئینتدابی) خۆی دابوو لەو

شوێنانەدا، بۆیە ئینگلیزەکان لەو هەڵوێستەی ئەمریکا سڵەمیبوونەوە (لەباسی کوشتاری ئەرمەنیەکاندا باسی دەستبڕینی ئەرمەنیەکان دەکەین لەلایەن ئەمریکیەکانەوە کە وایان تێگەیاندبوون ئامادەن یارمەتیان بدەن وەکو چۆن ئینگلیزەکان دەستی کوردیان بڕیبوو، بۆیە ئینگلیزەکان هەوڵیاندابوو ئەمریکا دووربخەنەوە لەدەستێوەردانی ناوچەکە و بەو مادانەی بۆ ئەرمەنیەکان تەرخانکرابوو لەسیڤەردا ویستیان کارێکی وابکەن ئەرمەنیەکان بیر لەوە نەکەنەوە بچنە پاڵ ئەو مەبەستەی ئەمریکیەکان نیازیان وابوو بەدییهێنن.

بێجگە لەوەی ئەمریکا، حکومەتی سۆڤیەت ئەرمینیای دراوسێی خۆی خستبووە ژێر سایە و باڵی خۆیەوە کە (هنشاق)ەکان دەیانبرد بەرێوە، بۆیە ئینگلیزەکانیش بەڵێنێکی درۆیان بە(تاشناق)ەکان دابوو کە هەڵگری بیروباوەڕی نەتەوایەتی ئەرمەنی بوون کە ئامادەن حکومەتێکیش بۆ ئەوان سازبکەن و لەمادەکانی (سیڤەر)دا ئەو زیادەڕۆییەیان کردبوو کە بوو بەهۆی کێشەیەکی گەورە لەنێوان کورد و ئەرمەنیدا لەلایەکەوە و بووش بەهۆی ئەوەی کورد خۆشی لەناو خۆیدا تێکبچێت وەکو لەڕووداوەکانی داهاتوودا ئاشکرا دەبێت. بەکورتی دەتوانین لەم چەند خاڵانەی خوارەوەدا هەڵوێستی بەریتانیا بخەینە پێشچاو کە بۆچی لەسەرەتادا سەرگەرمی مۆرکردنی پەیمانی سیڤەر بووە بەڵام لەڕاستیدا بۆ دەستبڕینی کورد بووە کە دەتوانین بەڵگەکانی ئەم ڕاستیە بخەینە پێشچاو:

١-حاکمی گشتی بەریتانیا لەبەغدا (ولسن) لەکتێبەکەیدا (Mesopotamia, ١٩١٦- ١٩٢٠)، چاپی لەندەن ١٩٣١، ئاشکرا وتویەتی: سێر پرسی کۆکس لەمانگی دیسەمبەری ١٩٢٠دا (یەعنی هەمووی نۆ مانگ بەسەر مۆرکردنی پەیمانی سیڤەردا تێپەڕی نەکردبوو) نەخشەیەکی ئامادەکرد بۆ دواڕۆژی عێراق و بەپێی ئەو نەخشەیەی ئەو ماددەکانی پەیمانی سیڤەر پشتگوێخرابوو، کوردستانی باشووری خستبووە ناو چوارچێوەی دەوڵەتی عێراقەوە و باشووری کوردستانی بەبەشێك لەخاکی عێراق حساب کردبوو (لەکاتێکدا دەبوایە بەپێی ماددەکانی پەیمانی سیڤەر ئەم بەشەی باشووریش بخرایەتە سەر باکووری کوردستان وەکو لەماددەکانی سیڤەردا باسکراوە).

٢-کاربەدەستانی حکومەتی بەریتانیا، بەتایبەتی ئەوانەی لەنەخشەی پەیمانی سیڤەردا بەشداربوون حسابی ئەوەیان کردبوو ئەو حکومەتە ئەرمەنیەی شانبەشانی حکومەتەکەی کورد پێکدێت بەشێکی زۆر لەناوچە کوردیەکانیش

دەگرێتەوە لەبەرئەوە حکومەتەکەی کورد لاواز دەبێت و ناوچەکانی پچڕپچڕ و لێکترازاو دەبێت و دەکەوێتە ژێر ڕەحمەتی ئەو حکومەتە نەرمەنیەی بەسەرکردایەتی تاشناقەکان پێکدێت کە ئینگلیز خۆی سەرپەرشتی دەکات.

٣-تورکە کەمالیەکان لەسەرەتادا خۆیان لای کوردەکان وا نیشاندابوو دڵسۆزی میللەتی کورد دەبن و لەپاش پاککردنەوەی وڵات لەداگیرکەران ئامادەن ئۆتۆنۆمی بدەن بەکورد کە ئەم تەقەلادانەی تورك لەوەدا سەریگرتبوو کە توانیبوویان ژمارەیەك لەکوردەکان بکەن بەلایەنگر و هاوکاریان لەکۆنگرەکانی (ئەرزڕوم) و (سیڤاس)دا وەکو لەدواییدا باسی هەردوو کۆنگرەکە دەکەین، بۆیە ئینگلیزەکان ئەو هاوکاریکردنەی کوردیان بەدڵنەبوو، لێی‌سڵەمیبوونەوە بۆیە یەکێکی وەکو (مێجەر نویل)یان ناردبوو بۆ ناو کوردەکان بۆئەوەی هەستی کورد ببزوێنن دژی تورکە کەمالیەکان کە خەریکبوون خۆیان بەهێزدەکرد و هەڕەشەیان لەداگیرکردنەوەی ویلایەتی موسڵ دەکرد، بۆیە ئینگلیزەکان دەیانویست بەبوونی ئەو ماددانەی پەیمانی سیڤەر وا لەکورد بگەیەنن کە تەنها هەر حکومەتی بەریتانیا دەتوانێت مافی ئەوان دابینبکات نەك تورکە کەمالیەکان.

٤-ئینگلیزەکان زۆر باش لەحاڵی کورد گەیشتبوون و هەڵیان سەنگاندبوون و دەمارەکانیان دەناسی کە چۆن هەمیشە لەناو خۆیاندا ناکۆکبوون و کەسیان بەسەرکردایەتی ئەویتریان قایل نابێت و ناتوانن سەرکردایەتیەکی یەکگرتوو پێکبێنن، لەبەرئەوە ترسیان نەبوو دەربارەی ئەنجامەکانی ئەو حکومەتە کوردیە ئەگەر پێکبهاتایە و زۆرباش لەوە گەیشتبوون بار و هەڵوێستی ناو کوردستان جیاوازبوو لەو بار و هەڵوێستەی بۆ عەرەبەکانی حیجاز ڕەخسابوو.

## باسی چوارەمی بەشی چوارەم

## سەرەنجامی پەیمانی سیڤەر و هۆی سەرنەگرتنی

هەروەکو لەمادده ٦٢ی پەیمانی سیڤەردا بڕیاری لەسەر درابوو کە پەیمانەکە لە (١٩٢٠/٨/١٠)دا مۆرکرابوو، دەبوایە لەدوای شەش مانگ تێپەڕبوون بەسەر (١٩٢٠/٨/١٠)دا (یەعنی لە ١٩٢١/٢/١٠دا) ئەو لیژنە سیٚقۆڵیەی بڕیاربوو لەبەریتانیا و فەرەنسا و ئیتاڵیا پێکبهاتایە و پڕۆژەی ئەو موختاریەتە ناوچەییەی (Local) ئامادە بکردایە لەسنووری ئەو ناوچانەدا کە لەپەیمانەکەدا دەستنیشانکرابوو.

هەروەها بەپێی ماددەی/٦٣ی پەیمانەکە دەبووایە مافی ئەوە بدرایە بەکورد لەماوەی ساڵێکدا دوای مۆرکردنی پەیمانی سیڤەر (بێگومان لەدوای دامەزراندنی موختاریەتە ناوچەییەکە)، ئەگەر بیویستایە لەتورك جیابێتەوە و سەربەخۆ بێت بۆی هەبووە داوا لە(عصبة الامم) بکات ئەو داخوازیەی بەجێبهێنرێت ئەگەر (عصبة الامم) بۆی دەرکەوت کورد لەباریدا دەبێت کاروباری خۆی بەرێتبەرێوە و هەڵدەگرێت ئەو مافەی پێبدرێت و پاش بڕیاری (عصبة الامم) دەبوایە بەپێی پەیمانەکە کە خۆی مۆریکردبوو، ئەو داخوازیەی کورد بەجێبێنێت و دەستبەرداری هەموو ماف و نەریت (حقوق-تقالید-عنعنات)ی وازلێبێنێت و نەدەبوو هیچ بەرهەڵستیەکیش بخرایەتە بەردەمی خواست و داخوازیەکانی کوردی باشوور لەویلایەتی موسڵدا، کە بچنە پاڵ ئەو حکومەتە کوردیەی لەباکووردا دروستدەبوو، بەڵام بەداخەوە ئەمانە هیچیان نەکران و خاوەخاوکرا لەبەجێهێنانی قۆناغەکانی ئەو پەیمانە، کە جگە لەهۆی بێگانە لەسەرنەگرتنی ناوەڕۆکی پەیمانەکە، کەمتەرخەمی کورد و کێشەی نێو خۆیان هۆی سەرەکی بووە لەسەرنەگرتنی ئەو ئاواتە گرنگەی لەو ڕۆژانەدا بۆ کورد ڕەخسابوو. بۆ ڕوونکردنەوەی هۆی سەرنەگرتنی پەیمانەکە بەپێویستم زانی باسەکە بکەم بەسێ بەشەوە:

١-كەمتەرخەمی کورد و کێشەی کورد لەناو خۆیدا.

٢-هەڵوێستی بێگانە:

أ-هەڵوێستی دەوڵەتانی ئەوروپا.

ب-هەڵوێستی تورک، ئەوانەی پاشماوەی خەلافەت لەئەستەمبوڵ و هی کەمالیەکان.

## هۆی یەکەم- کەمتەرخەمی کورد و کێشەی کورد لەناو خۆیدا لەوکاتە ناسك و گرنگەدا

بەر لەمۆرکردنی پەیمانی سیڤەر کۆمەڵگای کورد لەباکووری کوردستاندا کۆمەڵێکی ڕێکوپێکی دامەزراندبوو بەسەرۆکایەتی شێخ عەبدولقادر و ئەمین عالی بەدرخان جێگری ئەو کۆمەڵە بووە وەکو لەباسی کۆمەڵ و ڕێکخراوەکاندا لێی‌دواین، بەڵام بەداخەوە زۆری پێنەچوو بەرلەوەی ئەو ئاواتە پیرۆزەی لەماددەکانی سیڤەردا دەهاتە پێشچاو بێتەدی وردە وردە وەکو بەفری بەهار توایەوە و ناکۆکی نێوان ئەندامانی ئەو کۆمەڵە بوو بەهۆی لێکدابڕانی هەردوو تاقمەکەی شێخ عەبدولقادر و بەدرخانیەکان بەهاوکاری ژمارەیەکی زۆر لەڕۆشنبیرانی لایەنگری بەدرخانیەکان و دوکیومێنتەکانی ناو ئەرشیفی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا کە لەدواییدا ناوەڕۆکی هەندێکیان دەخەینە پێشچاو، ڕوونیدەکەنەوە ئەو کێشە و ناڕێکیەی لەنێوان کوردەکاندا پەیدابووبوو تا چ ڕادەیەك زیانی بەکورد گەیاندبوو، کە تورکە کەمالیەکان لەهەمووان زۆرتر سوودیان لەو ناکۆکیە دەستگیربووبوو.

بەر لەپەیدابوونی ئەو ناکۆکیە، شەریف پاشای خەندان کە هەڵبژێردرابوو بۆ نوێنەرایەتی کورد لەو کۆنگرانەدا کە باسی کوردیان تیادا دەکرا شەریف پاشا لەوپەڕی چالاکیدا بووە و بەپێی لێکدانەوە و بۆچوونی خۆی لایوابوو کلیلبەدەستی چارەسەرکردنی کێشەی کورد بریتی‌یە لەحکومەتی بەریتانیا کە لەو ڕۆژانەدا هێشتا لایەنگری تاقمی پاشماوەی خەلافەت بووە لەئەستەمبوڵ کە ڕووبەڕووی کەمالیەکان بووبووەوە، بەڵام کە کێشەی نێوان شێخ عەبدولقادر و بەدرخانیەکان پەیدابوو ئیتر تای تەرازووی شەریف پاشاش ئەو کێش و قەوارەیەی جارانی نەما و ئەوەی ئەو بۆی چووبوو لەڕووی نزیکبوونەوە و

مۆرکردنی پەیمان لەگەڵ نوبار پاشای نوێنەری ئەرمەنیدا بەشێوەیەك لێکدرایەوە کە شەریف پاشا زیانی بەکورد گەیاندبوو، بۆیە نە شێخ عەبدولقادر خۆی و تاقمەکەی نە ئەوانەی بەدرخانیەکانیش هیچ حسابێکیان بۆ شەریف پاشا نەدەکرد وەکو لەدواییدا ئەم ڕاستیە ڕووندەبێتەوە و لەئەنجامدا شەریف پاشا خۆی لەنوێنەرایەتی کورد کێشایەوە و لەڕاستیشدا کێشەی ئەو دوو تاقمە لەناو بۆچونەکانی شەریف پاشاشدا ڕەنگیدابووەوە و لەگەڵ ئەوەشدا دەیویست کورد بەمافی خۆی بگات و دەوڵەتی تایبەتی خۆی هەبێت کەچی هەروەکو لەدوکیومێنتی ژمارە (Fo.٣٧١-٥٠٦٨) ڕۆژی ١٩٢٠/٤/٢٣دا (یەعنی نزیکی چوار مانگ بەر لەمۆرکردنی پەیمانی سیڤەر کە لە(١٩٢٠/٨/١٠)دا مۆرکرابوو لە(مۆنتکارلۆ)وە تەلگرافێکی ناردبوو بۆ ئەستەمبوڵ و بەپێی دوکیومێنتەکە لەو تەلگرافەدا وتبووی: ((ئەوپەڕی ڕێزم هەیە بۆ مەقامی پیرۆزی خەلیفەی پایەبەرز و نامەوێ بەقسە و بۆچوونی جیاخوازەکان کارێکی وابکەم نیگەرانی ئێوەی تیادا بێت بۆیە وا لەنوێنەرایەتی کورد وازمهێنا چونکە بەر لەهەموو شتێك من موسڵمانم و هەموو هەوڵ و توانایەکم لەپێناوی خەلیفەدا تەرخاندەکەم بەبێئەوەی گوێبدەمە هیچ پارتێکی سیاسی)).

دەربارەی هەڵوێستێکی تری شەریف پاشا بەرامبەر بەخەلیفە لەدوکیومێنتێکی تری ناو ئەرشیفی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیادا ژمارە (Fo.٣٧١-٥٠٦٧, No.١٧٨-M١٧٣٤) ڕۆژی ١٩٢٠/٢/٣، ڕاپۆرتێکی تیایە دەربارەی شەریف پاشا و لەو ڕاپۆرتەدا وتراوە: ((لەنامەیەکی نوێنەری کورد (کە مەبەستی شەریف پاشایە) کە بۆ (ئەدمیرال ویب)ی ناردووە کە لەو نامەیەدا وتراوە: کورد زۆر بێزارە لەهەڵوێستی تورك و ئەو هەواڵانەی بڵاودەکرێنەوە دەربارەی ڕێکێتی کورد لەگەڵ تورکدا هەمووی دوورە لەڕاستی و ئەگەر شتی واش ڕوویدابێت ئەوا لەئەنجامی هەڕەشەکردنی تورکەوە ئەو قسانە بڵاوکراوەتەوە چونکە کورد بۆ ئەوە تێدەکۆشێت خۆی لەچنگی تورك ڕزگاربکات. لەفەقەرەی شەشەمی ئەو دوکیومێنتەدا وتراوە: لەگەڵ ئەوەشدا نوێنەری کورد دانی بەوەدا ناوە کە کورد دڵسۆزی خەلیفەیە بەڵام لەڕاستیدا کورد دوای سیاسەتێکی تایبەتی خۆی کەوتووە و هەرچەند ئەکەم لەهەڵوێستی ڕاستی کورد نەگەیشتووم (مەبەستی نوسەری دوکیومێنتەکەیە دیارە کاربەدەستێکی بەریتانیای بووە)، وە لاموایە

پڕوپاگەنــدە کــارێکی زۆری کردۆتەســەر هەنــدێ لــەکوردەکان لەوانــەی بــوون بەلایەنگر و دڵسۆزی خەلیفە)).

لــەدوکیومێنتی ژمــارە (Fo.٢٧١-٥٠٦٨) تــەلگرافێکی ئــەمین عــالی بــەدرخانی باســکردووە کــە لــەڕۆژی ١٩٢٠/٤/١٢دا لەلاپــەڕە (٢٢٧)ی ئــەو دوکیومێنتــەدا بلاّوکراوەتەوە کە ئەمین عالی بەدرخان ناردویەتی بۆ مەندوبی سامی بەریتانیا لەئەستەمبولّ، لەوەدا باسی لابردنی شەریف پاشای کردووە لەنوێنەرایەتیکردنی کورد لەکۆنفرانسی ئاشتیدا کە ئەمین عالی بەدرخان وتویەتی: ((بەشانازیەوە دەمــەوێ پایەبەرزتان لــەوە ئاگاداربکــەم کــە لیژنــەی ناوەنــدی جەمعیــەتی کــورد (مەبەستی جمعیتی تعالی کورد بووە کە شێخ عەبدولقادر سەرۆکی بووە و ئەمین عالی بەدرخان جێگری بووە) بڕیاریداوە شەریف پاشای نوێنەری جەمعیەتەکەمان کە خۆی بەهەندێ چالاکی سیاسیەوە خەریك کردووە و بەیاناتی وای دەرکردووە لەگــەڵ بەرژەوەنــدی کــورددا یەکناگرێتــەوە، لەبەرئــەوە لابــراوە و لــەجیاتی ئــەو یەکێکی تر دادەنرێت کە لەدواییدا ئاگاداری ناوەکەیتان دەکەین، تکا لەبەرێزتان دەکەین ئەم بڕیارەمان لای خۆتان تۆمار بفەرموون.

| ئیمزا | ئیمزا |
| --- | --- |
| حەمدی | ئەمین عالی بەدرخان |
| سکرتێری گشتی | جێگری سەرۆکی جمعیتی تعالی کورد |

سەیر ئەوەیە دەربارەی هەڵوێستی شەریف پاشا، سیامەند ئەحمەد عوسمان لەسەرچاوە/١٣دا باسی ئەرشیفەکانی وەزارەتی دەرەوەی فەرەنسای کردووە کە وتویەتی: ئەو دوکیومێنتانە پڕن لەباسی ئەو تەلگرافانەی لەلایەن هەندێ سەرۆك عەشیرەتی کوردەوە نێردراون بۆ حکومەتی فەرەنسا و تیایاندا بێزاری خۆیان دەربڕیوە بەرامبەر نوێنەری کورد (کە مەبەست شەریف پاشایە) چونکە شەریف پاشا داوای لەحکومەتــە گــەورەکان کردبــوو حکومــەتێکی کــوردی دامــەزرێنرێت (بێگومان ئەو تەلگرافانە دەبێ لەلایەن ئەو سەرۆك عەشیرەتانەوە نێردرابن کە بووبوون بەلایەنگری کەمالیەکان و کەمالیەکان بەوە ئەو کوردانەیان ترساندبوو کە سەرگرتنی پەیمانی سیڤەر دەبێتە هۆی ئەوەی گەلێك ناوچەی کورد بخرێتە ژێر دەسەلاّتی ئەرمەنیەوە.

هەرچۆنێك بووبێت مامۆستا ڕەفیق حیلمی لەیاداشتەكانیدا ڕەخنەیەكی توندوتیژی لەكوردەكانی باكوور گرتووە كە نەبووبوون بەپشتیوانی شەریف پاشا لەتەقەلاكانیدا بۆ دەستگیربوونی مافی كورد، ڕەفیق حیلمی لەیاداشتەكانیدا وتویەتی: لەگەڵ ئەوەشدا شەریف پاشا بەو تەلگرافانەی دژی ئەو نێردرابوون ساردنەبووبووەوە و لەچالاكی خۆی نەكەوت و هەروەكو سیاسیەكی زرنگ و لێهاتوو توانی مافی كورد بخاتە بەردەمی كۆنگرەی ئاشتی و بەزمانی فەرەنسی یاداشتێكی دەربارەی مافی كورد پێشكەشكردبوو بەكۆنگرەی ئاشتی (بەرلەمە لەباسی شەریف پاشادا ئاماژە بۆ ئەو یاداشتەی كراوە).

دەربارەی ئەو تێكچوون و كێشەیەی لەنێوان هەردوو تاقمەكەی شێخ عەبدولقادری شەمزینی و بەدرخانیەكاندا پەیدابووبوو، وەلید حەمدی لەكتێبەكەیدا سەرچاوە/٢٣ ئاماژەی بۆ دوكیومێنتێكی ناو ئەرشیفی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا كردووە ژمارە (C-١٧٣٤-M-٦٢٠) ڕۆژی ١٩٢٠/٥/٣ باسی نامەیەكی مەندوبی سامی بەریتانیای تیادایە كە لەڕۆژی ١٩٢٠/٤/١٦ لەئەستەمبوڵەوە ناردویەتی بۆ (لۆرد كرزن)ی وەزیری دەرەوەی بەریتانیا، باسی تێكچوونی ئەندامانی (club–ی كردووە كە مەبەستی جمعیتی تعالی و تعاونی كوردە)، لەو نامەیەدا مەندوبی سامی هۆی ئەو تێكچوونەی داوەتەپاڵ ئەو ڕێكەوتنەی لەنێوان شەریف پاشا و بوغوص نوبار پاشای ئەرمەنیدا مۆركرابوو، لەدوای ئاشكرابوونی ئەو ڕێكەوتنە كێشەی هەردوو تاقمەكەی كورد ئەوەندەی تر ئاڵۆزتر بوو.

وێنەیەكی بوغوص نوبار پاشا
لە پاشكۆی كتێبەكەی روهات ئالاكوم

دوكيومێنتەكە باسێكی ڕۆژنامەی (اقدام)ی توركی بڵاوكردۆتەوە دەربارەی ئەو گفتوگۆیەی پەیامنێری ئەو ڕۆژنامەیە لەگەڵ شێخ عەبدولقادردا بڵاویكردبووەوە، بۆ ڕوونكردنەوەی ئەو گفتوگۆیەی شەریف پاشا و بوغوص نوبار پاشا كردبوویان و لەو گفتوگۆیەدا شێخ عەبدولقادر ئەو گفتوگۆیەی بێسوود و بێبایەخ ژماردوە و وتویەتی كورد و تورك لەگەڵ یەكتردا لەسەر دوارۆژ ناكۆك نین و لایوایە حوكمی زاتی بۆ كورد باشترین شێوەی گونجاوە بۆ كورد (بێگومان مەبەستی توركی سەر بەخەلیفەی ئەستەمبوڵ بووە)، بێگومان بڵاوبوونەوەی ئەو گفتوگۆیەی لەگەڵ شێخ عەبدولقادردا كرابوو ئەوەندەی تر كێشەی نێوان هەردوو تاقمەكەی ئاڵۆزتر كرد و بوو بەهۆی لێكترازانی هەردوولایان.

بەپێی دوكیومێنتەكە بەدرخانیەكان تەنها بەلابردنی شێخ عەبدولقادر لە(Club) وازیان نەهێنا بەڵكو بڵاویانكردەوە شەریف پاشا ئیتر بەنوێنەری كورد نازانرێت و ئەمە بوو بەهۆی ئەوەی شەریف پاشا وازی لەنوێنەرایەتی كورد هێنا وەكو بەرلەمەش باسمانكردووە. دوكیومێنتەكە لەفەقەرەی (٨)یدا دەربارەی شێخ عەبدولقادر وتویەتی: ((بۆچونەكەی شێخ عەبدولقادر لەبۆچونی ئەوانیتر باشتر دێتە بەرچاو و لەوانیتریش شەعبیەتی زۆرترە لەكوردستاندا و دەیەوێ ئیدارەیەكی جیاواز پێكبێت بۆ كورد لەژێر چاودێری بەریتانیادا و ئەگەر ئەو ئیدارەیە پێكبێت ئیتر بیر لەجیابوونەوە ناكات لەتوركیا، بەلآم ئەگەر توركیا مەبەستی بێت كورد سەربەخۆ بێت و دەسەلآتی سەركردایەتی ئەو سەربەخۆییە بەو بسپێردرێت ئەوا ئامادە دەبێت ئیعلانی ئەو سەربەخۆییە بكات)).

لەڕاستیدا تۆزێك ئاڵۆزی دەبینرێت لەناوەڕۆكی دوكیومێنتەكە و لەوەرگێڕانی دوكیومێنتەكە لەلایەن وەلید حەمدیەوە، چونكە لەلایەكەوە وتراوە شێخ عەبدولقادر قایلبووە بەحكومەتێك لەژێر چاودێری بەریتانیادا و لەولاشەوە باسی سەربەخۆیی كوردی كردووە ئەگەر تورك بەوە قایل بووبێت كە ڕێی تێناچێت تورك لایەنگری ئەوە بووبێت. بەپێی هەمان دوكیومێنت لەفەقەرە (٩)یدا باسی ئەوە كراوە كە مەندوبی سامی وتویەتی: ئەو كوردانەی لەناوخۆیاندا تێكچوبوون هەرلایەك بەجیا هەوڵی ئەوەیدا پەیوەندیم پێوەبكەن بەلآم من نەچوومە ژێر باری هیچ جۆرە بەڵێنێك بەهیچ لایەكیان، تێمگەیاندن باسی كورد لەكۆنگرەی ئاشتیدا دەكرێت بۆیە چاوەڕوانی بڕیارەكانی ئەو كۆنگرەیە بكەن.

دەربارەی تێکچونی ئەندامانی جمعیتی تعاون و تعالی، سیامەند ئەحمەد عوسمان لەسەرچاوە/١٣دا ئاماژەی بۆ باسێکی ڕۆژنامەی (نیویۆرك تایمس) کردووە کە لەڕۆژی ١٩٢٠/٣/٩دا دەرچووە کە لەمەدا ئاماژەی بۆ ڕۆژنامەی (تفسیر افکار)ی تورکی کردووە کە شێخ عەبدولقادر لەو ڕۆژنامە تورکیەدا وتویەتی: ((تۆمەتی خۆڕایی دەدرێتە پاڵ کورد کە گوایا کورد دەیەوێ لەتورك جیابێتەوە، من خۆم (شێخ عەبدولقادر) یەکێکم لەوانەی بیر لەجیابوونەوە ناکەم چونکە کورد ڕێزێکی تایبەتی هەیە بۆ خەلافەت و من داوای حوکمی زاتی ناکەم بۆ کورد)).

لەڕۆژنامەکەدا وتراوە (کە مەبەستی ڕۆژنامەی تایمسە) هۆی ئەم بۆچوونەی شێخ عەبدولقادر ئەوە بووە پیاوێکی ئاینداری سەر بەخەلافەت بووە و جگە لەویش یەکێکی وەکو (خەلیل بەگ) کە مودیری پۆلیسی ئەستەمبوڵ بووە و هیچ پەیوەندیەکی بەکێشەی ئاینداریەتیەوە نەبووە، ئەویش وەکو شێخ عەبدولقادر لایەنگری ئۆتۆنۆمی بووە بۆ کورد. دەربارەی ئەو کێشەیەی لەناو کوردەکانی باکوردا پەیدابووبوو، کریس کۆچرا لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٤١ باسی گفتوگۆیەکی خۆی و کامەران بەدرخانی کوڕی ئەمین عالی بەدرخان کردووە دەربارەی ئۆتۆنۆمی بۆ کورد و کامەران بەم شێوەیە وەڵامی کریس کۆچرای داوەتەوە: ((لەو ڕۆژانەدا ئەوانەی لایەنگری ئۆتۆنۆمی بوون، قاچێکیان لای کوردە نەتەوەییەکان بوو (مەبەستی تاقمی بەدرخانیەکان و ڕۆشنبیرەکانی هاوکاریانن)، وە پێیەکی تریان لای سەربازگەی حکومەتی عوسمانی بووە (مەبەست پاشماوەی خەلافەت لەئەستەمبوڵ) و ئەوانە بەتەمای ئەوەبوون بکرێن بەوەزیر لای حکومەت بۆیە بووبوون بەلایەنگری ئەستەمبوڵ و ئەوانەیتر کە بەئاشکرا داوای سەربەخۆیی کوردیان دەکرد دژی خەلافەتی عوسمانی بوون)).

لەهەمان سەرچاوە/١٣دا سیامەند ئەحمەد عوسمان باسی بۆچونێکی (لۆرد کرزن)ی وەزیری دەرەوەی بەریتانیای کردووە کە وتویەتی: ((زۆر شتێکی گرانبوو بزانین لەو ڕۆژانەدا کوردەکان چییان دەویست و لەئەنجامدا بۆم دەرکەوت تاقە کوردێك لەناویاندا نابینرێت بتوانێ لەبۆچوونی تاقمەکەی خۆی بەولاوە بیر لەهیچ شتێکی تر بکاتەوە)).

دەربارەی کێشەی کورد لەو ڕۆژانەدا لەگۆڤاری (مامۆستای کورد) کە لەسوید دەرچووە لەژمارە (٩)ی ساڵی ١٩٩٦دا وەرگێڕانی باسێکی ناو ڕۆژنامەی (لاکور

بسپوندانس دوریان)ی ڕۆژی ١٩١٩/٤/١٤ کە لەشاری (جنێڤ) دەرچووە لەلایەن (محەمەد موهتەدی)یەوە دەرکراوە بەکوردی و لەڕۆژنامەکەدا چەند پرسیارێک کراوە لەشەریف پاشا کە بریتی بوون لەمانەی خوارەوە:

١-داخوازیەکانتان لەپاریس دەربارەی کێشە لەسەر ناوچەکان و هەڵوێستی سیاسی بریتین لەچی؟

٢-ئایا بزوتنەوەیەکی ڕاستی نەتەوایەتی لەکوردستاندا هەیە یا تەنها بۆ ئەوەیە گیروگرفتێکی تازە پێکبێت بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەی ئەرمەنی بەمەبەستی دوانخستنی؟

٣-ئایا پەیوەندی کورد و ئەرمەنی کە کۆنە دراوسێی یەکن، بەواتایەکی تر ئامۆزای یەکن، ئەو پەیوەندیە چی لێدێت؟

٤-ژمارەیەکی تەواوی کوردەکان چەندە و سەرچاوەی ماددی گەلی کورد (وابزانم مەبەستی سەرچاوەی دارایی کوردە) و دامودەزگا کۆمەڵایەتیەکانی کورد بریتین لەچی؟

٥-ئەگەر پێویست بوو، ئایا ئێوە دەتانەوێ کام وڵات پاراستنی ئێوە بگرێتە ئەستۆی خۆی بۆئەوەی لەباروداۆخی تازەدا یارمەتی وڵاتەکەتان بدات؟

هەروەکو وەرگێڕی باسەکە بڵاویکردۆتەوە، شەریف پاشا وەڵامی ئەو پرسیارانەی بەم جۆرەی خوارەوە داوەتەوە: ((سنوورەکانی کوردستان لەباری نەتەوایەتیەوە، لەباکورەوە لە(Ziven) لەسنووری قەفقاسەوە دەستپێدەکات و لەڕۆژئاواوە بەرەو ئەرزڕوم، ئەرزنجان و (Divick) و (Behisn) و کیماخ و عەرەبگر و لەباشورەوە بەرەو (حران) و بەرزاییەکانی سنجار، تەلئەسفەر (کە لامواییە مەبەست تەلەعفەر بێت)، هەولێر، کەرکوک، سلێمانی و (Akk-elman–کە نەمزانی مەبەستی کوێیە)، سنە و لەڕۆژهەڵاتەوە دەکشێت بەرەو ڕەواندز و باشقەڵا و (Kala-Vizir)، واتە سنووری ئێران هەتا ئارارات (بێگومان شەریف پاشا لەم وەڵامەدا تەنها باسی ئەو شوێنانەی کردووە لەچوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانیدا بوون، بۆیە باسی ناوی شارەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستانی نەکردووە بێجگە لەسنە).

شەریف پاشا لەوەڵامدانەوەیەکدا لەسەری ڕۆیشتووە و وتویەتی: کورد لەمێژووی زۆر کۆنەوە لەم ناوچانەدا لەژێر ناوی جۆربەجۆردا ناویان هاتووە و ژیاون و ئەمە نزیکەی هەزار و سێسەد ساڵە لەم ناوچانەدا بەناوی کوردەوە دەژین

که وتەی کوردی بەزمانی فارسی مانای خەباتکەر دەگرێتەوە، (بێگومان شەریف پاشا لەو هەزاروسێسەد ساڵەی ئاماژەی بۆ کردووە، مەبەستی ئەو سەرەتایە بووە کە بۆ یەکەم جار وشەی کورد لەسەرچاوەکاندا بەکارهێنراوە، چونکە شەریف پاشا دوایئەوە باسی کوردی کردووە لەسەدەکانی (٨، ٩)ی پێش زاییندا).

شەریف پاشا لەباسەکەیدا دەڵێت: کوردەکان لەنەوەی مادن کە لەسەدەکانی (٨، ٩)ی پێش زاییندا و لەزەمانی ئاشوریەکاندا لەنوسراوەکانی ئاشووریدا باسیکراوە، لەکاتی بەرەوپێشەوەچوونی پاشاکانیان بەرەو ورمیە و باکوری ڕۆژئاوای ئێران. مادەکان و ئاریەکان یەکەم شەپۆلی ئێرانی بوون لەباکوری باکوردا نیشتەجێبوون لەکاتێکدا فارسەکان لەخوارووی ئەواندا جێگیربوون و ساتێك کوردەکان لەلایەن فارسەکانەوە شکێنران، پەنایان بردە بەرچیاکان و لەوساوە لەو ناوچانەدا دەژین و لەسەدەی دەهەمدا تورکە داگیرکەرەکان پەلاماری کوردەکانیاندا لەدەشتەکانی ئازربایجاندا و ناچاریانکردن بەرەو شاخەکان بکشێنەوە، لەسەردەمی مادەکاندا چەندین میرنشینی بچوکیان پێکهێنابوو کە لەدواییدا لەئێران و تورکیاش ژمارەیەکی زۆریان پێکهێنابوو.

شەریف پاشا لەدوایئەوەی باسی هەندێ لەئەمارەتەکانی کوردی کردووە وتویەتی: بۆ ئیمڕۆ پێویستە کۆمیسیۆنێك لەنوێنەرانی هەندێ لەدەوڵەتانی ئەورووپا سازبکرێت بۆ کرینەوەی موڵك و سامانی ئەو کەمایەتیەی لەناو خاکی کوردستاندا دەژین بۆئەوەی چواردە مادەکەی (ولسن)ی سەرۆك کۆماری ئەمریکا کە حکومەتی عوسمانیش پەسەندی کردووە حساب بۆ کوردیش بکرێت و بەمافی ڕەوای خۆی بگات کە بریتی‌یە لەسەربەخۆیی بێئەوەی ئەم داخوازیەی بەبێوەفاییەك بژمێردرێت بەرامبەر بەئیمپراتۆریەتێك کە کورد چەند سەدەیەکە لەژێر سایەیدا ژیاوە و تا ئێستە توانیویەتی نەریت و ڕێوشوێنی خۆی بپارێزێت و (اتحاد و ترقی) لەکاتی دەسەڵاتداریێتی زاڵمانەیاندا کوشتاریان لەکورد کردبێت وەکو چۆن لەئەلبانیەکانیان کردبوو لەکاتی شەڕی جیهانیدا ئەمە نیشانەی خراپەکاری کاربەدەستانی تورك بووە نەك هی کورد و لەکۆتایدا ئێمەی کورد بەتوندوتیژی بێزاری و دژایەتی خۆمان دەردەبڕین بەرامبەر هەرلایەك چاوببڕێتە خاکی کوردستان کە هی میللەتی کورد خۆیەتی.

پاشـئەوە دەچـێتە سـەر باسـی دەرامـەتی کوردسـتان و دەڵـێ ئەگـەر کـورد سـەربەخۆ بێـت دەتوانێـت سـوود لەسـامان و پیتـی وڵاتەکـەی وەربگرێـت و پێشـبکەوێ و بەئاشـتی لەگـەڵ دراوسـێکانیدا بـژی، بۆیـە داوادەکـەین کۆمیسیۆنێکی نێونەتـەوەیی سنووری وڵاتەکـەمان دەستنیشانبکات بەمـەرجێك ئەو شوێنانەی زۆربـەی دانیشتوەکانی کوردبن چ لـەتورکیا و چ لەهەرشوێنێکی تردا بێ، بخرێتە ناو ئەو سنوورەوە.

وادیارە بەرامبەر بەو پرسیارانەی لەشەریف پاشا کرابوو، ڕۆژنامـەی (اقدام)ی تورکی لـەڕۆژی ۱۹۲۰/۲/۲۷دا وتـارێکی شێخ عەبدولقادری بڵاوکردۆتـەوە لـەژێر نـاوی (کـورد و عوسمـانیزم) و لـەدوکیومێنتی ژمـارە (Fo.۳۷۱-۵۰٦۸-No.٦۲۰-M-۱۷٤۳-۵) ڕاپـۆرتێکی مەنـدوبی سـامی بـەریتانیای تیادایـە لەئەسـتەمبوڵەوە ناردویـەتی نـاوەڕۆکی ئـەو وتـارەی لەدوکیومێنتەکـەدا تۆمارکردووە کـە ئەمـە وەرگێڕانی ئەو باسەیە بۆ کوردی کە لەسەرەتادا وتویەتی: ((کوردەکان ئاگاداری ئەوە بوون ڕێکەوتنەکەی شـەریف پاشا و نوبار پاشا بۆ مەبەستی جیابوونـەوە بـووە، بۆئـەوەی بیروبۆچـونی سـەید عەبـدولقادر ئەفەنـدیمان دەسـتگیربێت کـە سیناتۆرێکی کوردە لەئەنجومـەنی پیرانـی عوسمانیدا و سەرۆکی ئەو ئەنجومەنـە بووە سـاتێك (فەریـد پاشـا) سـەرۆك وەزیرانـی عوسمـانی بـووە، بۆ ئەو مەبەستە هەواڵنێرێکی خۆمان ناردە لای سەید عەبدولقادر و لەقسەکانیدا دەرکەوت بەهیچ شێوەیەك لەگەڵ بیروبۆچوونی شەریف پاشادا نیە دەربارەی سەربەخۆیی کورد و عەبدولقادر تەنها داوای ئۆتۆنۆمی دەکات بۆ کورد و دەڵێ مەبەست لەڕێکـەوتنی نێوان شەریف پاشا و نوبار پاشا تەنها بۆ چارەسەرکردنی کێشەی سنووری کورد و ناوچە کوردنشینەکان بووە لەڕێگەی (تەحکیم)ەوە.

هەرچـەند (عەبـدوڵا ئەفەنـدی ئەجەڤیـد) کـە یەکێکـە لەئەنـدامانی (Club-کـە مەبەسـت جەمعیـەتی تعـاون و تعـالی کـوردە)، وتبـووی یـەکێتی و هاوکـاریکردنی کورد و ئەرمەنی مانای سـەربەخۆیی دەگرێتـەوە، بەڵام شێخ عەبدولقادر وتبووی ئەمـە شتێکی نـەگونجاوە. لەگـەڵ ئەوەشـدا کـە شـەریف پاشـا و عەبـدوڵا ئەفەنـدی هەردووکیان بەناوی ئەو جەمعیەتەوە قسـەدەکەن و لایـەنگری سـەربەخۆیین، بەڵام شێخ عەبدولقادر ڕوونیکردەوە کە داخوازیی ئەو تەنها بریتی‌یە لە(ئۆتۆنۆمی).

بەپێی دوکیومێنتەکە پرسیارەکانی تری هەواڵنێری ڕۆژنامەکە (کە دیارە سەر بەئەستەمبوڵ بووە)، بریتی بووە لەم پرسیارانەی خوارەوە:

پرسیار: ئایا دەتوانیت بۆچوونی خۆت ئاشکرا بکەی دەربارەی ڕێکەوتنەکەی شەریف پاشا و نوبار پاشا لەپاریس؟

وەڵام: دەربارەی ئەو ڕێکەوتنە بیروبۆچونی خۆمان ڕوونکردۆتەوە کە ئەو داخوازیانەی ئەرمەنیەکان لەو شەش ویلایەتەی کێشەیان لەسەرە وتومانە زۆربەی دانیشتوانی هەر شەش ویلایەتەکە کوردن و بەهی کورد دەژمێردرێن و بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە وای بەباش دەزانین بدرێتە دەست لیژنەیەك بۆئەوەی سەرژمێریەکی ئەو ناوچانە بکرێت و بزانرێت چ لایەکیان زۆربەی دانیشتوان پێکدێنن کە نوبار پاشاش بەم پێشنیازە قایلبووە و هەروەکو ئێمە ئەویش بڕیاریداوە هیچ کۆسپ و تەگەرەیەك نەخرێتە بەردەمی ئەو لیژنەیە.

پرسیار: ئایا ڕاستە کە دەوترێ کورد و ئەرمەنی لەیەك ڕەگەزن و لەبنەڕەتدا دەچنەوە سەریەك؟

وەڵام: دەربارەی ئەمە گەلێك بۆچونی جیاواز هەیە، هی وا هەیە کورد دەبەنەوە سەر عەرەب یا فارس بەڵام کورد پەیوەندی بەڕەگەزی ئەرمەنیەوە نی یە.

پرسیار: ئەو یەکێتیەی کە باسیدەکەین لەنێوان کورد و ئەرمەنیدا کراوە بەشتێکی باش و سەرگرتووی دەزانیت؟

وەڵام: ئەو یەکێتیە لەسەر بناغەیەکی پتەو دروستنەبووە بۆیە شایانی ئەوەنی یە باسی لێوەبکرێت و ئێمە لەوەدا تەنها مەبەستمان دەستنیشانکردنی هێڵی سنووری هەردوولایە لەسەر بناغەیەکی ڕاست.

پرسیار: ئایا شەریف پاشا بەنوێنەری کورد دەژمێردرێت؟

وەڵام: شەریف پاشا لەلایەن ( جمعیتی تعالی کورد )ەوە کراوە بەنوێنەر کە ئەو جەمعیەتە نوێنەری کوردە.

پرسیار: بیروبۆچونتان چی یە دەربارەی پەیوەندی و یەکێتی نێوان کورد و تورك؟

وەڵام: تورکەکان برای خۆشەویستی ئێمەن و هاوئایینی یەکترین و لەبەرئەوەی محەمەدین، بۆیە هیچ جۆرە دوژمنایەتیەکمان لەنێواندا نی یە و ئەوەی ئێمە داوایدەکەین بریتی یە لەوەی سەربەستی پێشکەوتنمان هەبێت و ئەوەی بڵاودەکرێتەوە کە گوایا ڕێکەوتنی شەریف پاشا و نوبار پاشا دەبێتە هۆی دوژمنایەتی لەگەڵ تورکدا شتێکی ڕاست نی یە و بێبناغەیە و ئێمە بەهیچ جۆرێك لەشتی وا نەدواوین کە ئەم ڕێکەوتنە

**دەبێتە مایەی دوژمنایەتی لەگەڵ تورکدا و ئەو جۆرە پڕوپاگەندانە هەمووی بۆ مەبەستێکی تایبەتی بڵاودەکرێنەوە.**

**پرسیار: داخوازیە ڕاست و سەرەکیەکانی کورد چیە کە لەڕووی نەتەوایەتیەوە داوایدەکات؟**

**وەڵام: ئیمڕۆ پێنج شەش ویلایەت هەیە دانیشتوەکانی کوردن، با حکومەت ئۆتۆنۆمی بدات بەو ویلایەتانە، ئێمەش لەلای خۆمانەوە مرۆڤی پاك و لێهاتوو هەڵدەبژێرین بۆ بەڕێوەبردنی کاروباریان، ئێمەی کورد لەمێشکماندا هەست بەهیچ جۆرە دوژمنایەتیەك ناکەین بەرامبەر بەتورك، بائەوانیش وەکو ئێمە ڕەفتاربکەن بۆ پێکهێنانی ئەو دەزگایانەی بۆ ئۆتۆنۆمی پێویستن.**

**لەدوکیومێنتەکەدا لەلاپەڕە (٢٢٦)یدا وتراوە: ((دەربارەی ئەو گفتوگۆیەی شێخ عەبدولقادر و هەندێ بۆچونی ئەمین عالی بەدرخانی جێگری (جمعیتی تعالی کورد) و سکرتێرە گشتیەکەی کە (حەمدی) بووە، ئەمین عالی بەزمانی فەرەنسی نامەیەکی لەڕۆژی ١٩٢٠/٤/١٤دا بڵاوکردۆتەوە کە وتویەتی: ئەو بەیان و بڵاوکراوانەی لەلایەن شێخ عەبدولقادرەوە لەئەنجومەنی (سنا-پیران) و لەڕۆژنامەکاندا بڵاویکردۆتەوە هەمووی پێچەوانەی سیاسەتی گشتی جەمعیەتەکەیە، لەبەرئەوە بەزۆری دەنگەکان شێخ عەبدولقادر لەسەرۆکایەتی لابرا)).**

**ئەوەی شایانی باسە، بەر لەباسی بڕیاری شێخ عەبدولقادر باسی دوکیومێنتی ڕۆژی (١٩٢٠/٣/٣)مانکرد، کە بەپێی ئەوە بڕیاری لابردنی شەریف پاشاش بڵاوکرابووەوە لەنوێنەرایەتی کورد، دەربارەی کێشەی کورد لەناوخۆیدا جگە لەو سەرچاوانەی بەرلەمە باسمانکردون لەئەرشیفەکانی حکومەتی بەریتانیادا گەلێك دوکیومێنتی تر هەیە لەو باسە دواون و بەپێویستم زانی هەندێکیان وەرگێڕم بۆ کوردی و لەم باسەدا پێشکەشی بکەم بەپێی مێژووی دوکیومێنتەکان:**

**دوکیومێنتی ژمارە (Fo.٣٧١-١٦٣٤٦) ڕۆژی ١٩٢٠/٢/١ لاپەڕە (٢) لەباسی ناکۆکی کوردەکان لەناوخۆیاندا وتویەتی: ((کوردەکان داوای ئەوە دەکەن بزوتنەوە و ڕاپەڕینی کورد پەرەبسێنێت، حەمدی پاشای بابان پێشنیازی ئەوە دەکات شێخ عەبدولقادر و چەند کەسێك بچن بۆ موسڵ و لەوێوە دەستبکەن بەخەبات و ڕاپەڕین، بەڵام بەدرخانیەکان ڕوویانکردۆتە شوێنێکی تر و عەبدولڕەحمان پاشای برای ئەمین عالی بەدرخان چووەتە بەیروت بۆئەوەی لەگەڵ**

فەرەنسیەکاندا باسی دەسەڵاتداریێتی فەرەنسا لەکوردستاندا بکات بەڵام هیچی دەستگیرنەبووە بۆ ئەو مەبەستە، چونکە تەقەلاکەی بێهودە بوو بۆیە سەرینەگرت)).

لەدوکیومێنتێکی تردا ژمارە (Fo.٣٧١-٥٠٦٧) ڕۆژی ١٩٢٠/٢/٢٧ باسی نامەیەکی ئەدمیرال (Robeck)ی کردووە کە لەئەستەمبوڵەوە ناردویەتی بۆ وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا دەربارەی کێشەی کورد لەناوخۆیدا وتویەتی: کێشەیەکی گەورە پەیدابووە لەناو کوردەکاندا بەهۆی شەریف پاشاوە کە ئەنجامەکەی ڕەنگە بەوە بگات کوردستان بکەوێتە ژێر دەسەڵات و چاودێری دوو دەوڵەتەوە، کە یەکەمیان فەرەنسایە کە دەسەڵاتیان (سێواس) و (خەرپوت) و هەندێ شوێنی تر بگرێتەوە و بەریتانیاش جەزیرە و بۆتان کە دەسەڵاتی بنەماڵەی بەدرخانیەکانە بگرێتەوە، بەڵام شەریف پاشا لەگەڵ ئەم دابەشبوونەدا نیە و دەیەوێ ئۆتۆنۆمی هەموو کوردستان بگرێتەوە بەمەرجێك سەرکردەکان لەناوخۆیاندا لەسەرئەوە ڕێکبکەون. لەولاشەوە شێخ عەبدولقادری شەمزینی دەیەوێ کوردستان لەژێر سایەی تورکدا بێت (مەبەست پاشماوەی خەلافەتی عوسمانی بووە لەئەستەمبوڵدا).

وادیارە بەدرخانیەکان لەگەڵ بۆچونەکەی شەریف پاشادا نین و پرسیارێکیان هەیە دەربارەی ئەوە کە بریتی‌یە لەوەی ئایا دەستبەجێ بڕیارێکی ئەوتۆ ئەدرێت کە ڕێگا لەجموجوڵی ئەو عەشایرانە بگیرێت بەهاندانی بولشەویکەکان لەگەڵ تورکیزمەکاندا یەکبگرن؟ (مەبەست ئەو عەشایر و تاکە کەسانەیە کە تورکەکان توانیبویان لەکۆنگرەکانی ئەرزڕوم و سێواسدا بیانکەن بەئەندام و لایەنگری خۆیان کە لەو ڕۆژانەدا ئەو تورکە کەمالیانە پەیمانێکی دۆستانەیان لەگەڵ سۆڤیەتدا مۆرکردبوو وەکو لەشوێنی خۆیدا باسی ئەو پەیمانە دوقۆڵیەی نێوان کەمالیەکان و سۆڤیەت دەکەین).

ئەدمیرال (Robeck) لەنامەکەیدا لەسەری ڕۆیشتووە و وتویەتی: ((لەڕاستیدا هیچ پێشنیاز و نەخشەیەکی ئەوتۆ ئامادەنەکراوە بۆ دابەشکردنی کوردستان لەنێوان فەرەنسا و بەریتانیادا و تا ئێستە باسی دواڕۆژی کوردستان نەهاتۆتە ئاراوە و هەرباسێك پەیوەندی بەکوردەوە هەبێت هێنراوەتەوە بۆ کۆبونەوەکانی سیڤەر کە لەوەدا بڕیار لەسەر میراتەکەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دەدرێت و ئەم

ڕوونکردنەوەیەمان تەنها بۆ دڵنیایی و بۆ ئاگاداربوونە لەو پڕوپاگەندانەی لەملاولاوە دەربارەی کورد بڵاودەکرێتەوە)).

لەدوکیومێنتێکی تردا، ژمارە (Fo.٣٧٠-٦٣٤٦) نامەیەکی (هارولد رمبولد)ی مەندوبی سامی بەریتانیای تیادایە لەڕۆژی (١٩٢١/٣/٢٠)دا ناردویێتی بۆ وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا تیایدا وتراوە: ((هەواڵەکانی کۆنگرەکە دەگەنە ئێرە (مەبەست کۆنگرەی سیڤەرە) کوردەکانی دڵخۆشکردووە و هەردوو تاقمەکەی کورد (مەبەستی تاقی شێخ عەبدولقادر و بەدرخانیەکانە) داوای بەجێهێنانی مافەکانی کورد دەکەن و لەبەرئەوەی لەیەکتری جیابونەتەوە بۆیە هیچیانم نەبینی و بیروبۆچونی خۆمانم پێنەگەیاندن لەو ڕووەوە)).

لەگەڵ ئەوەشدا هەردوولا جیابونەتەوە بەڵام لەسەر چەند داخوازیەك یەکدەگرنەوە کە بریتین لە:

١-کورد نیازی نیە زەوی‌وزاری هیچ لایەك داگیربکات لەکوردستاندا، چ لەتورکیا و چ لەئێران و دەڵێن ئەو کوردانەی لەمەجلیسی میللی کەمالیەکاندا خۆیان وا پیشانئەدەن نوێنەری کورد بن هیچ توانا و دەسەڵاتێکیان نیە کە بتوانن بەناوی کوردەوە قسەبکەن (سەیر ئەوەیە لەدوایدا لەکاتی بەستنی کۆنفرانسی لۆزاندا دەوڵەتە هاوپەیمانەکان تەنها پرسیان بەوانە کرد کە لەگەڵ کەمالیەکاندا بوون وەکو لەباسی پەیمانی لۆزاندا ڕوونیدەکەینەوە).

٢-هەردوولایان دەڵێن پەیمانی سیڤەر دانی بەمافی حوکمی زاتیدا ناوە، بۆیە دەڵێن هەرجۆرە گۆڕانکاریەك لەو پەیمانەدا بکرێت نابێ ئەو دەستکاریە ئەو مافەی کورد بگرێتەوە و تەنها ئەبێ ئەو دەستکاریانە باسی ئەو ناوچانەی تری کورد بگرێتەوە کە کەوتونەتە ڕۆژهەڵاتی ئاسیای بچوك (مەبەستی ئەو ناوچە کوردنشینانەیە لەجیاتی ئەوەی بخرایەتە سەر کوردستان کەچی خرابووە سەر ئەرمینیا) و هەندێ ناوچەی تر کە بەپێی ڕێکەوتنێك خرابوونە ناو سنووری (سوریا)ی سەر بەفەرەنسا، هەروەها داوای بوارێك (منفذ) ئەکەن کە بدرێت بەکورد بۆئەوەی بگەنە سەر دەریا و بۆ ئەو مەبەستە داوای ئەوە ئەکەن بەشێك لە(ئەیان) بخرێتە سەر کوردستان.

دوای ئەو دوکیومێنتەی پێشوو، لەدوکیومێنتێکی تردا ژمارە (Fo.٣٧١-٥٠٦٨) ڕۆژی ١٩٢٠/٣/٢٩دا وتراوە: ((گومانێکی زۆر هەیە دەربارەی ئەوەی ئایا هەستی

داواکردنی مافی ئۆتۆنۆمی یا سەربەخۆیی کورد لەناو کوردەکاندا گەیشتۆتە ئەو ڕادەیەی داخوازی و پێشنیازێك دەربارەی ئەوە داوابکەن، هەرچۆنێك بێت دەتوانین بڵێین: هەستێکی یەکگرتوو لەناو کوردەکاندا بەدیناکرێت و زۆربەیان چاوەڕوانی ئەوەن لایەکی دەسەڵاتداری لەخۆیان بەرەو ژوورتر و بەهێزتر بیانبات بەڕێوە، ئەو تاقمانەیان کە بۆچوون و بیرکردنەوەکانیان (مەبەست لەبەدرخانی و ڕۆشنبیرەکانی ئەو ڕۆژانەیە)، پێشکەوتووترە لەهی عەشایرەکان و ئاغاکان و پیاوە ئایینیەکان، ئەگەرچی ئەمانەی دواییش ڕێگە لەوە ناگرن گەربێت و ئێمە (مەبەستی حکومەتی بەریتانیایە) حکومەتێکی باشیان بۆ پێکبێنین بەکەمە نەتەوەکانی ناوچەکانیشیانەوە)).

دوکیومێنتەکە لەسەریئەڕوا و ئەڵێت: ئەو ڕۆشنبیرە کەمەی کورد کە لەدەرەوەی کوردستانن و بیری جیابوونەوە و سەربەخۆیی کوردستانیان لەمێشکدایە، زیادەڕۆیی دەکەن لەقسەکانیاندا کە وای دەرئەخەن دەسەڵاتێکی زۆریان هەیە لەوڵاتدا، بۆ نمونە شەریف پاشا هیچ بایەخێك بەبوونی دەسەڵات و توانای تورکەکان نادات و بەڵگەی زۆرم هەیە بۆ ئەو بۆچونەی ئەو کە ئەمە مانای ئەوەیە ئاگای لەزۆر شت نی یە، ڕاستە ژمارەی ئەمانە لەپەرەسەندندا دەبێت ئەگەر مەسەلەی کوردستانێکی سەربەخۆ بێتە کایە و سەربگرێت و ببێت بەشتێکی ڕاست.

لەگەڵ ئەوەشدا بیروبۆچونی ئەو نوێنەرانەی لەلایەن (Kurdish Club)ەوە هەڵبژێردراون هەتا ڕادەیەك سوودی هەیە و لاموایە حکومەتی خاوەن شکۆ بێجگە لەشەریف پاشا ئەوانەی تریش بانگدەکات کە خۆیان بەنوێنەری ئەو یانەیە دەزانن بۆئەوەی بۆچونە جۆربەجۆرەکانی سەرکردەکان بزانرێت و لاشموایە لەم ڕووەوە ئێوە لەگەڵ فەرەنسیەکان پەیوەندی بکەن بۆ ڕێکخستنی ئەم کارە و لاشموایە ئەگەر بڕیاری سەربەخۆیی کورد بدرێت ڕەنگە حکومەتی بەریتانیا لایەنگری بێت.

**هۆی دوهەمی سەرنەگرتنی پەیمانی سیڤەر (هۆی بێگانە)**

هەروەکو چۆن کەمتەرخەمی کورد لەبایەخ نەدان بەسەرگرتنی مادەکانی سیڤەر لەکاتی خۆیدا هۆیەکی سەرەکی بووە بۆ لەکیسچونی ئەو هەل و دەرفەتە لەبارەی بۆ کورد ڕەخسابوو بەمۆرکردنی پەیمانی سیڤەر، هەڵوێستی دەوڵەتە هاوپەیمانەکانیش بەرامبەر کورد و بەرامبەر ڕووداوەکانی دوای سیڤەر و پێشبڕکێی دەوڵەتانیش هۆیەکی گرنگی تر بووە لەسەرنەگرتنی پەیمانی سیڤەردا شانبەشانی ئەوەش کەمالیەکان کە تا دەهات لەبەهێزبووندا بوون ئەوەندەی تر باری پەیمانی سیڤەری پێئاڵۆزبوو هەروەکو لەشوێنی خۆیدا باسیدەکەین و بەپێویستم زانی ئەم باسە بکەم بەم بەشانەی خوارەوە:

**یەکەم: هەڵوێستی تورکی پاشماوەی خەلافەتی عوسمانی لەئەستەمبوڵ و کەمالیەکان کە لەدواییدا ئەنقەرەیان کرد بەپایتەختی خۆیان.**

**دوهەم: هەڵوێستی دەوڵەتان.**

**دەربارەی هۆی یەکەم**

**أ-هەڵوێستی تورکەکانی پاشماوەی خەلافەتی عوسمانی لەئەستەنبوڵ:**

لەدوای تەواوبوونی شەڕی جیهانی و مۆرکردنی پەیمانی مودراس، کاروباری وڵات هەمووی کەوتە ژێر دەستی هێزەکانی دەوڵەتە هاوپەیمانەکان و ئەوەی لەئەستەمبوڵدا مابووەوە لەدەسەڵاتدارێتی پاشماوەی خەلافەتی عوسمانیدا تەنها بریتی بوو لەقاوغێکی وشکی مردوو، لەهیچ کاروبارێکدا هەنگاوێك نەدەنرا بەبێ ڕازیبوونی دەوڵەتە هاوپەیمانەکان و لەمۆرکردنی پەیمانی سیڤەردا نوێنەری خەلیفە بەناوی حکومەتەوە پەیمانەکەی مۆرکرد و پاشئەوە هەڵوێستی بەرامبەر بەکورد شتێك نەبوو حسابێکی ئەوتۆی بۆ بکرێت و تەنها سەیری دەمی دەوڵەتە هاوپەیمانەکانیان دەکرد بۆ چۆنێتی بەجێهێنانی مادەکانی سیڤەر و جاروبار لەڕۆژنامەکانیاندا تەقەلای ئەوەیانئەدا لەکورد بگەیەنن ئامادەن دان بەمافی کورددا بنێن لەچوارچێوەی پاشماوەی خەلافەتدا، بەتایبەتی لەدوائەوەی

کەمالیەکان وەکو بزوتنەوەیەکی تۆرانی کەوتە جموجۆڵ بۆئەوەی دەست بەسەر کاروباری وڵاتدا بگرێت، بۆیە ئەوانەی ئەستەمبوڵ هێشتا هیوایان بەکورد مابوو کە لایەنگری ئەوان بن دژی بزوتنەوەی کەمالیەکان هەروەکو لەباسی ڕووداو و بەسەرهاتەکاندا لەشوێنی خۆیدا ڕووندەبێتەوە.

### ب-هەڵوێستی کەمالیەکان بەرامبەر بەکورد

وەکو لەشوێنی خۆیدا باسمانکرد، نوێنەری حکومەتی ئەستەمبوڵ لەکاتی گفتوگۆکردنی پەیمانی سیڤەردا ڕێگەی پێدرابوو ئامادەبێت و کە دەوڵەتە هاوپەیمانەکان لەسەر نەخشەی پەیمانەکە ڕێککەوتن تەنها نوێنەری خەلیفە پەیمانەکەی مۆرکردبوو، چووبووە ژێر باری بەڵێندان بەبەجێهێنانی پەیمانەکە و لەوەدا کەمالیەکان حسابیان بۆ نەکرابوو، نوێنەریان لەکۆبونەوەکانی سیڤەردا ئامادە نەبوون و بێگومان ناوەڕۆکی پەیمانەکە لەگەڵ بیروباوەڕ و بۆچوونی کەمالیەکاندا یەکینەدەگرتەوە بۆیە هەر لەسەرەتاوە دژی پەیمانەکە بوون و تارادەیەکی زۆریش ژمارەیەکیان لەکورد لەخشتەبردبوو کە ئەوانیشی والێکردبوو دژی پەیمانەکە بن بەبیانووی ئەوەی لەو پەیمانەدا نەخشەی دامەزراندنی حکومەتی ئەرمەنیش کێشرابوو.

لەڕۆژنامەکانیاندا کوردیان بەوە دەترسان ئەگەر پەیمانەکە سەربگرێت بەشێکی زۆری خاکی کوردستان دەچێتە ناو چوارچێوەی ئەو دەوڵەتی ئەرمەنیەوە، بەتایبەتی لەدوای بڵاوبوونەوەی ڕێکەوتنەکەی شەریف پاشا و نوبار بوغوص پاشا کە بەرلەمە باسکراوە ئەوەندەی تر شتەکە ئاڵۆزبوو، پڕوپاگەندەی تورکە کەمالیەکان لەلایەك و لەیەکنەچونی بیروباوەڕی تاقمەکەی کورد لەگەڵ یەکتردا بەتەواوەتی کۆمەڵگای کوردی تێکدا و بوو بەدوو بەشەوە کە هیچ لایەکیشیان هیچی نەکرد بەهیچ و ئەو ماوانەی بۆ سەرکەوتن و بەجێهێنانی پەیمانەکە دەستنیشانکرابوو بەخۆڕایی بەسەرچوو، ئەوەی لەمەدا قازانجی کرد تەنها هەر کەمالیەکان بوون وەکو لەدواییدا ڕووندەبێتەوە.

### ج-دەربارەی هۆی دووهەم/ هەڵوێستی دەوڵەتان لەسەرنەگرتنی سیڤەر

دەوڵەتانی دەستڕۆیشتوو ئەوانەی لەو ڕۆژانەدا هەریەکەیان بۆ دابینکردنی بەرژەوەندیەکانی خۆی لەناوچەکەدا هەڵوێستێکی تایبەتی خۆی هەبووە، هەوڵئەدەین لێرەدا کورتەی هەڵوێستی ئەو دەوڵەتانە بخەینە پێشچاو:

#### یەکەم-هەڵوێستی حکومەتی بەریتانیا

بەرلەمە لەباسی هۆی مۆرکردنی پەیمانی سیڤەردا بەدووروودرێژی باسی هەڵوێستی حکومەتی بەریتانیامان کرد کە چۆن ڕۆڵێکی گرنگی هەبووە لەمۆرکردنی ئەو پەیمانەدا و لێرەدا هەوڵئەدەین هەڵوێستی بەریتانیای دوای مۆرکردنی پەیمانەکە شیبکەینەوە بۆئەوەی بزانین هۆی ساردبوونەوەی لەسەرنەگرتن و بەجێهێنانی مادەکانی ئەو پەیمانە چیبووە، ئەگەرچی پێویستە بەرلەوەی ئەو هۆیانە باسبکەین دەبێ دان بەوەدا بنرێت کە ئۆباڵی ئەو سەرنەگرتنە لەپێش هەموو شتێکدا لەئەستۆی کورد خۆیایەتی و حکومەتی بەریتانیا و کاربەدەستانی بەریتانیا و هی دەوڵەتەکانی تریش کە بەچاوی خۆیان کوردیان بینی چۆن لەناو خۆیدا تێکچووبوو، بیری لەوە نەکردبووەوە لیژنەیەك لەچەند کەسێکی کارامە پێکبهێنێت بۆ بەجێهێنانی مادەکانی سیڤەر و لەجیاتی ئەوە بەربوونە وێزەی یەکتر و کورد خۆی بەزەیی بەخۆیدا نەهاتەوە، ئیتر بێگانەیەك کە تەنها بەدوای چەسپاندن و دابینکردنی بەرژەوەندیەکانی خۆیدا دەگەڕا لەپێناوی چیدا مشوور و خەمی مافی کورد بخوات کە کورد خۆی پشتگوێی خستبوو.

ئەو سەرچاوانەی دەربارەی هەڵوێستی بەریتانیا دواون و لەدوکیومێنتەکانی ئەرشیفی حکومەتی بەریتانیادا ئەوەندە باسی نەگبەتی و کوێرەوەری میللەتی کوردی کردووە بەدەست کاربەدەستان و سیاسەتمەدارانی ئەو ڕۆژانە کە پیاو نازانێت باسی کامیان بکات، بۆیە هەوڵئەدەین کورتەی هەندێکیان بخەینە بەرچاو: بەر لەهەموو شتێك دەبێ بزانرێت کە حکومەتی بەریتانیا ئەگەرچی سەرپەرشتیکەری پەیمانی سیڤەر بووە و وەکو بەرلەمە باسمانکردووە موسوەدەی ئەو پەیمانە لەدوکیومێنتێکی بەریتانیادا باسکراوە کە ئەمە نیشانەی

ئەوەبووە ئینگلیزەکان بۆ سەرگرتنی مەبەستەکانی خۆیان وەکو شتێکی تەکتیکی مەبەستیان بووە ئەو پەیمانە مۆربکرێت بۆ گەیشتن بەو ستراتیجیەتەی نەخشەی بۆ کێشابوو، حکومەتی بەریتانیا بەتایبەتی ئەو سیاسەتمەدارانەی کاروباری ناوچەی ڕۆژهەڵاتیان پێسپێردرابوو، ئەو شتانەی دەیانوت و بڵاویان دەکردەوە شتێك بوو، ئەوەش کە مەبەستیان بوو سەربگرێت و بچەسپێنرێت شتێکی تربووە.

بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرا بۆ ئەو هەڵوێستەی بەریتانیا لەدوو شتدا ڕووندەبێتەوە، هەروەها وتمان ئینگلیزەکان خۆیان نەخشەی مادەکانی سیڤەریان کێشابوو کە لەمەدا باسی دامەزراندنی حکومەتێکی کوردی کراوە لەباکووری کوردستاندا لەگەڵ ڕێگەدان بەکوردی باشوور لەکاتی خۆیدا بچێتە پاڵ ئەو حکومەتە و هەردووکیان ببن بەیەك کەچی لەلایەکی ترەوە نەخشەی شتێکی تری کێشابوو کە سەرگرتنی ئەمەیان لا پەسەندتر بوو وەك لەوەی سیڤەر، بۆ نمونە هەروەکو سەرچاوە/١٩ ئاماژەی بۆ کردووە، ئەو تەلگرافەی ژمارە/٦٦٦٦ لەڕۆژی ١٩١٩/٦/١٣دا (یەعنی بەر لەمۆرکردنی پەیمانی سیڤەر) لەلایەن حاکمی گشتی بەریتانیاوە لەبەغداد، (ولسن) ناردبووی بۆ حکومەتەکەی خۆی لەلەندەن وتبوی: لەبەر گرنگێتی باری ئابووری و ستراتیجیەتی ویلایەتی موسڵ پێویستە ویلایەتەکە (مەبەست باشووری کوردستانە) بخرێتە سەر عێراق (کەواتە نەخشەکێشانی ئینگلیز هەر لەسەرەتاوە نیازیان نەبووە باشووری کوردستان بخرێتە سەر باکوور).

دەربارەی ئەو تەلگرافەی لەو سەرچاوەیەدا باسکراوە، بەرلەمە لەباسی سێهەمی بەشی چوارەمدا (هۆی مۆرکردنی پەیمانی سیڤەر)، ئاماژەمان بۆ کتێبەکەی (ولسن) کردووە چاپی (١٩٣١) کە لەوەدا وتویەتی: سیر پرسی کوکس (کە لەدوای ولسن بووە بەمەندوبی سامی بەریتانیا لەبەغداد) نەخشەیەکی ئامادەکرد بۆ دواڕۆژی عێراق و بەپێی ئەو نەخشەیە مادەکانی سیڤەر پشتگوێ خرابوو، باشووری کوردستانی خستبووە ناو چوارچێوەی دەوڵەتی عێراقەوە کە ئەو نەخشەیەی لەمانگی دیسەمبەری ١٩٢٠دا ئامادەکردبوو (یەعنی چوار مانگ بەسەر مۆرکردنی سیڤەردا تێپەڕی نەکردبوو).

هەڵوێستێکی تری حکومەتی بەریتانیا لەدوکیومێنتێکی تردا ژمارە -E ١٢٤٧٤) ٣-٤٤-No.١٣٤٩) ڕۆژی ١٩٢٠/٩/٢٨ یەعنی نزیکەی مانگ‌ونیوێك دوای مۆرکردنی

سیڤەر لەفەقەرەی ٦ی ئەو دوکیومێنتەدا باسی یاداشتێکی (مستەر ریان-Ryan)ی تیادایە کە لەو یاداشتەدا وتراوە: ئەوەی لەئارادایە دەربارەی کورد شتێکی ئەوتۆ نییە کە شایانی بایەخ پێدان بێت چونکە بەپێی بۆچوونی هەندێ لەکوردەکان ناتوانرێ بۆچونەکانیان لەهی تورکەکان جیابکرێنەوە (مەبەستی ئەو کوردانەیە چووبوونە ناو ئەنجومەنەکەی مستەفا کەمال و لەکۆنگرەکانی ئەرزڕۆم و سیڤاسدا بەشداربوون) کە ئەمانە بەتەواوەتی لەژێر دەسەڵاتی تورکە نەتەوەییەکاندان، هەندێ کوردی تر لەژێر سایەی پیاوە ئایینیەکاندان و لایەنگریانن (مەبەست تاقمی شێخ عەبدولقادری شەمزینییە) و کەمێکیشیان دژی تورکن (anti Turk)، هەرچەند ئەمانە لەناو خۆیاندا یەکنەگرتوون بەڵام حکومەتی خاوەنشکۆ دەتوانێت دژی کەمالیەکان بەکاریانبهێنێت، هەروەها دژی بولشەویکەکانیش.

کوردەکان زۆر پەست و بێزارن لەوەی پەیمانی ئاشتی (لاموایە مەبەستی سیڤەر بووبێت) پانتاییەکی داناوە بۆ کوردستان بەڵام بەشێکیشی داناوە بخرێتە چوارچێوەی ئەو ناوچانەی دەخرێنە ژێر دەسەڵاتی فەرەنساوە و لەو سنوورەش دڵنیانین و بەگومانن کە بۆ نێوان کورد و ئەرمەنی دەستنیشانکراوە و ئەو شوێنە کوردنشینانەی خراونەتە ناو سنووری ئەرمەنیاوە کوردەکانی تەواو هەراسان و بێزار کردووە چونکە ئەرمەنیەکان زۆر سەرگەرمن بۆ ئایینی کریستیانێتی.

دەربارەی هەڵوێستێکی ڕوون و ئاشکرای حکومەتی بەریتانیا بەرامبەر بەکورد، دکتۆر فوئاد حەمەخورشید لەسەرچاوە/١٩دا باسی کتێبەکەی (لازارییف)ی کردووە (ئیمپریالیزم و مەسەلەی کورد چاپی مۆسکۆ ساڵی ١٩٨٩ کە لەلاپەڕە (٢٦٥)یدا وتراوە: (لەکۆنفرانسی مانگی شوباتی (١٩٢١)دا (لوید جۆرج)ی وەزیری دەرەوەی بەریتانیا بەتورکیای ڕاگەیاند کەوا ڕووداوەکانی دوای سیڤەر کاریانکردۆتە سەر مەسەلەی کورد و ئەرمەنی بۆیە دەبێ مەسەلەی هەردوولایان چاوی پیابگێڕرێتەوە).

(دکتۆر مارف گوڵ عومەر)یش لەگۆڤاری (ڕابوون)ی ژمارە/١٦ی ساڵی ١٩٩٤دا باسی داخوازیەکی حکومەتی ئێرانی کردووە کە لەدیسەمبەری ١٩٢٢دا لەگفتوگۆکانی لۆزاندا داوای لەبەریتانیا و فەرەنسا و ئیتاڵیا کردبوو لەکاتی دەستنیشانکردنی سنووری ناوچە کوردیەکاندا (مەبەست ئەو سنوورەیە کە بەپێی مادەکانی سیڤەر بۆ کورد دەستنیشانکرابوو)، پێویستە بەرژەوەندی

حکومــەتی ئێـران بخرێتــە بەرچـاو، لەوەڵامیـدا وەزیـری دەرەوەی بـەریتانیا پێی‌دەڵێت: ئیتر مەسەلەی پێکهێنانی دەوڵەتی کوردی یاخود ناوچەی ئۆتۆنۆمی بۆ کورد لەتورکیادا هەروەکو لەسیڤەردا دەستنیشانکرابوو لەئارادا نەماوە.

لەکۆتاییـدا باسـی هەڵوێسـتی بـەریتانیا بەرامبـەر بـەکورد و چـۆنێتی ساردبوونەوەی لەلایەنگرێتی سەرگرتنی پەیمانی سیڤەر و بەشێکی ئەو ڕاپۆرتە گرنگـەی (راولنسـن) وەردەگێـڕین بـۆ کـوردی و لـەو ڕاپۆرتـەدا دەردەکـەوێت کـە لــەدوکیومێنتی ژمــارە (C.O.٧٣٠-٢٨) مــانگی مایســی ١٩٢٢دا تۆمــارکراوە دەردەکەوێت چۆن حکومەتی بەریتانیا گێڕی گۆڕیبوو بەرەو لای تورکەکان و ئەو هەڵوێستە تازەیەی بوو بەهۆی ئەوەی بەتـەواوەتی مافی کورد پشتگوێ بخات و لەپـەیمانی لۆزانـدا (وەکـو لەدواییـدا باسـێکی تایبـەتیمان بـۆ تـەرخانکردووە) بەئاشکرا دژی داخوازیەکانی تورکە کەمالیەکان ڕانەوەستا وەکو جاران.

راولنسن لەبەشێك لەڕاپۆرتەکەیدا کە پەیوەندی بەم باسەوە هەیە وتویەتی: ((گرنگترین شتێك ڕوویدا بریتی‌بوو لەوەی لە ١٩٢١/١/٢٠ بەدواوە ئیتر بەساڵی نەرمونیانی هەڵوێستی بەریتانیا و ساردبوونەوەی دەژمێردرێت بۆ لایـەنگرێتی پـەیمانی سـیڤەر و چـۆن ئـیتر لەوسـاوە کاربەدەسـتانی حکومـەتی بـەریتانیا لەکۆبوونــەوەکانی لۆزانـدا بەتــەواوەتی مـافی کـورد و باسـی نەتـەوەی کـورد پشـتگوێخرا و سـەرکەوتنی تـورك بەسـەر یۆنانـدا (لەبەشـی شەشـەمدا باسـێکی تایبـەتیمان تـەرخانکردووە بـۆ ئـەو شـەڕەی تـورك و یۆنـان) بـوو بـەهۆی خۆکێشانەوەی فەرەنسا و ئیتاڵیاش بەرامبەر بەمادەکانی سیڤەر.

بـەپێی بۆچوونی (راولنسـن) لـەو ڕاپۆرتـەیدا تورکـەکان لـەبیری ئـەوەدا بـوون (کۆنفیدراسیۆن)یك لـەنێوان ئیسلامە سوننیەکاندا پێکبێت لە(بۆسفۆر)ەوە هـەتا (قەزوین) بگرێتەوە بەداغستانیشـەوە لەگـەڵ (باتوم) و (باکۆ) و لەئازەربایجانـدا و هـەمووی بخرێتـە ژێـر دەسـەڵاتی خۆیانـەوە. لێـرەدا (راولنسـن) دەپرسـێت: ئایـا بەرامبەر بەو نیازەی تورك ئاخۆ دەوڵەتە هاوپەیمانەکان یان هیچ نەبێ بەریتانیا بیر لەوە دەکاتەوە کارێکی وا بکرێت ئەو تورکە نەتەوەییانە لاوازبکرێن بۆئەوەی ئاسـایش لەناوچـەکەدا دابینبکرێـت؟؟ راولنسـن هـەرخۆی وەڵامـی پرسـیارەکە ئەداتەوە و ئەڵێت: باشترین شت بۆ ئەمە ئەوەیە حساب بۆ ناوچەکانی ڕۆژهـەڵاتی تورکیـا بکرێـت کـە لـەو ناوچـە کوردنشـینانەدا تورکـەکان لاوازن و دەتوانرێـت بـەهێزی کـورد هـەمووی داگیربکرێـت لەماوەیـەکی کەمـدا، بەتایبـەتی کوردەکـان

تەواو بێزارن لەهەڵوێست و ڕەفتاری ئێستەی تورکەکان و بەیارمەتیدانێکی چەك و بەپارەیەکی کەم دەتوانرێت سەرۆکە کوردەکان هانبدرێن و بنکەکانی تورکە نەتەوەییەکان داگیربکەن، بۆیە پێویستە هاوکاری لەگەڵ کورددا بکرێت و یارمەتی بدرێت و چەند پاپۆڕێکی بەریتانیا بگاتە کەناری دەریا و بەشەو چەند تەقەیەك لەو پاپۆڕانەوە بکرێت و بەمانە بەهەمووی دەتوانریٚ وا لەتورك بکرێت بێتە ژێربار و لەوە ئەگەن کە دوورنییە لەبەر لاوازیان لەناو خۆشیانا تێکبچن.

راولنسن لەڕاپۆرتەکەیدا چووەتە سەر باسی چۆنێتی ڕاپەڕینی کورد دژی تورك کە بەم جۆرە یاداشتی کردووە: پێویستە ڕاپەڕینی عەشیرەتەکانی کورد بەسەرکردایەتی (ئەیوب پاشا)ی سەرۆکی ناوچەی (OLTI) بێت کە توانای ئەوەی هەیە ناوچەی (ئەرزرۆم) بگرێت و لەولاشەوە (حسێن پاشای ئەلازگرد) دەتوانێت (Kara Kilis) یاخود (بایەزید) بگرێت و کوردەکانی دەرسیمیش کە ئێستە یاخیبوون دەتوانن (ئەرزنجان) بگرن (لەبەشی نۆهەمی ئەم بەرگەدا باسی ئەو ڕاپەڕینەی یەکەمی دەرسیم دەکەین).

دەربارەی ئەو پێشنیازانەی (راولنسن) لەو دوکیومێنتەدا بڵاوکراوەتەوە، (ڕۆبەرت ئولسون) لەلاپەڕە/٧٩ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٨٤ وتویەتی: (بەپێی بۆچوونی (لۆرنس)، بۆ سەرگرتنی ئەو پێشنیازانەی لەیاداشتەکەی (راولنسن)دا باسیانکردووە پێویستی بەبوونی چەند شارەزایەك هەیە و ئەبێ هێزێکی بێگانە بەو کارە هەستێت (مەبەستی لۆرنس ئەوەیە کە ئەو کارە تەنها بەکورد ناکرێت، بەڵکو دەبێ هێزێکی بێگانە هاوکاری کورد بێت ئەوسا سەردەگرێت)، هەروەکو چۆن سەرکەوتنی عەرەبەکان (مەبەستی ئەوەی حیجازە)، (٨) پاپۆڕ و (٥٠) ئەفسەری بەریتانی و (٥) ملیۆن ملیۆن پاوەندی بۆ تەرخانکرابوو لەگەڵ دانانی (١٥) ملیۆنی تر بۆ ئیحتیات ئەوسا کارەکەی عەرەب سەریگرت و ئەگەر بویسترێت ئەوەی کوردیش وەکو هی عەرەبەکان سەربگرێت پێویستە هەمان شتیش بۆ کورد تەرخانبکرێت کە ئەمەش هەندێ کێشەی لێپەیدا دەبێت لەگەڵ تورك و ئەرمەنیدا، بۆیە من (لۆرنس) ئەو تەقەلایەی راولنسن باسیکردووە بەشتێکی بێسوودی دەزانم (ئەوەی شایانی باسە بەرلەمە لەبەشی دوهەمی ئەم بەرگەدا کە بۆ هەڵوێستی دەوڵەتان ئەوەی بەریتانیا تەرخانکراوە باسی ئەوە کراوە (پرسی کۆکس) و (شیك بۆرگ) هەردووکیان پێشنیازەکانی (راولنسن)یان

پشتگوێ خستبوو هەروەکو چۆن لۆرنس ئەو تەقەلادانەی پەسەندنەکردبوو وە بەشێکی سەرنەگرتووی حساب کردووە.

(ڕۆبەرت ئۆلسون) لەکتێبەکەیدا بێجگە لەو بۆچوونەی (لۆرنس)، ئاماژەی بۆ باسێکی (ریدر بولارد) کردووە کە لەهەمووان زۆرتر ڕەخنەی لەپێشنیازەکەی (راولنسن) گرتووە چونکە لای وابووە ئەوەی ئەو باسیکردووە دەبێتە هۆی نیگەرانی و نارەزایی ئیسلامەکان لەبەشداربوونی تەقەلایەکی وادا دژی تورکیا، جگە لەوە لۆرنس وتویەتی: (ئەگەر هات و کوردەکان دژی تورك هاندران و لەکاتی شەڕدا واز لەکوردەکان هێنرا، ئیتر تورکەکان دەستدەکەن بەکوشتار لەناو کوردەکاندا بەبێئەوەی یارمەتیان بدەین و لایان لێبکەینەوە).

ڕۆبەرت ئۆلسون لەباسەکەیدا دەڵێت: لە ١٥ی مارتی ١٩٢١دا چەند کەسێکی لێپرسراو کۆبووبونەوە بۆ لێکۆڵینەوە و شیکردنەوەی پێشنیازەکەی (راولنسن) کە (شیك بورگ و لۆرنس)یشیان لەگەڵدا بوو، لەئەنجامدا بۆچوونەکانیان پەسەند نەکرد و ڕێبەری ئەنتلجسی بەریتانیا دەریبڕی کەوا کوردەکان لەگیرفانی تورکدان (مەبەستی ئەو کوردانە بووە لەکۆنگرەکانی ئەرزڕوم و سێواسدا بەشداریان کردبوو وە لەئەنجومەنی باڵای میللی تورکدا بووبوون بەهاوکاری کەمالیەکان کە ژمارەیان (٧٢) کورد بووە وەکو لەدواییدا باسدەکرێت).

لەهەمان ئەو دوکیومێنتەی ڕاپۆرتەکەی (راولنسن)ی تیادا بڵاوکراوەتەوە وتراوە: ((بولارد بە(شیك بورگ و چرچلی) ڕاگەیاند کە پێویستە (سیر پرسی کۆکس) مەندوبی سامی بەریتانیا لەبەغدا ئاگادار بکرێت، لەبەرئەوەی بەتەمای ئەوەنین کوردەکان دژی تورکەکان هانبدەین ئیتر پێویست بەمانەوەی مێجەر نویل نەماوە و مانەوەی خەلیل بەدرخان پاشاش کە هاتۆتە بەغدا پێویست بەمانەوەی ئەویش ناکات)).

دوکیومێنتەکە لەسەری ئەڕوا و دەڵێت: ((حکومەتی بەریتانیا هەمیشە هەوڵی ئەوەی دابوو گفتوگۆ لەگەڵ تورکەکاندا بکات و لەماوەی (٩-١٦ی مانگی مارتی ١٩٢١)دا لۆرد کرزنی وەزیری دەرەوە لەگەڵ (یوسف کەمال)ی وەزیری دەرەوەی تورك لەلەندەن چەند کۆبونەوەیەکیان کردبوو، بەڵام تورکەکان داخوازیەکانی حکومەتی بەریتانیایان پەسەند نەدەکرد چونکە تورکەکان دژی پێکهێنانی حکومەتێك بوون بۆ ئەرمەنیەکان و بەوەش قایل نەبوو هێزەکانی تورك بەرامبەر بەیۆنانیەکان بکێشێتەوە)).

## ٢-هەڵویستی حکومەتی فەرەنسا و ئیتاڵیا

لەکاتی گفتوگۆی پەیمانی سیڤەردا هێشتا هەڵویستی فەرەنسا و ئیتاڵیا بەرامبەر بەئینگلیزەکان تێکنەچووبوو، هێشتا هەردووکیان بەتەمای ئەوەبوون بەرژەوەندیەکانیان لەناوچەکەدا دابین بکەن، بەلاّم ساتێك بۆیان دەرکەوت حکومەتی بەریتانیا نەخشەی ئەوەی کێشابوو کە ببێت بەدەسەلاّتدار لەهەموو ناوچەکەدا بۆیە بەهەڵویستی پێشوویاندا چوونەوە و دەستیانکرد بەبەربەرەکانیکردنی بەریتانیا لەسیاسەتەکانیدا لەناوچەی ڕۆژهەلاّتدا بەتایبەتی دوابیەوەی بۆیان دەرکەوتبوو پەلاماردانی یۆنانیەکان بۆ سەر تورکیا بەهاندانی ئینگلیزەکان بوو بەمەبەستی تەواو لاوازکردنی تورکیا و هەروەکو (لونگریك) لەکتێبەکەیدا (Iraq from ١٩٠٠-١٩٥٠)، چاپی لەندەن ساڵی ١٩٥٧ باسیکردووە ئەو سەرکەوتنەی یۆنان لەسەرەتادا بەسەر تورکەکاندا وای لە(سنیۆر سفورزا)ی وەزیری دەرەوەی ئیتاڵیا کرد بەئاشکرا لەو کۆنفرانسەی لەپاریسدا بەسترا دژی یۆنانیەکان بوەستێت و ساتێك لەلەندەنیش کۆنفرانسێك بەسترا لەنێوان ماوەی ٢١ی شوبات هەتا ١٤ی مارتی ١٩٢١، لەوەدا فەرەنسا و ئیتاڵیا بەئاشکرا داوای ئەوەیانکرد پەیمانی سیڤەر دەستکاری بکرێت (لەڕاستیدا ئەو پەیمانە دەستکاری بکرایە یان نەکرایە هەرهەمان شت بوو چونکە وەکو ڕووداوەکان دەریانخستووە کورد لەقسە بەولاوە هیچی تری نەکردبوو، خەریکی کێشەی ناو خۆی بوو تا ئەوکاتەی بەجێهێنانی ماددەکانی سیڤەری تیادا دەستنیشانکرابوو، کە کاتیش بەسەرچوو هەموو ڕووداوە تازەکان لەسوودی تورکە کەمالیەکاندا بوو کە تادەهات یەك لەدوای یەك مەبەستە سەرەکیەکانی خۆیان دەهێنایەدی هەروەکو لەبەشی پێنجەمی ئەم کتێبەدا ڕووندەبێتەوە.

بێگومان باری نالەباری ئابووری ئیتاڵیا لەدوای شەڕی جیهانی هۆیەکی کاریگەر بوو هەڵویستی جارانی خۆی بگۆڕێت بەرامبەر بەتورکیا و ئەو پەیمانەی لەنێوان فەرەنسا و تورکیادا لە ٢٠ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٢١دا بەسترا کە بەپەیمانی (فرانکلین-ویلون) ناسرابوو، ئیتاڵیەکان بەهەلیان زانی و ئەوانیش لەتورکە کەمالیەکان نزیکبوونەوە و فەرەنسیەکان ئەو هێزەیان کە ژمارەی (٨٠ هەزار سەرباز بوو) بەرامبەر بەتورکەکان لە(سیلیزیا) هەموویان کێشایەوە و ئیتاڵیەکانیش پەیمانێکیان لەگەڵ تورکەکاندا مۆرکرد و هێزەکانی خۆیان

له(ئەدەنە) کێشایەوە کە بەرامبەر تورکەکان بوو، لەئەنجامی هەڵوێستی فەرەنسا و ئیتاڵیادا تورکەکان ئەو هێزانەی بەرامبەر هەردوولایان وەستاندبووی دوایئەوەی ترسی هیچ لایەکیان نەما ئەوانیش هێزەکانی خۆیان کێشایەوە بۆ ئەو شوێنانەی کە پێویستیان بوو، پاشئەوەی یۆنانیەکانیان شکاند و لە(ئەزمیر) دەریانکردن ئیتر دەستیانکرد بەبەجێهێنانی نەخشە تازەکەیان کە بریتی بوو لەپاشگەزبوونەوە بەرامبەر بەکورد و هەڵوەشانەوەی خەلافەت و مۆرکردنی پەیمانی لۆزان وەکو باسی ئەو ڕووداوە تازانە یەك لەدوای یەك دەکەین لەباسی داهاتوودا.

### ٣-هەڵوێستی سۆڤیەت

سۆڤیەت کە لەدوای شەڕ وازی لەو بەشە هێنابوو کە بەپێی پەیمانی (سایکس پیکۆ) بۆ ڕووسیای قەیسەری تەرخانکرابوو وە دەستیکردبوو بەرەخنەگرتن و هێرشبردن بۆ سەر دەوڵەتە هاوپەیمانەکان کە بەئیمپریالیزم و داگیرکەر ناویان دەبردن و لایانوابوو کەمالیەکان کە تازە کەوتبوونە خۆیان بۆ دەرکردنی هێزەکانی هاوپەیمانەکان لەتورکیا، بزوتنەوەکەیان بریتیبووە لەبزوتنەوەیەکی ئازادیخوازانەی دژ بەدەوڵەتە سەرمایەدارەکانی ولأتانی ڕۆژئاوا، تورکە کەمالیەکانیش لەسەرەتادا هەتا ڕادەیەك زیرەکانە ئەو هەڵوێستەی سۆڤیەتەکانیان قۆستەوە و لێیان نزیك بوونەوە و لە ١٩٢١/٣/١٦دا پەیمانێکی دوو قۆڵی لەنێوان سۆڤیەت و تورکە کەمالیەکاندا بەسترا و تورکەکان مۆڵەتی دروستبوونی حیزبی شیوعیان دابوو بەسەرۆکایەتی (حەقی بەهیج)، کە مامۆستا ڕەفیق حیلمی لەیاداشتەکانیدا لەباسی (حەقی بەهیج)دا وتویەتی کابرایەکی تۆرانی بوو، فڕی بەسەر ئازادیخوازیەوە نەبوو، ڕۆژنامە و بڵاوکراوەکانی ئەو حیزبی شیوعیەی تورکە کەمالیەکان لەوپەڕی چالاکیدا بووە و بۆ وروژاندنی باشووری کوردستان دژی کاربەدەستانی بەریتانیای لایەنگر ڕۆژنامەکانیان لەڕێگەی کەرکوکەوە دەگەیاند بەهەندێ شوێن لەباکووری کوردستاندا کە ئەمە سەرودڵی کاربەدەستانی بەریتانیای گرتبوو لەبەغدا و (ئەرنۆڵد ولسن)ی حاکمی گشتی بەریتانیا وەکو لەشوێنی تریشدا باسمانکردووە لەکتێبەکەیدا (Mesopotamia ١٩١٦-١٩٢٠)، چاپی لەندەن ١٩٣١، بێزاری خۆی دەربڕیبوو

بەرامبەر بەو چالاکیە کە وتبووی وای لێهاتووە خەڵك لەمانای (بولشەویك) بگات (هەر ئەو هەڵوێستەی ئەو ڕۆژانەی سۆڤیەت بوو کە لەدواییدا شێخ مەحمود لەسلێمانیەوە نامەیەکی ناردبوو بۆ سۆڤیەت و داوای یارمەتی لێکردبوو بۆ کورد هەروەکو لەلاپەڕە (٤١٨)ی بەرگی دوهەمی کتێبەکەی شێخ مەحمودا سەرچاوە/٨٠ باسی ئەو نامەیەی شێخ مەحمود کراوە.

لەڕاستیدا نەگبەتی کورد لەو ڕۆژانەدا کە پەیمانی سیڤەر لەئارادا بووە و کورد بەتەمای ئەوە بووە لەڕێگەی بەجێهێنانی مادەکانی ئەو پەیمانەوە بگات بەئاواتی خۆی و مادە (١٢)ی چواردە مادەکەی ولسنی سەرۆکی کۆماری ئەمریکا مافی میللەتی کورد بگرێتەوە، بەپێچەوانەوە سۆڤیەتەکان بوون بەدۆستی گەورەترین دوژمنی ئەو ڕۆژانەی کورد کە بریتی بوون لەکەمالیەکان کە تورکەکان نەك تەنها لەڕووی مەعنەویەوە سوودیان لەسۆڤیەت دەستگیربووبوو بەڵکو هەروەکو سەرچاوە/١٩ باسیکردووە تورکە کەمالیەکان لەماوەی (١٩١٩-١٩٢٢)دا نزیکەی (١٠٠) ملیۆن ڕۆبڵیان لەسۆڤیەتەکان دەستگیربووبوو.

دەربارەی ئەو دۆستایەتیەی نێوان سۆڤیەت و تورکە کەمالیەکان (ڕیچارد رالنیسون) لەلاپەڕە (٧٧)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٢٨ وتویەتی بێجگە لەو دەستکەوتانەی تورکەکان لەسۆڤیەت دەستگیریان بووبوو، تورکەکان ئیتر ترسی سۆڤیەتیان لەسەر نەما و هێزەکانیان کە لەسەر سنووری سۆڤیەت دایاننابوون کێشایانەوە و بەکاریانهێنا لەکوشتاری ئەرمەنیەکاندا.

ئەوەی شایانی باسە لەدوکیومێنتی ژمارە (Fo.٣٧١-٦٣٤٩)ی ساڵی ١٩٢٢دا لەلاپەڕە (١٥٤)دا دەربارەی ئەو پەیمانەی سۆڤیەت و تورك وتویەتی: ((لە ١٦ی مارتی ١٩٢١دا لەژێر دروشمی (لەپێناوی یەکێتی و هاوکاری دۆستانە و برایەتیدا) لەمۆسکۆ پەیمانێك لەنێوان تورك و سۆڤیەتدا مۆرکرا، نوێنەرانی تورك لەمۆرکردنی ئەو پەیمانەدا بریتی بوون لە: عەلی فوئاد پاشا و یوسف کامل بەگ و دکتۆر ڕەزا نوری بەگ کە هەموویان ئەندامی ئەنجومەنی باڵای میللی بوون لەو ڕۆژانەدا) و نوێنەری سۆڤیەت بریتی بوون لە (Tchitcherim) و (Djemal Korkmazoff) و ئەوەی وای لەسۆڤیەت کرد ئەو پەیمانە مۆربکات بڕوابوونی سۆڤیەت بوو بەئازادی میللەتانی دژ بەئیمپریالیزم و لەو پەیمانەدا سۆڤیەت بەڵێنی دابوو بەکەمالیەکان کە دان بەهیچ پەیمانێکدا نەنێت کە پەیوەندی بەتورکەوە هەبێت ئەگەر ئەو پەیمانە لەمیساقی میللیدا بڕیاری لەسەر نەدرابێت و

دژی تورك بێت، كە ئەم بەڵێنەی سۆڤیەت بوو بەهۆی ئەوەی سۆڤیەت دان بەناوەڕۆكی مادەكانی پەیمانی سیڤەردا نەنێت)).

لەپەرەگرافی/١ی ئەو دوكیومێنتەدا باسی یەكەم مادەی ڕێكەوتنی سۆڤیەتی بەمجۆرە كردووە: هەردوولا بڕیاری ئەوە ئەدەن هیچ كامیان پەیمان لەگەڵ لایەكی تردا نەبەستێت ئەگەر ئەو لایە دژی مادەكانی ئەو ڕێكەوتنە بێت و بڕیار لەسەرئەوە ئەدەن سنووری توركیا بریتی دەبێت لەو سنوورەی لەلایەن ئەنجومەنی بالآی میللی توركەوە كە توركەكان خۆیان پێیان وتوە (میساقی میللی) دەستنیشانكراوە (بەپێی ئەم میساقی میللییەی لەڕێكەوتنەكەیاندا باسیانكردووە ویلایەتی موسڵ دەكەوێتە ناو سنووری توركیاوە).

مادە/ ٢، ٣ی پەیمانەكە پەیوەندی بەكوردەوە نیيە، مادە/٤ هەردوولا سۆڤیەت و تورك دان بەوەدا دەنێن دانیشتوانی ئەو ناوچانەی ئەكەونە ڕۆژهەلآتی توركیا (كە مەبەستی ئەو بەشەی ئەرمینیا بووە كە لەژێر سایەی سۆڤیەتدا بوون و كورد و نەتەوەكانی تری نەگرتۆتەوە) مافی سەربەخۆییان هەیە لەبەڕێوەبردنی كاروباری ناوخۆیاندا، ئەمەی خوارەوە دەقی (مادە/٤)ە بەپێی دوكیومێنتەكە:

(The contraction Parties Recognized the right of independent and self government of eastern places).

دەربارەی ئەو پەیمانەی لەنێوان سۆڤیەت و توركدا مۆركرا جگە لەو دوكیومێنتە، لەهەندێ سەرچاوەی تردا لێیدواون و هەریەكەیان باسی چمكێكی ئەو پەیمانەیان كردووە، بۆ نمونە: لەلاپەڕە (١٨١)ی سەرچاوە/٤٤دا (الرجل الصنم) وتویەتی: ساتێك ئەو پەیمانە مۆركرا مستەفا كەمال لایەنگرانی خۆی ڕاسپاردبوو قردێلەیەكی سووربكەن بەقەڵپاغەكانیانا و بۆیمباغی سوور ببەستن بۆ نیشانەی دۆستایەتی و نزیكبوونەوە لەسۆڤیەت كە ڕەنگی سووریان كردبوو بەدروشمی خۆیان و هەر بەمستەفا كەمالیشەوە نەوەستابوو بەڵكو زۆری تر لاسایی ئەویان دەكردەوە.

بۆ نمونە نووسەری سەرچاوە/٤٤ ئاماژەی بۆ كتێبی (جانقایا-ناوی ئەو كۆشكە بووە مستەفا كەمال لەئەنقەرەدا تیایدا ژیابوو) كردووە لەنووسینی (فالح رفعت) كە تیایدا وتویەتی: ((ڕۆژێك (سید ناظم) كە نوێنەری ویلایەتی (توقات) بوو، بەبۆنەی دروستكردنی یانەیەكی تازەوە كۆبونەوەیەكی كردبوو زۆربەی ئەنجومەنەكەی مستەفا كەمال هاتبوون و لەو كۆبوونەوەیەدا (شێخ ثروت)

پێشوازی لەمیوانەکان کردبوو، پێی وتبوون شیوعیەت لەگەڵ ئایینی ئیسلامدا یەکدەگرێتەوە و دژی نیە، ئەبوبەکری یەکەم خەلیفەی ئیسلام شیوعی بوو چونکە لەدوایینەوەی بوو بەئیسلام هەموو پارەکانی بەسەر هەژارەکاندا دابەشکرد)).

دەربارەی (حقی بهیج)یش کە بەرلەمە باسمانکرد و مامۆستا ڕەفیق حیلمی وتویەتی تۆرانی بووە، لەلاپەڕە (١٨٢)ی سەرچاوە/٤٤دا وتویەتی: (حقی بهیج) بەیانێکی حیزبی شیوعی نارد بۆ هەموو سەرکردەکانی سوپا بەئیمزای مستەفا کەمال بۆئەوەی بیخوێننەوە و پەیڕەوی بکەن)، هەمان سەرچاوە/٤٤ باسی (عەلی فوئاد جیسو)ی کردووە کە یەکێك بووە لەسەرکردەکانی سوپای تورك و شانبەشانی مستەفا کەمال لەشەڕی ڕزگاریدا بەشداربووە، لەکتێبەکەیدا (مذکرات الکفاح القومی) وەکو وەرگێڕاوە عەرەبییەکەی ئەو سەرچاوەیە باسیکردووە وتویەتی: ((وا بەباش و پێویست زانرا لەژێر چاودێری حکومەتدا حیزبی شیوعی تورك لەسەرەتادا لە(٣٠) کەس پێکبێت کە فەوزی پاشا (مەبەست فەوزی چقماقچی بووە) و عەلی فوئاد پاشا و کازم پاشا ڕەفعەت و ئەنوەر بەگ تیایدا بەشداربن و جفرەی حیزبەکە لەلایەن (حقی بهیج)ەوە ئامادەکرا کە سکرتێری حیزبەکە بوو)).

لەسەرچاوە/٨٥دا کە نوسەرەکەی (Patrick Kinross)ە لەلاپەڕە (٢٦)ی کتێبەکەیدا دەربارەی ئەو حیزبی شیوعیەی لەتورکیادا پێکهاتبوو وتویەتی: لەو ڕۆژانەدا بیروباوەڕی مارکسی بەشێوەیەکی ئاشکرا لەئەنجومەنی میللیدا باسی لەسەردەکرا و ناوەڕۆکەکەی تاوتوێ دەکرا و لەئەنجومەنەکەدا دواکرا یاسایەك دەرچێت لەژێر ناوی (سوپای سەوز) و ئەو سوپایە لەشێوەی سوپای سووری ڕووس پێکهێنرا کە ئۆرگانی ئەو هێزە سوپاییە بریتی بوو لە(Yeni Dunya–کە ماناکەی دنیای نوێ دەگرێتەوە) و کار بەمەشەوە نەوەستا بەڵکو لە(ئەسکی شەهر)دا ئەنتلجسی سۆڤیەتیش پێکهات، لەشەڕی یۆناندا وا بڵاوبووەوە ترسی ئەوە هەبووە کە دوورنییە ئەو هێزە لەپشتەوە لەمستەفا کەمال بدات بۆیە زۆری پێنەچوو هەڵوەشێنرایەوە.

نوسەر ئەڵێ: ئەمەی مستەفا کەمال لەو ڕۆژانەدا کردی شتێکی کاتی بوو، زۆری پێنەچوو ئینگلیزەکان لەمستەفا کەمال نزیکبوونەوە و وایانلێکرد ئەو حیزبە هەڵوەشێنێتەوە و (مستەفا سوبحی) کە تورکێکی سۆشیالیست بوو لەگەڵ

(١٦) کەسی تر گیران و بەوجۆرە بەنزیکبوونەوەی مستەفا کەمال لەئینگلیزەکان ئیتر پێویستی بەدۆستایەتی سۆڤیەت نەما.

### ٤-هەڵوێستی ئەمریکا

ئەمریکا لەشەڕی جیهانیدا بەشداری نەکردبوو، لەڕووی ئابووریەوە لەهەمووان زۆرتر قازانجی کردبوو، قەرزێکی زۆری دابوو بەهەموولایەك و سوودێکی زۆری لەو قەرزدانە دەستگیربوو، بەڵام کە شەڕ بڕایەوە نەیتوانی بەرامبەر ڕووداوەکانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست گۆشەگیربێت و بەر لەهەموو شتێك سەرۆك کۆمارەکەیان کە (ویلسن) بوو چوارده مادەکەی خۆی بلأوکردەوە کە مادە/١٢ی بریتیبوو لەمافی چارەنووسی گەلان کە میللەتی کوردیشی دەگرتەوە و کە دەستیشکرا بەدامەزراندنی ڕێکخراوە جیهانیەکان، هەروەکو لەبەشی یەکەمدا لەباسی دروستبوونی کۆمەڵی نەتەوەکاندا (عصبة الأمم)، ویلسن ڕۆڵێکی گرنگی بینیووە و هەروەکو لەو باسەدا بەدووروودرێژی باسکراوە لەباسی دامەزراندنی (عصبة الأمم)دا باسی پێکهێنانی حکومەتی کوردیش خرابووە پێشچاو.

بەڵام زۆری پێنەچوو ویلسن نەخۆشدەکەوێت و لەهەڵبژاردنی سەرۆك کۆماردا کە نوێنەری (حیزبی جمهوری) بووە دەرناچێت و دیموکراتیەکان دەیبەنەوە کە ئەمانە سیاسەتێکی جیاوازیان هەبووە لەگەڵ سیاسەتی جمهوریەکاندا و بەپێچەوانەی ئەوان لایەنگری ئەوەبوون پەیمانی سیڤەر دوابخرێت. دەربارەی چۆنێتی دواخستنی پەیمانی سیڤەر، سریا بەدرخان لەلاپەڕەکانی (٣٥-٣٦)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٧٩ باسی ئەوەی کردووە چۆن دەوڵەتە هاوپەیمانەکان داخوازیەکەی سەرۆکی تازەی ئەمریکایان بەجێهێنا بەدواخستن و بەسەرنەگرتنی پەیمانی سیڤەر کە لەو ناوەدا تەنها کورد و ئەرمەنی زیانیان پێکەیشت.

دەربارەی ڕۆڵی ئەمریکا، سریا بەدرخان لەکتێبەکەیدا ئاماژەی بۆ ڕاپۆرتێکی (M. Auguste Benand)ی فەرەنسی کردووە کە ئەفسەرێکی ئەکادیمی (Liguillon) بووە کە لەڕاپۆرتەکەیدا وتویەتی: ((لەساڵی ١٩١٩دا حکومەتی فەرەنسا موافەقەتی لەسەرئەوە کرد (١٢) هەزار سەرباز بنێرێت بۆ ئەرمینیا و کۆلۆنێل (Bromand)ی ڕاسپارد دەستبکات بەڕێکخستنی سوپای ئەرمینیا لەکیلیکیا (کە کیلیکیا بەپێی پەیمانی سایکس پیکۆ بەر خۆی کەوتبوو)، بەڵام بەهۆی ئەو فڕوفێڵانەی ڕێکخرابوو، بۆچوونەکەی ئەمریکا سەریگرت (کە بریتیبووە

لەدواخستنی سەرگرتنی پەیمانی سیڤەر) و لەکاتێکدا ئێمە خۆمان دەمانویست ئەو هێزەمان بنێرین کەچی ئەمریکاییەکان بلاّویانکردەوە ئەوان خۆیان دەیانەوێ هێزێکی خۆیان بنێرن بۆ ئەرمینیا. بەوجۆرە ئەو بەسەرهات و کارەساتەی ئەرمەنیەکان تووشیبوون هەمووی دەکەوێتە ئەستۆی ئەمریکاییەکانەوە (کەوا دیارە خۆشیان هیچ هێزێکیان نەناردبوو بۆ ئەرمەنیەکان)، هەرچەند ئێمە بەرامبەر بەوە بێدەنگ نەبووین و بێزاری و نارەزایی خۆمان ئاشکراکرد کە دواخستنی بەجێهێنانی پەیمانی سیڤەر ئەو کارەساتەی لێپەیدابوو)).

سریا بەدرخان هەروەکو لەکتێبەکەیدا ڕوونیکردۆتەوە دواخستنی پەیمانی سیڤەر و سەرنەگرتنی هەروەکو لەو ڕاپۆرتەدا ئاماژەی بۆ کراوە گەورەترین خزمەتی پێشکەش کرد بەتورکە کەمالیەکان کە توانیبوویان لەو ماوەیەدا خۆیان کۆبکەنەوە و خۆیان بەهێزبکەن و توانیبوویان بەسەر یۆنانیەکاندا سەربکەون. سریا بەدرخان لەلاپەرە (٣٦)ی کتێبەکەیدا باسی پڕوپاگەندەکانی تورکە کەمالیەکانی کردووە چۆن لەو ڕۆژانەدا باسی ئەمریکاییەکانیان بلاّودەکردەوە چۆن دەیانویست پەیمانی سیڤەر دوابخەن.

سریا بەدرخان باسی ئەو ئەمریکاییانەی کردووە کە لەو ڕۆژانەدا لەئەستەمبوڵدا دەژیان و چۆن میسنێرەکانیان خەموخەفەتی ئەوەیان دەخوارد کە ڕێگا نەدرابوو بەتورکە کەمالیەکان حکومەتەکەیان ببێت بەئەندام لەکۆمەڵی نەتەوەکاندا (عصبە الامم) و ئەو ئەمریکاییانە بەئاشکرا پێیانەوە دیاربوو کە وای بۆ چووبوون سەربەخۆیی کورد و ئەرمەنی مەترسیەکی زۆری هەبووە بۆ بوژاندنەوەی (Hellenism—نەتەوایەتی هیلینی مەبەست نەتەوەی یۆنانە)، وە ئەو ئەمریکاییانە ترسی ئەوەیان لێنیشتبوو بەسەرکەوتنی ئەوانە زیانێکی زۆر بەبەرژەوەندیەکانی ئەوان دەگەیەنێت و ئەمریکایی واهەبوو وەکو (D.Gate) و (Bristol) بەئاشکرا و بێپێچوپەنا پڕوپاگەندەیان بۆ تورکەکان دەکرد و (D.Gate) نامەیەکی لەتەلّعەت پاشاوە پێگەیشتبوو (تەلّعەت پاشا یەکێك بووە لەو تاوانبارانەی دەستێکی بالاّیان هەبووە لەکوشتاری ئەرمەنیەکاندا) کە بدرێت بەنوێنەری ئەمریکا لەپاریس بۆئەوەی کارێکی وابکرێت ئەمریکا ببێت بەتاقە هێزێك بەشێوەیەکی شەرعی ببێت بەسەرپەرشتیکەری (Mandate—منتدب)ی تورکیا.

تورکـەکان هەرچـەند دەیـانزانی ئـەو پێشـنیازەی خرابـووە پێشچـاو بـۆ سەرپەرشتیکردنی تورکیا لەلایەن ئەمریکاوە شتێك نەبوو ئومێدی سەرکەوتنی تیادا بێت بەلام دەیانویست سوود لەبەسەربردنی کات وەربگرن چونکە دەزانرا ئەگـەر ئـەوە سـەریبگرتایە نـاوی دەوڵەتـە هاوپەیمانـەکان بەتـەواوەتی دەزڕا لەناوچەکانی ڕۆژهەلاتدا، تورکەکان تـەنها بـەوە ئومێدیان هـەبوو ئـەو پێشـنیازە دەبێتـەهۆی تێکچـوونی دەوڵەتـە هاوپەیمانـەکان لـەناو خۆیانـدا (کـە لەڕاستیدا تاڕادەیـەك تەقـەلای تورکـەکان بێسـوود نـەبوو لـەڕووی تێکچـوونی دەوڵەتـە هاوپەیمانـەکان لـەناو خۆیانـدا هـەروەکو بەرلەمـە باسـی نـاڕێکی فەرەنسـا و ئیتاڵیامان کرد لەگەڵ حکومەتی بەریتانیادا).

هەرچـەند سـریا بـەدرخان باسـی هـۆی ئـەو بایـەخ پێدانـەی ئـەمریکای زۆر بـەکورتی کـردووە کـە بریتی‌بـووە لەهەڵوێسـتی ئەمریکاییـەکان و میسـیۆنەرە ئەمریکاییەکان کە لەئەستەمبوڵدا بوون لـەو ڕۆژانـەدا، بـەلام هـیچ گومـان لـەوەدا نییـە هـەروەکو چـۆن ئینگلیزەکـان و فەرەنسیەکان ماوەیـەکی زۆربـوو خـەریکی کۆکردنـەوەی زانیـاری بـوون دەربـارەی ڕۆژهـەلاتی ناوەڕاسـت کـە بـوونی نـەوت لەناوچـەکەدا شـتێك نـەبووە سـەرمایەدارانی ئـەمریکاش وەکـو کۆمپانیـا و سـەرمایەدارەکانی بـەریتانیا و فەرەنسـا بایـەخیان پێنـەدابێت، کۆمپانیـا و سـەرمایەدارەکانی ئـەمریکا مەبەسـتیان بـووە جگـە لەسـوودوەرگرتن لەنـەوتی ناوچـەکە، ئـەو قەرزانـەیان دەسـتبکەوێتەوە کـە دابوویـان بـەو دەوڵەتانـەی لەشـەڕەکەدا بەشـداربوون کـە بێگومـان تورکیـا یـەکێك بـووە لـەو قەرزاربارانـەی دەبووایە قەرزەکانیان بەسوودەکانیشەوە بدەنەوە بەئەمریکا.

ئەمریکاییەکان بەهیوای ئەوە بوون تورکەکان توانای ئەوەیان هەبێت ویلایەتی موسـڵی پـڕ لەنـەوتیان دەسـتگیربێتەوە و لایـانوابوو ئـەو کۆمپانیـا نەوتـەی کـە عوسمانی بەشێکی بەناوی ئەوەوە بوو شتێك نەبوو گاڵتەی لەگەڵ بکرێت و ئەگەر تورکیا ئەو بەشەی خۆی دەستگیربێتەوە ئەمریکاییەکان دەتوانن سودێکی زۆریان لێدەستگیربێت کە کۆمپانیای (ستاندر ئویل)ی ئەمریکی لەو ڕووەوە لەو ڕۆژانەدا لەوپەڕی چالاکیدا بـووە، دەربـارەی ئەمـە لەلا ـەڕە (١١٥)ی دوکیـومێنتی ژمـارە (Fo.٣٧١-٦٣٤٤)ی مـانگی مایسـی ١٩٢٢ باسـی کۆبونەوەیـەك دەکـات کـە لـە ١٩٢٢/٥/٢دا بەسەرۆکایەتی (شیك بورگ) بەس ترابوو ـ ـەدا وتراوە: ((شـەریکەی ستاندر ئویلی ئەمریکی هـانی تورکـەکان ئەدات واز لەو ـلایـەتی موسڵ نەهێنن، چونکە حکومـەتی ئـەمریکا دەیـەوێ بەشـێك لەنـەوتی موسـڵی دەسـتگیربێت و لـەو

کۆبوونەوەیەدا ئەوە خرایە بەرچاو ئایا ئەگەر بەشێك بدرێت بەئەمریکا ئیتر واز لەهاندانی تورکەکان دەهێنێت)).

بۆ نەهێشتنی ئەم مەترسیە، هەروەکو دوکیومێنتەکە باسیکردووە وەزیری موستەعمەرات (کە لەو ڕۆژانەدا چرچل بووە) داوای لەوەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا کرد کە لەوە بکۆڵێتەوە ئایا ئەگەر پەیوەندی بەتورکە کەمالیەکانەوە بکرێت و بدرێت بەگوێیاندا کە دەتوانرێ چاو بەمادەکانی پەیمانی سیڤەردا بخشێنرێتەوە و دەستکاری مافەکانی کورد بکرێت (بێگومان ئەمە بۆ ئەوە بووە تورکەکان بەڕەسمی واز لەویلایەتی موسڵ بێنن و بەمە ڕزگاریان بێت لەمەڵپە و تەقەلاکانی ئەمریکا).

لەڕاستیدا سیاسەتی بێکۆڵدان و درێژخایەنی کاربەدەستانی بەریتانیا کارێکی وایکرد هەروەکو چۆن دەستی فەرەنسیەکانیان بڕی و بەشتێکی کەم ئەو لە ٢٥٪ نەوتەی کە پەیمانیان پێدرابوو بەنرخێکی هەرزان لەدەستیان دەرهێنان و ئەو بەشە مێژووییەش کە تورکەکان تا ماوەیەك سووربوون لەسەری، کاربەدەستانی ئینگلیز تورکەکانیشیان خەڵەتاند و (هنری دوبس) لەنامەی ژمارە ٩٨٨ی ڕۆژی ١٩٢٦/٥/١١دا بۆ حکومەتی عێراقی ناردبوو داوای لێکردبوو ئەو کێشەیە لەگەڵ تورکەکاندا چارەسەر بکرێت و (سیر ڕۆناڵد لیندسای) بڕیاریدا حکومەتی عێراق تەنها (٣٠٠) هەزار پاوەندی ئەستەرلینی بدات بەتورکیا و بەوە کێشەکە بڕایەوە، بەڵام لەلایەکی ترەوە ئەگەرچی سیاسەتی حکومەتی ئەمریکا و سەرمایەدار و کۆمپانیاکانی سەرگەرمی لایەنگرێتی کەمالیەکان بوون بەڵام ڕۆژنامە و گۆڤارەکان و هەندێ لەسیاسەتمەدارانی ئەمریکا لەدەماری تورکەکان و لەدڕندەیەتیان گەیشتبوون.

بۆ نمونە (ریچارد ڕالینسۆن) لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/ ٢٨ باسی ڕۆژنامەی (Literary digest)ی مانگی مارسی ١٩٢٠ی کردووە کە تیایدا وتراوە: (بڕواناکەم هیچ ڕۆژنامەیەکی ئەمریکی لای وابێ باری ژیانی دانیشتوانی تورك ڕوو لەباشی دەکات). هەمان سەرچاوە/ ٢٨ باسی ڕۆژنامەیەکی تری کردووە (NewYork Tribune) کە دەربارەی تورك وتویەتی: (تورك کە پیشەی جەردەیی و پیاوکوشتنە و ئالوودەی خوێنڕشتنە هەمیشە دژی هەموو جۆرە پێشکەوتن و شارستانیەتیەکە).

ڕۆژنامەیەکی تری ئەمریکی (The Philadelphia inourer) لەسەروتارێکدا وتبووی: (تورکەکان لەو جۆرە خەڵکە نین بەرەو ڕەوشتی باش بڕۆن و لەوانەش نیە چاکبکرێن و جێگەی بڕواش نین کە هیچ بەڵێنێکی خۆیان ببەنەسەر). هەمان سەرچاوە باسی ساڵنامەی فرنگستانی زانیاری سیاسی ئەمریکا کردووە کە لەتەموزی ١٩١٩دا وتویەتی: (تورکەکان لەدڕندەیەتیاندا هەروەکو مرۆڤەکانی سەدەی ناوەڕاست ڕەفتاردەکەن و بەکۆمەڵ خەڵك ئاوارە دەکەن بۆ چۆڵ و بیابانەکان و کوشتن و بڕین و تالآنی لای ئەوان شتێکی بێسنوورە و ئەتکی شەرەف و ناموسی ژنان و برسیکردنی دانیشتوانی گوندەکانیان لەلا شتێکی ئاسان و ئاساییە).

تا ئێرە باسی ئەو هۆیانە بوو کە کورد لەئەنجامیاندا زیانێکی زۆری لێکەوت بەسەرنەکەوتنی پەیمانی سیڤەر و ئەگەرچی هەروەکو دکتۆر قاسملۆ لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/١٦ باشی بۆچووە کە وتبووی پەیمانی سیڤەر پەیمانێکی شلۆق و لاوازبوو، هەر لەسەرەتاوە کەموکوڕیەکانی دەرکەوتبوو بەلآم لەڕاستیدا هۆی سەرەکی سەرنەگرتنی پەیمانەکە دەکەوێتە ئەستۆی کورد خۆی وەکو لەشوێنی خۆیدا بەدووروودرێژ لەکەموکوڕیەکانی کورد دواین و بایەخنەدانی کورد بەبەجێهێنانی قۆناغەکانی سیڤەر لەکاتی خۆیدا هەلێکی باش و لەباری بۆ تورکە کەمالیەکان ڕەخساند کە پەیمانەکەیان مۆرنەکردبوو، دانیان بەناوەڕۆکەکەیدا نەنابوو، سۆڤیەت لەمەدا خزمەتێکی زۆری تورکەکانی کردبوو، بەلآم ئەگەر کورد بەبەڵێنەکانی حکومەتی بەریتانیا هەڵنەخەڵەتایە و هەنگاو بەهەنگاو ئەوەی پێویست بوو بۆ بەجێهێنانی پەیمانەکە بیکردایە و ناکۆکی نێوان ڕیزەکانی خۆی نەبوایە بەهۆی دواخستنی، تورکەکانیش بەئاسانی ئەوەی مەبەستیان بوو بۆیان نەدەچووەسەر و ئەو ئالوگۆڕەی سەر هەڵوێستی دەوڵەتە هاوپەیمانەکاندا ڕوویدابوو نەدەبوو بەهۆی لەکیسچوونی ئەو هەل و دەرفەتە مێژووییە و لەو ڕووەوە (بوانکارە)ی سەرۆك وەزیرانی فەرەنسا باشی بۆچووبوو کە وتبووی: (پەیمانی سیڤەر لەخانووی کارگەیەکی کاشی و فەرفوریدا مۆرکرابوو، کە لەکاتی خۆیدا سەرینەگرت وەکو یەکێك لەکاشیەکانی ئەو کارگەیە شکا و لەدەستچوو).

# بەشی پێنجەم

## بزوتنەوەی کەمالیەکان

لەدوای تەواوبوونی شەڕی جیهانی و مۆرکردنی پەیمانی (مودراس) لەنێوان دەوڵەتە هاوپەیمانەکان لەلایەك و لەلایەن نوێنەری حکومەتی تورکی پاشماوەی خەلافەتی عوسمانی لەلایەکی ترەوە، بەمۆرکردنی ئەو پەیمانە ناوی حکومەت هەر بەناو و وەکو شتێکی ڕەمزی مابوو، کاربەدەستانی دەوڵەتە هاوپەیمانەکان کە دەستیان بەسەر هەموو کاروبارێکی وڵاتدا گرتبوو بەتایبەتی ئینگلیزەکان بەوپەڕی لوتبەرزیەوە لەگەڵ دانیشتوانی وڵاتدا هەڵسوکەوتیان کردووە و بەچاوێکی سووکەوە دەیانڕوانیە کاربەدەستە تورکە بێدەسەڵاتەکان، هەندێ سەرچاوە لایانوایە خەلافەتی تورك لەئەستەمبوڵ لەسەرەتادا خۆی بووبوو بەهۆی ئەوەی بزوتنەوەیەکی دژ بەدەوڵەتە هاوپەیمانەکان لەوڵاتدا سەرهەڵبدات و بەناوی چەککردنی هێزەکەی (کازم قەرەپاشا) کە دەوڵەتە هاوپەیمانەکان لێی ڕازی نەبوون حکومەتی ئەستەمبوڵ مستەفا کەمالیان ناردبوو هەروەکو پشکنەرێکی گشتی ئەو چەککردنەی کازم قەرەپاشا ئەنجامبدات و ئەحمەد تەقی کە لەو ڕۆژانەدا ئەفسەرێك بووە لەناو سوپای عوسمانیدا لەیاداشتەکانیدا سەرچاوە/٦٩ لەباسی ئەو ڕۆژانەدا وتویەتی:

ساتێك مستەفا کەمال لەگەڵ چەند ئینگلیزێکدا نێردران بۆ چەککردنی هێزەکەی کازم قەرەپاشا، مستەفا کەمال لەجیاتی ئەوەی لەگەڵ کازم قەرەپاشادا لەسەرئەوە ڕێککەوتن ئەو ئینگلیزانە بگرن و بەهەردوولا بڕیاریاندا (کۆنگرەی ئەرزڕووم) ببەستن بۆ چارەسەرکردنی باری وڵات و لەیەکەم کۆبونەوەی ئەرزڕومدا (١٠٠) هەزار لیرە کۆکرایەوە بۆ یارمەتیدانی مستەفا کەمال و لەو ڕۆژانەدا کوردەکان (بێگومان هەندێکیان) ئامادەبوون لەگەڵ شەیتانیشدا ڕێکبکەون بەمەرجێك لەئینگلیز و ئەرمەنیەکان ڕزگاریان بێت و بەوجۆرە ژمارەیەکی زۆری کورد بەخۆیان و چەکەکانیانەوە چوونە پاڵ چەکدارەکانی مستەفا کەمال (لەڕاستیدا ناڕازیبوونی کورد لەئینگلیزەکان بەهۆی ئەوەوە بووە کە لایانوابووە دەبن بەلایەنگری ئەرمەنیەکان کە کۆنە قینێکی کۆن هەبووە لەنێوان ئەو کوردانەی لەدەسەڵاتدارێتی ئەرمەنیەکان سڵەمیبوونەوە و ترسی ئەوەیان

هەبووایـە تۆڵـەی پێشـووی خۆیانیـان لێبکەنـەوە کـە هەنـدێکیان بـەوە تاوانبـار کرابوون لەکاتی عوسمانیەکاندا بووبوون بەهاوکاری تورکەکان لـەو کوشتارانەی لێیـانکرابوو وەکـو لەشـوێنی خۆیـدا دەچینە سـەر ئـەو باسـە و بەدووروودرێـژی لێی‌دەکۆڵینەوە).

ئەحمـەد تـەقی لەیاداشـتەکانیدا لەسـەرینەڕوا و ئـەڵێت: ((لەسـەرەتادا کـە مستەفا کەمال تەواو بەهێز نەبووبوو، پێویستی بەیارمەتی و هاوکاری کوردەکان هـەبوو لەگـەڵ کوردەکـان ڕێککـەوتبوو ئیدارەیـەکی برایانـەی هاوبـەش پێکبێـنن بەوپێیە (بویوك مجلسی–کە مەبەستی ئەنجومەنی باڵای میللی‌یە) پێکهێنرا)). بۆ ئاسانکردنی ئەم باسە دەیکەین بەم چەند بەشەی خوارەوە:

یەکەم: پڕۆگرام و پەیڕەو و ئامانج و مەبەستە سەرەکیەکانی کەمالیەکان.

دوهەم: ژیانی مستەفا کەمال و چۆنیەتی دەرکەوتن و سەرکەوتنی.

سـێهەم: کۆنگرەکـانی ئـەرزڕوم و سـێواس و مـۆرکردنی میسـاقی میللـی و هاوکاریکردنی کورد لەم ڕێکخراوانەدا.

## یەکەم/ پڕۆگرام و پەیڕەو و ئامانج و مەبەستە سەرەکیەکانی کەمالیەکان

دەربـارەی دەستنیشـانکردنی بیروبۆچـوون و دەستنیشـانکردنی پرۆگـرام و پـەیڕەو و ئامـانج و مەبەسـتە سـەرەکیەکانی کەمالیـەکان، (ڕیچـارد ڕالینسـۆن) لەسەرچاوە/٢٨دا باسـی کۆبونەوەیـەکی کـردووە کـە لـەمانگی تـەموزی ١٩١٩دا کرابـوو بەسـەرۆکایەتی مسـتەفا کـەمال، نەخشـەی پرۆگـرام و پـەیڕەوی خۆیـان دەستنیشـانکرد کـە بریتـی بـوون لـەو بڕیارانـەی لـەم شـەش خاڵانـەی خـوارەوە باسکراون:

١-ئەو شوێنانەی لەپەیمانی (مـودراس-کـە پـەیمانی شـەڕ وەستاندن بـووە)دا بڕیاریـان لەسەردرابوو بەهیچ شێوەیەك لەوڵات جیاناکرێتەوە و ڕێگەی دابەشکردنیان نادرێت.

٢-ئەگەر هات و بڕیاری پارچە پارچەکردنی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی درا پێویستە بەهـەموو شێوەیەك بەرەنگاری ئەو بێگانانە ببینەوە کە وڵات پارچە پارچە دەکـەن و ڕێگـەیان پێنـەدەن مەبەستەکانی خۆیان لەو ڕووەوە بەجێبێنن.

٣-لەبەرئەوەی حکومەتی ئەستەمبوڵ توانا و دەسەڵاتی پاراستنی سەربەخۆیی وڵات و میللەتی نەماوە بۆیە پێویستە حکومەتێکی کاتی پێکبێت (کە بڕیاربووە لەکۆتایی ساڵی ۱۹۱۹دا ئەو حکومەتە کاتیە لەسێواس پێکبێت).

٤-نابێ هیچ جۆرە ئیمتیازێك بدرێت بەکریستیانەکان (کە بێگومان مەبەست ئەرمەنیەکان بووە کە ویسترابوو حکومەتێکیان بۆ دروست بکرێت) ئەگەر ئەو جۆرە ئیمتیازە زیان بەحاکمێتی سیاسی وڵات بگەیەنێت.

٥-نابێ هیچ جۆرە بڕیارێك قبوڵ بکرێت بەناوی (Mandate-انتداب)ەوە.

٦-پێویستە بەزووترین کات ئەنجومەنی میللی دامەزرێنرێت.

نووسەری سەرچاوەکە دەڵێ: ئەو ئەنجومەنە لەدواییدا لە ۱۹۲۰/۱/۲۰دا پێکهات (بەڵام لەسەرچاوە/۸۵دا وتراوە لە ۱۹۲۰/۲/۱۷دا ئەو ئەنجومەنە دامەزرا)، نوسەری سەرچاوەکە لەسەر باسەکەی دەڕوات و دەڵێت: زۆربەی ئەوانەی لەکۆبوونەوەی ئەنجومەنی میللیدا بەشداریان کردبوو پێیان دەوترا (میللیون-سەر بەمستەفا کەمال بوون و لەو ئەنجومەنەدا داواکرا ئەو باس و بەیاناتەی لەکۆنگرەی ئەرزڕوم و سێواسدا بڕیاری لەسەردرابوو هەموویان بەشێوەیەکی ڕەسمی بلاوبکرێنەوە.

لەلایەن ئەنجومەنەوە بڕیاردرا (میساقی میللی) ناوەڕۆکەکەی بریتی بێت لەمانەی خوارەوە:

أ-باسی چارەنووسی ئەو بەشانەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی کە زۆربەی عەرەبنشین بوون لەگەڵ بەشەکانی تری کە زۆربەیان موسڵمانن بکرێت (بێگومان کوردیش وەکو بەشێکی موسڵمان ئەمە دەیگرتەوە).

ب-ئیعلانی سەربەستی و ئازادی هاتوچۆکردن لەدەریای ڕەشدا بەمەرجێك هیچ زیانێك بەئاسایشی ئەستەمبوڵ نەگەیەنێت.

ج-پێویستە مافی کەمە نەتەوەکان بپارێزرێت.

د-پێویستە نەتەوەی تورك بەتەواوەتی ئازاد و سەربەخۆ بێت.

لەدوای دەرچوونی ئەو بلاوبوونەوەیە دەوڵەتە هاوپەیمانەکان کە جاران زۆرتر دەستیان بەسەر ئەستەمبوڵدا گرت و حکومەتی سوڵتان لەڕێگەی (شیخ الاسلام)ەوە فەتوایەکی دەرکرد دژی میللیون و یۆنانیەکانیش فشارێکی زۆریان

خستەســەر تاقمەکــەی مســتەفا کــەمال. لــەڕۆژی ١٩٢٠/٤/٢٣دا میللیــون لەئەنجومەنی میللیدا کۆبوونەوە و مستەفا کەمال کرا بەسەرۆك و ئەویش بڕیاری دامەزراندنی حکومەتێکی دا و دروستیکرد و بڕیاردرا هیچ دەسەڵاتێك لەژوور دەسەڵاتی ئەم حکومەتەوە نەمێنێت.

نوسەری سەرچاوە/٢٨ لەلاپەڕە (٧٣)دا لەسەر باسەکەی دەڕوا و دەڵێت: زۆری پێنەچوو ژمارەیەکی زۆر لەوانەی هێشتا لەناو سوپای سوڵتاندا مابوون پەیوەندییان بەمیللیونەکانەوە کرد و پاشئەوەی سۆڤیەت و کەمالیەکان پەیمانە دووقۆڵیەکەی نێوانیان لەمانگی مارتی ١٩٢١دا مۆرکرد، ئیتر کەمالیەکان هێزەکانی خۆیان کە بەرامبەر سۆڤیەت بوو کێشایانەوە و دژی ئەرمەنیەکان بەکاریانهێنا و پاش ماوەیەکیش کە کەمالیەکان لە(ئەناتولیا) خۆیان بەهێزکرد و ڕوویانکردە دەردەنێل و ئینگلیزەکان ڕێگەیان پێگرتن، تورکەکان توانیان لەشەڕی (چەنا قەلعە)ی بەناوبانگدا ئینگلیزەکان بشکێنن و ئەو شکاندنەی ئینگلیز لەو شەڕەدا بوو بەهۆی بێزاربوونی ڕای گشتی لەبەریتانیادا و لەئەنجامدا (لوید جۆرج) ناچاربوو دەست لەکار بکێشێتەوە، لەوەوە وردەوردە ڕێگە بۆ مۆرکردنی پەیمانی (لۆزان) خۆشکرا کە سەرچاوەی ئەم باسەی لەلایەن (ڕیچارد ڕالینسۆن)ەوە بڵاوکراوەتەوە بریتی‌یە لەکتێبی (The Western Question in Greece and Turkey) هەروەکو خۆی باسیکردووە.

دەربارەی مادەکانی (میساقی میللی) لەسەرچاوەی پێشوودا باسی پێشەکی ئەو (میساقی میللی)یەی بەم شێوەیەی خوارەوە کردووە: نوێنەرانی ئەنجومەن (مەبەست ئەنجومەنی باڵای میللیە کە مستەفا کەمالی کردبوو بەسەرۆك)، بڕیاریانداوە سەربەخۆیی و پاشەڕۆژی وڵات بەپێی ئەم بڕیارانەدا بپارێزرێت و بەبێ سەرگرتن و بەجێهێنانی ئەم بنەمایانە ناتوانرێت درێژە بەمانەوەی وڵاتانی عوسمانی (مەبەست ئەوانەشە کە لەکیسیانچووە) بدرێت و پاراستنیان مسۆگەر بکرێت.

بێجگە لەو باسەی لەسەرچاوە/٢٨دا دەربارەی مادەکانی (میساقی میللی) کردووە، لەسەرچاوەیەکی تردا ژمارە/٨٥ نوسینی (Patrick Kinross) لاپەڕە (٥٣١)ی کتێبەکەیدا لەژێر ناوی (The National Pact–کە هەر میساقی میللی

دەگرێتـەوە)، باسـی شـەش مادەکـەی بـەم شێوەیەی خوارەوە کردووە کە دەڵێت ئــەویش لەسەرچــاوەیەکی فەرەنســیەوە وەریگرتــووە، کــە خوێنــەری بــەڕێز لەخوێندنــەوەی هــەردوو سەرچــاوەکەدا و لەبــەراوردکردنیان هەســت بــەجۆرە جیاوازیـەك دەکـات کـە ئەمـە نمونەیـەکی لەیەکنەچووی ئـەو باسـانایە لەلایـەن نوسەرانی بێگانەوە بەچەند زمانێك وەرگێڕاوە لەیەکێکەوە بۆ یەکێکی تر:

یەکەم: ئەو ناوچە عەرەبنشینانەی بەشێك بوون لەئیمپراتۆریـەتی عوسمانی و لەئەنجامی شەڕ وەستاندنی ڕۆژی ۳۰ی ئۆکتۆبەری ۱۹۱۸دا کەوتە ژێر دەسەڵاتی هێزەکانی دوژمنەوە، تـەنها مافی ئـەوەیان هەیـە بـەپێی دەنگدانێکی سەربەستانە مافی چارەنوسی خۆیان دەستنیشان بکەن و ئەو شوێنانەی تریش کە لەپـەیمانی شـەڕ وەسـتاندندا ناویـان هاتبێـت یـا نـەهاتبێت، لەوانـەی کـە ئـاینی ئیسـلام یەکیخسـتبوون (کـە ئەمـە کوردیشـی دەگرتـەوە) لەگـەڵ دەوڵـەتی عوسمانیـدا و ئەوانـە ڕێـزی یـەکتری دەگـرن هـەموویان مـافی نەتەوایـەتی و کۆمەڵایـەتی خۆیـان دەبێت (تەنها باسی مافی نەتەوایەتی و کۆمەڵایەتی کراوە لەم مادەیەدا نەك مـافی چارەنووس).

دووەم: ئـەو سێ سنجاقەی کـاتی خۆی بـەئارەزووی دانیشـتوەکانی بووبـوون بەبەشێك لەدەوڵەتی عوسمـانی بـەپێی دەنگـدانێکی ئـازاد کە لـەو ڕووەوە کرابـوو، ئێمە دوبارە داخوازی ئـەو سێ سنجاقە قبـوڵ دەکەینـەوە ئەگـەر بیانـەوێ بۆ ئـەو مەبەسـتە دوبـارە دەنگـدانێکی تـر بکەنـەوە (بەداخـەوە نـاوی ئـەو سێ سـنجاقە نەهێنراوە).

سـێهەم: پێویسـتە بەشـەکانی ڕۆژئـاواش (مەبەسـت ناوچـەی کیلیکیـا و ئـەو شوێنانەی تـر بووە کـە خرابوونـە ژێـر دەسـەڵاتی فەرەنساوە کە ڕەنگـە مەبەسـت سـوریاش بووبێـت)، دوبـارە دەستنیشـانکردنی چارەنوسـیان بـەپێی دەنگـدانێکی ئازاد ئەبێت.

چـوارەم: پێویسـتە شـاری ئەسـتەمبوڵی پایتـەختی خەلافـەتی ئیسـلامی و جێنشـین و پایتـەختی سـوڵتان لەگـەڵ دەریـای (مەڕمـەڕە) بپارێزرێن و دەریـای (بوسفۆڕ) کراوە بێت بۆ بازرگانی هەموولایەك.

پێنجەم: دەبێ مافی کەمەنەتەوەکان بپارێزرێت هەروەکو لەپەیمانەکاندا دەستنیشانکراون و پێویستە دراوسێ موسڵمانەکانیشمان سوود لەمە وەربگرن.

شەشەم: بۆ ئێمە مەرجێکی زۆر پێویستە هەروەکو وڵاتانی تر مافی سەربەخۆیی خۆمان هەبێت لەهەرشتێکدا و بۆ هەرشتێك کە بەرەو پێشکەوتنمان ببات و ڕێگا خۆشبکات بۆ باشبوونی باری ئابووری و چەسپاندنی ئەو سیاسەتەی لەگەڵ مافە ڕەواکانماندا یەکدەگرێتەوە و پێویستە بەرەنگاری هەموو شتێك ببینەوە کە ڕێگەی ئەمەمان لێبگرێت و نەیەڵێت ئامانج و مەبەستەکانمان بهێنێتەدی.

نوسەری سەرچاوە/٨٥ دوای باسی مادەکانی میساقی میللی دەڵێ: زۆری پێنەچوو کۆلۆنێل (ڕاولنسن) لەلەندەنەوە ئاگادارکرا هێزەکانی بکێشێتەوە و تەنها هەر لە(ساروقامیش) و (قارس) و ناوچە ئەرمەنیەکان سەرپەرشتی کاروبارەکان بکات و بەوجۆرە هێزەکانی بەریتانیا لە(ئەناتولیا)وە کێشرایەوە بۆ (باتوم) و پاشئەوەی (ڕاولنسن) کۆپیەکی (میساقی میللی) پێدەگات تورکیا بەجێدێڵێت و دەگەڕێتەوە بۆ لەندەن و لەوێ ئەو مەترسیانەی خستمە پێشچاو کە لەبزوتنەوەی کەمالیەکانەوە پەیدابووبوو، بەڵام تەنها توانیبووی (لۆرد کرزن) والێبکات نەختێك سەرنج بۆ پێشنیازەکانی خۆی و هەڵوێستەکان بەکێشبکات، بۆیە لۆرد کرزن (ڕاولنسن)ی دوبارە ناردەوە بۆ تورکیا بۆئەوەی بزانێت مستەفا کەمال بەچ جۆرە ئاشتیەك قایل دەبێت (کە لەڕاستیدا ئەمە سەرەتای پیاچوونەوەی ئینگلیزەکان بووە بەسیاسەتیاندا لەگەڵ تورکە قەومیەکان کە لەدواییدا هەمووی بەرەو سوود و قازانجی تورکەکان ملیدەنا).

بەرلەمە لەبەشی دوەمی هۆی سەرنەگرتنی پەیمانی سیڤەردا بەشێکی ئەو ڕاپۆرتەی (ڕاولنسن)مان خستە پێشچاو کە بەدووردرێژ پێشنیازە سەرنەکەوتوەکانی خۆی ناردبوو بۆ کاربەدەستانی حکومەتی بەریتانیا و لێرەدا باسێکی (ڕۆبەرت ئولسون) لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٨٤ باسێکی بۆ بزوتنەوەی کەمالیەکان تەرخانکردووە لەژێر ناوی: (The second time around British policy and Kurds from ١٩٢١-١٩٢٣) لەو باسەدا دەربارەی (ڕاولنسن) وتویەتی: ڕاولنسن کاربەدەستێکی سیاسی حکومەتی بەریتانیا بووە لەناوچەکانی ڕۆژهەڵاتدا

لەنێوان ساڵانی (١٩١٨-١٩٢٢)دا کە بۆ کارێکی تایبەتی نێردرابوو بۆ تورکیا (وەکو چۆن مێجەر نویلیشیان ناردبوو)، بەڵام لەلایەن کەمالیەکانەوە گیرابوو، لەدواییدا بەریاندا بەرامبەر بەوەی بەریتانیاش هەندێ لەو تورکانەی لەماڵتادا گیرابوون بەربدرێن کە (ڕاولنسن) لەماوەی ئۆکتۆبەری ١٩١٩ هەتا نۆڤەمبەری ١٩٢١دا لەزیندانی کەمالیەکاندا بووە.

بێجگە لەوەی (ڕۆبەرت ئولسون) دەربارەی (ڕاولنسن) باسیکردووە، لەدوکیومێنتێکی ئەرشیفی بەریتانیادا بەشێکی ئەو ڕاپۆرتەی (ڕاولنسن)مان بڵاوکردەوە کە پەیوەندی بەهەڵوێستەکانی حکومەتی بەریتانیاوە هەبووە لەهۆی سەرنەگرتنی پەیمانی سیڤەردا، لێرەدا بەشێکی تری ڕاپۆرتەکەی (ڕاولنسن) کە لەدوکیومێنتی ژمارە (C.O.٧٣٠-٢٨)، مانگی مارتی ١٩٢٢دا بڵاوکراوەتەوە دەیخەینە پێشچاو کە وتویەتی: تورکە کەمالیەکان هەتا بەهاری (١٩٢٠) دوژمنیان زۆربوو، بەڵام کە یۆنانیەکان هێرشیان بردە سەر خاکی تورکیا و هاوپەیمانەکان لە ١٩٢٠/٣/١٦دا دەستیان بەسەر ئەستەمبوڵدا گرت، ئیتر وردە وردە دژەکانی کەمالیەکان کەمبوونەوە و پاڵپشتیکردنی هاوپەیمانەکان بۆ یۆنان (کە لامواییە وەکو لەدواییدا لەو باسەی بۆ شەڕی تورك و یۆنان تەرخانکراوە دەردەکەوێت کە تەنها بەریتانیا سەرگەرمی یارمەتیدانی یۆنانیەکان بووە و فەرەنسا و ئیتاڵیا تیایدا بەشدارنەبوون) وە داگیرکردنی (ئەزمیر) لەلایەن یۆنانیەکانەوە ئیتر دژی ئەوانەی دژی کەمالیەکان بوو کپبووەوە و چالاکی (ئینتلجس)ی ئەو ئەڵمانیانەی تورکەکان بەکرێیانگرتبوون کارێکی تەواوی کردە سەر ئەوەی حکومەتی بەریتانیا ئەمە بەهەڕەشەکردن بزانێت بۆ سوود و بەرژەوەندیەکانی خۆی و لێرەدا بەرامبەر بەم هەڵوێستە تازەیە (ڕاولنسن) سێ پرسیاری خستۆتە پێشچاو:

١-ئایا سیاسەتی چەوت و ناڕێکی دەوڵەتە هاوپەیمانەکان بوو بەهۆی تەبایی و یەکگرتن و بەهێزکردنی تورکەکان لەژێر سەرکردایەتی تورکە قەومیەکاندا؟

٢-ئایا تورکە نەتەوەییەکان هەتا چ ڕادەیەك بڕیارەکانی دەوڵەتە هاوپەیمانەکانیان پشتگوێخست و تا چ ڕادەیەك لەوەدا سەرکەوتن؟

٣-ئایا تورکەکان لەو یەکگرتنەیاندا بەوەیان زانیبوو کە گەیشتبوونە ڕادەیەکی ئەوتۆ حسابیان بۆ بکرێت و لەمەدا چییان دەستگیربوو؟

(ڕاولنسن) هەرخۆی وەڵامی ئەو پرسیارانەی بەمجۆرەی خوارەوە داوەتەوە:

وەڵامی یەکەم: بەڵێ سیاسەتی پڕ لەهەڵە و کەموکوڕیی هاوپەیمانەکان کارێکی وایکردبوو تورکەکانی والێکردبوو ناکۆکیەکانی ناوخۆیان بخەنە لاوە، بەتایبەتی پەیمانی سیڤەر بۆی دەرخستبوون خاکی وڵاتەکەیان سنوورەکەی تەواو تەسك دەبێتەوە و دۆستایەتیان لەگەڵ سۆڤیەتدا وایلێکردن باوەڕ بەخۆیان بکەن و واز لەناکۆکیەکانی ناوخۆیان بێنن.

وەڵامی دوهەم: بەڵێ، تورکەکان بڕیارەکانی هاوپەیمانەکانیان پشتگوێخست و (ڤارس)یان گرت و بەسەر ئەرمەنیەکاندا سەرکەوتن و توانیبوویان ژمارەیەك لەئینتلجسی خۆیان بنێرن بۆ ئەفغان و هیندستان و فەلەستین و میسر بۆئەوەی لەو شوێنانەدا پڕوپاگەندە دژی حکومەتی بەریتانیا بلاّوبکەنەوە.

وەڵامی سێهەم: تورکەکان لەوە دڵنیابوون یۆنانیەکان ئەو توانا و دەسەڵاتەیان نیە هەتا سەر بتوانن هەڕەشەیەکی ئەوتۆ لەپاشەڕۆژی تورك بکەن کە ببێتە هۆی لەناوبردنی و لەوەش گەیشتبوون هاوپەیمانەکان نایانەوێ دەستدرێژی بکەنەسەریان. (لەڕاستیدا تورکەکان لەوە گەیشتبوون کە هێزەکانی هاوپەیمانەکان بەهۆی شەڕی جیهانیەوە زۆر ماندوو بووبوون و قەرزێکی زۆریش بەسەریانەوە کەڵەکەی کردبوو، بۆیە ئەو دەوڵەتانە لەبەرخاتری سوودی یۆنانیەکان جارێکی تر سەربازی خۆیان نەدەدا بەکوشت و ماندانەکەی بەریتانیاش بریتیبوو لەجۆرە دەستبڕین و تووشکردنی یۆنانیەکان کە لەگەرمەی ئەو شەڕەدا بەدەنگ و هاواریانەوە نەچوون وەکو لەو باسەی لەدواییدا بەتایبەتی بۆ شەڕی یۆنان و تورکمان تەرخانکردووە).

## باسی دوهەمی بەشی پێنجەم

### کورتە باسێکی ژیانی مستەفا کەمال و چۆنیەتی دەرکەوتن و سەرکەوتنی

مستەفا کەمال لەدوایئەوەی بوو بەسەرۆکی کۆماری تورکیا و هەڵوێستی هەندێ لەدەوڵەتان و ئەو گۆڕانکاریانەی بەسەر بارودۆخی ناوچەکەدا ڕوویدا، بەهەموویان کارێکی وایانکرد مانەوەی تورکیا بەو شێوەیەی لەژێر سەرکردایەتی مستەفا کەمالدا لەنگەری گرتبوو ببێت بەمایەی بەهێزبوونی دەسەڵاتی مستەفا کەمال کە لەدواییدا لەناو تورکەکاندا بە(ئەتاتورك-باوکی تورك) ناودەبرا.

دەربارەی ڕەگەزی مستەفا کەمال و ناوی باوك و دایکی و ژیانی منداڵیی مستەفا کەمال لەگەڵێك سەرچاوەدا باسکراوە و ئەوانەی سەر بەوبوون هەوڵیانداوە ئەو کتێب و باس و نوسراوانە بەدرۆبخەنەوە دەربارەی ژیانی مستەفا کەمال دوابوون و باسەکانیان بەدڵ نەبووە، ئەوانە هەوڵیانداوە بەرپەرچی ئەو بڵاوکراوانە بدەنەوە هەرچەند هەندێك لەو نوسەرانەی باسەکانیان بەدڵی لایەنگرانی مستەفا کەمال نەبووە لەهەموو کەس زۆرتر شارەزای ژیانی بوون و لەمستەفا کەمال نزیك بوون و لەشەڕی ڕزگاربوونی تورکیادا دژی داگیرکەران هاوکاریبوون.

لەسەرچاوە ٤٤/دا (الرجل الصنم) لەنووسینی ئەفسەرێکی تورکی شارەزای زەمانی مستەفا کەمال باسی یەکێکی لەوانە کردووە کە نەیویستووە هیچ کەس ناوی مستەفا کەمال بەخراپی ناوببات کە ناوی (شوکت ثریا ئایدمیر) بووە و کتێبێکی تایبەتی بۆ ژیانی مستەفا کەمال تەرخانکردووە بەناوی (پیاوە تاکەکە) کە وەرگێڕانە عەرەبییەکەی سەرچاوە/٤٤ بە(الرجل الاوحد) ناویبردووە. (شەوکەت ثریا) لەکتێبەکەیدا وتویەتی مستەفا کەمال لەساڵی (١٨٨٠)دا لە(سالانیك) لەدایکبووە کە دایکی ناوی (زبیدە) بووە و نوسەری سەرچاوە/٤٤ دەڵێ ناتوانم بەدڵنیاییەوە بڵێم باوکی مستەفا کەمال کێ بووە، بەڵام شەوکەت ثریا هەوڵیداوە

لەباسی (زبیدە)دا بەو شێوەیە باسی نەکات کە سەرچاوەکانی تر باسیانکردووە کە لێیاندەدوێین.

سەرچاوە/٤٤ لەباسی (زبیدە)دا وتویەتی: ((بەشێوەی وێنەکەیدا دەردەکەوێت لەپێست سووروسپییەکان نەبووە و هەروەکو هەندێ سەرچاوە باسیانکردووە لەو تورکمانانە بووە کە پێیاندەوترا (یوروك) لەوانەی لە(قونیە) یا لە(ئایدن)ەوە چووبوون بۆ (روملی) و گوایا (عەلی ڕەزا ئەفەندی) مێردی (زبیدە) بووە و یەکێك بووە لەوانەی خۆبەخش بووە لەڕیزی (العساكر الملكیە)دا کە لەساڵی (١٨٧٦)دا لە(سالانیك) پێکهێنرابوو، ئەو وێنەیەی (عەلی ڕەزا) کە لەڕیزی سەربازەکاندا بینراوە دەریدەخست ئەویش دوبارە لەپێست سپییەکان نەبووە و لەهەمووی گرنگتر ئەوەبوو لەدوایدا کاتێك ئەو وێنەیەی عەلی ڕەزا ئەفەندی پیشانی مستەفا کەمال درا دانی بەوەدا ناوە کە ئەوە باوکی ئەو نەبووە.

سەرچاوە/٤٤ لەلاپەڕە (٣٧)ی بەرگی یەکەمیدا باسی کتێبی (جانقایا)ی کردووە لەنوسینی (فالح رفقی)، فالح ڕفقی خۆی وتویەتی: جارێك لەگەڵ مستەفا کەمالدا خۆی بەدەمی خۆی چرپانی بەگوێچکەمدا کە عەلی ڕەزا ئەفەندی باوکی ئەو نەبووە. هەروەکو سەرچاوە/٤٤ ئاماژەی بۆ کتێبەکەی (جانقایا) کردووە، لەلاپەڕە(٦٧)ی ئەم کتێبەدا فالح ڕفقی وتویەتی: ساتێك عەلی ڕەزا مردووە ئەوکاتە مستەفا کەمال لەتەمەنی (٦-٧) ساڵاندا بووە و دوورنی‌یە هێشتا باوکە ڕاستەقینەکەی خۆی مابووبێت بۆیە وتبووی عەلی ڕەزا ئەفەندی باوکی ئەو نەبووە کە لایەنگرانی وەکو (شەوکەت ثریا) ویستویانە ئەو بۆشاییەی ژیانی مستەفا کەمال بەوە پڕبکەنەوە و شەوکەت ثریا بەپێچەوانەی سەرچاوەکانی تر وتویەتی ئەو وێنەیەی عەلی ڕەزا کە لای زبیدە بوو خرایە بەردەستی مستەفا کەمال ماچیکرد.

سەرچاوە/٤٤ ئاماژەی بۆ یاداشتەکانی (دکتۆر نوری ڕەزا) کردووە کە پزیشك و نوسەرێکی سیاسی ئەو ڕۆژانە بووە و مامۆستا بووە لەکۆلێجی پزیشکی سوپایی و بەشداربووە لەبزوتنەوەی سەربەخۆیی تورکدا دژی هاوپەیمانەکان و یەکێك بووە لەئەندامانی ئەو لیژنەیەی پەیمانی سۆڤیەت و تورکیان مۆرکردبوو و جێگری سەرۆکی وەفدی تورك بووە لەگفتوگۆکانی (لۆزان)دا و ماوەیەك جێگری وەزیری دەرەوەی حکومەتەکەی مستەفا کەمال بووە، لەلاپەڕە (٥٧)ی

یاداشتەکانیدا بەرگی سێهەم وتویەتی: لەقوتابخانەی سربیەکاندا لە(سالانیك) قوتابیەکی تیابوو بەناوی (مستەفا-کە مەبەستی مستەفا کەمال)ە، عەلی ڕەزا ئەفەندی کە یەکێك بوو لەپاسدارەکانی گومرگی سالانیك (هەندێ سەرچاوە وتویانە لەدوایدا بووە بەئەفسەر لەسوپادا) مستەفای کردبوو بەکوڕی خۆی.

نوری ڕەزا باسی گەلێك ڕوایەتی کردووە دەربارەی عەلی ڕەزا کە گوایە بەڕەگەز سربی بووە یا بولغاری بووە، بەڵام ئەو نوسخە تازەیەی لەلایەن دائیرەی مەعاریفی فەرەنسی بەناوبانگ (لاروس)ەوە بڵاوکراوەتەوە لەوەدا وتراوە باوکی مستەفا کەمال لە(ئەلپوماك)ەکان بووە و پیاوە پیرەکانی (تسالیا) وتویانە دایکی مستەفا کەمال لەمەیخانەیەکدا ئیشی کردووە و ڕۆژێك کوڕێکی خەڵکی (ینی شهر) کە ناوی (ئابدوش ئاغا) بووە لەمەیخانەکەدا چاوی بە(زبیدە) کەوتووە و لەگەڵ خۆیدا بردویێتی بۆ شارەکەی خۆی و مستەفا کەمال لەوێ لەدایکبووە و پاشئەوەی تەمەنی مستەفا گەیشتوەتە پێنج ساڵ ئابدوش ئاغا مردووە و (زبیدە) گەڕاوەتەوە بۆ (سالانیك) و کە مستەفا تەمەنی دەگاتە (١٠) ساڵ دەچێتە شارەکەی ئابدوش ئاغا و داوای بەشەمیراتی باوکی دەکات کە ئابدوش ئاغا بووە بەڵام لەوەڵامی داخوازیەکەیدا پێی دەڵێن لەبەرئەوەی ئابدوش ئاغا باوکی شەرعیت نەبووە بۆیە بەشە میراتەکەی بەر تۆ ناکەوێت و دوایئەوە ئەوسا (زبیدە) شوویکردووە بە(عەلی ڕەزا) و دەبێت بەباوەپیارەی مستەفا.

دکتۆر نوری ڕەزا لەباسەکەیدا وتویەتی: ئەگەر مستەفا کەمال زۆڵیش نەبووبێت بەڵام باوکێکی ئاشکرا و ناسراوی نەبووە و دکتۆر نوری لەوبارەوە چەند سەرنجێکی خۆی دەربڕیوە کە وتویەتی:

١-لەڕووی (ئەنپرۆپۆلۆجی)یەوە مستەفا کەمال بەپێستی سپی و چاوی شین و بەکەللەی سەریدا کە لەشێوەی (دولیکوسفال)ی سلاڤیە دەردەکەوێت کە زۆر دووربووە لەوەی بەڕەگەز تورك بووبێت.

٢-لەدایکبوونی منداڵێک لەجۆری (دولیکوسفال) لەگەڵ جۆری (پراکتیکال)ی عەلی ڕەزا و (زبیدە)ی دایکیدا یەکناگرێتەوە.

٣-پەستی و نارەزایی (عەلی ڕەزا) لەژیانی خێزانیدا کە زانیویێتی مستەفا لەو نەبووە شتێکی ئاشکرا بووە.

٤-ڕەوشتی دایکی و جۆری ژیانی شتێکی ئاشکرابووە و ئەوەی لێوەشاوەتەوە کە باسیانکردووە دەربارەی.

٥-بێـدەنگبوونی مسـتەفا کـەمال لـەناوبردنی نـاوی بـاوکی و بایەخنـەدان بەباسـکردنی و ناونـەهێنانی بەڵگـەی ئەوەیـە باوکـە ڕاستەکەی خـۆی بـۆ سـاغ نەبووبووەوە.

نوسـەر ئـەڵێ سـەیر ئەوەیـە لەگـەڵ ئـەم هـەموو ڕاسـتیانەدا مسـتەفا کـەمال بـە(ئـەتاتورك) نـاوبراوە، فـالح ڕفقـی لەکتێبەکەیـدا (جانقایـا) بـەپێی کتێبەکـەی سەرچاوە/٤٤ وتویەتی: ((ئەم هەموو دەنگوباس و هەواڵانـەی دەربارەی نەزانینی بـاوکی ڕاسـتی مسـتەفا کـەمال بڵاوبووبونـەوە بووبـوو بەگرێکوێرەیـەك لـەژیانی مسـتەفا کەمالـدا و وایلێکـرد هـەتا مـردن ببێـت بەعـەرەقخۆرێکی هەمیشـەیی و ساتێك بوو بەئەفسـەر زۆربـەی کاتی خـۆی لەشوێنی ڕابواردنەکانی (بـەگ ئوغلو) کـە شـوێنی هەمەچـیزە و هەمـەجۆرە ڕابواردنێـك بـوو دەیبردەسـەر و سـاتێك بەئەفسەری گوێزرایەوە بۆ شام لەوێ شوێنی وەکو (بـەگ ئوغلو)ی لێنـەبوو، بۆیـە ئەوەندەی تر سەریکردە سەر عەرەقخواردن)).

دەربـارەی ئـەو عەرەقخواردنـە هەمیشـەییەی مسـتەفا کـەمال کـە لـەو سەرچاوەیەدا باسـکراوە، لـەو دوکیومێنتـەی لەشوێنی خۆیدا باسمانکردووە کە دەقی ڕێکەوتنی نێوان سۆڤیەت و تورکی تیادا بڵاوکراوەتـەوە، ئاماژە بـۆ ئـەوەش کـراوە کـە زۆر خواردنـەوەی مسـتەفا کـەمال لای سـۆڤیەتەکانی ئـەو ڕۆژە زۆر ئاشـکرابووە بۆیـە لـەدوای مـۆرکردنی پەیمانەکـە کارگەیـەکی دروسـتکردنی ڤۆدکایان بەتایبەتی ناردبوو بۆ مستەفا کەمال.

لەم ساڵانەی دواییدا بەبۆنەی ئەو هەڕەشە یەك لەسەر یەکەی سوپای تورك بۆ سەر باشووری کوردسـتانی دەکرد بـەبیانووی ڕاونـانی تیرۆریسـتەکانی کـوردی باکوور، لەسـاڵی ١٩٩٥دا ڕۆژنامـەی (Orlando Sentinel) کە لەئەمریکا دەردەچێت لەڕۆژی ١٩٩٥/٦/٤دا باسـی ئـەوەی کـردووە کـە سـاتی خـۆی لـەزەمانی مسـتەفا کەمالدا ڕۆژنامەی (دەیلی تەلگراف)ی لەندەنی باسی مستەفا کەمالی کردووە (کە دوور نییـە لـەکاتی شـۆڕشـی ئاگریـداغ یـان شـۆڕشـی دەرسیمدا بووبێـت) لـەوەدا (دەیلـی تـەلگراف) وتبـووی ئیمـڕۆ تورکیا لەلایـەن سەرخۆشـێك و یـانزە کەسـی ترەوە دەبرێت بەڕێوە، ساتێك مستەفا کەمال ئەوە دەبیستێت تەلگرافێك دەنێرێت بـۆ ڕۆژنامـە لەندەنیەکـە و پێیدەڵـێ: جـەنابی نوسـەر ئێـوە لەباسـەکەتاندا زۆر بەهەڵەدا چوون، چونکە تورکیا تـەنها لەلایـەن سەرخۆشێکەوە دەبرێـت بـەڕێوە کە خۆمم.

ڕۆژنامەکەی (ئۆرلاندو سینتینال) بەبۆنەی ئەو هێرشەی ساڵی ١٩٩٥ کە باسمانکردووە نوسیویێتی: ئەوەی باشە ئێستە هەروەکو جاران زمان درێژێکی وەکو مستەفا کەمال نەماوە هەواڵی ئەم دەستدرێژیکردنەی ئیمڕۆی تورک بەدرۆبخاتەوە. ئەوەی شایانی باسە ئەو سەرخۆشە و ئەو یازدە کەسەی (دەیلی تەلگراف) لەکاتی خۆیدا باسیکردووە بریتی بوون لەئەندامانی ئەو ئەنجومەنە سوپاییەی تورك کە تا ئیمڕۆش هەرماوە و پێیدەوترێت (ئەنجومەنی ئاسایشی میللی) و ئەو ئەنجومەنە هەروەکو جاران لەژوور هەموو یاسایەکەوەیە و هەموو شتێکی بەدەستە و هەتا ئێستە چەندین جار ئەنجومەنی وەزیران و پارلەمانی هەڵوەشاندۆتەوە لەهەر کاتێکدا کە لای وابووبێت لەڕێبازی ئەو ئەنجومەنی ئاسایشی میللیە دەجوڵێتەوە و کاردەکات.

دەربارەی ڕەوشتی مستەفا کەمال گەلێك نوسەری تورك کە زۆربەیان زۆر نزیك بوون لەمستەفا کەمال و ئاگاداری ژیانی و نهێنیەکانی بوون لەیاداشت و کتێبەکانیاندا بەبێ پێچ‌وپەنا گەلێك شتیان دەربارەی ڕوونکردۆتەوە، بەپێویستم زانی کورتەیەکی ئەو سەرچاوانە باسبکەم، یەکێك لەوانە کتێبێکی (٥٤٢) لاپەڕەیی لەسەر نوسیوە و بەشوێن گەلێك دوکیومێنت و سەرچاوەی باوەڕپێکراودا گەڕاوە (Patrick Kinross)ە کە هەموو کتێبەکەی بەناوی (Ataturk- The Rebirth of Nation)ەوە بەرلەوەی لەساڵی (١٩٧٦)دا بمرێت بڵاوکردۆتەوە لەوەدا لەلاپەڕە (٣٦٥)دا وتویەتی: ((مستەفا کەمال لەلایەکەوە دەیویست لەلای ئیسلامەکان خۆی بەپاڵەوان و پارێزەری ئاینی ئیسلام پیشانبدات و بەناوی خۆیەوە ڕایدەسپارد لەسەر منارەی مزگەوتەکان بانگەوازی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بەدەنگی بەرز بڵاوبکەنەوە، کەچی لای هەندێکی تر دەیوت لەمەودوا ئیتر پێویست ناکات نوێژی جومعە بەزمانی عەرەبی بکرێت، بەڵکو دەبێت بکرێت بەتورکی و مەرجیش نییە (وعظ) تەنها لەلایەن خەلیفەوە دەرچێت)).

هەمان نوسەر (کە دیارە تورکەکان تاڕادەیەك ڕێگەیان پێدابوو لەکتێبخانە و ئەرشیفە تایبەتیەکانی تورکیادا بگەڕێت بۆ ئامادەکردنی ئەو کتێبە)، چەند شتێکی دەربارەی مستەفا کەمال دەستگیربووە کە وتویەتی هەندێ لەقسەکانی مستەفا کەمال کێشەیەکی زۆری لێپەیدابووە لەکاتی خۆیدا و نمونەیەکی بۆ ئەمە هێناوەتەوە کە لەدەمی مستەفا کەماڵەوە بیستراوە کە وتویەتی: (جارێك لەئەناتولیا لەسەربازێکم پرسی: خوا کێیە و لەکوێ دەژی؟ لەوەڵامدا سەربازەکە

وتـی: مسـتەفا کـەمال خوایـە و لەئەنقـەرە دەژی!!، هـەروەها لەسـەربازێکی تـرم پرسی: مستەفا کەمال کێیە؟ لەوەڵامدا وتی: مستەفا کەمال سوڵتانە).

سەرچاوە (٤٤)یش باسی مستەفا کەمالی کردووە چۆن لەسەرەتادا خۆی وا پیشاندابوو دڵسۆز و سەرگەرمی ئایینی ئیسلامە و لەو ڕووەوە ئاماژەی بۆ کتێبی (نطـق) کـردووە کـە لەلاپـەڕە (٢٧٣)یـدا وتویـەتی مسـتەفا کـەمال لەسـەرەتادا بایەخێکی زۆری دابوو بەبۆنە ئاینیەکان بۆ دەستبڕینی خەڵك و لەوتارێکدا باسی ئەمانەی خوارەوەی کردبوو:

١-بەیارمەتی خودا و لوتفی خودا دەبێ لەپاش تەواوکردنی نوێژی هەینی ئەوسا ئەنجومەنی میللی گەورە لەئەنقەرە بکرێتەوە.

٢-کردنـەوەی ئەنجومـەن لـەم ڕۆژەدا نیشـانەی بەرەکـەت و پـیرۆزی ڕۆژی هەینی‌یە و دەبێ دوای کردنەوەی ئەنجومەن هەموو ئەندامان لەمزگەوتی (حاجی بایرام) سوود لەم ڕۆژە پیرۆزە وەرگرن و لەپاش سلاٌواتدان لەپێغەمبەری پیرۆز و لـەدوای نوێـژکردن ڕووبکرێتـە (مـزار شـریف) بـەئالآی سـنجاقەوە، (نوسـەر لەپەراوێزی لاپەڕەی ئەو باسەدا وتویەتی ئەو ئالآیە لەموناسەبەتە ئاینیەکانـدا هەڵـدەکرا) و بەرلـەوەی بچینە ژوورەوە بـۆ (مـزار شـریف) دوعـا بخوێنرێـت و قوربانی دابەشبکرێت و ڕیزێك سەرباز لەڕێگەی مزگەوتەوە هەتا (مزار شریف) بۆ ڕێزگرتن لەنوێژکەران ڕابوەستن.

٣-بۆ ڕێزگرتن لەم ڕۆژە پیرۆزە، لەم ڕۆژەوە ئیتر لەمەرکەزی ویلایەتدا لەلایـەن جەنابی (والی)یەوە دەستبکرێت بەخوێندنی قورئان و کتێبی (بخاری)ی شەریف و لەدوای نوێژ لە(مزار شریف)دا دوابەشی قورئان خەتم ئەکرێت.

٤-لەئێستە بەدواوە ناوی سوڵتان دەهێنرێت و دەبێت دوعای سەربەرزی و سەرکەوتنی خەلیفە بکرێت و لەهەموو ناوچەکانی وڵاتی زامدار و برینداردا دەبێ دەستبکرێت بەخوێندنی قورئان و (بخاری) و ڕوودەکرێتە دەزگاکانی حکومەت بۆ پیرۆزباییکردن لەدامەزراندنی ئەنجومەنی بالآی میللی.

٥-پێویستە ئەم ئامۆژگاریانەی لێیان دواوین بکرێت بەبەیانێکی ڕەسمی و بنێردرێت بۆ هەموولایەك و بچوکترین گوندیش ئەو بەیانەی پێبگات.

٦-داوا لەخوا دەکەین و لێی دەپاڕێینەوە سەرمانبخات.

سەرچاوە/٤٤ لەلاپەڕە (١٦٦)دا باسی هەڵوێستێکی تری مستەفای کردووە کە لـەدوای چـەند سـاڵێك لـە ١٩٧٤/٤/٢٩دا بەشـێك لـەو وتـارەی کـاتی خـۆی لـە

۱۹۲۰/٤/۲۳دا لەئەنقــەرە دابــوو، لەڕۆژنامـــەی (Ortagu)ی ڕۆژی ۱۹۷٤/٤/۲۹دا لەیەکـەم ڕۆژی کردنــەوەی ئەنجومــەنی بـاڵای میللیـدا دابـووی لـەوەدا وتبـووی: ((لەبەرئەوەی سوڵتان جێگری خەلیفەیە و لەبەرئەوەی سوڵتانەکەمان کە سەرۆکی کۆماری ئیسلامەکانە (کۆماری تورکیای بەکۆماری ئیسلامی ناوهێناوە) بۆیە ئێمە ڕوونیدەکەینــەوە خــەبات و تێکۆشـانمان بـەنیازی ئەوەنیـە دەسـەڵاتی دەوڵـەت لەمەقامی خەلافەت جیابکەینەوە، بەڵکو دەمانـەوێ لەدوژمنان بگەیەنین ئیرادەی میللـەت دژی ئـەو جیاکردنەوەیەیـە و بەهەوڵـدانمان لـەناو ئەنجومەنـدا دەمانـەوێ خەلافەت ڕزگاربکەین لەچنگی بێگانە)).

نوسەری سەرچاوە/٤٤ لەتێهەڵکێشی ئەو وتارەی مستەفا کەمالدا وتویەتی: ئەمە ئـەو قسانەیە مستەفا کـەمال بـەدەمی خـۆی وتویـەتی و بەدەستی خۆشـی نوسیوێتی کە پێیوتراوە (نطق)، ئایا درۆ و دەلەسە و دووڕوویی و ساختەچێتی تـر ماوە لەمـە زیـاتر؟!. هـەمان سەرچاوە لەسـەرینەڕوا و ئـەڵێت: لەمـەش سەیر و سـەمەرەتر ئـەو قسـانەی (مـەحمود ئەسـعەد بوزقـورت)ی وەزیـری عەدلیـەی کەمالیەکانە کە لەباسی قورئانـدا وتویـەتی ئـەوەی لەقورئانـدا باسکراوە هـەمووی بریتیـیـە لـە(شـریعـة الصـحراء-یاسـای دەشـتوبیابان) و هـەروەکو ڕۆژنامـەی (طـان)ی ڕۆژی ۱۹٤۰/۱۱/۱۰ بڵاویکردۆتـەوە هـەمان وەزیـر کـە وەختـی خـۆی وەزیری دارایی مستەفا کەمال بووە بەدەمی خۆی وتبووی جارێك لەگەڵ مستەفا کەمالـدا بڕیارمانـدا بچین بـۆ مزگـەوتی (حـاجی بـایرام)، مەلایـەك لەبـەردەمی مزگەوتەکەدا هاتـە بـەردەمی مسـتەفا کـەمال و ڕاوەسـتا، ساتێك مستەفا کـەمال لێیپرسـی چیت ئـەوێ؟ لەوەڵامـدا مەلاکـە دەسـتی بەرزکردەوە و پێیوت: بـەبێ خوێندنی دوعا نابێ بچنە ناو مزگەوتەکەوە، مستەفا کـەمال پاڵێکیـنا بەمەلاکەوە و پێیوت: وڵات بەچەکی سەربازەکانی ڕزگارکراوە نەك بەدوعا و پاڕانەوەی تۆ.

هەمان سەرچاوە/٤٤ لەسـەری ڕۆیشتووە و وتویـەتی: مستەفا کـەمال بـەپێی ڕۆژ قسەی دەکرد و لەیەکەم وتاریدا (نطق) خۆی وا پیشاندابوو عەبد و نۆکـەری سـوڵتانە و وایدەردەخسـت کـە بزوتنەوەکەشـی بەڕاسـپاردەی سـوڵتان بـووە بـۆ ڕزگارکردنی وڵات، کە ئەم قسانەی ئـەو ڕۆژەی هەمووی بـەپیتی عـەرەبی لەیەکەم فـایلی میللیـدا تۆمـارکرابوو بـەڵام لەدواییـدا کـە وەقائیعـە کۆنـەکان لەنوسـینە تورکیەکەیەوە بەپیتی عەرەبی کرا بەپیتی لاتینی ئەوەی لـەو کۆبونەوەیـەی یەکەم

ڕۆژدا وتبووی هەمووی لابرا و هەروەکو مستەفا کەمال لەو ڕۆژەدا ئەو قسانەشی نەکردبێت.

هەمان سەرچاوە/٤٤ لەلاپەڕەکانی (٤٩١-٤٩٣)ی بەرگی دوهەمی کتێبەکەیدا ئاماژەی بەدوکیومێنتێکی تورکی کردووە ژمارە (٢٩) کە دەقی ئەو دوکیومێنتە لەکتێبی (جانقایا)ی فالح ڕفقی‌دا بلاوکراوەتەوە کە تیایدا وتراوە: (مستەفا کەمال ماسۆنی بوو، لەزەمانی دەسەلاتداریێتی ئەودا ژمارەیەکی زۆر لەکاربەدەستانی زەمانی ئەو بەبێ‌ترس دەبوون بەئەندام لە(محفلی ماسونی)دا کە ژمارەیەك لەئەفسەرانی سوپاشیان تیادابوو، هەرچەند لەدواییدا مستەفا کەمال بەدرۆ و بۆ پینەکردن و شوێنەونی ئەو ئاشکرابوونەی بەناو ولاتدا بلاوبووبووەوە بۆ دەمکوتکردنی خەلك ئەو مەحفەلەی داخست).

بێجگە لەوەی وەکو ئەو سەرچاوەیە باسیکردووە مستەفا کەمال ماسۆنی بووە، پەیوەندیەکی زۆریشی هەبووە بەزایۆنیزمەوە هەروەکو لەدواییدا لەباسی (لۆزان)دا ڕووندەبێتەوە. مستەفا کەمال چ خۆی و چ هاوکارەکانی لەسەرەتادا کە هەموویان پەروەردەی (اتحاد و ترقی) بوون وەکو عیصمەت ئینونو، تەلعەت پاشا، ئەنوەر پاشا، جەمال پاشای سەفاح (خوێنڕێژ) بەئاشکرا دۆست و هاوکاری زایۆنیزمەکان بوون و بۆ ڕازیکردنیان لەهەلوێستەکانیاندا بەئاشکرا دژی ئیسلام و ئەرمەنی و ئاسوریەکان بوون و ڕۆژێك لەڕۆژان زیانێکیان بەو زایۆنیزمانە نەدەگەیاند کە بەئاشکرا لەناو ولاتدا لەچالاکیدا بوون.

لەسەرچاوەیەکی تردا ژمارە/٥٨ (تأريخ الدولة العلية العثمانية) باسێکی دەربارەی (صبری افندی)ی (شيخ الاسلام)ی تیادا بلاوکراوەتەوە دەربارەی مستەفا کەمال لەکاتی سەرەمەرگیدا و لەگیانی گیانەللادا وەسیەتی کردبوو نابێ لەدوای مردنی نوێژ لەسەر جەنازەکەی بکرێت و تەلقینی بدرێت، بەلام کە مرد خوشکەکەی بەدەست ماچکردن و پاڕانەوە توانیبووی مەلایەك قایل بکات نوێژی لەسەربکات.

هەمان (شيخ الاسلام) هەروەکو لەسەرچاوە/٥٨دا باسیکراوە، وتویەتی لەسالی ١٩٣١دا مستەفا کەمال قایل نەبووە بەوەی کە تورکیا وەکو دەولەتێکی ئیسلامی لە(مؤتمر القدس)دا بەشداربێت چونکە تورکیای بەدەولەتێکی ئیسلامی نەزانیر ،، هەروەکو (Patrick Kinross) لەسەرچاوە/٥٨دا لەلاپەڕە (٣٨٤-٣٨٥)دا باسیکردووە مستەفا کەمال نەیهێشتبوو تورکیا لەکۆنگرەی ئاسیەویشدا کە

لەدەلهی بەسترابوو بەشداری بکات چونکە تورکیای بەولاتێکی ئاسیایی نەدەزانی و ئەمیش ئاماژەی بۆئەوەی (صبری افندی شیخ الاسلام) کردووە.

لەوەش سەیرتر دەربارەی مستەفا کەمال ئەو باسەیە لەڕۆژنامەی (الاهرام)ی میسری لەشوباتی ساڵی ١٩٦٨دا بلأوکراوەتەوە و سەرچاوە/٤٤ دەقی ئەو باسەی بەمجۆرە بلأوکردۆتەوە: ((مستەفا کەمال بەر لەمردنی، باڵیۆزی بەریتانیا کە (پیرسی لورین) بووە هەڵبیژاردبوو ببێت بەجێگری خۆی و ڕۆژنامەی (Sunday Times) لەژێر ناوی (چۆن پیاوەکەی ئێمە کە مەبەست باڵیۆزی بەریتانیا بووە لەتورکیا) قبوڵی ئەوەی نەکردبوو ببێت بەسەرۆکی تورکیا))، ڕۆژنامەکە وتویەتی: بۆ ماوەی (١٥) ساڵ مستەفا کەمال تەقەلایەکی بێوچانیدا تورکیا والێبکات ببێت بەولاتێکی ئەورووپی، بۆ ئەو مەبەستە (فێست) لەسەرکردنی قەدەغەکرد، پەچە و ڕووپۆشی نەمێشت، دەسەلأتدارێتی ئایینی لەناودا نەمێشت، بڕیارێکی دەرکرد کە دەبێ زمانی تورکی تەنها هەر بەپیتی لاتینی بنوسرێت.

ئەو مستەفا کەماله لەمانگی نۆڤەمبەری (١٩٣٨)دا کە لەناو پێخەفی گیانەڵلأ و سەرەمەرگا بوو، ترسی ئەوەی لێنیشتبوو یەکێکی وا پەیدا نەبێت جێگەی خۆی بگرێتەوە، بۆیە (پیرسی لورین)ی باڵیۆزی بەریتانیای بانگکرد بۆ کۆشکی سەرۆکایەتی و ئەو گفتوگۆیەی لەنێوانیاندا کرا بۆ ماوەی (٣٠) ساڵ بەنهێنی مایەوە، بەلأم وا ئیمڕۆ پەردە لەڕووی ئەو نهێنیەوە هەڵماڵرا بەوەی وەختێك (بیر دیکسۆن)ی کوڕی (پیرسی لۆرین) ساتێك باسی باوکی کردووە لەو باسەدا ئاماژەی بۆ تەلگرافێکی باوکی کردبوو کە وەختی خۆی ناردبووی بۆ (لۆرد هالیفاکس)ی وەزیری دەرەوەی بەریتانیا کە وتویەتی ئەو تەلگرافە سەیرترین دوکیومێنتە لەمێژووی بەریتانیادا کە بەپێی ئەو دوکیومێنتە (پیرسی لۆرین) بەدووروودرێژ باسی ئەو گفتوگۆیەی خۆی و مستەفا کەمالی لەو تەلگرافەدا باسکردووە کە دەقی تەلگرافەکە بەم شێوەیە بووە: (ساتێك مستەفا کەمال ناردی بەشوێنمدا و گەیشتمە لای فەخامەتی، لەژوورەکەیدا دکتۆرێك و دوو برینپێچی لابوو، ئەوانەی ناردە دەرەوە و بەدەنگێکی نەرم و لەسەرخۆ پێیوتم بۆیە داوای هاتنی ئێوەم کردووە بۆئەوەی داخوازیەکی زۆر گرنگ و دەستوبردت لێداوابکەم و تکاشت لێبکەم داخوازییەکەم پەسەندبکەیت).

پرسی لۆرین لەتەلگرافەکەیدا لەسەری ڕۆیشتووە و وتویەتی: ئەوەی بەرلەمە بۆ مستەفا کەمالم کردبوو بریتیبوو لەو ئامۆژگاری و پێشنیازانەی چۆن وەزیرێکی خۆی بەوپەڕی سەربەستیەوە قسەی لەگەڵ دەکرد منیش بەوجۆرە وابووم لەگەڵیا و ڕاوێژ و پێشنیاز و بۆچوونەکانی خۆمم پێڕادەگەیاند و هەرئەمەش بوو ئەوەندە باوەڕی بەمن هەبوو لێم دڵنیابوو داوام لێبکات بەجێگری خۆی و منیش بەرامبەر بەو داخوازیە، پاش نەختێك بیرکردنەوە پێم وت ناتوانم و نازانم بەچ شێوەیەك ئەو وشانە بدۆزمەوە و هەستی خۆمیان پێدەربڕم بەرامبەر بەو هەست و هەڵوێستەی ئەو کە ئەوەندە جێگەی باوەڕ و دڵنیایی ئەوم.

لەداخوازیەکەیدا دەرکەوت کە نەك تەنها هەر ستایشی منی کردبوو، بەڵکو ستایشی حکومەتی خاوەنشکۆی بەریتانیاشی پێدەربڕیبوو، بەڵام ئا لەوکاتە زۆر ئاسکەدا بیرم لەجیاوازی بەڕێوەبردنی کاروباری سەرۆکی کۆمارێکی وەکو تورکیا دەکردەوە و بەراوردم دەکرد لەگەڵ بەڕێوەبردنی کاروباری باڵیۆزخانەکەی خۆمان و چۆن لەو بەراوردکردنەدا شارەزایی خۆمم زۆر لەوە بەرزتر دەزانی لەو سەرۆکیەی ئەو داوای لێدەکردم قبوڵی بکەم، بۆیە داوای لێبووردنم لێکرد و پێموت بەداخەوە ناتوانم داخوازییەکەی بەجێبێنم.

ساتێك مستەفا کەمال وەڵامەکەی منی بیست ڕەنگی هەڵبزرکا و تێکچوو، دەستینا بەزەنگێکدا و داوایکرد دەرمانی بۆ بێنن و کە هاتەوە سەرخۆی پێیوتم: کەوابێ لەدوایئەوەی هیوام لەتۆ بڕرا ناچار دەبم (عیسمەت ئینونۆ) بکەم بەجێگری خۆم و دەستی درێژکرد و تەوقەی لەگەڵدا کردم و سوپاسی کردم کە تا ئەوکاتە تەقەلایەکی زۆرم دابوو بۆ بەهێزکردن و پتەوکردنی دۆستایەتی بەریتانیا و تورکیا و بەجێمهێشت.

نوسەری سەرچاوە/٤٤ لەباسەکەیدا لەسەرینەڕوا و دەڵێت: بەپێی ئەوەی لەڕۆژنامەی (سەندەی تایمس)دا بڵاوکرابووەوە کە ڕۆژنامەی (ئەهرام)ی میسری لێیوەرگرتبوو، (پرسی لۆرین)ی مەندوبی سامی بەریتانیا لەتورکیا تەلگرافێك دەنێرێت بۆ وەزیری دەرەوەی بەریتانیا و لەو تەلگرافەدا بەدووروودرێژی باسی ئەو گفتوگۆیەی خۆی و مستەفا کەمالی پێڕادەگەیەنێت و پێیدەڵێ: (سوپاستان ئەکەم ئەگەر ئەو هەڵوێست و وەڵامەی منتان لا پەسەندە ئەوا ئاگادارم بکەن و ئەم باسەش عەرزی جەلالەتی مەلکی خاوەنشکۆ بکەن).

دەربارەی ئەم باسەی لەسەرچاوە/١٤٤دا بلاوکراوەتەوە، دوو سەرنج دێن بەبیردا:

یەکەمیان: هیچ دوور نییە مستەفا کەمال ئەو داخوازییەی کە لەکاتی سەرەمەرگدا بوویەتی هۆی ئەوە بووبێ تووشی نەخۆشی (خەڵەفاو)ی بووبێت، چونکە لەمێژووی هیچ سەرکردەیەکدا ڕوویندداوە سەرۆک کۆماری وڵاتێك داوا لەکاربەدەستێکی بێگانە بکات ئەو پێشنیازەی ئەو قبوڵبکات و ئەگەر ئەمە لەلێپرسراوی یەکێك لەو دەوڵەتانەی بەسترابوون بەتاجی شای بەریتانیاوە یا ئەو وڵاتانەی داگیرکراوی بەریتانیا بوایە، ئەو داخوازیە تۆزێك زۆرتر ڕێی تێدەچوو وەك لەداخوازی سەرۆك کۆماری وڵاتێکی سەربەخۆ کە بەشەمیراتی ئەو ئیمپراتۆریەتە زلەی عوسمانی بۆ مابێتەوە.

دووهەم: یاخود دوور نییە مستەفا کەمال ویستویەتی دەمودوی حکومەتی بەریتانیا تاقیبکاتەوە لەڕێگەی باڵیۆزەکەیەوە بۆئەوەی بزانێت بیروبۆچونی چۆن دەبێت دەربارەی (عیسمەت ئینونۆ) یا ئاخۆ تورکێکی تریان لا باشبووە کە ئەوان پەسەندیبکەن بۆئەوەی جێگەی بگرێتەوە.

## باسی سێههەمی بەشی پێنجەم

### کۆنگرەکانی ( ئەرزڕوم ) و ( سیواس ) و مۆرکردنی میساقی میللی و ڕۆڵی کورد لەمانەدا

نەخشـەی تورکـە نەتەوەییـەکان بەسـەرکردایەتی مسـتەفا کـەمال لەسـەرەتادا بەشـێوەیەك بـوو خۆیـان وا دەرنەخـەن نیازیـان وابـووە حکومـەتێکی کۆمـاری دروستبکەن چونکە دەیانزانی پەلەکردن لـەوەدا دەبـووە هـۆی سـەرنەکەوتنیان و هێشتا دانیشتوانی تورکیا بەئاسـانی نەیاندەتوانی دەستبەرداری بوونی خەلیفە و سوڵتان کە سەدان ساڵ بوو کرابوو بەڕەمزی مانەوەی خەلافەتی ئیسلام و کورد لـەناو ئەوانـەدا زۆر سـەرگەرمی ڕێزگـرتن بـوون لەخلیفـە و دڵنیـاش نـەبوون لەهەڵوێست و لەبەڵێنەکانی تورکە نەتەوەییەکان و دەوڵەتە هاوپەیمانەکانیش بەو هەموو لاوازی و گەندەڵ بوونەی پاشماوەی خەلافەت لەئەستەمبوڵدا هێشتا هەر ئەمانیان لا باشتربوو لەتورکـە قەومیەکان بۆیە ناوی هەڵوەشانەوەی خەلافەت و دامەزرانـدنی کۆمـاری تورکیـا هێشـتا لـەئارادا نـەبوو، بـەڵام هـیچ گومـان لـەوەدا نـەبووە نەخشـەی ئەمانـە بریتیبـووە لەدامەزرانـدنی حکومـەتێکی کۆمـاری و هەڵوەشانەوەی خەلافـەت و ڕێگـە نـەدان بەکەمـە نەتـەوەکان کـە بـەهیچ جۆرێك بیر لەجیابوونـەوە بکـەن لـەتورکیا و دەشـیانزانی توانـای ئـەوەیان نـەبووە بەتـەنها هەرخۆیان ئەو مەبەستانەیان بهێننـەدی بۆیـە هەوڵیانـدا لەڕێگـەی بەسـتنی چـەند کۆنگرەیەکەوە بتوانن کوردیشی تیادا بەشداربکەن هەنگاو بەهەنگاو نەخشەکەیان بـەجێبێنن و لـەم باسـەدا هەوڵئـەدەین باسـی هـەردوو کۆنگرەکـەی (ئـەرزڕوم) و (سـێواس) بکـەین لەگـەڵ ڕۆڵـی کـورد لەهەردووکیانـدا و بێجگـە لـەوەی لێـرەدا دەربارەی ئـەو دوو کۆنگرەیـە دێتـە پێشچـاو لـەڕووداو و بەسـەرهاتەکاندا باسـی چالاکی و بڕیارەکانی ئەو دوو کۆنگرەیە باسدەکەین.

## یەکەم-کۆنگرەی ئەرزڕوم

لەباسی یەکەمدا باسی پرۆگرام و پێڕەو و ئامانج و مەبەستە سەرەکیەکانی کەمالیەکانمان خستە پێشچاو و پێکهێنانی (میساقی میللی-ئەنجومەنی بالأی میللی) یەکێك بووە لەکارە کرنگەکانی (ئەرزڕوم). پرۆفیسۆر حەسرەتیان لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٤٥ ئاماژەی بۆ کتێبەکەی مستەفا کەمال کردووە کە لەلاپەڕە (٣٨١)دا (ڕێگای تازەی تورکیا)، بەرگی یەکەم باسی کۆنگرەی (ئەرزڕوم)ی بەم شێوەیە کردووە: کۆنگرەی ئەرزڕوم لەماوەی (١٠ تا ٢٣)ی تەموزی ١٩١٩دا بەسترا، دکتۆر فوئاد حەمەخورشید لەژمارە (٩٨)ی گۆڤاری ڕەنگیندا وتویەتی ئەو کۆنگرەیە لەنێوان ٢٣ی تەموزی ساڵی ١٩١٩ هەتا ١٩١٩/٨/٦دا بەسترابوو، کە بێجگە لەکەمالیەکان کۆمەڵی پاراستنی کەمە نەتەوەکانیش لەویلایەتەکانی ڕۆژهەلأتدا ژمارەیەك لەسەرۆکە کوردەکان تیایدا بەشداربوون (ئەمە یەکەم سەرچاوەیە باسی بوونی کۆمەڵێکی وای کردبێت).

حەسرەتیان لەلاپەڕە (٢٠)ی هەمان سەرچاوەدا وتویەتی: لەو ڕۆژانەدا ئەو پەردەی ئیسلامەتیەی بەبۆیاغی ڕەگەزپەرستێتی تورکەکان ڕەنگکرابوو شتێکی پێویست بوو بۆ تورکە نەتەوەییەکان بۆئەوەی بتوانن لەپشتی ئەو پەردەیەوە کورد و چەرکەس لەدەوری خۆیان گردبکەنەوە و هەستی ئاینیان بۆ سوودی خۆیان بەکاربێنن دژی داگیرکەران کە بەکریستیانەکان ناویاندەبردن.

کوردەکان لەمەبەستی ڕاستی کەمالیەکان گەیشتبوون و لێیان بەگومان بوون (لاموایە هەندێکیان خەڵەتێنرابوون و لەخشتەبرابوون بۆیە بووبوون بەلایەنگریان و کەمالیەکانیش باوەڕیان بەجەماوەری کورد نەدەکرد، بۆیە تەنها هەر پشتیان بەستبوو بەدەرەبەگ و ئاغا و هەندێ لەشێخەکانی کورد کە ئەم ڕاستیە لەو بانگەوازەی مستەفا کەمالدا ڕوونبووبووەوە کە ناردبووی بۆ هەندێ لەشێخ و دەرەبەگەکانی کورد بۆئەوەی بیانکات بەلایەنگری خۆی.

مستەفا کەمال لەمانگی ئابی ١٩١٩دا بڕیارەکانی کۆنگرەی (ئەرزڕوم)ی نارد بۆ شێخ و ئاغاکانی کورد (بەرلەمە لەبەشی دوهەمدا-باروودۆخی کوردستان دوای وەستانی شەڕی جیهانی یەکەم باسی هەمان تەقەلای مستەفا کەمالمان کردووە لەگەڵ هەندێ لەکوردەکان) کە یەکێك لەوانە (عەبدولڕەحمان ئاغای شرناخ) بوو کە مستەفا کەمال بۆی نوسیبوو: ((دڵسۆزیت بۆ خەلیفە شتێکی ڕوون و ئاشکرایە و گومانم لەوەدا نیە ئێوە بەهیچ شێوەیەك ڕێگەنادەن ئەرمەنیەکان خاکی وڵاتەکەتان گلأوبکەن و من لەهەموو کەس باشتر شارەزای ڕەوشتی پاکی

ئێوەم و دڵنیام ئێوە یەکێکن لەوانەی خۆتان بۆ پاراستنی نیشتمان تەرخان دەکەن و ئەوا لەگەڵ ئەم نامەیەدا حەوت کۆپی لەبڕیارەکانی کۆنگرەی (ئەرزڕوم)تان بۆ دەنێرم و داواتان لێدەکەم بەدەستوبردی هێزێکی نیشتمانی پێکەوە بنێیت دژی خائینەکان کە ئەمە لەدڵسۆزی و نیشتمانپەروەرێتی ئێوە دەوەشێتەوە)).

حەسرەتیان دەڵێ جگەلەوەی عەبدولڕەحمان ئاغا، مستەفا کەمال چەند تەلگرافێکی تری لەو شێوەیە ناردبوو بۆ (حاجی موسا بەگ لەموتکا) و بۆ (شێخ عەبدولباقی کێوزادە لەبەدلیس) و (عومەر ئاغا لەیرشو) و (ڕەسول ئاغا لەموش) و بۆ سەعدەڵلاّ ئەفەندی نائیبی کۆن و محەمەد ئەفەندی و (شێخ زەینەدین لەنورستین) و (جەمیل چەتۆ بەگ لەعەزیزان).

دەربارەی ئەوانەی نامەیان بۆ نێردرابوو لەلایەن مستەفا کەمالەوە، (ڕۆبەرت ئولسون) لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٨٤ ئاماژەی بۆ باسێکی (ئیسماعیل بێشکچی) کردووە کە وتویەتی مستەفا کەمال (١٠) نامەی ناردبوو بۆ کوردەکان کە کۆپیەکی لەفایلی تایبەتیدا بەناوی (نطق)ەوە هەڵگیراوە، بەڵام بێجگە لەو (١٠) نامەیەی (ئیسماعیل بێشکچی) باسیکردووە مستەفا کەمال گەلێك نامەی تری ناردبوو بۆ کوردەکان یەکێك لەو نامانە ئەوەبووە کە بۆ (شیخ ضیاء افندی) ناردبوو کە خەڵکی (Narshin) بووە کە لەڕۆژی ١٩١٩/٨/١٣دا ناردبووی هەروەکو لەدوکیومێنتی ژمارە (٩٤٣-٥٢.P.٩٤٢)دا تۆمارکراوە و لەو نامەیەدا مستەفا کەمال سوپاسی ئەو شێخەی کردووە بەرامبەر بەوەی لەشەڕی جیهانیەوە دڵسۆز بووە بۆ وڵات و بۆ سوڵتان.

ڕۆبەرت ئولسون باسی نامەیەکی تری مستەفا کەمالی کردووە کە سوپاسی (حەقی موسا بەگ-حەسرەتیان وەکو بەرلەمە باسیکردووە بەحاجی موسا بەگ ناویبردووە) کردووە کە سەرۆکی عەشیرەتی موڵکی بووە کە ئەو سوپاسنامەیەی لەلاپەڕە (٤٧)ی دوکیومێنتی ژمارە (٩٣٦-٩٣٩)ی ڕۆژی ١٩١٩/٨/١٠دا تۆمارکراوە و پێیوتوە دوژمنان دەیانەوێ وڵاتەکەمان لەتوپەتبکەن و حکومەتێکی ئەرمەنی تیادا دروستبکەن.

## دوهەم-کۆنگرەی سێواس

دەربارەی کۆنگرەی (سێواس) کە لەدوایئەوەی (ئەرزڕوم) بەسترا، ئەوەی لەکۆنگرەی سێواسدا ڕوویدا زۆر جیاواز بوو لەو گەرموگوڕییەی لەکۆنگرەی ئەرزڕومدا هەبوو، کێشەیەکی تازە پەیدابووبوو بەهۆی بۆچوونی هەندێ لەتورکەکان دەربارەی ئەوەی ئایا ئەگەر حکومەتی ئەمریکا بێتە پێشەوە و لەسەر نەخشەیەکی دوقۆڵی لەگەڵیان ڕێکبکەوێت سوودی ئەوەی نابێ کە بتوانرێت تۆزێك لەکەڵەگایەتی ئینگلیزەکان کەمبکرێتەوە لەناوچەکەدا، بەتایبەتی لەتورکیادا کە بەریتانیا ڕۆڵێکی سەرەکی بینیبوو لەلەتوپەتکردنی ئیمپراتۆریەتەکەیاندا.

لەکۆنگرەی سێواسدا ئەوەی زۆر دەم هەراش و لەبلەبان بوو (خالیدە ئەدیب) بووە کە ئەندامی کۆنگرەکە بووە و یەکێك بووە لەڕۆشنبیرانی ئەو ڕۆژانە لەتورکیا و هەروەکو سەرچاوەکان باسیانکردووە پەیوەندیەکی بەهێزی هەبووە لەگەڵ (M.Charle. P. Crane) کە لەلایەن لیژنەی (King Crane)ەوە هەڵبژێردرابوو باسێکی دوورودرێژ ئامادەبکات دەربارەی (سەرپەرشتیکردن–Mandate)ی وڵاتە عەرەبییەکان و ئەو (مستەر چارڵس) بەباشی زانیبوو تورکیا خۆشی بکرێت بەسێ ناوچەی ئینتیداب هەروەکو لەسەرچاوە/٨٥دا (Patrick Kinross) بەدوورودرێژی باسیکردووە، ئەو سێ ناوچەیە بریتیبوون لە:

١-ئەرمینیا.

٢-ناوچەی ئەستەمبوڵ.

٣-ناوچەی ئەناتولیا.

لەگێڕاوی ئەم باسانەدا (خالیدە ئەدیب) لەنامەیەکیدا کە بۆ مستەفا کەمالی ناردبوو، کورتەی ئەو نەخشەیەی لەلایەن دەوڵەتە هاوپەیمانەکانەوە کە دیارە بریتیبوون لەبەریتانیا و فەرەنسا و ئیتاڵیا ئامادەکرابوو بۆ پاشەڕۆژی تورکیا ناردبووی بۆ مستەفا کەمال و خۆشی پێشنیازی ئەوەی کردبوو ئەگەر ئەو نەخشەیە بەزۆر بسەپێنرێت بەسەر تورکیادا باشترین شت ئەوەیە ئەو سەرپەرشتیکردنە (ئینتیداب) بەئەمریکاییەکان بسپێرێت چونکە دەبێتە مایەی بەهێزکردنی تورکیا و جۆرە خۆڕاگرتنێکیش دەبێت بۆ پوچەڵکردنی نەخشەی دەوڵەتە هاوپەیمانەکان ڕێگەش بۆ ئەوە خۆشدەکرێت تورکیا لەوڵاتێکی

کشتوکاڵییەوە بەرەو پێشەوە بڕوات و ببێت بەحکومەتێکی مۆدێرن کە ئێستە تورکیا ئەوەی لەباردا نی یە بەئاسانی بگات بەو مەبەستە و بەمە تورکیاش دووردەخرێتەوە لەسایە و دەسەلاٌتی ئیمپریالیزمەکانی ئەورووپا.

خالیدە ئەدیب بۆ زۆرتر ڕوونکردنەوەی هەڵوێست و بارودۆخی تورکیا باسی ولاٌتی (فیلیپین)ی بۆ ڕوونکردۆتەوە کە چ سوودێکیان لەئەمریکاییەکانەوە دەستگیر بووبوو بەهۆی ئەوەی خرابوونە ژێر چاودێری (ئینتیداب)ی ئەمریکاوە و مستەفا کەمالی لەنامەکەیدا دڵنیاکردبوو ئەگەر ئەم نەخشەیە سەربگرێت تورکیا لەماوەی بیست ساڵدا بەرەو قۆناغێکی تازە بەرەو پێشەوە دەڕوات.

سەرچاوە/٨٥ لەباسەکەیدا لەسەرینەڕوا و ئەڵێت: لەکاتی کۆنگرەی سیواسدا گەلێك کێشە لەنێوان ئەندامەکانیدا پەیدابوو بەهۆی لێکدانەوەی مەبەست و ناوەڕۆکی (ئینتیداب–Mandate)، بەلاٌم لەئەنجامدا توانرا چارەسەرێکی مامناوەندی بۆ کێشەکە بدۆزرێتەوە کە کۆنگرە قبوڵی کردبوو کە بریتی بوو لە: (پێویستە داوا لەئەمریکا بکرێت نوێنەری خۆی بنێرێت بۆئەوەی لەبارودۆخی ولاٌت بکۆڵێتەوە و ڕاپۆرتێك ئامادەبکات و پێشنیازەکانی دەستنیشان بکات و بۆ ئەمە بڕیاردرا تەلگرافێك لەلایەن کەمال (کە دیارە مەبەست مستەفا کەمال بووە) و ڕەئوف و چەند کەسێکەوە نێردرا بۆ ئەنجومەنی (سەنا–پیران)ی ئەمریکا و داوای ناردنی ئەو نوێنەرە کرا، (بێگومان ئەم داخوازیە لەو ڕۆژانەدا بووە کە هێشتا کەمالیەکان زۆر لاواز بوون و نەگەیشتبوونە ئەو ڕادەیەی بەخۆیانا ڕاپەرموون بەبێ ولاٌتێکی وەکو ئەمریکا دەتوانن نەخشەیەکی تایبەتی خۆیان بهێننەدی).

نوسەری سەرچاوە/٨٥ لەپەراوێزی لاپەڕە (١٨٨)دا دەربارەی ئەو ڕاپۆرتەی لەلایەن نوێنەری ئەمریکاوە ئامادەکرابوو وتویەتی: (لەڕاستیدا ئەو ڕاپۆرتە لەدوای ئامادەکردنی لەلایەن حکومەتی ئەمریکاوە پشتگوێخرا و دیاریش بووە داواکردنی هاتنی نوێنەرەکەی سەناش تەنها بۆ ئەوە بووە هەندێ لەئەندامانی کۆنگرەکەی پێڕازیبکەن و لەلایەکی تریشەوە ویسترابوو لەڕێگەی ئەو هەوڵدانەوە سەرنجی ولاٌتانی جیهان ڕابکێشرێت بۆ چالاکی ئەو بزوتنەوەیەی کەمالیەکان لەو ڕۆژانەدا دەیاننواند و هیچ دوور نی یە مستەفا کەمال شانبەشانی ئەمەش ئاگاداری ئەوە بووە کە ئەمریکاییەکان (J. G. Harbord)یان ناردبوو بۆ ئەرمەنیا لەسەر داخوازی (ودرو ویلسن)ی سەرۆك کۆماری ئەمریکا بۆئەوەی لەگەڵ ئەرمەنیەکاندا باسی ئینتیداب بکات (بێگومان ئەمریکاییەکان لەدوایی‌دا

لەکاتی کوشتاری ئەرمەنیەکان لەلایەن کەمالیەکانەوە، نەك هەر ئینتیداب بەڵکو دەستیشیان برین و بەهیچ شێوەیەك لایان لێنەکردنەوە وەکو لەبەشی شەشەمی ئەم بەرگەدا باسێکی تایبەتیمان تەرخانکردووە بۆ کوشتاری ئەرمەنیەکان).

نوسەری سەرچاوە/٨٥ لەلاپەڕە (١٨٩)ی کتێبەکەیدا دەربارەی پەیوەندی تورك و ئەمریکاییەکان باسی گفتوگۆیەکی نێوان مستەفا کەمال و (J. G. Harbord)دا کراوە، کە مستەفا کەمال بە(هاربۆرد)ی وتبوو: ((دیارە هەر حکومەتێك ڕێز لەخۆی بگرێت (مەبەست ئەمریکا)یە قبوڵی هیچ جۆرە ئینتیدابێك ناکات ئەگەر هەموو دەسەلاتێکی تەواوی پێنەدرێت و مستەفا کەمال هاربۆردی دڵنیاکرد بزوتنەوەکەی بۆئەوەیە هاوکاری لەگەڵ هەموو هاولاتیاندا بکات بێئەوەی گوێ بداتە جیاوازی ڕەگەز و ئاین و دەیەوێ ئەو مەترسیەی کریستیانەکان هەیانبووە دەربارەی ڕووداوەکانی ڕابردوو ئیتر لەمەودوا ڕێگە نەدرێت شتی وا ڕووبداتەوە و تاقە مەبەستی ئەوەیە هەموو هاولاتیان یەکبخات بۆئەوەی ولاتەکەیان لەدوژمن بپارێزێت. بۆ وەلامی ئەمە هاربۆرد پێی دەڵێت: ئەم قسانەی تۆ ئێستا دەیکەیت لەگەڵ ڕەوشتی سەربازێتیدا یەکناگرنەوە)).

# بەشی شەشەم

## سەرکەوتنی کەمالیەکان و خۆچەسپاندنیان و هۆی سەرکەوتنەکانیان

لەدوایئەوەی کەمالیەکان لەحکومەتی تورکی ئەستەمبولْ یاخیبوون کە بەناو لەژێر سایەی خەلیفەدا مابووەوە، پاشئەوەی خۆیان بەهێزکرد و هەستیانکرد ئیتر لەتوانایاندایە ببن بەتاقە نوێنەر و دەسەلآتدار لەتورکیادا ئیتر دەستیانکرد بەبەجێهێنان و سەرگرتنی ئەو نەخشانەی بەپێی پرۆگرام و پەیرەوەکانیان نەخشەیان کێشابون و لەسەرەتادا کۆنگرەی ئەرزرۆم و سێواسیان بەست و میساقی میللیان دەرکرد و بەشێوەیەکی ڕەسمی بلآویانکردەوە و ئەنقەرەیان کرد بەبنکە و پایتەختی خۆیان کە لەسەرەتادا بەمانەی خوارەوە دەستیانپێکرد:

یەکەم: ڕووبەڕووبونەوەی ئەو هێزە یۆنانیەی بەهاندانی حکومەتی بەریتانیا نێردرابوو بۆ داگیرکردنی ئەزمیر لەم باسەدا لەرۆلی کورد ئەدوێین لەچۆنیەتی بەشداربوونیاندا شانبەشانی تورکە کەمالیەکان.

دوهەم: پەلاماردانی ئەرمەنیەکان و ئەو کوشتارەی لێیانکردن بۆ سەرنەگرتنی ئەو مادانەی لەپەیمانی سیڤەردا بۆ دامەزراندنی حکومەتێکی ئەرمەنی تەرخانکرابوو.

سێیەم: لابردنی سولتان و هەلوەشانەوەی خەلافەت و دامەزراندنی کۆماری تورکیا.

# باسی یەکەمی بەشی شەشەم

## ڕووبەڕووبونەوە لەگەڵ هێزی یۆنانیەکاندا

بۆ ئاسانکردنی ڕوونکردنەوەی ئەم شەڕە و هۆی دەستپێکردنی و سەرەنجامەکەی و ڕۆڵی دەوڵەتان لەهەڵگیرساندنی ئەم شەڕەدا و ڕۆڵی کورد و بەشداربوونی ئەم باسە دەکەین بەم بەشانەی خوارەوە:

١-هۆی دەستپێکردنی شەڕ و چۆنیەتی دەستپێکردنی و ڕۆڵی دەوڵەتان.

٢-ڕۆڵی کورد لەو شەڕەدا:

أ-بەشداربوونی کورد لەو شەڕەدا شانبەشانی تورك.

ب-تەقەللای سەرنەگرتووی هەندێ لەکوردەکان بۆ هاوکاریکردن لەگەڵ یۆنانیەکاندا دژی تورك.

### یەکەم-هۆی دەستپێکردنی شەڕ و چۆنیەتی دەستپێکردنی و ڕۆڵی دەوڵەتان

یۆنانیەکان لەڕووی مێژووییەوە هەمیشە بەشێکی زۆری وڵاتی تورکیایان بەبەشێك لەخاکی خۆیان زانیوە و ئەستەمبوڵی پایتەختی عوسمانیەکان لەکاتی خۆیدا لەلایەن بیزەنتی (یۆنانیەکان)ەوە دروستکرابوو، بۆیە شکاندنی دەوڵەتی عوسمانی و لاوازبوونی دەسەڵاتی تورکیان بەهەلێکی مێژوویی زانی و بۆ دەرفەتێك دەگەڕان کە بەشێك لەو وڵاتە داگیرکراوەیان دەستگیربێتەوە، بەڵام لەپەیمانی (سایکس پیکۆ)دا هیچ حسابێکی بۆ ئەو نیازەی یۆنان نەکرابوو، لەگەڵ ئەوەشدا هەروەکو سەرچاوە/٨١ (گزیدەی اسناد سیاسی ئێران و ترکیا، لەلاپەڕە (٦٣)یدا باسی (وەنزیلوس)ی سەرەك وەزیرانی یۆنانی کردووە چۆن لەگەڵ کابرایەکی یۆنانی دەوڵەمەنددا کە ناوی (بازیلیوس زاخاریاس)دا کە هەردووکیان ئاشنای (لوید جۆرج)ی سەرەك وەزیرانی بەریتانیا بوون و ئەو پیاوە دەوڵەمەندە لەلایەکەوە بازرگانی چەك فرۆشتن بووە و لەهەمان کاتدا لێپرسراوێکی نهێنی ئینتلجسی بەریتانیا بووە، لەو ڕۆژانەدا (١٠٠) هەزار دۆلاری تەرخانکرد بۆ دەستپێکردنی ئەو شەڕە و بڕیاریدا خەرجی ئەو شەڕە بکێشێت و بەو پێیە هێزەکانی یۆنان بەپاپۆڕەکانی ئینگلیز گوێزرانەوە بۆ ئاسیای بچوك (تراکیا) و شەڕ لەگەڵ تورکدا دەستپێکرد.

لەڕاستیدا وەکو ئەو سەرچاوانەی باسی شەڕەکەیان کردووە، لەهەموویدا دەردەکەوێت کە ئاگری بن کای هەڵگیرساندنی ئەو شەڕە و نەخشەی پەلاماردانی یۆنان بۆ سەر (ئەزمیر) لەلایەن کاربەدەستانی بەریتانیاوە کێشرابوو. لەکتێبەکەی (Patrick Kinross)دا سەرچاوە/٨٥، بەدوورودرێژ باسی ئەو شەڕەی کردووە و ئاماژەی بۆ گفتوگۆیەکی (لوید جۆرج)ی سەرەك وەزیرانی بەریتانیا کردووە لەگەڵ ئەفسەرێکی فەرەنسیدا کە ناوی (Vensittart) بووە، کاربەدەستێك بووە لەوەزارەتی دەرەوەی فەرەنسادا و لەو گفتوگۆیەدا (لوید جۆرج) پێیوتوە: ((ئێمە لەم شەڕەدا (مەبەست شەڕی جیهانی بووە) هەرچییەکمان ویست هەمووییمان دەستگیربوو، پەیمانی ئاشتی مۆرکرا و دەوڵەتی عوسمانی پارچە پارچەکرا و بوو بەچەند حکومەتێك و ئەو حکومەتی تورکیەش کە دەمێنێتەوە دەوڵەتە هاوپەیمانەکان دەتوانن لەدەریاوە سەرپەرشتی بکەن و ڕێگەی ئەوەی پێنادەن دەسەلاتێکی ئەوتۆی هەبێت و هەموو ولاتە عەرەبییەکانی لێجیاکراوەتەوە و یۆنانیەکانیش دەستبەسەر دەریای (ئیجە)دا دەگرن و ئیتاڵیەکان دورگەکانی (دوریکانیس)یان بەدەستەوە دەبێت و لەڕۆژهەلاتی تورکیادا حکومەتێکی سەربەخۆی ئەرمەنیش دروست ئەبێت لەگەڵ دامەزراندنی ئۆتۆنۆمیەك لەکوردستاندا و بەشێکی تری تورکیاش دەخرێتە ژێر دەسەلاتی فەرەنسا و ئیتاڵیاوە و هێزی تورك تەنها بریتی دەبێت لەهێزێکی جەندرمە لەژێر چاودێریی هاوپەیمانەکاندا)).

نوسەری سەرچاوە/٨٥ لەباسەکەیدا دەڵێت: ساتێك مستەفا کەمال هێزی خەلیفەی لە(ئەزمیت) دەرکرد و لەئەستەمبوڵ نزیکبووەوە جەنراڵ (Mine) هێزێکی نارد بۆ پاراستنی ئەستەمبوڵ و بەرامبەر بەمە سەرەك وەزیرانی یۆنان (وەنزیلوس) هاتەپێشەوە و (لوید جۆرج) داوای لێکرد لەکۆبونەوەیەکی کۆنگرەی ئاشتیدا ئامادەبێت و بڕیاریاندا دوو هێز لە(ئەزمیر)ەوە پەلاماری ناوچەی (ئەزمیت) بدەن بۆئەوەی تورکەکانی لێدەرکەن.

لەم کاتەدا مستەفا کەمال کێشەیەکی بۆ پەیدابووبوو بەهۆی دەرەبەگێکی تورکی بەهێزەوە کە ناوی (چاپان ئوغلو) بوو کە ئیعلانی سەربەخۆیی حکومەتێکی کردبوو بەمەبەستی لایەنگرێتی بۆ سوڵتان و نیازی وابوو (قیصریە) داگیربکات. نوسەر دەڵێت: کاتی خۆی (ئەدمیرال ڕوبیك) لە(لۆرد کرزن)ی گەیاندبوو ئەگەر بێت و فشار بخرێتە سەر مستەفا کەمال ئەوا ڕوودەکاتە سۆڤیەت و لەڕاستیشدا لەدواییدا مستەفا کەمال هەروایکرد.

بەڵام زۆری پێنەچوو هەڵوێست گۆڕا و (وەنزیلوس) و (داماد فرید)ی سەدری ئەعزەمی تورك هەردووكیان لابران و ساتێك لەحوزەیرانی ۱۹۲۱دا هێرش برایە سەر توركیا (ملك قسطنطین)ی یۆنانی خۆی سەركردایەتی هێزەكانی یۆنانی كرد و ڕوویكردە (ئەزمیر) و لەگفتوگۆیەكی (ملك قسطنطین) و ڕۆژنامەی (Times)ی لەندەنیدا بەدڵنیاییەوە بەڕۆژنامەكەی وت كەوا هێزی كەمالیەكان تێكدەشكێنرێن و چرچڵی وەزیری داگیركراوەكانی بەریتانیاش وەكو لەیاداشتەكانیدا باسیكردووە ئەویش لەو ڕۆژانەدا دڵخۆشی خۆی دەربڕیبوو بەرامبەر سەركەوتنی هێزەكەی یۆنان.

نوسەری سەرچاوە/۸۵ لەباسەكەیدا لەسەرینەڕوا و ئەڵێت: (لۆرد كرزن)ی وەزیری دەرەوەی بەریتانیا هەوڵی ئەوەیدا كێشەكە بەوە چارەسەر بكرێت ئۆتۆنۆمی بدرێت بەناوچەی (ئەزمیر) و بۆ ئەو مەبەستە لەپاریس لایەنگرێتی (Brind)ی مسۆگەر كردبوو، بەڵام هاوپەیمانەكان حسابی ئەوەیان كردبوو ئەگەر ئۆتۆنۆمی بدرێت بە(ئەزمیر) دەبێ سوپای تورك خۆی لەو ناوچەیە بكێشێتەوە، بەمە ئاسایشی ناو شارەكە دەكەوتە ئەستۆی دەوڵەتە هاوپەیمانەكان كە ئەمە كارێكی ئاسان نەبوو بۆیە چارنەما و دەبوایە كێشەكە بەشەڕ یەكلابكرایەتەوە.

یۆنانیەكان لەو شەڕەدا پڕچەك بوون و فڕۆكەشیان هەبوو، بۆ یەكەم قۆناغ پەلاماری (ئەفیون) و (قەرەحەسار) و (كوتاهیە)یاندا، لە ۱۹۲۱/۸/۱۳دا یۆنانیەكان چوونە پێشەوە هەرچەند نەیاندەویست ئەنقەرە داگیربكەن بەڵكو ویستیان بۆ مەبەستێكی سیاسی توركەكان لە(قیصریە) و (سیواس) دەركەن و بیانشكێنن و بەوجۆرە شەڕەكە (۲۲) شەو و ڕۆژ درێژەی كێشا و بۆ پێشەوە دەرچوونی یۆنانیەكان زۆر لەسەرخۆ بوو لەپێشدا چیای (چالاداغ)یان گرت بەڵام وردە وردە هێزی پەلاماردانی نەما و لە ۱۲ی سێپتەمبەردا فەرمان لەئەسینای پایتەختی یۆنانەوە دەرچوو هێزەكەیان بكشێتە دواوە.

(لۆرد كرزن) داوای كۆبونەوەیەكی كرد بۆ دۆزینەوەی چارەسەرێكی بنەبڕ و بڕیاردرا بەر لەهەموو شتێك شەڕ بوەستێنرێت، یۆنانیەكان بڕیاری وەستانی شەڕیان پەسەندكرد بەڵام توركەكان بەمەرجێك بەوە قایل بوون كە یۆنانیەكان هەموو شوێنە داگیركراوەكانیان چۆڵبكەن و لەهەمان كاتدا خۆیان كۆدەكردەوە بۆ ڕووبەڕووبونەوەیەكی تر و یۆنانیەكانیش لەولاوە نیازیان وابوو ئەستەمبوڵ داگیربكەن.

هێزی کەمالیەکان لە ١٩٢١/٨/٢٦دا دەستیانکرد بەهێرشبردن و دانیشتوانی (ئەزمیر) خۆیان ئامادەکردبوو شارەکە چۆڵبکەن و چەند پاپۆڕێکی ئینگلیز لەکەناری دەریادا چاوەڕوانی هەڵوێستیان دەکرد و ساتێك تورکەکان چوونە ناو شاری (ئەزمیر)ەوە شارەکەیان سوتاند و کوشتارێکی زۆریان لەدانیشتوان کرد و هەروەکو ڕۆژنامەنوسێکی ئەرمەنی باسیکردووە نزیکی دووهەزار کەسی تیادا کوژرابوو کە وەکو مستەفا کەمال بەئەدمیراڵ (Dumesnil)ی ڕاگەیاندبوو تاوانی کارەسات و کوشتارەکەی ناو شاری ئەزمیری دابووە پاڵ ئەرمەنیەکان.

دەربارەی چۆنێتی داگیرکردنی ئەزمیر کە سەرچاوە ئینگلیزیەکان بە(Smyrma) ناودەبرێ، سریا بەدرخان لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٧٩ ژمارەی کوژراوەکانی ئێجگار زۆرتر داناوە کە بەشیر و ڕمی تورکەکان کوژرابوون و دەستیان بەسەر هەزاران ژن و کچدا گرتبوو وە ئاماژەی بۆ کتێبی (The Light of Asia) کردووە لەنووسینی (George Horton) کە کونسوڵی ئەمریکا بووە لە(Smyrma–ئەزمیر) کە بەدووروودرێژی باسی ئاواتەکانی تورکی کردووە لەشاری (ئەزمیر)دا.

سەرچاوە/٨٥ باسی تەقەلادانی کەمالیەکانی کردووە بۆ داگیرکردنی ئەستەمبوڵ و باسی ئەو کۆنفرانسەی کردووە کە لە ٣ی ئۆکتۆبەری ١٩٢١دا لە(مودانیا) بەسترا و (عیسمەت ئینونو) نوێنەری کەمالیەکان بووە و لەو کۆنفرانسەدا تورکەکان چی‌یان داواکردبوو دەستگیریان بوو، لەئەنجامی ئەوەدا (لوید جۆرج)ی سەرەك وەزیرانی بەریتانیا دەستی لەئیش کێشایەوە.

## دووەم: ڕۆڵی کورد لەوشەڕەدا

باسی ئەو شەڕەی یۆنان و تورك باسێکی دووردرێژە و لەباسی باکوری کوردستانمان دووردەخاتەوە و ئەوەی زۆر مەبەستمانە لێی بدوێین بریتییە لەهەڵوێستی کورد لەباکووری کوردستاندا لەو شەڕەدا کە دەیکەین بەدوو بەشەوە:

أ-هاوکاریکردنی کورد و پشتگیریکردنی تورك لەو شەڕەدا.

ب-ئەو تەقەلا سەرنەگرتووەی کورد دابووی بۆ نزیکبوونەوە لەیۆنان و هاوکاریکردن لەنێوانیاندا دژی تورك.

### أ-هاوکاریکردنی کورد بۆ تورك و بەشداربوونی لەو شەڕەدا

هەروەکو لەباسی سیڤەر و لەبەستنی هەردوو کۆنگرەکەی (ئەرزڕوم) و (سێواس)دا باسی ئەوەمانکرد چۆن تورکەکان توانیبوویان ژمارەیەکی زۆری کورد بکەن بەهاوکاری خۆیان و کردبوویانن بەلایەنگری خۆیان تا ئەوکاتەی لەدوا تەقەلادانیاندا لەگەڵ کورد توانیبوویان لەکاتی کۆنگرەی لۆزاندا ئەو کوردانە بخەڵەتێنن هەروەکو لەو باسە تایبەتییەی بۆ (کۆنگرەی لۆزان) تەرخانکراوە هەموو شتێك ڕووندەبێتەوە و بەرلەوەش لەو شەڕەی لەگەڵ یۆنانیەکاندا کردبوویان، لەوکاتەدا کە پێویستیەکی تەواویان بەکورد هەبوو بۆئەوەی لەو شەڕەدا کۆمەکیان بکات، توانیبوویان کوردەکان بەوە بخەڵەتێنن کە لەدوای سەرکەوتن بەسەر دوژمندا و پاکردنەوەی ولات لێیان ئەوسا مافی کوردیش دەخەنە پێشچاو و لەو ڕۆژانەدا کە هێزی یۆنانیەکان تەنگیان بەتورکەکان هەڵچنیبوو، لەوکاتە ناسکەدا ژمارەیەکی زۆر لەچەکدارانی کورد و هەندێك لەسەرۆك عەشیرەتەکان بوون بەهاوکاری، لەو شەڕەدا کورد ڕۆڵێکی زۆر گرنگی هەبووە لەسەرکەوتنی تورکەکاندا و بەوپەڕی دڵسۆزیەوە سنگیان دەنایە بەرگوللە و بەشمشێری یۆنانیەکانەوە تا ئەوکاتەی هێزی یۆنانیەکان شکا و کە شەڕەکە بەسەرکەوتنی تورکەکان بڕایەوە، لەکاتی ئاهەنگی سەرکەوتن لەو شەڕەدا لەلایەن سەرکردەی ئەو هێزەی تورك کە یۆنانیەکانی شکاندبوو، پەردە لەسەر (سەربازی نەناسراو-جندی المجهول) لابرا، سەرکردەی ئەو هێزە

بەئاشکرا وتبووی لەم کاتەدا کە پەردە لەسەر ئەم سەربازی نەناسراوە لادەدەین دەبێ دان بەوەدا بنرێت کە دوورنییە ئەو سەربازە کورد بووبێت.

لەڕاستیدا هاوکاریکردنی کورد بۆ تورك شتێکی تازە نەبوو، بەڵکو گەلێك سەرچاوە باسی ئەو هاوکاریکردنەی کوردیان کردووە، بۆ نمونە دەربارەی ئەو شەڕە دکتۆر فوئاد حەمەخورشید لەگۆڤاری (ڕەنگین)ی ژمارە (٩٨)ی ساڵی ١٩٩٧دا ئاماژەی بۆ باسێکی (غ. ئیستیخانوف) کردووە کە باسی قارەمانێتی ئافرەتێکی کوردی کردووە کە ناوی (فاتمە خانم) بووە کە لەخزمەکانی سمکۆی شکاك بووە، ئەم ئافرەتە لەدەوروبەری (ئەنقەرە)دا بەجلی سەربازی پیاوانەوە سەرکردایەتی هێزێکی جەنگاوەرانی کوردی کردووە کە بریتی بوون لەسەدان چەکدار و فاتمە خان بەشێوەیەکی ڕێكوپێك سەرکردایەتی ئەو هێزەی خۆی کردووە و لەناو جەنگاوەرەکانیدا دەسەڵاتێکی بەهێز و توانای هەبووە و هێزەکەی شانبەشانی ئەنجومەنی باڵای میللی تورك دژی یۆنانییەکان وەستاوە و شەڕیکردووە و هێزەکەی گەلێك شەهیدی دابوو لەپێناوی ڕزگارکردنی کوردستان و تورکیادا.

جگە لەو باسە، ئەمین زەکی بەگ لەلاپەڕە (٢٧٠)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٣٢ باسی (کازم قەرەپاشا)ی تورکی کردووە کە هێزێکی پێکەوەنابوو زۆربەی چەکدارەکانی بریتیبوون لەکورده ئازاکانی ئەو ڕۆژانە و لەمانگی ئابی ١٩٢٠دا ئەو هێزە شاری (قارس)ی داگیرکرد و ئەو سەرکەوتنە لەمێژووی تورکدا بەیەکێك لەهۆ گرنگەکان دەژمێردرێت بۆ دانانی بناغەیەکی پتەو و چەسپاو بۆ دامەزراندن و سەرگرتنی کۆماری تورك و ئەگەر ئەرمەنییەکان لەو شەڕەی قارسدا سەربکەوتنایە بزوتنەوەی تورکە کەمالییەکان سەرینەدەگرت، بێجگە لەم هۆیەی ئەمین زەکی باسیکردووە کە بووە بەهۆی سەرکەوتنی تورك و داگیرکردنی (قارس) ئەو پەیمانەی کەمالییەکان لەگەڵ سۆڤیەتدا بەستبوویان بوو بەهۆی ئەوەی ئیتر ترسیان لەسۆڤیەت نەمێنێت بۆیە ئەو هێزانەی بەرامبەر بەوان دایانناببوون هەموویان کێشایەوە و بەکاریانهێنا دژی ئەرمەنییەکان کە لەقارسدا بەسەریاندا سەرکەوتن.

## ب-تەقەلایەکی سەرنەگرتووی کورد بۆ هاوکاریکردن لەگەڵ یۆناندا دژی تورك

چ حکومەتی یۆنان و چ هەندێك لەو کوردانەی بەفرۆفێڵی کەمالیەکان نەخەڵەتێنرابوون هەردوولایان زۆر مەبەستیان بووە جۆرە هاوکاریەك لەنێوان یۆنان و کورددا پێکبێت دژی تورکە کەمالیەکان کە دوژمنی هەردوولایان بوون، بەلاّم لەمەشدا سیاسەتی کاربەدەستانی بەریتانیا وەکو هەموو هەڵوێستێکی تریان بەرامبەر کورد ئەو لێك نزیکبوونەوەیان بەباش نەزانیبوو چونکە سوودی خۆیانی تیادا نەبوو.

دەربارەی ئەمە بەپێویستم زانی بەزنجیرە هەندێ لەو دوکیومێنتانە بخەمە پێشچاو کە چۆن هەندێ کوردی داخ لەدڵ بەرامبەر تورك و ئەو ناکۆکیەی لەنێوان تورك و یۆناندا لەدوای شەڕی جیهانی سەریهەڵدابووەوە بکەم بەکوردی کە پەیوەندیان بەو تەقەلا سەرنەگرتووانەوە هەیە کە درابوو بۆ سازکردنی پەیوەندی ئەو دوو لایە:

__دوکیومێنتی یەکەم:__

ژمارە (Fo.٣٧١-٦٣٤٦١) ڕۆژی ١٩٢١/٥/٢٥ باسی ڕاپۆرتێك ئەکات لەباڵیۆزخانەی بەریتانیاوە لەئەستەمبوڵ نێردرابوو بۆ (لۆرد کرزن)ی وەزیری دەرەوەی بەریتانیا دەربارەی چاوپێکەوتنی مەندوبی سامی بە(ئەمین عالی بەدرخان) کە لەو چاوپێکەوتنەدا داوای لەحکومەتی بەریتانیا کردبوو لایەنگری ئەوە بێت بزوتنەوەی کورد بتوانێت هاوکاری بکات لەگەڵ یۆنانیەکاندا دژی تورك لەو شەڕەی لەنێوان هەردوولادا دەستیپێکردبوو. بەپێی دوکیومێنتەکە وەڵامی مەندوبی سامی بەریتانیا بۆ (ئەمین عالی بەدرخان) بەم شێوەیە بووە: (سیاسەتی حکومەتی بەریتانیا هەر لەمۆرکردنی پەیمانی شەڕ وەستاندنەوە بریتی‌یە لەوەی حکومەتی خاوەنشکۆمان هانی کورد نەدات هیچ جۆرە ڕاپەڕینێك بکات، لەبەرئەوە هیچ ڕاپەڕینێکتان بەرامبەر تورك بەدڵی حکومەتی خاوەنشکۆ نابێت).

**دوکیومێنتی دووەم:**

ژمارە (No.٣١-A.٩٣-٤٣-٦٢٥) ڕۆژی ١٩٢١/٥/١٣ ڕاپۆرتێکی تیادا باسکراوە کە وتویەتی: ئەمین عالی بەدرخان کە گەورە و سەرکردەی بنەماڵەی بەدرخانیەکانە لەگەڵ جەلادەتی کوڕیدا ڕۆژی ١٩٢١/٤/٢٥ زیارەتی (ریان)یانکرد کە جەلادەت یەکێکە لەکوردە چالاکەکانی بزوتنەوەی کورد و ئەمین عالی بەدرخان بە(ریان)ی وت خۆی و هاوڕێکانی پەیوەندیان بەیۆنانیەکانەوە کردووە، بەڵام ناتوانێت هیچ بکات هەتا بیروبۆچونی حکومەتی خاوەنشکۆی ئێمە وەرنەگرێت و دەیەوێ بۆ ئەم مەبەستە بچێت بۆ موسڵ، ئەگەر بچێت بۆ موسڵ ئایا لەوێ پێشوازی لێدەکرێت یان نا؟ لەوەڵامدا (ریان) پێی‌دەڵێت لەم ڕۆژانەدا هەر هەوڵدانێك بۆ کورد دژی تورك بەشتێکی ڕاست نازانرێت و پێشوازی لێناکرێت، بەڵام ئەگەر هات و تورکەکان تەنگەتاویان کردین شتێکی خراپ نی‌یە سوود لەتەقەلای بەدرخان وەربگیرێت.

دەربارەی ئەو دوکیومێنتەی باسی گفتوگۆکەی (ریان) و ئەمین عالی بەدرخانی تیادا کراوە، هەروەکو دکتۆر وەلید حەمدی لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٢٣ ئاماژەی بۆ چاوپێکەوتنێکی ئەمین عالی بەدرخان و مەندوبی سامی بەریتانیا کردووە لەئەستەمبوڵدا کە ئەمین عالی بەدرخان داوای لێکردبوو ڕێگەی پێبدرێت بچێت بۆ موسڵ لەوەڵامدا پێی‌دەڵێت ئەگەر بۆچونەکەت بەنیازی گەڕانیش بێت دەبێ پێشەکی موافەقەتی بۆ وەربگریت بەمەرجێك چوونەکەت بۆ شتی تر نەبێت، بەڵام لەدواڕۆژدا ئەگەر حکومەتی ئەنقەرە بکەوێتە شەڕەوە دژی بەریتانیا یان فەرەنسا ئەوسا لەوانەیە سوود لەکوردیش وەربگیرێت کە ئەمە هەروەکو وەڵامەکەی (ریان) وابووە.

**دوکیومێنتی سێیەم:**

ژمـــــــارە (No.٣٥٨-C.O.٤٦٧٦-٤٤) ڕۆژی ١٩٢١/٤/٢١: لەسەرچـــــــاوەیەکی بـــاوەڕپێکراوەوە پێمانگەیشـــتووە مفـــەوەزی یۆنـــان لەئەســـتەمبوڵ هەوڵیـــداوە پەیوەندی و هاوکاری لەگەڵ کوردە نەتەوەییەکاندا بکات و بۆ سەرگرتنی ئەو مەبەستە لەشاری سێواس (مستەفا پاشا یامولکی) و (حاکی بەگ) کۆبوونەوە بۆ چۆنیەتی ئەو گفتوگۆکردنە لەگەڵ یۆنانیەکاندا.

دوكيومێنتی چوارەم:

ژمـــارە (No.C.O.۲۸۸۰۹-۳۳۳-۲۱) ڕۆژی ۱۹۲۱/٥/۱۱، نامەیـــەكی (هـــۆراس ڕامبولـد)ی مەنـدوبی سـامی بـەریتانیای تیادایــە كـە بـۆ وەزارەتــی دەرەوەی بەریتانیای تیادایە دەربارەی كورد و یۆنان كە لەنامەكەدا وتراوە:

۱-حەزئەكەم ئاگاداری ئەوەتان بكەم كە یۆنانیـەكان خـەریكن هـانی كوردەكـان ئەدەن بۆئـەوەی ناوچەكانی ڕۆژهـەڵاتی توركیا بشێوێنن دژی توركیا، بێگومـان هــەموو بزوتنـــەوە و ڕاپـــەڕینێكی كـــورد بەتایبـــەتی ئەگـــەر لەلایـــەن كـــوردە نەتەوەییەكانـەوە بێـت دەبێتـە مایـەی سـەغڵەتی بـۆ توركـەكان كـە دژی ئـەوەن ئۆتۆنۆمی بدرێت بەكورد.

۲-بەڵام لامواپە ئەگەر بزوتنـەوە و چالاكیەكانی كورد یەكیشبگرێت هێشتا بـەهیچ ئـەنجامێك ناگـەن چـونكە پەیوەنـدی كـورد و تـورك لـەڕووی هەسـتی ئاینیانـەوە كـە هاوئاینیـان ڕێگـەی ئـەوە نـادات كـورد هاوكاری لەگـەڵ یۆنـانی و كریسـتیانیدا بكـات (كـە بـەزۆری لەمـەدا مەبەسـتی هەڵوێسـتی تـاقمی شـێخ عەبدولقادر شەمزینی بووە).

۳-مستەفا یامولكی هـەروەكو ئەفسـەرێكی كوردی شـاری سلێمانی پیـاوێكی ناسـراوە و قـەرزاری حكومـەتی بەریتانیایـە بەرامبـەر بـەوەی سـاتێك لەلایـەن توركەكانەوە گیرابوو بەرلەوەی ماوەی زیندانیكردنەكەی تەواوببێت ئێمە هەوڵمان بۆدا و بەردرا و ڕێگەی پێدرا بگەڕێتەوە بۆ سلێمانی.

(ئەوەی شایانی باسە مستەفا پاشا یامولكی پاشنەوەی گەڕایەوە بۆ سلێمانی و بەنهێنی خۆی گەیاندە لای سمكۆ، هـەوڵێكی زۆری لەگەڵ سمكۆدا دا لەجیاتی ئـەوەی شـەڕ لەگـەڵ حكومـەتی ئێرانـدا بكـات بچێتە كوردسـتانی باكوور و دژی توركە كەمالیەكان شۆڕش بكات بەتایبەتی لەو ڕۆژانەدا توركـەكان تووشـی شـەڕ بووبوون لەگەڵ یۆنانیەكاندا، لەدوكیومێنتی ژمارە (C.O.۷۳۰/۱۹-٥٥۲۹. No.۲۷-۳٤) ڕۆژی ۱۹۹۲/۱/۲۰دا باسـی ئـەو تەقەلایـەی مسـتەفا یـامولكی كراوە كە لەلاپـەڕە (۳٥۱)ی كتێبـی (سمكـۆ و بزوتنـــەوەی نەتەوایـەتی كـورد)، چـاپی سـتۆكهۆڵم، لەسـاڵی ۱۹۹٥دا چـاپمكرد و بەدووروودرێـژی باسـی ئـەو دوكیومێنتـەم كـردووە، بـەڵام سمكـۆ نەچـۆتە ژێـر بـاری ئـەو داخوازییـەی مسـتەفا یامولكی و لای وابـوو دەیتوانی سوود لەتورك وەربگرێت دژی ئێران.

**دوکیومێنتی پێنجەم:**

لەلاپەڕە (٦٣)ی کتێبەکەی (Robert Tolson) سەرچاوە/٨٤ باسی چۆنیەتی پەیوەندی کوردەکانی کردووە بەیۆنانیەکانەوە کە وتویەتی: پەیوەندی کورد بەیۆنانیەکان لەوەوە دەستیپێکرد کە (Kane Populos)ی کاربەدەستی یۆنانی لەباڵیۆزخانەی یۆنان لەئەستەمبوڵ پەیوەندی بەئەمین عالی بەدرخان و حامدبەگەوە هەبوو، مەندوبی سامی یۆنان لەئەستەمبوڵ کوردێك کە ناوی (Hamid Cavus–کە ڕەنگە هەر ئەو حامدبەگە بوبێت کە وتویەتی لەگەڵ ئەمین عالی بەدرخاندا چاوی بەو کاربەدەستەی یۆنانی کەوتوە) بوو ناردی بۆ کوردستان بۆ ناوچەی (ئەماسیە) بۆلای لێپرسراوی کەنیسەی (Votsis) و کوردەکان ویستیان ئەو کوردانەی لەناو سوپای تورکدا بوون و لەو شەڕەی تورك و یۆناندا لەلایەن هێزەکانی یۆنانەوە بەدیل گیرابوون لەتورکە گیراوەکان جیابکرێنەوە و بەربدرێن و پڕوپاگەندەیەکی باشیان پێبکەن دژی تورکەکان لەناوچەی (ئەنادۆڵ)دا و پێشنیازی کوردەکان درا بەجەنراڵ (Papolus) کە لەسەرکردەی یەکێك لەهێزەکانی یۆنان بوو، بەڵام ئەو پێشنیازە هیچی لێنەهاتە بەرهەم.

لەمانگی ئۆکتۆبەری ١٩٢١دا هەروەکو (ڕۆبەرت ئولسون) باسیکردووە ئەمین عالی بەدرخان و کوڕەکەی کە زمانی کوردی دەزانی نێردران بۆ میسر و لەوێ بەیاننامەیەکیان بەکوردی تورکەکان ئامادەکرد و بڕیاردرا ئەو بەیاننامانە بەفڕۆکە بەسەر هێزەکانیدا بڵاوبکەنەوە بۆئەوەی کوردەکانی ناو ئەو هێزانە بیخوێنندنەوە و ناوەڕۆکەکەی بەجێبێنن.

(ڕۆبەرت ئولسون) دەڵێت بێجگە لەو تەقەلایانە مستەفا پاشای کوردی (مەبەست مستەفا پاشا یامولکی بووە)ش پەیوەندی بەیۆنانیەکان و بەئەرمەنیەکانەوە کرد بۆ هاوکاریکردنی کورد لەگەڵ هەردوولایاندا، لەمانگی شوباتی ١٩٢١دا مستەفا یامولکی پەیوەندی هەبووە لەگەڵ پارتی دیموکراتی ئەرمەنی (Dashnaksuthium).

هەروەکو لەدوکیومێنتی چوارەمدا باسمانکردووە سمکۆ بەهەڵەدا چووبوو کە داخوازیەکەی مستەفا پاشای قبوڵ نەکردبوو دژی تورکەکان ڕاپەڕین لەکاتی شەڕەکەی یۆناندا و لای وابوو ڕەنگە تورکیا بەسوودتر بێت بۆ بزوتنەوەکەی دژی ئێران وەك لەوەی بەگژیدا بچیت و ئاگاداری ئەوە نەبووە کە چۆن تورکە کەمالیەکان بەچاوێکی دوژمنانەوە سەیری بزوتنەوەکەیان کردووە و مامۆستا ڕەفیق حیلمی لەیاداشتەکەیدا سەرچاوە/٦٥ ڕەخنەی لەو هەڵوێستەی سمکۆ

گرتووه کە وتویەتی: تورکەکان هەمیشە بەگومان بوون بەرامبەر بەسمکۆ و بەڵگەشی بۆ ئەم قسەیەی ئەو نامەیەی (صبری بەگ) بووە کە بەناوی قوماندانی جەبهەوە لەرۆژی ١٣٣٨/٦/١٤ی کۆچیدا لەدیاربەکرەوە ناردبووی بۆ کاربەدەستانی خۆی و لەو نامەیەدا وتبووی (سمیتقو-تورکەکان بەسمکۆیان وتووە سمیتقو) کابرایەکی فێڵبازە و بەهۆی زرنگێتی خۆیەوە ئەو خەنجەرەی هەڵیگرتووە شاردویەتیەوە بۆئەوەی لەکاتی خۆیدا بەکاریبێنێت و لەدوهەم برگەی ئەو نامەیەی (بصری بەگ)دا وتراوە: سەرکەوتن و دەرکەوتنی سمکۆ لەناو عەشیرەتەکانی کورددا و گەورەبوون و بەهێزبوونی دەسەڵاتی شتێکە بۆ حکومەتی میللی ئێمە دەستنادات، بەلأم لەم رۆژەشدا تێکچوونمان لەگەڵیدا شتێکی باش نی یە و ئەوەی پێویستە ئیمرۆ دەربارەی ئەو بکرێت بریتی یە لەبلأوکردنەوەی پروپاگەندە دژی ئەو وەکو بوترێت بزوتنەوەکەی سمکۆ بەهاندان و بەپارەی ئینگلیز جێبەجێدەکرێت، بەمە دەتوانرێ ناوی بزرێنرێت.

بەچاوپیاخشاندنێك بەناوەرۆکی ئەو سەرچاوە و دوکیومێنتانەی خرانە بەرچاو بەئاشکرا ڕووندەبێتەوە حکومەتی بەریتانیا لەهیچ کاتێکدا لایەنگری هیچ بزوتنەوەیەکی کورد نەبووە و لەهیچ هەڵوێستێکیدا تەنها لەقسە و بەڵێنی سەرنەگرتوو بەولاوە کورد هیچی لێیان دەستگیر نەبووە و دڵنیام هەتا لەو تەقەلادانەی کورد بۆ هاوکاریکردن لەگەڵ یۆنانیەکاندا ئینگلیزەکان هەرخۆیان ڕێگەیان نەدابوو بەیۆنانیەکان لەگەڵ کورددا ڕێکبکەون، ئەگینا ئاخۆ چ هۆیەکی تر هەبووبێت ڕێی لەوە گرتبێت کە کورد بەدەمی خۆی چووبێتە پێشەوە و داوای لەیۆنان کردبێت ئامادەیە شانبەشانی ئەو دژی تورك شەڕبکات و یۆنانیش بەهیچ شێوەیەك بەدەنگیەوە نەچووبێت؟

## باسی دوهەمی بەشی شەشەم

### کوشتاری ئەرمەنیەکان لەلایەن تورکەوە

لەبەرگی یەکەمدا، لەبەشی سیازدەهەمدا کورتەباسێکی تاوانی تورکی عوسمانی و ئەو کوشتارەی لەئەرمەنیەکانیان کردبوو پێشکەشکرا و بەڵێنمدا لەبەرگی دوهەمدا تاوانی ڕەگەزپەرستەکانی تورك و ئەو کەمالیانەی لەدوای تەواوبوونی شەڕی یەکەمی جیهانی جێگەی ئەوانیان گرتبووەوە و ئەو کوشتارانەی لەئەرمەنیەکانیان کردبوو بەپێی ئەو سەرچاوانەی دەستگیرمان بوون باسیان بکەین، بەلاّم بەرلەوەی بچینە سەر باسی تاوانی کەمالیەکان و ئەو کوشتارەی لەئەرمەنیەکانیان کردبوو بەپێویستم زانی باسێکی مێژوویی دەربارەی پەیوەندی نێوان کورد و ئەرمەنی پێشکەش بکەم:

### یەکەم-باسێکی مێژوویی دەربارەی پەیوەندی کورد و ئەرمەنی

نەتەوەی ئەرمەنی یەکێکە لەو نەتەوە کۆنانەی لەدێرزەمانەوە خاوەنی ولاّتی خۆیان و مێژووی خۆیانن و دەیان بەڵگەی مێژوویی ڕوونیانکردۆتەوە، ئەرمەنیەکان خاوەنی شارستانیەکی دووروودرێژ بوون، بەلاّم ئەمانیش وەکو کورد تووشی سەدان کارەسات و بەسەرهاتی خوێناوی و ماڵکاولی و ولاّت وێرانی بوون و ئەمانیش وەکو میللەتی کورد زۆرجار خەڵەتێنراون و دستیان بڕیوون و تووشی کارەساتی جەرگبڕ و کوشتار بوون و بەپێی دراوسێتی کورد و ئەرمەنی لەلایەکەوە و لەیەکچوونی بەخت و چارەڕەشی هەردووکیان بەپێویستم زانی ئەو بەڵێنەی لەبەرگی یەکەمی ئەم کتێبەدا لەبەشی سیازدەهەمدا دابووم بگەڕێمەوە سەر باسی ئەرمەنیەکان و ئەو کوشتارانەی لێیانکرابوو کە تاڕادەیەکیش بەهۆی تورکەکانی عوسمانیەوە هەندێ لەچینەکانی کوردیش بەشداریان کردبوو لەکارەساتی کوشتاری ئەرمەنیەکاندا، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا کورد لەزۆر قۆناغی مێژووییدا خۆی بەدۆستی ئەرمەنی زانیوە و حەزی بەبرایەتی و هاوکاریکردنی ئەرمەنی کردووە و دەیان بەڵگە و سەرچاوەی باوەڕپێکراو دەربارەی دۆستایەتی و پەیوەندی باشی نێوان کورد و ئەرمەنی دراون و بۆیە بەپێویستم زانی باسەکە بکەم بەدوو بەشەوە، بەشی یەکەمی بریتی‌یە لەپەیوەندی کورد و ئەرمەنی و

دۆستایەتی و هاوکاریکردنی نێوانیان و بەشی دوهەم بریتییە لەتەواوکردنی باسی کوشتاری ڕەگەزپەرستەکانی تورك کە لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەمەوە سەریانهەڵدابوو بەناوی (ژون تورك) و بەناوی (اتحاد و ترقی) و لەدوای تەواوبوونی شەڕی جیهانی تورکە کەمالیەکان جێگەی ئەو ڕێکخراوە ڕەگەزپەرستە تۆرانیانەیان گرتەوە.

دکتۆر کەمال مەزهەر لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٢٤ (کوردستان لەساڵەکانی شەڕی جیهانیدا)، بەدوورودرێژی لەوە دواوە هەروەکو چۆن دەوڵەتی میدیای باوباپیرانی کورد دەوڵەتەکەیان لەلایەن ساسانیەکانەوە لەناوچوو، بەوجۆرەش ئەرمەنیا لەساڵی (٣٨٧)ی زاییینیدا لەنێوان دەوڵەتی ساسانی و بیزەنتیدا دابەشکرا و لەسەرەتای سەدەی هەشتەمەوە ئەرمەنیا بوو بەبەشێك لەدەوڵەتی عەرەبی ئیسلامی و لەسەرەتای سەدەی یازدەدا کەوتە ژێر دەسەڵاتی بیزەنتیەکان و بەرەودوا کەوتە ژێر دەستی سلجوقیەکان و تاتار و مەغۆل (لەبەرگی یەکەمدا باسی گەیشتنی لێشاوی تورکمانی کردووە بۆ سەر ئەرمەنیا) و وڵاتەکەی هەرجارەی لەلایەن تاقمێکەوە کاولکراوە و پاشنەوەی شەڕی عوسمانی و سەفەویەکان هەڵگیرسا لەسەدەی شازدەهەمدا وڵاتی ئەرمەنیا بوو بەیەکێك لەکۆڕەکانی ئەو شەڕە و لەساڵی (١٦٣٩)دا ئەرمەنیا دابەشکرا، ئەرمەنیای ڕۆژهەڵات کەوتە ژێر دەسەڵاتی سەفەوی و ئەرمەنیای ڕۆژئاوا کەوتە ژێر دەسەڵاتی عوسمانیەکان و بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ لەژێر جەور و ستەمی تورکەکاندا دانیشتوانەکانی دەیانناڵاند و لەدوای تەواوبوونی شەڕی جیهانیش ئینجا تورکە کەمالیەکان لەوانەی بەر لەخۆیان دڕندانەتر ڕەفتاریان لەگەڵ ئەرمەنیەکاندا کرد بەنیازی لەناوبردنیان.

لەبەرگی یەکەمدا ئاماژەمان بۆ هەندێ سەرچاوە کردبوو دەربارەی خەبات و تێکۆشانی ئەرمەنیەکان بۆ خۆڕزگارکردن لەعوسمانیەکان و ڕاپەڕینەکانیان لەساڵی (١٨٦٢)دا کە جوتیارەکانی ئەرمەنی لەناوچەی (زەیتون) دەستیانپێکردبوو لەگەڵ ئەو شۆڕش و ڕاپەڕینەی لەنێوان ساڵانی (١٨٧٨-١٨٨٤)دا دەستیپێکردبوو هەردووکیان لەلایەن تورکەکانەوە بەوپەڕی دڕندەیەتیەوە لەناوبران کە ئەو ڕەفتارەی تورك بوو بەهۆی تووڕەبوون و ناڕەزایی دەوڵەتە ئەوروپاییەکان و ساتێك تورکەکان لەو شەڕەی ڕوسەکان لەگەڵیاندا کردن شکێنران ئیتر تورك ناچاربوو لەمانگی شوباتی (١٨٧٨)دا پەیمانی (سان

ئیستیفانۆ) مۆربکات و لەبەندی (١٦)ی ئەو پەیمانەدا داوا لەعوسمانیەکان کرا باری ئابووری و جۆری بەڕێوەبردنی کاروباری ئەرمەنیەکان باش بکرێت و لەپەیمانی (بەرلین)یشدا کە تورکەکان ناچاربوون مۆریبکەن لەمادە (٦١)یدا، ناوەڕۆکی مادە (١٦)ی پەیمانی (سان ئیستیفانۆ) دوبارە کرایەوە، بەلاّم ئەوەی لەو دوو پەیمانەدا کرابوو بەمەرج بەسەر تورکەکانەوە هیچ سوودێکی بۆ ئەرمەنی تیادا نەبوو، هیچیان لیّدەستنەکەوت.

دەربارەی پەیوەندی کورد و ئەرمەنی ئەو سەرچاوانەی لەو باسە دواون پڕن لەبەلّگەی ڕوون و ئاشکرا کە لەکۆندا کورد و ئەرمەنی نەیار و دوژمنی یەکتر نەبوون و لەشۆڕشەکانی بەدرخان پاشا و شێخ عوبەیدوڵلاّی نەهریدا گەلێك نمونەی دۆستایەتی کورد و ئەرمەنی بەرچاودەکەوێت کە لەبەرگی یەکەمدا لەو سەرچاوانە دواوین هەتا ئەوکاتەی (میسینێر)ەکان بەتایبەتی ئەوانەیان لەلایەن دەولّەتە سەرمایەدارەکانەوە بۆ مەبەستێکی سیاسی نێردرابوون لەژێر پەردەی ئایندا نەبووبوونە هۆی ناکۆکی لەنێوان کوردی موسلّمان و کریستیانەکانی دراوسێیاندا، کورد لەگەلّ هەموویان دۆست بووە و تا ئەوکاتەی میسینێرەکان بەڕاسپاردەی کاربەدەستانی دەولّەتەکانیان نەکەوتبوونە تێکدانی نێوان کورد و ئەو کریستیانانە کە ئەم هەلّوێستە لەڕووداوەکانی حوکمداریّتی بەدرخان پاشا و شێخ عوبەیدوڵلاّی نەهریدا ڕووندەبێتەوە کە بەر لەتێکدانی نێوانی کورد و کریستیانەکان چۆن هەردووکیان بەچاوێکی برایانەوە سەیری هەموو هاولاّتیانی خۆیان دەکرد بیٚگوێدانە جیاوازی ڕەگەز و ئایین.

بێگومان ئەو کێشە و ناڕێکیانەی بەرەبەرە لەنێوان کورد و کریستیانەکانی ناوچەکە تا دەهات پەرەیدەسەند کە بێجگە لەڕۆلّی میسینێرەکان، کاربەدەستانی تورکیش ئاگری ناکۆکی نێوانیانی خۆشدەکرد و هەروەکو پڕۆفیسۆر جەلیلی جەلیل لەسەرچاوە/١٨دا بەدووروودرێژی باسیکردووە تەقەلاکانی کاربەدەستانی تورك ئەوەندە کاریگەر بووە لەمێشکی هەندیّ لەکوردە کەللەڕەقەکاندا کە بەئاشکرا دژی کریستیانەکان دەجولاّنەوە و تورکەکان وایان خستبووە مێشکیانەوە ئەگەر فریای خۆیان نەکەون بەپێی بڕیارەکانی (سان ئیستیفانۆ) و (بەرلین) دەولّەتە ئەوروپاییەکان کارێکی وا دەکەن کریستیانەکان دەست بەسەر کوردستاندا بگرن.

بۆ نمونە ئەمە حاجی قادری کۆیی لەچەند شیعرێکیدا شیوەنی خۆی کردووە بۆ ئەو کارەساتەی بەسەر کورددا دەهات ئەگەر کورد فریای خۆی نەکەوتایە کە وتویەتی:

خاکی جزیرە و بۆتان، یەعنی وڵاتی کوردان

سەد حەیف و سەد مخابن دەیکەن بەئەرمەنستان

(مسجد) دەبێتە (دیر) و (ناقوس)یان مؤذن

مطران دەبێتە قازی، مفتی دەبێتە رهبان

هیچ غیرەتێک نەماوە، سەدجار قەستەم بەقورئان

پەیدابێ ئەرمەنستان نامێنێ یەک لەکوردان

لەڕاستیدا هەموو کورد هەمیشە بەو چاوەی عوسمانی سەیری ئەرمەنیەکانیان نەکردووە و زۆر کوردی وا هەبووە ئەرمەنیان بەبرای خۆیان زانیوە و هەستیان بەئێش و ژانیان کردووە، ئەمین زەکی بەگی مێژوونوسی بەناوبانگ لەلاپەڕە (٢٥٤)ی کتێبەکەیدا فەرموویەتی: ((پەیوەندی نێوان کورد و ئەرمەنی لەڕابردوودا خراپ نەبوو، لەسەرەتای مێژوودا هەردوولایان پێکەوە ژیابوون و ئەو پەیوەندیەی جارانیان درێژەی دەکێشا ئەگەر کاربەدەستان و موچەخۆرەکان (مەبەست هی عوسمانیە) دەستیان نەخستایەتە ناو کاروباری ناوچەکانیانەوە و کاربەدەستانی حکومەتی بۆئەوەی توانا و دەسەڵاتی هەردوولایان کزبکەن هەوڵیاندەدا بیانکەن بەگژیەکتردا نەوەکو هەردووکیان لەناو خۆیاندا دژی ئەوان یەکبگرن)).

ئەمین زەکی لەباسەکەیدا لەسەری ڕۆیشتوە و وتویەتی: (لەڕاستیدا ئەم سیاسەتەی تورك بەرامبەر هەردوولایان سیاسەتێکی سەرکەوتوانە بووە بۆ سوودی خۆیان و توانیبووی هەردوولایان لەیەکتر دابڕێت و بیانکا بەدوژمنی یەکتر و ئەنجام بەوە گەیشت زنجیرەیەك بەسەرهات و ڕووداوی خوێناوی لەنێوانیاندا قەوما کە یەکێك لەوانە ڕووداوەکەی ساڵی (١٣١٢)ی کۆچی بەرامبەر بەساڵی (١٨٩٤)ی زایینی بوو کە هەردوولایان لەو ڕووداوەدا تووشی زیانێکی گەورەی خۆڕایی بوون و لەهەردوولادا تووشی ماڵکاولی بوون کە لەمەدا کورد زۆرتر بەتوندوتیژی جوڵابووەوە، لەساڵی (١٣١٣)ی کۆچی بەرامبەر بەساڵی (١٨٩٥)ی زایینی شەڕ لەناوچەی (هەکاری) تازەبووەوە، بەڵام ئەمجارە هێزەکانی حکومەتی تورك پەلاماری ئەرمەنیەکانیاندا و کوشتارێکی زۆریان لێکردن.

بەرلەوەی بچینە سەر باسی تاوانەکانی تورك لەو کوشتارانەی لەئەرمەنیەکان کرابوو، کە هەندێ لەئاغا و دەرەبەگ و سەرۆك عەشیرەتە کەللەڕەقەکانی کوردیش بەشدارییان تێدا کردبوو دژی ئەرمەنیەکان، بەلاّم بەداخەوە ئەرمەنیەکانیش هەندێکیان بەرامبەر بەڕەفتاری ئەو کوردانە لەهەندێ هەڵوێستیاندا بەوپەڕی کورتبینی و گێرەشێوێنیەوە دژی کورد جولاّونەتەوە، بۆ نمونە دکتۆر کەمال مەزهەر لەلاپەڕەکانی (١٢٦-١٢٧)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٢٤ باسی هەڵوێستی هەندێ لەئەرمەنیەکانی بەپێی بۆچونی گردلیڤسکی و لازاریفی بەمجۆرە باسکردووە کە وتویەتی: ((ڕووناکبیرەکانی ئەرمەنی هەوڵی ئەوەیاندابوو کورد و ئەرمەنی پەیوەندیان باش بێت لەگەڵ یەکدا و تێکنەچن و دووربینانە دەیانڕوانیە ئەو پەیوەندیە، بەلاّم لازاریف وتویەتی داشناقەکان بەپێچەوانەی ئەو ڕۆشنبیرانە خزمەتێکی زۆر خراپیان پێشکەش بەئەرمەنیەکان کرد، چونکە ئاگری ڤینی ئاینیان دژی کوردەکان خۆشکرد)).

مێجەر نویل لەلاپەڕە (١٧)ی یاداشت و ڕاپۆرتەکەیدا سەرچاوە/٢٧ لەیاداشتی ڕۆژی ١٩١٩/٩/٣دا نوسیویەتی: ڕۆژی ١٩١٩/٩/٣ لەڕێگاماندا کە بەرەو (مالاتیا) دەڕۆیشتین، تووشی چەند کوردێکی ئاوارە بووین لەوانەی لەدوای شکانی تورکەکان لەلایەن ڕوسەوە لەقارس کە لەلایەن ئەرمەنیەکانەوە ئاوارەکرابوون دوایئەوەی ئەرمەنیەکان دوای ئەو شکاندنەی تورك حکومەتێکیان لەقارسدا دروستکردبوو ئەرمەنیەکان بەهیچ شێوەیەك ڕێگەیان نەدا بەو کوردە ئاوارەبووانە بگەڕێنەوە شوێنەکانی خۆیان و ساتێك لەیەکێك لەو کوردە ئاوارەبووانەم پرسی ئایا بیر لەوە دەکەیتەوە بگەڕێیتەوە بۆ شوێنی خۆت، لەوەلاّمدا بەدووروودرێژی باسی دڕندەیەتی ئەرمەنیەکانی بۆ کردم کە چۆن ڕەفتاریان لەگەڵ کورددا دەکرد و خۆزگەیان بەو ڕۆژانە دەخواست کە ساتی خۆی لەژێر دەسەلاّتی ڕوسی قەیسەریدا بوون کە کەس دەستی نەدەخستە ناو کاروباریانەوە و باجێکی کەمیان دەدانێ و لەسەربازێتیش ڕزگاریان بووبوو.

مێجەر نویل لەشوێنێکی تری یاداشتەکانیدا لاپەڕە (٢٦) کە یاداشتی ڕۆژی ١٩١٩/٩/١٨ی تێدا تۆمارکردووە، لەگەڵ ئەوەشدا (نویل) کریستیان بووە و بێلایەن بووە بەلاّم کە هەڵوێستی ئەرمەنیەکانی دیوە بەرامبەر بەکورد خۆی پێنەگیراوە و لەو یاداشتەیدا وتویەتی: لەڕاستیدا نابێ لۆمەی هەموو میللەتی کورد بکرێت تەنها لەبەرئەوەی چەند کەسێکیان لەوانەی کە خووڕوفتاری

ئەفەندیەکانی تورك کاری تێکردبوون و هەڵخەڵەتێنرابوون و مێشکیان بەنجکرابوو، گەیشتبوونە ڕادەیەك لەهەستی کوردایەتی دوورکەوتبوونەوە و دەماری کوردایەتیان مردبوو، هەتا بینەقاقایان لەقوڕ و لیتاوی تورکەکاندا نوقم بووبوون، کەچی تورکەکان هەموو دەستە خوێناویەکەی خۆشیان هەر بەسەر کوردەکاندا ئەسڕین و ئەو گەڕیدە ئەوروپاییانەی کە دەچنە ئەو ناوچانە لەلایەن کاربەدەستانی تورکەوە چەواشە دەکرێن، بۆئەوەی ببێتە هۆی ئەوەی وڵاتان بەچاوێکی سوك بڕواننە میللەتی کورد.

مێجەر نویل لەیاداشتەکەیدا هەروەکو چۆن هێرشی بردۆتە سەر ئەو تاقمەی کورد، لەهەمانکاتدا هێرشیشی بردۆتەسەر هەندێ لەئەرمەنیەکان و ڕەخنەی لێگرتوون و لەوڕووەوە وتویەتی: ((تورکەکان و ئەرمەنیەکان هەریەکەیان بەشێوەیەك دوژمنایەتی کوردیان کردووە، ئەرمەنیەکان بەپشتگیریکردنی دەوڵەتەکانی ئەورووپا پشت ئەستووربوون و هەردوولا (مەبەستی تورك و ئەرمەنیە) هەروەکو سەگ وان بەرامبەر کورد و ئامادەن ڕیەجووتە دژی کورد کاربکەن و سەرەڕای ئەوەش ئەو کوشتارەی لەئەرمەنیەکان کرابوو هەمووی بخەنە ئەستۆی کوردەوە کە لەمەدا تورکەکان بەرتیلێکی باشیان دابوو بە(Pierre Loth)ی فەرەنسی بۆئەوەی لەپاریس بەزمانی فەرەنسی نامیلکەیەك چاپبکات و لەو نامیلکەیەدا ناوی کورد بزڕێنرێت و هەروەکو تورك لەو تاوانەدا هیچ دەستێکی نەبووبێت)).

نویل لەلاپەڕە (٢٨)ی یاداشتەکەیدا لەسەریڕۆیوە و وتویەتی: کاپتن (Elphiustone) ساتێك بۆ ماوەیەك چووبوو بۆ (حەڵەب) و لەوێ چادری هەڵدابوو لەناوچەیەکدا کە زۆربەی دانیشتوانی ئەو ناوچەیە کورد بوون و ساتێك لەحەڵەب گەڕایەوە و بارودۆخی ناوچەکەی بۆ گێڕامەوە کە چۆن وەختێك تورکەکان کوشتاریان لەئەرمەنیەکان کردبوو، کوردەکانی ئەو ناوچانە بەرپەڕی جوامێریەوە فریای ئەرمەنیەکان کەوتبوون و داڵدەیان دابوون و ژمارەیەکی زۆری ئەرمەنیان لەدەست تورکەکان ڕزگارکردبوو، کار گەیشتبووە ئەو ڕادەیەی ئەرمەنیەکان بەجۆرێك هۆگری کوردەکان بووبوون نەیاندەویست بەجێیان بێڵن و کاپتن (ئیلفستۆن) بەچاوی خۆی دیبووی کوردەکان ئاشێکی گەورەیان بەخشیبوو بەخێزانێکی ئەرمەنی و بەوە باری گوزەرانی ئەو خێزانە تەواو باشبووبوو، بەڵام ئەمە زۆری نەخایاند چونکە هەندێ لەگێرەشێوێن و پڕوپاگەندەچی ناو

ئەرمەنیەکان هاتنەلای ئەو خێزانە و چوونە بنکلێشەیان بۆئەوەی ئاشەکەی پێبەجێبهێڵن بەئومێدی ئەوەی خۆیان ئەو شوێنەیان دەستگیرببێت و هەندێ لەو گێرەشێوێنانەی ئەرمەنی تاقمێك لەئەرمەنیەکانیان بەوە خەڵەتاندبوو ئەگەر ئەو ناوچەیە بەجێبێڵن و بچنە حەڵەب لەوێ دەتوانن یارمەتی لەئەمریکاییەکان وەربگرن چونکە ئەمەیان بۆ باشترە وەك لەوەی لای کوردەکان بمێننەوە.

مێجەر نویل لەیاداشتی دوو ڕۆژی تریدا باسی دوو هەڵوێستی باشی کوردی کردووە بەرامبەر بەئەرمەنیەکان و لەوەی لەڕۆژی ١٩١٩/٨/٢٦دا کە خۆی ئاگاداری هەڵوێست بووە وتویەتی: ڕۆژی ١٩١٩/٨/٢٦ کە چووم بۆ گوندی (سەری حەسەن ئاغا)، لەشوێنێکدا لەدۆڵی ڕووباری (ئاق سو) کە شوێنی هەوارگەی (تاپوئاغا) و (ئاسف ئاغ) کە سەرۆکی خێڵی (سینا میللی) بوون (نویل لەلاپەڕە ٨٥ی دوکیومێنتەکەدا وێنەیەکی تاپوئاغای بڵاوکردۆتەوە لەگەڵ چوار کوردی تردا)، لەگوندێکدا ئەرمەنیەکی قژ زەردی دەم هەراش و زمان لوسی لێبوو دەستیکرد بەپیاهەڵدان و ستایشی ئەو کوردانەی لەدەست تورکەکان ڕزگاریانکردبوو، بەپێی یاداشتەکە ناوی ئەو ئەرمەنیە (Kirkol Parlaquain) بووە ساتێك لەناوچەی (مەرعەش)ەوە هاتبوو، لەوەدا (حەسەن ئاغا)ی باوکی ئاسف ئاغا لەساڵی ١٨٩٥دا لەتورکەکان ڕزگاریکردبوو، کوردەکان لەو گوندەدا خۆشیان بۆیانگێڕامەوە چۆن ئەو ئەرمەنیانەی لەناوچەی (سێواس)ەوە هاتبوون و لەڕێگایاندا لەگەڵ تورکەکان تووشی شەڕبوون و کوردەکان فریایان کەوتن و ئەرمەنیەکانیان پاراست لەدڕندەیەتی تورکەکان کە لەئەنجامی ئەمەدا کوردەکان خۆشیان تووشی کێشە و هەرا بوون لەگەڵ تورکەکاندا کابرای ئەرمەنی قژ زەردیش ئەوی ئەو کوردانە لەبیریان چووبوو باسیبکەن ئەو بۆی تەواودەکردن.

مێجەر نویل لەشوێنێکی تری یاداشتەکەیدا لاپەڕە (٢٢) باسی پیاوەتی و جوامێریەکی تری کوردی کردووە بەرامبەر بەئەرمەنیەکان و لەیاداشتەکەیدا وتویەتی: ((تاپۆ ئاغای سەرۆکی عەشیرەتی (سینامیللی) بۆی گێڕامەوە چۆن لەکاتی شەڕی تورك و ئەرمەنیەکاندا هۆزەکەی ئەو دالدەی ژمارەیەك لەئەرمەنیەکانی دابوو، لەکوشتاری تورکەکان ڕزگاریانکردبوون، هەتا قائیمقامی (بازارجیك) کە بەڕەگەز لوبنانی بوو بەڵام زۆر دۆستی کورد بوو خۆشیدەویستن، ئەو قائیمقامە داوای لەکوردەکان کردبوو ئەرمەنیە ئاوارەکان بگرنەخۆیان و ئەوانیش حەوانیاننەوە و لەمردن ڕزگاریانکردن، بەڵام ساتێك کاربەدەستەکانی بەڕەگەز تورك بەمەیانزانی نەك تەنها هەر ئەرمەنیەکان بەڵکو کوردەکانیشیان سزادابوو)).

دکتۆر کەمال مەزهەر لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٤٥ ئاماژەی بۆ چەند سەرچاوەیەك کردووە کە باسی کوشتاری ئەرمەنیەکان و تاوانەکانی تورکیان کردووە بەرامبەر ئەرمەنی و لەلاپەڕە (١٥٠)ی ئەو کتێبەیدا وتویەتی: ((لەکاتی خۆیدا لەساڵی ١٨٩٤دا نزیکی (٢٥٠٠) ئەرمەنی لەناوچەی (ئورفە)دا کە زۆربەیان ئافرەت و منداڵ بوون پەنایان بردبووەبەر کەنیسەیەکی ئەرمەنیەکان بەڵام تورکەکان نەوتیان کرد بەسەر کەنیسەکەدا و ئاگریان تێبەردا و توانرا لەوانە (٥٠) کەسیان بەهۆی مستەفا ئاغای ڕەجەب و خەلیل ڕەجەب و حەیدەرەوە ڕزگاربکرێن و بەهۆی ئەو سێ کەسەوە لەهەندێ شوێنی تریش گەلێك ئەرمەنی ڕزگارکران)).

دکتۆر کەمال مەزهەر لەلاپەڕە (١٥١)ی هەمان سەرچاوەدا ئاماژەی بۆ کتێبێکی ڕوسی کردووە کە لەساڵی ١٨٩٧دا لەمۆسکۆ چاپکراوە لەژێر ناوی (یاریدەی برایانە بۆ ئەرمەنیە لێقەوماوەکانی تورکیا)، لەو کتێبەدا دەربارەی یارمەتیدانی کوردی بۆ ئەرمەنیەکان بەمجۆرە باسکردووە: ((گەلێك بەگی کوردی واهەبووە جوامێرانە ژمارەیەك لەئەرمەنیەکانی لەکوشتار ڕزگارکردبوو، وەکو (مەحمودزادە بەیتوڵڵا بەگ) کە پیاوێکی باشبووە و بەمرۆڤدۆست ناسرابوو، توانیبووی ئەرمەنیەکانی ناوچەی (موکس) لەکوشتاری تورك ڕزگاربکات و (٤٠٠) کوردی ئازای کۆکردبووەوە بۆئەوەی ئەو عەشیرەتە کوردانەش ڕاوبنێت کە دەیانویست بەهاندانی حکومەتی تورکی عوسمانی پەلاماریان بدەن لە(موکس-کە مەبەست لەوانە بووە سوارەی حەمیدیە بوون) و هەمان مەحمودبەگ (٣٠٠) لیرەی خۆی بۆ یارمەتیدانی ئەرمەنیەکان تەرخانکردبوو، جگەلەوە کوردەکانی دەرسیمیش لەهەمووان پیاوانەتر هاتبوونە دەست و توانیبوویان داڵدەی پێنج هەزار ئەرمەنی ئاوارە بدەن)).

دکتۆر کەمال مەزهەر لەهەمان کتێبیدا سەرچاوە/٤٥ لەلاپەڕە (١٥٤)دا ئاماژەی بۆ لاپەڕە (٢٠٩)ی کتێبەکەی (E.١١.Keeling-lop-cit) کردووە کە لەو کتێبەدا وتویەتی: ((لەدوای تەواوبوونی شەڕ، لەزۆر شوێنی کوردستاندا گەلێك ئەرمەنی پەنابەر دۆزرابوونەوە و لەپاش مۆرکردنی پەیمانی (مودراس) بەماوەیەکی کەم چەند نوێنەرێکی کورد چووبوونە لای ئینگلیزەکان لەحەلەب و نامەیەکی تایبەتیان بۆ بردبوون و ئاگاداری ئەوەیانکردبوون کە لەگوند و ناو ڕەشماڵەکانیاندا (٦٥٠) ئەرمەنی ئاوارە هەن زۆربەیان ئافرەت و منداڵن و لای دراوسێکانیشمان نزیکەی (٣٨٠٠) ئەرمەنی تریان لایە و لەناو خێوەت و

ڕەشماڵەکانی ئاسیاوەکانماندا (٦٨٠٠) ئەرمەنی تر لەناوچەکانی ڕۆژهەلاتدان کە دوورن لەئێمەوە بۆیە پەیوەندیکردن پێیانەوە ئاسان نییە و کوردەکان ئامادەیی خۆیان پیشاندا بۆ دۆزینەوە و کۆکردنەوەی ئەرمەنییە ئاوارەکان و یارمەتیدانیان)).

دکتۆر کەمال مەزهەر لەلاپەڕە (١٥٥)ی هەمان سەرچاوەدا باسی کتێبەکەی (ئستارجیان)ی کردووە کە لەلاپەڕەکانی (٣١٥-٣١٦)دا وتویەتی: ((زۆرجار کوردەکان لەسەر یارمەتیدانی ئەرمەنییەکان تووشی سزای قورسی تورکەکان دەبوون و تورك بیزانیایە هەرکوردێك یارمەتیدەری ئەرمەنییە لەناویاندەبرد و کەسوکارەکەشی تووشی سەرکەردانی و ماڵوێرانی دەبوون)).

دەربارەی هاوکاری و یارمەتیدانی کورد بۆ ئەرمەنی، (لازاریف) لەلاپەڕە (١٢٩)ی کتێبەکەیدا، چاپی لەندەن، ئاماژەی بۆ کتێبەکەی (نوری دەرسیمی) کردووە کە لەو کتێبەدا وتراوە: ((لەگەڵ ئەوەشدا کورد لەئەرمەنییەکان زۆرتر و خراپتر تووشی جەور و ستەمی تورکەکان بوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەپێی توانا یارمەتی ئەرمەنییەکانیان داوە لەکاتی ئەو کوشتارانەی لەشەڕی جیهانیدا لەلایەن تورکەوە لێیانکرابوو، لەڕێگەی (دیرزور)ەوە ئەرمەنییەکان پەنایانبردبووەبەر کوردە یەزیدیەکان و ئەوانیش پاراستنیان و نەیانهێشت تورکەکان سزایان بدەن)).

لازاریف لەو کتێبەیدا ئاماژەی بۆ نامەیەکی تایبەتی کردووە کە لەئەرمەنییەکانی گوندی (خاشو)ەوە ناردبوویان و لەو نامەیەدا باسی هۆزی (محەمەد ئاغا)یان کردووە چۆن بەرەنگاری سەرباز و جەندرمەکانی تورك بووبوونەوە و ڕێگەیان نەدابوو دەستدرێژی بکرێتەسەر ئەرمەنییە ئاوارەکانی ئەو ناوچەیە لەگەڵ ئەوەشدا کورد خۆی لەو ڕۆژەدا پەرێشانبوو، بەدەست برسێتییەوە دەیناڵاند و کەچی دوا پارچە نانیان لەگەڵ ئەرمەنییەکاندا دەکرد بەدوو بەشەوە و جاری وا هەبووە کوردەکان ناچاریش دەبوون بۆ ئەو مەبەستە کەلوپەلی خۆشیان بۆ دەفرۆشتن.

تا ئێرە بریتی بوو لەباسی هەڵوێستی کورد و ئەرمەنی بەرامبەر بەیەك و هەرچەند لەبەرگی یەکەمدا کورتەباسێکی تاوانی تورکی عوسمانیان کردبوو بەرامبەر بەئەرمەنی، بەپێویستم زانی ئەوەی لەو بەرگەدا هێشتبوومەوە بۆ بەرگی دوهەم باسی ئەو سەرچاوانە بکەم لەکاتی شەڕی جیهانی و لەدوای شەڕەکەش تورکە تۆرانییەکان و تاقمی کەمالیەکان چ جۆرە تاوانێکیان لەئەرمەنی کردبوو.

## دووهەم-کوشتاری ئەرمەنی لەلایەن تورکەکانەوە لەکاتی شەڕی جیهانی و لەدوای شەڕ

دەربارەی تاوانی تورکەکان لەو کوشتارانەی تورکەکان کردبوویان لەکاتی شەڕی جیهانیدا ئاماژە بۆ ئەو یاداشتەی (نەدیم بەگ)ی تورك دەکەین کە لەژێر ناوی (The memories of Nation bex)، چاپی لەندەن، ١٩٢١، (تورکەکان پیتی دال دەکەن بەتێ) کە دکتۆر کەمال مەزهەر لەلاپەرە (١٢٣)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٢٤ باسیکردووە، لەو یاداشتەی نەدیم بەگدا دکتۆر کەمال ئاماژەی بۆ لاپەرە (٦٤)ی ئەو یاداشتە کردووە کە باسی تەلگرافێکی تەلعەت پاشای وەزیری ناوخۆی تورکی کردووە کە ناردوویەتی بۆ والی تورك لەحەڵەب و پێی‌وتوە: ((بەرلەمەش پێتان ڕاگەیەنرابوو کە پێویستە بەپێی فەرمانی جەمعیەت ئەو بڕیارەی داوێتی بەجێبهێنرێت بۆئەوەی بەیەکجاری ئەو ئەرمەنیانەی لەناو خاکی تورکیادا دەژین لەناوببرێن و هەر کاربەدەستێك دژی ئەو بڕیارە بوەستێت و بەجێی‌نەهێنێت لەسەر کارەکەی نامێنێتەوە، هەرچەندە ئەم هەنگاوانە توندوتیژیش بن، بەڵام دەبێ کۆتایی بەئەرمەنیەکان بهێنرێت و نابێ گوێبدرێتە تەمەن و پیاو و ئافرەت و ویژدان)).

یاداشتەکەی نەدیم بەگ لەلاپەڕەکانی (٢٥٥، ٢٨٠، ٢٨٢) هەروەکو دکتۆر کەمال مەزهەر باسیکردووە لەو لاپەڕانەدا وتراوە: ((لەزمانی یەکێك لەکاربەدەستە گەورەکانی تورك لە(موش)ەوە گێڕاویەتیەوە کە وتویەتی ئێمە لەو شەڕەدا (مەبەست ئەو کوشتارەیە لەئەرمەنیەکان کرابوو) فەرمانمان بەکوردەکان دابوو ئەرمەنیەکان لەناوببەن کەچی ئەوان هەر خەریکی تاڵانکردنیان بوون وەك لەکوشتار، دیارە وەکو ئەو سەرچاوەیە باسیکردووە تورکەکان هەر بەوەوە نەوەستابوون کە تەنها ئەوانەی ئەو فەرمانەیان پێدرابوو بەشدارییکەن لەکوشتاردا بەڵکو ئەو کوردانەی تریش کە لەسەر جەردەیی و دزی و پیاوکوشتن گیرابوون ئەوانیشیان لەزیندان بەردا و ناردیانن بۆ ئەو کوشتارەی لەئەرمەنیەکان کرا)).

دەربارەی ئەو تەلگرافەی (تەلعەت پاشا) کە لەیاداشتەکەی نەدیم بەگدا باسیکراوە، لەگۆڤاری (Kurdish Time) کە (مستەفا قەرەداغی) لەئەمریکا

دەریدەکات باسێکی تیایە بەپێنوسی (Kak Bajalan–کاك باجەلان) لەمەشدا ئاماژە بۆ هەمان تەلگراف کراوە کە وتویەتی لەو تەلگرافەدا (تەلعەت پاشا) داوایکردووە بێبەزەییانە لەئەرمەنیەکان بدەن و تۆویان نەهێڵن چونکە هەتیوەکانیشیان لەداوڕۆژدا دەبن بەدوژمنێکی سەرەکی ئێمە.

گۆڤارەکە لەباسەکەدا وتویەتی: ((لەگەڵ ئەوەشدا تورکەکان لەشەڕێکی سەختدابوون لەگەڵ یۆنانیەکاندا، بەلام مستەفا کەمال هێزێکی نارد بۆ قەلاچۆکردنی ئەرمەنی و بەسەرکردەکانی ئەو هێزەی وت بەدەستێکی ئاسنین بکێشن بەسەر هەر بزوتنەوەیەکدا کە دەیەوێ ڕووداوەکانی وەکو ئەوسای ئەلبانیەکان و بولغاریەکانی ساڵانی (١٩١٢-١٩١٣) دوبارە بکرێتەوە)).

هەمان گۆڤاری (Kurdish Time) دیارە (بوغوص نوبار پاشا) داوای لەئینگلیز و فەرەنسا کردووە فریای ئەرمەنیەکان بکەون و ئەوانیش لایان لەئەرمەنیەکان نەکردۆتەوە و داخوازیەکی (نوبار بوغوص پاشا)یان پشتگوێ خستبوو وەکو لەکۆتایی ئەم باسەدا ڕوونیدەکەینەوە، جێی خۆیەتی باسی دانپیانانێکی مێجەر نویل بکەین کە لەڕاپۆرتە دووروودرێژەکەیدا سەرچاوە/٢٧ تۆماریکردووە کە بەبێ پێچ‌وپەنا باسی هەڵوێستی بەریتانیای بەرامبەر بەئەرمەنیەکان بەم شێوەیە کردووە کە وتویەتی: ((لەحەڵەب لەتورکێکم پرسی: ئایا ئینگلیزەکان بۆچی هاتوونەتە ئەم ناوچانە؟ لەوەلامدا کابرای تورك پێی‌وتم بەڕاستی ئێمە خۆشمان هێشتا لەوە نەگەیشتووین و سەرمان لێی‌سوڕماوە، لەپێشدا وامانەدەزانی ئینگلیزەکان بۆئەوە هاتوون فریای ئەرمەنیەکان بکەون، کەچی زۆر سەیرە ئەو هەموو سکالاَ و داخوازیانەی ئەرمەنیەکان دابوویان بەکاربەدەستانی بەریتانیا لەماوەی سێ مانگی ڕابردوودا، کەچی ئەوانەیان هەموو دابوو بەتورکەکان)).

تاوانی تورك بەرامبەر بەئەرمەنی و ئەو نەتەوانەی تر ساڵەهای ساڵ لەژێر جەور و ستەمی نەوەی هۆلاکۆ و جەنگیزخاندا ژیابوون ئەوەندە زۆرە کە باسەکەی هەر تەواو نابێت و لەکۆتایی ئەم باسەدا ئاماژە بۆ سێ سەرچاوە دەکەین کە باسی تاوانی تورکیان کردووە کە لەڕاستیدا ئەوە دەهێنێت هەریەکەیان بەجیا بکرێن بەفیلمێکی سینەمایی بۆئەوەی جیهانی شارستانیەتی ئیمڕۆ لەڕاستی ئەو خوێنڕێژانە بکات کە ئیمڕۆ دەیانەوێ خۆیان وا پیشان بدەن دەیانەوێ ببن بەنمونەی دیموکراتیەت و ببن بەبەشێك لەولاَتی ئەورووپا.

## سەرچاوەی یەکەم

بریتیە لەو یاداشتەی (سەید محەمەد عەلی جەمالزادە) کە قونسوڵی ئێران بووە لەبەرلین لەکاتی شەڕی یەکەمی جیهانیدا کە ویستویەتی لەبەرلینەوە لەڕێگەی ئەستەمبوڵەوە بگەڕێتەوە، لەڕێگایدا چی دیوە تۆماریکردووە کە کاتی خۆی لەبڵاوکراوەی (ئاراکس)ی ئەرمەنیدا لەتاران لەشوباتی ١٩٩٥دا بڵاوکراوەتەوە و گۆڤاری (کوردنامە) کە لەشام دەردەچێت لەژمارە (٢-٣)ی تەموز و ئەیلولی هەمان ساڵدا ئەو باسەی کردووە بەعەرەبی و بڵاویکردۆتەوە کە لەو باسەدا (سەید محەمەد عەلی جەمالزادە) وتویەتی: کە چوومە ئەستەمبوڵ دوو سویدیشم لەگەڵدابوو لەو فەرمانبەرانەی لەئێراندا کاریاندەکرد و ئەوانیش وەکو من دەیانویست بچن بۆ تاران و لەڕێگەماندا کە بەرەو ئێران دەڕۆیشتین چاوم بەژن و منداڵی ئەرمەنی پێخاوس دەکەوت چۆن جەندرمەکانی تورک بەقۆناغی تفەنگەکانیان دەیانبردن بەڕێوە و زۆرجار بەقۆناغە تفەنگ لێیانئەدان و شەپازلەیان لێئەدان، ئەوانەی دەمانبینین هیچیان گەنج نەبوون چونکە گەنجەکانیان یان برابوون بۆ شەڕ وە یان کوژرابوون و تەنها ژن و پیاوی پیروپەککەوتە بوون کە زۆر بەشەرەشەق دەیانتوانی هەنگاوبنێن و بەڕێگادا بڕۆن و جەندرمەکانی تورک هەروەکو شوانی ڕانەمەڕ ئەوانەیان پێش خۆیان دابوو، ئەگەر یەکێکیان لەبەر ماندوویەتی لەڕێگادا دوابکەوتایە یا نەخۆش بکەوتایە یا ناچاربووایە بوەستایە بۆئەوەی دەست بەئاو بگەیەنێت ئەوا لەو شوێنەی خۆیدا بەجێدەما و دەمرد و هیچ هاوار و پاڕانەوەیەکیش سوودی نەبوو، زۆرجار ژن و پیاوی پەککەوتەی ئەرمەنیم دەبینی لەقەراغی جادەکاندا کەوتبوون و لەحاڵی گیانەڵڵادا بوون.

ئەو ڕێگەیەی ئێمە پیایدا دەڕۆیشتین شانبەشانی فورات بوو، زۆرجار لاشەی مردووی ئەرمەنیم بەسەر ئاوی ڕووبارەکەوە دەبینی، شەوێك لەگوندێکداماینەوە و توانیمان مەڕێك بکڕین و بیبرژێنین و ناوسکی مەڕەکەمان دەرهێنا و بەورگ و ڕیخۆڵەوە لەقوژبنێکی گوندەکەدا فڕێماندا و کاتێکمان زانی چاومان بەهەندێ لەو ئەرمەنیە ئاوارانە کەوت چۆن پەلاماری ئەو ناوسکەی مەڕەکەیاندا و هەر بەکاڵوکرچی دایانپاچی، بەڕاستی دیمەنێکی ئەوەندە پڕ لەخەفەت و خەمناك بوو کە هەتا ماوم قەت لەبیرمناچێتەوە.

ڕۆژێکی تر لەڕێگەماندا تاقمێکی ئەرمەنی ئاوارەمان دی جەندرمەکانی تورك پێش خۆیان دابوون، لەپڕ ژنێکی ئەرمەنی ئێجگار پەرێشان هاتە لامەوە و بەفەرەنسی لێمپاڕایەوە و وتی: لەڕێگەی خوادا ئەم دوو پارچە ئەڵماسەت دەدەمێ بەڵکو لەبریتی ئەوە هەندێ خواردنم بدەیتێ بۆئەوەی بیدەم بەمنداڵەکانم، وە منیش هەندێ خواردنم دایە بێئەوەی ئەڵماسەکەی لێوەربگرم. بەکورتی لەو سەفەرەمدا چەند ڕۆژێکی ئێجگار ناخۆش و پڕ ستەمم بەچاوی خۆم بینی و لەدواییدا کە ڕێکەوت و چووم بۆ سویسرا هەندێ لەو منداڵە ئەرمەنیانەی لەو کوشتارە بێبەزەییانەی تورك ڕزگاریان بووبوو لەلایەن سویسریەکانەوە کردبوویانن بەمنداڵی خۆیان، هەندێکیان لەدواییدا بووبوون بەدکتۆر و بەئەندازیارن بەڵام دوای چی؟ پاشئەوەی پتر لەملیۆنێك ئەرمەنی لەو تاوانکاریەدا بەناڕەوا کوژرابوون!.

## سەرچاوەی دوەم

بریتیە لەو باسەی لەلایەن (Hur Klotzel)ی پەیامنێری (Berlimer Tageblot) نوسیویێتی کە (سریا بەدرخان) لەلاپەڕە (٧٥)ی کتێبەکەیدا لەفلادلفیا چاپیکردووە، ئەو باسەی بلأوکردۆتەوە کە وتویەتی: ((لەکەناری (تەرابزون)ەوە هەتا (ئەرزڕوم) کە (٧٦) میل دەبێت، بەناو وێرانەیەکی تەواودا تێپەڕمکرد و ئەو شوێنانەی کاتی خۆی ئەرمەنیەکانی تیادا دەژیان هەمووی لەلایەن تورکەوە تالأنکرابوو، خانووەکانیان هەمووی کاولکرابوو، لەڕێگادا لەو تورکانەی دەمبینین لێمدەپرسین: هۆی ئەم وێرانکردنە چیبووە؟ لەوەلأمدا دەیانوت: ئەو ئەرمەنیانە لەکاتی شەڕدا (مەبەستی شەڕی یەکەمە) بووبوون بەهاوکاری ڕوسەکان بۆیە بەو دەردەیان بەسەرداهات.

نوسەر دەڵێ: لەڕاستیدا هۆی ڕوودانی ئەو بەسەرهات و کارەساتە ئەوە نەبوو کە ئەوان کردبوویان بەبیانوو، لەشوێنێکی وەکو (Bapert) کە لەنیوەی ڕێگەی (تەرابزون–ئەرزڕوم)دایە ئەمە تاکە شارێکە هەتا ئێستە (مەبەستی کاتی نوسینی یاداشتەکەی بووە) هەندێ لەخانووەکانی ئاوەدانکراونەتەوە، ئەوانیتری ٣\٢ی هەروا بەکاولکاری ماونەتەوە، لەئەرزڕوم بەشی زۆری خانوەکانی لەلایەن تورکەوە داگیرکراوە و چەند فارس و عەرەبێکیش کە بۆ کاروباری بازرگانی دەچوونە ئەوناوە لەوێدا دەبینران، بەر لەشەڕ شاری (ئەرزڕوم) حەفتاهەزار کەسی تیادابوو

ئێستە تەنها حەوت هەزاری لێماوە، بەڕاستی دیمەنی ناو شارەکە تابڵێی ئێجگار ناخۆش و سامناکە و ژیانی دانیشتووەکانی شتێکی گەڕاوەتەوە لەژیانی حەیوان و هەرچی کەنیسە و شوێنی میسنیرەکانە هەمووی لەلایەن تورکەکانەوە یا کاولکراوە یا داگیریانکردووە بۆ خۆیان. تورکەکان بۆئەوەی نیاز و مەبەستەکانی خۆیان بهێننەدی دەیانەوێ هەرچی بەدوژمنی خۆیان دەزانن لەناویانببەن و نەیانهێڵن و لەڕاستیشدا ئەو ناوچەیەی بەشارستانیەتی ناسراوبووە بەجۆرێکی لێهاتووە نەناسرێتەوە ئەوەندە کاولکراوە)).

بێجگە لەو باسەی پێشوو کە (سریا بەدرخان) لەکتێبەکەیدا بڵاویکردۆتەوە، لەلاپەڕە (٧٩)شدا باسێکی تری بڵاوکردۆتەوە کە بریتیە لەگەشتی پەیامنێرێکی ڕۆژنامەیەکی تورکی (Aksham–ئەقشام) کە چووە بۆ شاری (موش) و (وان) و لەوەدا وتویەتی: ((شاری موش ئێستە بریتیە لەوێرانەیەکی تەواو، نزیکی (٣٠٠) خانوچکەیەکی تازەی لەقوڕ دروستکراوی تیادا دەبینرێت، کە سەیری شارەکە دەکەی خەموخەفەت داتدەگرێ، دوکاندارەکان تەنها بەدیار چەند شتێکی وەکو سەلکەپیاز و چەند پاکەت و شقارتە و هەندێ برنجەوە بەدیار دوکانەکانیانەوە ڕاوەستاون، سەر جادەکان دەڵێی گۆڕستانە نیشانەی هیچ چالاکیەکی پێوە دیارنیە)).

شاری موش کاتی خۆی ژمارەی دانیشتووەکانی (٣٥) هەزار کەس بوو، ئێستە تەنها دووهەزار کەسی تیادا ماوە، شاری (وان)یش بەتەواوەتی کاولکراوە، جاری جاران گۆمی (وان) ژمارەیەکی زۆر بەلەم و گەمێی تیادا هاتوچۆی دەکرد، بەڵام ئیمڕۆ شارەکە هەمووی وێرانە و کوندەبەبو بەسەر کەلاوەکانیدا دەخوێنێتەوە و دەنیشێتەوە، بەندەرەکەی سەر گۆمی وان تەنها سێ خانووی دیوار لارەوەبووی تیادا ماوە، لەوناوەدا کاربەدەستی تورك (Governer)ی خەواڵوو تاقمە کەسێك بوو لەوێ چایەکی دامێ و منیش بەرامبەر بەو چایەی ئەو هەندێ خواردنم پێدا کە دیاربوو ئەو داماوە چەند ڕۆژێك بوو خواردنێکی ئەوتۆی نەخواردبوو، پاشئەوەی ماوەیەك بەکەناری گۆمەکەدا گەڕاین، ئیتر شەو داهات و گەڕاینەوە بەدیار ئەو قوتیلە چرایەی کە هەیبوو خۆی دایگیرساند، ژمارەی دانیشتوانی شارەکە بەر لەشەڕ بریتی بووە لە(٦٥) هەزار کەس، بەڵام ئیمڕۆ تەنها (٢٥٠٠) کەسی تیادا ماوە کە لەناو وێرانەکاندا دەژین.

## سەرچاوەی سێهەم

بلەچ شێرکۆ-جەلادەت بەدرخان لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٦٠ باسی تاوانێکی تری تورکی کردووە، لەو کوشتارەی لەئەرمەنیەکانیان کردبوو، سەرەڕای ئەوە بەدرۆودەلەسە و پڕوپاگەندە دەیانویست دەستە خوێناویەکەی خۆیان بەسەر کورددا بسڕن و جەلادەت لەلاپەڕە (٧٧)ی ئەو کتێبەیدا وتویەتی: ((بەر لەشەڕی یەکەمی جیهانی و لەکاتی شەڕەکەدا و لەدواییشدا بەربوونە وێزەی ئەرمەنیەکان بەنیازی لەناوبردنیان و نزیکی ملیۆنێکی بێتاوانیان لێکوشتن و ساتێك هەواڵی ئەو ڕەفتارە خوێناویەی تورك بەهەموو ئەمریکا و ئەورووپادا بڵاوبووەوە، تورکەکان هەوڵیاندا ئەو تاوانەی خۆیان بخەنە ئەستۆی کورد و تۆفیق پاشای سەدری ئەعزەم لەدوای شەڕ لەکۆبونەوەی لەندەندا وتبووی ئەوانەی ئەرمەنیەکانیان کوشتبوو بریتی بوون لەکوردەکان، بەڵام حکومەتی تورك بەهۆی شەڕی جیهانیەوە توانای ئەوەی نەبوو سزای ئەو کوردە تاوانبارانە بدات لەوەختی خۆیدا)).

جەلادەت بەدرخان لەلاپەڕە (٧٩)ی کتێبەکەیدا بۆ بەدرۆخستنەوەی ئەو درۆیەی تۆفیق پاشا نوسیویەتی: ئەوەی باشبوون لەناو یانەکانی ئەرمەنیدا (Club-کە مەبەست ڕێکخراوی ئەرمەنیەکانە) لەو درۆیەی تۆفیق پاشا گەیشتبوون و دەیانزانی و دانیان بەوەدا نابوو کوردەکان بەپێچەوانەوە خزمەتێکی زۆری ئەرمەنیەکانیان کردبوو (بەرلەمە ئاماژەمان بۆ هەندێ سەرچاوە کردووە کە چۆن لەکاتی شەڕدا و لەدوای شەڕی جیهانیش چۆن خزمەتی ئەرمەنیەکانیان کردبوو)، لەمەش ڕوون و ئاشکراتر ئەو وتارەی (کلیمنصو)ی فەرەنسیە کە لەدوای شەڕی یەکەم بەناوی هەموو دەوڵەتە ئەورووپیەکانەوە وتبووی: ((تورکەکان بەهۆی جەوروستەم و خراپەکاریەکانیانەوە ئاشکرایان کردووە توانای ئەوەیان نیە کاروباری میللەتانی غەیری تورك بەباشی بیەن بەڕێوە، لەبەرئەوە جارێکی تر نابێ ڕێگایان پێبدرێت هیچ میللەتێکی تر بخەنە ژێر سایە و دەسەڵاتی خۆیانەوە)).

دەربارەی ژمارەی ئەرمەنیە کوژراوەکان لەو کوشتارەی لەدوای شەڕی جیهانیدا لێیانکرابوو، کە هەندێ سەرچاوە بەملیۆنێکی داناوە هەروەکو دکتۆر کەمال مەزهەر لەسەرچاوە/٢٤دا ئاماژەی بۆ کردووە، بەپێی ئەو سەرژمێریەی

لەلایەن ئەنجومەنی جوگرافیای قەفقاسەوە ئامادەکراوە ژمارەی ئەرمەنی بەمجۆرە بووە: لەتورکیا (٢,٩) ملیۆن، لەڕوسیا (١,٥) ملیۆن، لەئێران و ئەمریکا و ئەورووپا و شوێنەکانی تر (١,٢٥٠) ملیۆن کە هەمووی دەکاتە (٥,٦٥) ملیۆن.

ساتێك بوغوص نوبار پاشا داوایکردبوو لەبەریتانیا و فەرەنسا کە شوێنێك بۆ ئەرمەنیەکان تەرخان بکرێت لەتورکیادا، هەروەکو لەباسێکی پێشووی گۆڤاری (Kurdish Time)دا لێیدواین هەردووکیان بەبوغوص نوبار پاشا دەڵێن: جا کوا ئەرمەنی لەتورکیادا ماوە هەتا شوێنیان بۆ تەرخان بکرێت کە ئەمە وا دەگەیەنێت لەو (٢,٩) ملیۆنەی لەتورکیادا بوون پاشنەوەی ملیۆنێکیان لێکوژرایوو دەبێ ئەوانیتر هەموو ئاوارە و دەربەدەرکرابوون بەناو وڵاتانی جیهاندا.

بەوپێیە پووندەبێتەوە تاوانی تورك چ لەزەمانی عوسمانیدا، بەتایبەتی لەکوشتاری ساڵی (١٨٩٤-١٨٩٥)دا و چ لەکاتی شەڕی جیهانی و چ لەو شەڕەی لە(قارس)دا کرا کە کەمالیەکان دوای شەڕی جیهانی جێگەی عوسمانیەکانیان گرتبووەوە، ئەوەندە بێبەزەییانە و دڵڕەقانە بووە کە بەو کردارانەیان مێژووی باوباپیرانی خۆیان و یادی هۆلاکۆ و تەیموری لەنگ و جەنگیز خانیان بوژاندبووەوە و بەر لەنازیەکان خۆیانکردبوو بەوەستای ئەوەی پێیدەوترێت (هۆلۆکۆست) و داریان بەڕۆحی نازیەکاندا دابوو لەشێوەی دڕندەیەتی و خوێنڕێژیدا، کەچی ئەو هەموو کوشتارەی لەئەرمەنی و کورد و ئاسووری و یۆنانیان کردبوو لەلای بەدرۆ دیموکراتخوازەکانی جیهان وەکو هەر هیچ ڕوونەدابێت وایە و ڕۆژێك لەڕۆژان هەر هیچ نەبێ بۆ چێژیش ناوی ناهێنرێت.

## باسی سێهەمی بەشی شەشەم

### لابردنی سوڵتان و هەڵوەشانەوەی خەلافەت و دامەزراندنی کۆماری تورکیا

لەباسی ژیانی مستەفا کەمالدا لەوە دواین چۆن خۆی بەمرۆڤێکی ئاینپەرست و سەر بەخەلیفە لەقەڵەم ئەدا و بۆئەوە دەکرۆزایەوە خەلیفە بەهۆی داگیرکەرانی وڵاتەوە دەسەڵاتی لەدەستداوە و بەڵام دوای کۆنگرەکانی ئەرزڕوم و سێواس و دەرکردنی میساقی میللی و کوشتاری ئەرمەنیەکان و سەرکەوتن بەسەر یۆنانیەکاندا، وردە وردە خۆی و تاقمەکەی هەستیان بەدەسەڵاتداریتی خۆیان کردبوو، مابووەوە سەرئەوەی چۆن خەلافەت هەڵوەشێننەوە و چۆن پەیمانی سیڤەر زیندەبەچاڵ بکەن و نەخشەی ئەوەش بکێشن چۆن لەو تاقمانەی کە سەر بەخۆشیان بوون بەڵام لایەنگری مانەوەی خەلافەت بوون هەریەکەیان بەشێوەیەك نەیانهێڵن و هیچ دەسەڵاتێکیان نەمێنێت کە سەرگرتنی نەخشەکانیان لێتێکبدات.

لەلاپەڕە (٧٦٠)ی کتێبی (الدولة العلية العثمانية) سەرچاوە/٥٨ بەدوورودرێژی باسیکردووە چۆن دەوڵەتە هاوپەیمانەکان پاش سەرکەوتنەکانی کەمالیەکان بەهەڵوێستەکانی پێشووی خۆیاندا چوونەوە چونکە بۆیان ڕوونبووبووەوە مستەفا کەمال تاکە کەس بووە لەو ڕۆژانەدا بتوانێت تورکیا لەئیسلامەتی و لەوڵاتە ئیسلامیەکان دووربخاتەوە و لایانوابوو هەڵوەشانەوەی خەلافەت لەڕێگەی تاقمەکەی مستەفا کەمالەوە وەکو کارێکی تەواوکردنی شەڕی خاچپەرستەکان وابوو، بۆیە بڕیاریاندا وڵاتی (ئەنادۆڵ) بۆ خاوەنی خۆی بمێنێتەوە بەمەرجێك کاربەدەستانی ئەو وڵاتە لایەنگری ئەوان بێت و دژی بەرژەوەندیەکانیان ڕەفتارنەکات.

مستەفا کەمال و تاقمەکەشی لەخۆیان گەیشتبوون و دەیانزانی مانەوەی ڕژێمەکەیان بەندبووە بەوەی بەچ شێوەیەك دەتوانن ڕەزامەندی وڵاتانی ئەوروپا بەتایبەتی بەریتانیا بۆ خۆیان مسۆگەر بکەن و سووریش دەیانزانی هەڵوەشانەوەی خەلافەت و پێکهێنانی دەوڵەتێك (کە تورکەکان خۆیان ناویانلێنا عیلمانی) لەو شێوەیەی ئەو دەوڵەتانە بەباشیان دەزانی ئەنجامەکەی بەوە دەگات دەوڵەتێکی لاوازی تورکی لێپەیدادەبێت کە لەدواڕۆژدا ئەو دەسەڵاتەی نابێت

بتوانێت لەرکێفی ئەوان بچێتە دەرەوە و لەڕێبازیان لابدات (کە لەڕاستیدا ئەو بۆچوونەیان هەتا ئەم سەردەمە تەواو ڕاست دەرچووە).

هەروەکو لەلاپەڕە (٢٥٨)ی سەرچاوە/٤٤دا (الرجل الصنم)دا ئاماژەی بۆ وتارێکی مستەفا کەمال کردووە لەلاپەڕە (٤٢)ی کتێبی (نطق)دا بڵاوکراوەتەوە، مستەفا کەمال لەو وتارەیدا بۆ ئاشکراکردنی مەبەستی ڕاستی خۆی و بۆ بەڵگەی ئەوەی ئامادەیە خواستەکانی دەوڵەتە ڕۆژئاواییەکان بهێنێتەدی وتویەتی: ((خەلافەتی ئیسلامی لەدوای کوشتنی خەلیفە موعتەسەم (لەڕاستیدا مەبەستی دوا خەلیفەی عوسمانیە) ئیتر خەلافەت نەماوە)).

بۆ خۆشکردنی ڕێگا بۆ گەیشتن بەو مەبەستەی مستەفا کەمال دەستیکرد بەپاککردنەوەی حکومەتەکەی لەو کەسانەی هێشتا لەسەر لایەنگرێتی مانەوەی خەلافەت مابوون و مامۆستا ڕەفیق حیلمی لەیاداشتەکانیدا سەرچاوە/٦٥ باسی دوورخستنەوەی چەند کەسێکی کردووە لەوانەی لەکاروباری دەوڵەتدا ڕۆڵێکی گەورەیان هەبووە بەڵام لەگەڵ بیروبۆچونی مستەفا کەمالدا نەبوون دەربارەی هەڵوەشانەوەی خەلافەت لەوڵاتدا وەکو:

١-حاجی شوکری بەگ کە یەکێك بووە لەوانەی ڕۆڵێکی گرنگیان هەبووە و میرئالاَ بووە لەهێزی کەمالیەکاندا و بەشداری کردووە لەشەڕی سەربەخۆییدا دژی داگیرکەران و لەبەرەی خۆرئاوادا لەناوچەی (ئابدین) شەڕیکردبوو لەگەڵ فەرەنسیەکاندا، مستەفا کەمال لەسەرەتادا لەخۆی نزیك کردبووەوە و کردبووی بەئەندام لەئەنجومەنی میللیدا، بەڵام لەدواییدا بوو بەڕکەبەری مستەفا کەمال و تاقمەکەی دواینەوەی ئەمانە بەئاشکرا بڕیاری هەڵوەشانەوەی خەلافەتیاندابوو.

٢-حسێن بەگی سەرەك وەزیران کە هەمیشە وشەی غازی لەدەم دەباری و مستەفا کەمالی بەغازی ناودەبرد، بەڵام لەدواییدا کە ئیشی پێی نەما بیانووی پێگرت چونکە لایەنگری مانەوەی خەلافەت بوو، بەوەش لێی‌نەگەڕا بەڵکو بەپیاوی ئینگلیزی لەقەڵەمئەدا، ئەو حسێن بەگە بەقارەمانێکی گەورە دەژمێردرا لەشەڕی سەربەخۆییدا دژی هاوپەیمانەکان.

٣-بەکر سامی وەزیری کاروباری دەرەوەی تورکیا کە ڕۆڵێکی زۆر گەورەی هەبووە لەچەسپاندنی دەسەڵاتی مستەفا کەمالدا و لەبەرئەوەی هاوکاری ئەو نەبوو لەبیروبۆچونەکانیدا ئەویشی دوورخستەوە و بەرامبەر بەمە ئەویش

حیزبێکـی پێکهێنـا کـه ژمارەیـەکی زۆر لەوانـەی لەگـەڵ بیروبۆچـوونی مسـتەفا کەمالدا نەبوون چوونە ئەو حیزبەوە.

٤-کازم قەرەپاشا لەڕاستیدا مستەفا کەمال بەهۆی ئەمەوە بوو بەو سەرکردە گەورەیـە و لەدواییـدا لەویشـی هەڵپێچـا بـەتاوانی ئـەوەی لایـەنگری مانـەوەی خەلافەت بوو، لەئەنجامدا نامەیەکی ناردبوو بۆ مستەفا کەمال تیایدا وتبووی: ((دەسـتووری تازە لەگـەڵ شەرعی ئیسـلامدا یەکناگرێتـەوە، بۆیـە ئـەم دەستورە بەشـتێکی ڕاست نازانرێـت چونکە لەهەسـت و هـۆش و بیروبۆچونی هاوڵاتیان دوورکەوتۆتەوە، لەبەرئەوە بڕیارمداوە ئەرکی هەموو جۆرە فیداکاریەکی پێویست بخەمە سەرشانم بۆ ڕێگرتن لەوەی حوکمی سەڵتەنەت بگۆڕدرێ بەجمهوریەت)).

لـەوەڵامی ئـەو نامەیـەی کـازم قەرەپاشـادا مسـتەفا کـەمال بـۆی دەنوسـێت و پێیدەڵێت: لەو یاسایەی ئەنجومەنی میللی بڕیاری لەسەرداوە شتێکی وای تیادا نییە بۆنی دەستدرێژیکردنی لێبێت بۆ سەر سەڵتەنەتی موقەدەس یان خەلافەتی موقەدەس و هیچ هاندانێکی تیادا نییە بۆ سەرگرتنی حوکمی جمهوری و ئەو کەسـانەی وا لێکیدەدەنـەوە کـە دەمانـەوێ سـەڵتەنەت لەناودەبـەین و حـوکمی جمهـوری دێنینـە ئـاراوە، لەدنیایـەکی پـڕ لەواهیمـە و خەیاڵـدا دەژیـن (دیـارە وەڵامەکەی بۆ کازم قەرەپاشا بەرلەوە بووە کە بەئاشکرا بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی خەلافەت دەربچێت وەکو لەدواییدا باسی هەڵوەشانەوەی دەکەین).

ڕەفیـق حیلمـی دەڵێـت: ((مسـتەفا کـەمال بـەم نامەیـەی توانیبـووی (دەبوایـە بیوتایـە تـا ماوەیـەك) کـازم قەرەپاشـا بخەڵـەتێنێت و تـەفرەی بـدات و هێمنـی بکاتەوە، مستەفا کەمال تا ماوەیەکیش جاروبار بۆ خەلیفەی دەستبەسـەری ژێـر چنگی بێگانـە دەگریـا و دەکڕوزایـەوە و هـاواری دەبردەبـەر هاوکـاریکردن لەگـەڵ کورددا بۆ ڕزگارکردنی خەلیفەی ئیسلام)).

وێنەی مستەفا کەمال بەجلوبەرگی ئاینییەوە

دەربارەی ئەو مەترسیەی کەوتبووە دڵی هەندێ لەموسڵمانانەوە لەو ڕۆژانەدا کە مستەفا کەمال و هاوکارەکانی خەریکی هەڵوەشانەوەی خەلافەت بوون (Patrick Kinross) لەلاپەڕە (٣٨٤)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٨٥ وتویەتی: (ئاغاخان و ئەمیر عەلی و چەند سەرکردەیەکی تری موسڵمان نامەیەکیان ناردبوو بۆ عیسمەت ئینونۆ و پێیان ڕاگەیاندبوو جیاکردنەوەی خەلیفە لەسەڵتەنەت کارێکی زۆری کردۆتەسەر موسڵمانەکان بۆیە تکایان لەحکومەتی تورکیا کردبوو ڕێز لەهەستی ئایینی موسڵمانان بگرێت)، بێگومان تورکەکان لەسەرەتادا وشەی سوڵتان و سەڵتەنەتیان لەخەلیفە جیاکردووە، ئەوسا خەلافەتیشیان هەڵوەشاندەوە.

نوسەری سەرچاوە/٨٥ لەباسەکەیدا دەڵێت: بەلای مستەفا کەمالەوە خەلافەت شتێك بوو لەگەڵ ڕۆژانی ڕابردوودا دەگونجا بەڵام ئیتر کاتی ئەوە هاتبوو کۆتایی پێبهێنرێت بۆیە مستەفا کەمال وتبووی: بوونی خەلیفەی دەسەڵاتدار لەگەڵ بوونی حکومەتێکی بەهێزی دەسەڵاتداردا یەکناگرێتەوە و خەلیفە وەکو جاران ئەو دەسەڵاتەی پێشووی نەماوە بەسەر وڵاتانی تری ئیسلامدا، هەروەکو چۆن (پاپا) تەنها دەسەڵاتی هەر لەناو وڵاتانی کاتۆلیکدا ماوە، جگە لەمە بوونی

خەلافەت شتێکە لەڕژێمی عەرەبییەوە وەرگیراوە و ئەگەر ئاین لەدەسەڵاتی ئایینی بەولاوە هەر دەسەڵاتێکی تری هەبێت ڕێگە لەهەموو جۆرە پێشکەوتنێکی وڵات دەگرێت.

نوسەری سەرچاوە/٨٥ دەڵێت: ئەو قسانەی مستەفا کەمال لەڕۆژنامەکانی تورکیای ئەو ڕۆژانەدا بلاوکرابووەوە، لەپاشکۆی کتێبی (تأريخ الدولة العثمانية)، سەرچاوە/٥٨ باسێکی (دکتۆر ئیحسان حەقی) بلاوکراوەتەوە دەربارەی چۆنیەتی هەڵوەشانەوەی سوڵتان و خەلافەت کە وتویەتی: (ساتێك مستەفا کەمال و تاقمەکەی بەهێزبوون لەسەرەتادا داوایان لەسوڵتان کرد تەنها هەر بەخەلافەت قایل بێت و واز لەسوڵتانێتی (بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەت) بهێنێت و لەئەستەمبوڵیش نەچێتە دەرەوە).

لەڕاستیدا ئەوی چاوێك بەو سەرچاوانەدا بگێرێت کە باسی بزوتنەوەی کەمالیەکانیان کردووە بۆی ڕووندەبێتەوە ئینگلیزەکان لەهەموو کەسێك زۆرتر مەبەستیان بووە لەسەرکەوتنی مستەفا کەمالدا بەم شێوەیەی خوارەوە:

١-ئینگلیزەکان لەپشتی پەردەوە مستەفا کەمالیان ئامادەکردبوو، هێنابوویانە پێشەوە و ڕێگەیان بۆ خۆشکردبوو خەلافەت هەڵوەشێنێتەوە.

٢-هەرچەند ئینگلیزەکان هانی یۆنانیەکانیان دابوو پەلاماری تورکیا بدات، بەڵام ئەو هاندانە تەنها بۆ لاوازکردنی کەمالیەکان بوو بۆئەوەی ناچاریان بکات بەمەرجەکانی بەریتانیا قایل بن، کە یەکێك لەو مەرجانە بریتیبووە لەهەڵوەشانەوەی خەلافەت بەهەر نرخێك بێت.

٣-ئینگلیزەکان نەخشەی تێکچوونی مستەفا کەمال و شەوکەت پاشایان کێشابوو بۆئەوەی دەسەڵات هەمووی بکەوێتە دەست مستەفا کەمال کە لای ئینگلیزەکان وابوو تاقە کەسێکی لێوەشاوە بووە کە بتوانێت خواستەکانی حکومەتی بەریتانیا بەجێبهێنێت و پەیوەندی ئینگلیز و مستەفا کەمال شتێکی تازە نەبوو بەڵکو لەساڵی (١٩١٧)دا کە سەرکردەی هێزەکانی عوسمانی بووە لەفەلەستین پەیوەندی هەبووە لەگەڵ ئینگلیزەکاندا. (سەرچاوە/٤٤ لەلاپەڕەکانی (٤٧٠ تا ٤٩٦)ی بەرگی دوهەمیدا دەقی/٣٣ دوکیومێنتی تورکی بلاوکردۆتەوە، نهێنیەکانی ژیانی مستەفا کەمال کە هەندێکیان باسی پەیوەندی ئینگلیز و مستەفا کەمالی تیادا کراوە).

نوسەری سەرچاوە/٥٨ لەلاپەڕە (٧٥١)ی کتێبەکەیدا پرسیارێکی زۆر گرنگی کردووە کە بریتیە لەوەی (ئینگلیزەکان لەبەرچی یارمەتی مستەفا کەمالیان دابوو

بەرامبەر بەحکومەتەکەی ئەستەمبولْ یاخی ببێت لەکاتێکدا خۆیان دەستیان بەسەر ولأتدا گرتبوو؟؟)، نوسەر لەوەلأمی ئەو پرسیارەدا وتویەتی: لەڕێبازی رووداوەکانی ئەو ڕۆژانەدا بەتەواوەتی روونەبێتەوە، ولأتانی ڕۆژئاوا دەمێك بوو دەیانویست شیرازەی دەوڵەتی عوسمانی هەڵوەشێنرێتەوە و بۆ گەیشتن بەو مەبەستە بەر لەشەڕی جیهانی وایلێکردبوو پێیبوترێت (پیاوە نەخۆشەکە))، بۆیە کە شەڕی جیهانی بڕایەوە، دەوڵەتە هاوپەیمانەکان بەتایبەتی بەریتانیا بوونی دەوڵەتێکی بچوکی لاوازی وا کە لەڕێبازی ئاینی ئیسلام دوورکەوتبێتەوە ئەوەیان زۆر لەلا باشتربووە لەوەی پاش رووخانی دەوڵەتی موسمانی خۆیان دەستبگرن بەسەر ولأتدا و کاروباری ببەنبەڕێوە هەروەکو چۆن ولأتێکی داگیرکراو دەبرا بەڕێوە کە دەیانزانی ئەو کارە ئاسان نیە و لەئەنجامدا هەر ناچاردەبن و وازی لێبێنن بۆ خەڵکی ولأتەکە، جگە لەوەی ئەو دەوڵەتە عیلمانیەی کەمالیەکان دروشمیان بەرزکردبوەوە دەبوو بەکۆسپ و ڕێگرێك (Lumper) لەڕێگەی بلأوبونەوەی دەسەلأتی سۆڤیەت لەناوچەکەدا.

دەربارەی چۆنیەتی دەستپێکردنی مستەفا کەمال بەنەهێشتنی سەڵتەنەت و هەڵوەشانەوەی خەلافەت (Patrick Kinross) لەلاپەڕەکانی (٣٨٤-٣٨٥) کتێبەکەیدا سەرچاوە/٨٥ وتویەتی: (مستەفا کەمال بیرەوەری دامەزراندنی ئەنجومەنی میللی کرد بەبیانوو، کۆبونەوەیەکی گەورەی کرد و لەو کۆبوونەوەیدا ڕێگەدرا بەدووروودرێژی باسی خەلیفە و هەڵوەشانەوەی خەلافەت بکرێت و لەسەرەتادا بڕیاردرا دادگا ئاینیەکان هەڵوەشێنرێتەوە و کاروباریان بوەستێنریْ و هەمووی بدرێت بەو دادگا تازانەی بۆ ئەو مەبەستە پێکهێنران و وەزارەتی ئەوقاف هەڵوەشێنرا و هەموو دەرامەت و ماڵومولْکەکانی سپێردرا بەوەزارەتەکانی تر و (شیخ الاسلام) کە تا ئەوسا هێشتا وەکو ڕەمزێك هێڵرابووەوە ئەویش لابرا و شوێنەکەی هەڵوەشێنرایەوە و بڕیاری داخستنی هەموو قوتابخانە ئاینیەکانیش دەرچوو.

هەمان سەرچاوە لەلاپەڕە (٣٨٦)دا لەباسی هەڵوەشانەوەی خەلافەتدا وتویەتی: ((ئەو شەوەی بڕیاری هەڵوەشانەوەی خەلافەت درا، خەلیفە لەکۆشکی (دوڵمە باغچەسی) بوو، لەشیرین خەویدا هەڵیانساند و سەرۆکی پۆلیس پێیڕاگەیاند کە پێویستە سەعات پێنجی بەیانی تورکیا بەجێبێڵێت و ڕێگەی پێدرا هەندێ کەلوپەل و شتە تایبەتیەکانی خۆی بپێچێتەوە و لەگەڵ خۆیدا بیبات و ئێوارە بەشەمەندەفەر شاری ئەستەمبوڵی بەجێهێشت، لەدوای ڕۆیشتنی

خەلیفە ئیتر لەڕۆژی هەینیدا و لەنوێژی هەینیدا بەپێچەوانەی جاران ناوی خەلیفە نەهێنرا و لەجیاتی ئەوە تەنها ناوی جمهوریەت و ئوممەی ئیسلامی هێنرا)).

دەربارەی چۆنیەتی ئیعلانی جمهوریەت، دوایئەوەی خەلافەت نەما و خەلیفە دوورخرایەوە هەروەکو (ریچارد رالینسۆن) لەلاپەڕە (٨٢)ی کتێبەکەیدا، وەرگێڕانی بۆ فارسی، باسیکردووە و وتویەتی: هەڵوەشانەوەی خەلافەت گێرەوکێشەیەکی زۆری لێپەیدابوو، مستەفا کەمال خۆشی دەیزانی ئەو کارەی بەئاسانی بۆ ناچێتەسەر (بەڵام دیاربوو بەجێهێنانی ئەم کارە مەرجی سەرەکی مانەوەی بووە)، بۆیە بەر لەهەڵوەشانەوەی خەلافەت ڕێگەی بۆ دەربڕینی ئەو مەبەستەی بەوە خۆشکردبوو، لەشارێکی بچوکی سەر دەریای (مەڕمەڕە) ژمارەیەکی زۆری لەنوسەران و ڕۆژنامەنوسە بەناوبانگەکانی لەو شارە کۆکردبووەوە کە زۆربەیان لەپێشدا نەیانزانیبوو بۆچی بانگکرابوون، ساتێك مستەفا کەمال لەو کۆبوونەوەیەدا دەستیکرد بەقسەکردن، بەئاشکرا وتی: تەنها بەلابردنی خەلافەت لەوڵاتدا دەتوانرێت حکومەتێکی مۆدێرن و سەربەخۆی تورکیا دامەزرێنرێت.

نوسەر ئەڵێ: ئەوانەی لەوێ بوون هەموویان لەقسەکانی مستەفا کەمال حەپەسابوون کە ئەو کۆبونەوەیە ڕۆژ و نیوێکی خایاند و لەئەنجامدا هەموویان بوون بەلایەنگری مستەفا کەمال و یەکێك لەو ڕۆژنامەنوسانەی لەو کۆبونەوەیەدا بانگکرابوون (ناوی نەهێناوە کام ڕۆژنامە بووە) لەیاداشتەکانیدا باسی ئەو کۆبونەوەیەی بەمجۆرە کردووە: پەڕەوەی مێژوو لەم ژووری کۆبونەوەیەدا زۆر بەگورجی دەڕوات و ئەو هەموو گۆڕانکاریە ڕووکەشانەی هەتا ئێستا هاتوونەتەدی هیچی کەم نەبووە لەڕووداوەکانی سەدەکانی ناوەڕاست، بۆیە پێویستی بەبوونی ڕژێمێکی مامناوەندی هەبوو بۆئەوەی لەگەڵ بارودۆخی ڕۆژانی داهاتوودا بگونجێت، بەدرێژایی مێژوو دیکتاتۆرەکان قەت مەبەستەکانی خۆیان دەمەردەست ئاشکرانەکردووە، بەڵکو هەوڵیانداوە لەپێشدا زەمینە بۆ سەرگرتنی ئەو مەبەستانەیان خۆشبکەن ئەوسا دەستیانکردووە بەکاری خۆیان.

مستەفا کەمال نەیدەویست دەستوور بۆ میللەت دابنێت بەڵکو دەیویست خانەنشینیان بکات، من نیازم وابوو هێرش ببەمەسەر دەوڵەت و بپرسم چۆن و لەبەرچی ئەو هەموو مەترسیەی بۆ وڵات پەیداکرد کە ئەنجامەکەی بەوە بگات

خەلافەت هەڵوەشێنرێتەوە، بەلاّم بۆمدەرکەوت بەبێ نەهێشتنی پیاوە ئایینیەکان ڕێگا نەدەدرا دەوڵەتێکی تازە بێتەدی.

هەمان ریچارد رالینسۆن لەلاپەڕە (٨٦)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٢٨ لەباسی قەدەغەکردنی قوتابخانەکاندا وتویەتی ئەو قەدەغەکردنە بەرگ و پوشتەرینی هەموو پیاوە ئایینیەکانی ئیسلام و یۆنانی و ئەرمەنیشی دەگرتەوە و ئاماژەی بەنوسینی نوسەرێك کردووە کە لەباسێکیدا وتبووی: ((لەساڵی ١٩٢٥دا کە فێست لەسەرکردن قەدەغەکرا، زۆر باش لەبیرمدێ ساتێك قوتابیەك بۆ یەکەمجار و یەکەم ڕۆژ بەکلاّوێکی لەوێنەی شەپقە هاتە (دانشگای بین الملل)ی (سمیرنا-ئەزمیر) بوو بەهەرا و ژاوەژاو نەك تەنها هەر لەناو دانشگاکەدا بەڵکو لەناو هەموو شاریشدا دەنگی دایەوە و خەڵك بەئاشکرا دەیانوت گۆڕینی فێست بەشەپقە مانای نەهێشتنی دینە)).

دەربارەی ڕۆژی هەڵوەشانەوەی خەلافەت، لەلاپەڕە (٢٩٤)ی سەرچاوە/٤٤دا (الرجل الصنم) وتویەتی: لەیەکەم ڕۆژی تشرینی دوهەمی ١٩٢٣دا سەعات (٨,٥)ی ئێوارە تۆپی مژدەی ئیعلانی جمهوری تەقێنرا کە ئەنجومەنی میللی بەرلەمە لەڕۆژی ٣٠ی تشرینی یەکەمدا (١٨٠) ئەندامی ئەنجومەنی میللی بڕیاریاندابوو وڵات ببێت بەجمهوری و مۆریانکردبوو، شانبەشانی ئەو بڕیارەی ئەنجومەنی میللی یاسایەك دەرچوو لەلایەن هەمان ئەنجومەنەوە لەژێر ناوی (اقرار سکون-چەسپاندنی ئاسایش) وە بەپێی ئەو یاسایە هەموو جۆرە بلاّوکراوە و ڕۆژنامەیەك جگە لەوانەی لەلایەن کەمالیەکانەوە دەردەچوو هەمووی قەدەغەکران (لەباسێکی تازەدا کە لەدوای باسی لۆزان بۆ چۆنیەتی پاشگەزبوونەوەی تورکە کەمالیەکان لەو بەڵێنانەی بەکوردیان دابوو دەگەڕێنەوە سەر باسی چۆنیەتی قەدەغەکردنی کۆمەڵ و بلاّوکراوە کوردیەکان).

(Patrick Kinross) لەلاپەڕە (٣٨٦)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٨٥ باسی دوا تەقەلای سەرنەگرتووی کردووە کە وەختی خۆی بۆ هێشتنەوەی خەلافەت هەندێ لەمیسنیرە ئیسلامیەکانی هیندستان و میسر داخوازی و پێشنیازێکیان دابوو بەمستەفا کەمال بۆئەوەی خۆی ببێت بەخەلیفە و ئەو بۆشاییە پڕبکاتەوە کە بەلابردنی خەلیفە پەیدابووبوو بەلاّم مستەفا کەمال ئەو داخوازیەی پەسەند نەکردبوو.

دەربارەی ئەوەی سەرچاوە/٨٥ باسیکردووە، لەو کتێبەی (ڕیچارد رالینسۆن)، سەرچاوە/٢٨دا وتویەتی: لەدوایئەوەی خەلافەت هەڵوەشێنرایەوە بەچەند ساڵێك

مستەفا كەمال لەساڵی ١٩٢٧دا لەیەكێك لەقسەكانیدا (نطق) وتبووی هەندێ لەوانەی هەستی ئایینی و سیاسەتیان پێكەوە گرێدەدا، لایانوابوو پێویست بوو خەلافەت بمێنێتەوە و هەندێكیان پێشنیازیان كردبوو من (مستەفا كەمال) ببم بەخەلیفە بەڵام من ئەو داخوازیەم پەسەند نەكرد.

نوسەر ئەڵێ: هەرچەند (كازم قەرەپاشا) لەیاداشتەكانیدا وتویەتی مستەفا كەمال زۆر حەزیدەكرد ببێت بەخەلیفە (كە ئاماژەی بۆ هیچ بەڵگەیەك نەكردووە بۆ ئەم بۆچوونەی)، بەڵام من (نوسەری سەرچاوە/٢٨) ئەو بۆچوونەی (كازم قەرەپاشا) بەشتێكی ڕاست نازانم، چونكە لەدواییدا ڕەفتار و كردەوەكانی مستەفا كەمال ئاشكرایانكرد مستەفا كەمال تا چ ڕادەیەكی زۆر دژی مانەوەی خەلافەت و بوونی خەلیفە بوو، بۆیە خۆشی دەیزانی دەستینەئەدا بۆ ئەو كارە.

## بەشی حەوتەم

### پەیمانی لۆزان

لەدوایئـەوەی تورکـە کەمالیـەکان خۆیـان بـەهێزکرد و بەسـەر یۆنانیەکانـدا سـەرکەوتن و ڕاپـەڕین و شۆڕشـی ئەرمەنیـەکانیان بەکوشـتارێکی خوێنـاوی لـەناوبرد و سـەڵتەنەتیان نەهێشـت و ئـەو داروپـەردوەی خەلافـەت کـە هـەر بـەناو مابوو لەئەستەمبوڵدا هیچ حسابێکیان بۆ نـەدەکرد و نەخشـەی هەڵوەشانەوەی ئەویشیان کێشابوو وەکو لەبەشی پێشوودا باسمانکرد، مایەوە سەرئەوەی چۆن نەخشەی لەناوبردنی کوردیش بخەنە کار وەکو ئەوەی لەئەرمەنیـەکانیان کردبوو، بۆ گەیشتن بەو مەبەستە چاویان بڕیە ئەوەی ئەو مادانەی لەپەیمانی سیڤەردا دەستنیشـان کرابوون ئەگەرچی هیچیان لێنەهێنرابووە بەرهەم، بەڵام ئـەوان هـەر لەسـەرەتاوە دانیـان پیادانـەنابوو، مۆرکردنی سیڤەر لەلایـەن نوێنـەری خەلیفـەی ئەسـتەمبوڵ بەشـتێکی ناشـەرعیان زانیبـوو، چـونکە تـەنها هـەرخۆیانیان بەتاقـە دەسەڵاتداری وڵات دەزانـی، بۆیـە ئـەو بارودۆخـەی لـەدوای دەرکردنـی یۆنانیەکان بۆ تورکە کەمالیەکان ڕەخسابوو توانیان سوودی لێوەربگرن و بستیان بەقەرزنـەدا و لـەکاتی خۆیـدا دەستیان وەشـاند و توانیـان پـەیمانێکی تـازە لـەجیاتی سـیڤەر بهێنرێتـە ئـاراوە کـە باسـی چۆنیەتی سـەرگرتنی ئـەو پەیمانـە تازەیـەی لەلۆزانـدا مۆرکرا دەتوانین بیکەین بەسێ بەشەوە:

١-چۆنیەتی بەستنی و قۆناغەکانی کۆبونەوەکان کە لەدوا قۆناغیدا پەیمانەکە مۆرکرا.

٢-ناوەڕۆکی مادەکانی لۆزان.

٣-کەمتەرخەمی کورد و نەبوونی چالاکیەکی ئەوتۆ کە باسی مافی کوردی تیادا بکرێت.

# باسی یەکەمی بەشی حەوتەم

## قۆناغەکانی بەستنی لۆزان

ئەو سەرچاوانەی چوونەتە بنج‌وبناوانی کۆبوونەوەکانی لۆزان و چۆنیەتی مۆرکردنی، بەشێوەیەکی گشتی وتویانە ئەو دەوڵەتانەی لەو کۆبوونەوەیەدا بەشداربوون لەبەریتانیا، فەرەنسا، ئیتاڵیا، ژاپۆن، یۆنان، ڕۆمانیا، یۆگۆسلاڤیا، تورکیا (نوێنەری کەمالیەکان)، (خەلافەت هەرچەندە هێشتا هەر بەناوەمابوو لەکاتی کۆنگرەکەدا، بەڵام بەهیچ شێوەیەك نوێنەری خەلیفە بەشدار نەبووە).

لەگەرمەی کۆبونەوەکانی لۆزاندا، لەسەرەتادا لەسەر ناوەڕۆکی مادەکان بەپێی ئەو ڕەشنووسەی بۆ کۆنگرەکە ئامادەکرابوو لێیان بکۆڵرێتەوە و دەنگیان لەسەر بدرێت، هەندێ ڕووداو و هەڵوێست هاتەکایەوە کە هەمووشیان سوودی تورکەکانی تیادابوو، بۆ نمونە لەکۆبونەوەیەکی لۆزاندا لە٢٠ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٢٢دا، لەو ڕۆژانەدا کێشەیەك پەیدابووبوو لەنێوان فەرەنسیەکان و ئەڵمانەکان و فەرەنسا بۆئەوەی خۆی تووشی سەرئێشەیەکی تر نەکات لەگەڵ تورکەکاندا پەیمانی (فرەنکلین–بویون) لەنێوان فەرەنسا و تورکدا مۆرکرا.

لەلایەکی تریشەوە ئیتاڵیاش کێشەیەکی تازەی ناوخۆی بۆ پەیدابوو بەهۆی فاشستەکانەوە کە خەریك بوون دەستەجڵەوی وڵات بگرنەدەست، بۆیە چ فەرەنسا و چ ئیتاڵیا بەهۆی ئەو کێشە تازانەوە بەوێنەی ڕۆژانی سیڤەر سەرگەرمی ئەوە نەبوون کارێکی وابکرێت دژی بەرژەوەندی تورکەکان بێت، بۆیە هەردوولایان گوێیان بۆ داخوازیەکانی تورك شلکرد و بەرگری داخوازیەکانی تورکیان نەدەکرد.

بەپێی سەرچاوەکان یەکەم کۆبونەوەی لۆزان لە١٩٢٢/١١/٢٠ دەستیپێکرد هەروەکو سەرچاوە/١٩ ئاماژەی بۆ کردووە و هەروەکو دکتۆر مارف عومەر گوڵ لەلاپەڕە (١٨)ی گۆڤاری (ڕابوون) ژمارە (١٦)ی ساڵی ١٩٩٦ باسیکردووە مۆرکردنی پەیمانەکە لەدوا کۆبونەوەدا لەڕۆژی ١٩٢٣/٧/٢٤دا مۆرکرابوو.

دکتۆر فوئاد حەمەخورشید لەباسەکەیدا سەرچاوە/١٩ وتویەتی: (نوێنەری حکومەتی ئەمریکا هەروەکو چاودێرێك بەشداری کردبوو لەکۆنگرەی لۆزاندا کە لەو کۆنگرەیەدا (١٧) پەیمان مۆرکرا، کە یەکێك لەوانە پەیمانی لۆزان بوو).

دەربارەی قۆناغەکانی کۆبونەوەکانی لۆزان، سەرچاوە/٤٤ لەلاپەڕە (٢٦٩)ی بەرگی دوهەمیدا کردوویەتی بەدوو قۆناغ:

## قۆناغی یەکەم

نوێنەری تورکیا و دەوڵەتە هاوپەیمانەکان (مەبەست ئەو دەوڵەتانەی لەشەڕی یەکەمدا دژی حکومەتی عوسمانی هاوکاری یەکتربوون)، لەم قۆناغەدا هەردوولایان لەپێشبڕکێدا بوون و هیچ لایەکیان لەخواست و مەبەستەکانی لاکەی تر نەدەگەیشت و (لۆرد کرزن)ی وەزیری دەرەوەی بەریتانیا لەگەرمەی چالاکیدا بوو، بەتەمای ئەوە نەبوو دان بەسەربەخۆیی حکومەتی تورکیادا بنێت بەسەرکردایەتی کەمالیەکان.

(Patrick Kinross) لەلاپەڕە (٣٦٠)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٨٠ باسی کیشەی هەندێ لەکەمالیەکانی کردووە لەناوخۆیاندا لەکاتی گفتوگۆی لۆزاندا کە ئەو کێشەیە بەهۆی ئەوەوە پەیدابووبوو، نەیارەکانی مستەفا کەمال ڕەشنووسێکیان ئامادەکردبوو بۆ چۆنیەتی هەڵبژاردنی نوێنەرانی تورك لەناو ئەندامانی ئەنجومەنی بالآی میللیدا، بۆئەوەی ببن بەنوێنەری حکومەت لەگفتوگۆکانی لۆزاندا، یەکێك لەو مەرجانەی لەو ڕەشنووسەی ئەوانە ئامادەیان کردبوو کە دەبوایە بەپێی ئەو مەرجە ئەوەی مافی هەڵبژاردنی هەبوایە بۆ نوێنەرایەتی دەبوایە لەناو خاکی نیشتمانی تورکدا لەدایکبووبێت، هیچ نەبێ دەبوایە پێنج ساڵ تێپەڕبوایە بەسەر نیشتەجێبوونیدا لەتورکیا کە مستەفا کەمال هەردوو مەرجەکەی تیادا نەبوو چونکە لە(سالانیك) لەدایك بووبوو و پێنج ساڵەکەشی لەسەریەك تەواو نەکردبوو لەتورکیادا، بەرامبەر بەو مەرجە مستەفا کەمال وتبووی دیارە دوژمنانی وڵات مەبەستیان لەمنە و نایانەوێ خزمەتی وڵاتەکەم بکەم و بەوەشەوە ناوەستن بەڵکو دەشیانەوێ لەناویشمببەن.

نوسەری سەرچاوە/٨٥ لەباسەکەیدا لەسەری ڕۆیشتووە و وتویەتی: لەو ڕۆژانەدا لەلۆزان کۆبونەوەکانی یەکەم قۆناغ دەستیپێکردبوو، نەیارەکانی مستەفا کەمال لەئەنجومەنی میللیدا ڕەخنەیان لەعیسمەت ئینونۆی سەرۆکی نوێنەرانی تورك گرتبوو کە پرێشکی ئەو ڕەخنەگرتنە مستەفا کەمالیشی گرتبووەوە و ڕەخنەگران هاواریاندەکرد و دەیانوت بەهۆی دیبلۆماسیەتی سەرنەگرتووی عیسمەتەوە سەرکەوتنەکانمان لەدەستئەدەین و دەیانقیژان و دەیانوت: شەڕکردن

زۆر باشتره لەوەی تاقە ئینجێك لەخاكی ولأت بەجێبهێلرێت بۆ بێگانە (مەبەستمان ویلایەتی موسڵ بووه كه بەپێی میساقی میللی ویلایەتی موسڵ بەبەشێك لەخاكی توركیا دەژمێردرا).

نوسەر ئەڵێ: لەڕاستیدا كێشەكە تەنها ئاڕاستەی مستەفا كەمال كرابوو، یەكێكی وەكو (عەلی شكور) نەك تەنها هەر لەئەنجومەنی میللیدا بەڵكو بەئاشكرا لەقاوەخانەكانیشدا و لەسەرجادەكان كه بەخەڵك دەگەیشت دژی مستەفا كەمال ئەدوا و بێزاری و ناڕەزایی خۆی دەردەبڕی بەرامبەر بەڕەفتاری مستەفا كەمال و سەرخۆشی و خواردنەوه بێتامەكەی و دەیوت: سەرەڕای ئەمانه هەمووی مستەفا كەمال نیازیوایه ببێت بەسوڵتان، بەلأم زۆری پێنەچوو (عەلی شكور) ونبوو، كەس نەیزانی چی بەسەرهات و ئەندامانی ئەنجومەن دەیانزانی مستەفا كەمال لەناویبردبوو، ساتێك لاشەكەی دۆزرایەوه گومان خرایەسەر (توپال عوسمان-عوسمانه شەل) كه پاسەوانی تایبەتی مستەفا كەمال بوو، پاش چەند ڕۆژێك (عوسمان توپال) بەدەستوپێ بەستراوی لەدوكانی جل فرۆشێكدا دۆزرایەوه و دانی بەوەدا نابوو (عەلی شكور)ی كوشتبوو چونكه ئەویش هەوڵی كوشتنی دابوو.

پاش ماوەیەك پۆلیس عوسمان توپالی گرت و هەڵیواسی (لەباسی ڕاپەڕینی یەكەمی دەرسیمدا باسی عوسمان توپال دەكرێت)، ئەوەی شایانی باسه مستەفا كەمال زۆری وەكو عوسمان توپالی هەبوو لەوانەی بەدزی و پیاوكوژ ناسرابوون، دەربارەی ئەمه سەرچاوه/٤٤ لەلاپەڕه (١٧٤)دا ئاماژەی بۆ كتێبی (جانقایا) كردووه لەنوسینی (فالح رفقی) كه لەلاپەڕه (٢٣٥)یدا باسی (چەركەس ئەدهەم)ی كردووه كه لەلایەن مستەفا كەمالەوه كرابوو بەدەسەلأتدار و دەستڕۆیشتوویەكی ئەوتۆ لەزۆر شتدا وەكو مستەفا كەمال ناوبانگی دەركردبوو، ڕێگەی پێدرابوو چەكداری تایبەتی خۆی هەبێت و موچەی تایبەت بۆ خۆی و تاقمەكەی بڕابووەوە.

وا دیاره مستەفا كەمال ئەوەی پشتگوێ نەخستبوو دەست لەنەیارەكانی بوەشێنێت، بۆیه بڕیاریدا ئەنجومەنی میللی هەڵوەشێنێتەوه و لەڕۆژی ١٩٢٣/٤/١٦دا لەكۆبونەوەیەكی ئەنجومەنی میللیدا بڕیاریدا و پێشنیازیكرد یاسایەك دەرچێت دەربارەی ئەوانەی خیانەت لەولأت و میللەت دەكەن و یاساكه دەرچوو پاشئەوەی بڕیاری لەسەردرا و مستەفا كەمال بەڕۆژنامەكانی ڕاگەیاند كه

دەیـــەوێ پارتێــك دامـــەزرێنێت بـــەناوی (حزبـــی شـــعبی جمهـــوری) و داوای لەشـارەزایان و ڕۆشـنبیران کـرد ڕەشنوسـی پـڕۆژەی دامەزرانـدنی ئـەو پارتـە ئامادەبکەن.

نوسـەر ئـەڵێ: دوایئـەوەی مسـتەفا کـەمال ئەنجومـەنی میللـی هەڵوەشـاندەوە عیسمەت ئینونۆی نارد بۆ لۆزان و ئەو دەمە (لۆرد کرزن) لەوەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا لابرابوو، بەلابردنی ئەو ئەو گرژی و کێشـەیەی دەربارەی مۆرکردنی لـۆزان بەرلـەوە ڕوویـدابوو بەئاسـانی چارەسـەرکران و لـەڕۆژی تـەموزی ١٩٢٣دا پەیمانەکە مۆرکرا و پاش مۆرکردنی ئەو پەیمانە بەماوەی (١٠) هەفتە هێزەکانی هاوپەیمانـەکان ئەستەمبوڵیان بەجێهێشت بـەڵام مسـتەفا کـەمال هـەر لەئەنقـەرە مایـەوە و پایتەختەکـەی نەگوێزایـەوە بـۆ ئەسـتەمبوڵ و لەوساوە ئەنقـەرە بـووە بەپایتەخت لەجیاتی ئەستەمبوڵ.

## قۆناغی دوهەم

سەرچـاوە/٤٤ لەکتێبەکەیـدا وتویـەتی قۆنـاغی دوهـەمی کۆبونـەوەکانی لـۆزان بۆئـەوە تـەرخانکرابوو دان بەحکومـەتی تورکیـادا بنرێـت کـە لـەم کۆبونەوەیـەدا لـەجیاتی (لـۆرد کـرزن) وەزیرێکـی بـەریتانیا ئامـادەبوو (رومبولـد) کـە لـەم کۆبونەوەیەدا بەوپەڕی توندوتیژیەوە ئیهانەی وەفدەکەی تورکیای کرد بەبێنەوەی یەکێکیان ورتەی لەدەم دەربێت، دەربارەی ئـەو کۆبونەوەیـە نوسـەری سەرچاوەکە باسی ملکەچی و سەرشۆڕی مستەفا کەمالی کردووە بەرامبەر بەئینگلیزەکان تەنها بۆئەوەی پاش مۆرکردنی پەیمانەکە بەشێوەیەکی ڕەسمی دان بەحکومەتەکەیدا بنرێت و دەربارەی ئەوە سەرچاوە/٤٤ ئاماژەی بۆ کتێبەکەی (ڕەزا نوری) کردووە (کە وتمان جێگری عیسـمەت ئینونۆ بووە لەکۆبونـەوەی لۆزانـدا) کـە (ڕەزا نـوری) لەلاپەڕە (٦٨٢)ی بەرگی سێهەمی کتێبەکەیدا نوسیویەتی: ((لەکاتی ئەم قۆناغەدا مستەفا کەمال، عیسمەت ئینونۆ و منی (ڕەزا نوری) بردە پەنایەکەوە و پێی‌وتین: لەکاتی گفتوگۆکردندا ئەگەر زانیتان (تراکیا)شتان دەستگیر نابێت واز لەتراکیاش بهێنن و پێ لەسـەرئەوە دامـەگرن و ئەگـەر بۆ سـەرگرتنی ئاشتی بەپێویستیشـتان زانی واز لەئەستەمبوڵیش بهێنن و هـیچ پێویسـتیش ناکات تەقەلای سەندنەوەی ویلایەتی موسڵیش بدەن)).

ڕەزا نوری دەربارەی ئەوەی مستەفا کەمال وتویەتی: بەڕاستی ئەو قسانەی مستەفا کەمال ڕایچڵەکاندم و حەپەساندمی چونکە ئێمە بەرلەوە لەگفتوگۆکاندا کێشەی تراکیا و ئەستەمبوڵ بڕابووەوە و مسۆگەر کرابوو کە بۆ ئێمە دەبێت ئیتر تێنەگەیشتم نیازی مستەفا کەمال لەو پاشگەزبوونەوە تازەیە چیبوو؟!. ڕەزا نوری دوای ئەمە لەلاپەڕە (١٠٣٤)ی کتێبەکەیدا باسی ئەوەی کردووە کە چۆن جولەکەیەك کە ناوی (Salim–سالم) بووە و ڕاوێژکاری وەفدەکەی ئیتاڵیا بووە لەکۆبوونەوەی لۆزاندا و جولەکەیەکی تریش کە ناوی (ماترسالم) بووە، یەکێك بووە لەجولەکەکانی ناو دەوڵەتی عوسمانی لەگەڵ ئەوەشدا جولەکەکانی ئەوسای (سالانیك) بەدانیشتوانی ئیتاڵیا دەژمێردران، بەلام ئەو (ماترسالم)ە کاربەدەستێکی گەورە بووە لە(بانك سالانیك)، بەوجۆرە جولەکەکان لەلایەکەوە بەناو هاولاتی ئێمە بوون بەلام بەنهێنی هاولاتی ئیتاڵیا بوون و بێجگە لەو دوو جولەکەیە جولەکەیەکی تریش کە بە(قرەصو) بەناوبانگ بووە، ئەویش لەچالاکیدا بووە و هەریەکەیان لەگیرفانیاندا جۆرە پاسپۆرتێکیان هەبووە و سالم لەهەموویان زیرەکتر و چالاکتر بوو، تورکی و فەرەنسی زۆر باش دەزانی و شارەزاییەکی تەواوی هەبوو دەربارەی یاسا و لەکۆنەوە دۆستی تەلعەت پاشا و ئەنوەر پاشا و جەمال بەگ (مەبەست جەمال سەفاحە) کە هەرسێکیان لەدامەزرێنەرانی (جمعیتی اتحاد و ترقی) بوون (لەبەرگی یەکەمدا بەدوورودرێژی باسی پەیوەندی اتحاد و ترقی و زایۆنیزمی جیهانی و ماسۆنیمان کردووە) و تەلعەت پاشا لەهەموو کاروبارێکیدا پرس‌وڕای بەو سالمە دەکرد.

ڕەزا نوری ئەڵێ: لەهەمووی سەیرتر ئەوەبوو ئەو سالمە لەکۆبونەوەکانی لۆزاندا بەرامبەر ئێمە لەڕیزی دوژمنانی تورکیادا دانیشتبوو و لەگفتوگۆکاندا کە دیاربوو ئەو زەلامە هەر لەکۆنەوە هەموو زانیاری و دەنگ‌وباسەکانی کاربەدەستانی تورکی گەیاندبوو بەئیتاڵیەکان و دووریش نییە هەمان پەیوەندیشی لەگەڵ فەرەنسیەکاندا هەبووبێت چونکە پەیوەندیەکی زۆر بەهێزی هەبووە لەگەڵ دەزگا سەرمایەدارەکانی پاریسدا و لەئەنقەرەش بێگیروگرفت کاروباری خۆی دەبرد بەڕێوە کە بریتی بوو لەدرێژەپێدانی مافی ئیمتیاز لە(بانقی عوسمانی)شدا.

ڕەزا نوری لەباسی گفتوگۆکانی لۆزاندا دەگێڕێتەوە کە لەکۆبونەوەیەکدا (لۆرد کرزن) بەخۆی و گۆچانەکەیەوە هاتەلامەوە و پێیوتم: ئێوە نازانم موسڵ موسڵی چیتانە، موسڵ کەڵکی چییە بۆ ئێوە و چی لێدەکەن؟ سووریاتان لەتەنیشتەوەیە بۆچی ناچن داگیریبکەن کە بەتاقە پەلاماردانێك بەو مەبەستە دەگەن. ڕەزا نوری

ئەڵێ: ئەو قسەیەی لۆرد کرزنم زۆر لەلا سەیربوو کە چۆن بەئاشکرا وا داوا لەئێمە دەکات سوریا لەدەست فەرەنسیەکان دەربهێنین؟ بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا قسەکەیم پێخۆشبوو چونکە ئەمە ئەوەی دەگەیاند ئینگلیزەکان بەهیچ شێوەیەك ماوە نادەن بەفەرەنسیەکان لەسوریادا بمێننەوە.

سەرچاوە/٤٤ لەلاپەڕە (٢٨٧)دا وتویەتی: بۆم دەرکەوت وازهێنانی تورکیا لەداواکردنەوەی ویلایەتی موسڵ یەکێك بوو لەو مەرجانەی ئینگلیزەکان بۆ مستەفا کەمالیان دانابوو، بەو مەرجەی ئەویش خەلافەتیان بۆ هەڵوەشێنێتەوە. سەرچاوە/٤٤ لەکتێبەکەیدا دەچێتە سەر باسی ڕۆڵی جولەکەیەکی تر (حاییم ناعوم) کە چەند چالاك بووە لەهەڵوەشانەوەی خەلافەتدا و بەئاشکرا بەمستەفا کەمالی وتبوو: ((هەڵوەشانەوەی خەلافەت و وازهێنان لەویلایەتی موسڵ دوو مەرجی سەرەکین بۆئەوەی حکومەتی بەریتانیا دان بەدەوڵەتەکەتاندا بنێت))، بێجگە لەوە ئەو حاخام ناعومە لەیەکێك لەڕۆژنامەکانی پاریسدا باسێکی نوسیبوو کە کورتیەکەی بەم جۆرە بووە: هیچ پێویست بەترس و لەرز و دڵەڕاوکە ناکات چونکە عیسمەت ئینونۆ هاوڕێمە و لەقسەی من دەرناچێت و هەرچی پێویست بێت پێی جێبەجێدەکەم و پاشئەوە تەلگرافێکی ناردبوو بۆ عیسمەت ئینونۆ لەکاتی گفتوگۆی لۆزاندا و پێیوتبوو: ئەوا بەڕێوەم بۆلای ئێوە، هەموو شتێکم چارەسەرکردووە و هەواڵی زۆر باش و گرنگم پێیە، نەکەن کارێکی وابکەن گفتوگۆی لۆزان بوەستێنرێت.

لێرەدا سەرچاوە/٤٤ ئاماژە بۆ کتێبەکەی ڕەزا نوری دەکات کە باسی ئەو چوونەی (حاخام ناعوم)ی کردووە کە وتویەتی: ((لەکاتێکدا من و عیسمەت و چەند کەسێکی تر دانیشتبووین، پاسەوانێك هات و بەعیسمەتی وت ناعوم ئەفەندی هاتووە و حەزدەکا چاوی پێتان بکەوێت، بەرلەوەی عیسمەت ئینونۆ قسەبکات من (ڕەزا نوری) بەدەنگی بەرز بەعیسمەتم وت تۆ هیچ قسەیەك مەکە و وازبێنە لەمە چونکە من خۆم دەزانم چۆن لەگەڵ ئەو جولەکە بەرازەدا قسەبکەم، دیاربوو لەدەرەوە گوێی لەقسەکانی من بوو، بۆیە کە لێمانپرسی فەرموو چیت دەوێ؟ لەوەڵامدا وتی: هیچ تەنها بۆئەوە هاتووم زیارەتتان بکەم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەدواییدا هەرچیەکی ویست بەنهێنی لەگەڵ مستەفا کەمال و عیسمەتدا جێبەجێیکرد)). بەوجۆرە هەروەکو لەسەرەتای ئەم باسەشدا باسکراوە کۆبونەوەکانی لۆزان لە٢٠/١١/١٩٢٢دا دەستپێکرد و لە٢٤/٧/١٩٢٣دا یەعنی لەدوای نزیکی هەشت مانگ پەیمانەکە مۆرکرا.

## باسی دوهەمی بەشی حەوتەم

### ناوەڕۆکی مادەکانی پەیمانی لۆزان

دەربارەی مادەکانی پەیمانی لۆزان و ناوەڕۆکی مادەکانی باسێکی دووردرێژە و گەلێك سەرچاوە لێی‌دواون، بەڵام ئەوەی ئێمە مەبەستمانە لێی بدوێین بریتی‌یە لەو مادانەی دەستنیشانی مافی هاوڵاتیانی تورکیای تیادا کراوە کە دەبوایە هاوڵاتیانی کوردیشی بگرتایەتەوە.

پرۆفیسۆر حەسرەتیان لەلاپەڕە (٤٢)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٤٥ ئاماژەی بۆ مادە (٣٧ و ٣٨ و ٣٩)ی پەیمانەکە کردووە کە ئەو باسەی هەروەکو لەوەرگێڕانە عەرەبییەکەی کتێبەکەیدا ئاماژەی بۆ کراوە بریتییە لە (معاهدة سيفر و الوثائق الموقعة في لوزان)، لاپەڕە (١٥٢) کە دیارە لەچاپێکی ڕوسیەوە وەرگێڕاوە کە لەساڵی ١٩٢٧دا لەمۆسکۆ چاپکراوە لەوەدا وتراوە: مادە/٣٧ تورکیا بەڵێن ئەدا هیچ بڕیار و یاسایەك دەرنەکات پێچەوانەی ناوەڕۆکی مادەکانی ئەم پەیمانە بێت، مادە/٣٨ حکومەتی تورکیا بەڵێن ئەدات هەموو دانیشتوان سەربەستیەکی تەواویان دەبێت بێ‌جیاوازی لەڕووی نەتەوایەتی و زمان و ڕەگەز و ئاینیانەوە، مادە/٣٩ هیچ جۆرە فشار و بەرهەڵستیەك ناخرێتەبەر هیچ هاوڵاتیەکی تورکیا و ڕێگەی لێناگیرێت لەبەکارهێنانی هەرزمانێك کە بیەوێ بەکاریبێنێت لەکاروباری خۆیدا وەکو بازرگانی و ڕاگەیاندن و نوسین و بڵاوکردنەوەی چاپەمەنی لەشوێنە گشتیەکاندا.

بێجگە لەو دوو مادەیەی پرۆفیسۆر حەسرەتیان باسیکردووە هەندێ سەرچاوەی تر باسی مادە (٤٤)یان کردووە کە بریتیە لەبڕیاری گشتی و دەربارەی ئەمە بلەچ شێرکۆ (جەلادەت بەدرخان) لەلاپەڕەکانی (٨٨-٨٩)دا سەرچاوە/٦٠دا باسی ئەو مادەیەی بەم شێوەیە کردووە: ((بەڵێنەکانی حکومەتی تورکیا لەبەجێهێنانی مادەکانی ئەم پەیمانە بریتین لەبەجێهێنانی بڕیارەکانی نێودەوڵەتی کە بەهیچ شێوەیەك نابێ لێی پاشگەزبێتەوە و هەموو ئەو وڵاتانەی کۆمەڵی نەتەوەکان پێکدەهێنن (مەبەست عصبە الامم)ە مافی سەرپەرشتیکردنیان هەبێ بۆ ئاگاداربوون و دڵنیابوون لەوەی ئایا تورکیا بەڵێنەکانی خۆی

بەجێدەهێنێت یان نا؟ و مافی ئەوەیان هەیە دەست لەکاروباری تورکیاوە وەربدەن تا ئەوکاتەی ناچاریدەکەن بەڵێنەکانی بەجێبێنێت)).

لەڕاستیدا نە ئەو بڕیارەی مادە (٣٨، ٣٩)، نە ئەوەی (٤٤)یش هیچیان سوودێکی ئەوتۆیان نەبوو، بەڵکو تەنها نووسینی سەر کاغەز بوو، کاربەدەستانی تورك لەوساوە دەیان یاسا و بڕیاریان دەرکردووە کە هەموویان پێچەوانەی ئەو مادانە بوون و کۆمەڵی گەلانیش (عصبە الامم) تا دەستی ئەڕۆیشت هیچی نەکرد و یەکێك لەئەندامەکانی بۆ خوێی چێشتیش ڕۆژێك لەڕۆژان ورتەیان لێوەنەهات.

## باسی سێهەمی بەشی حەوتەم

### کەمتەرخەمیی کورد لە پەیمانی لۆزاندا

پاشئەوەی کەمتەرخەمی کورد و ناڕێکی لەنێوانیاندا بوو بەهۆی ئەوەی پەیمانی سیڤەر پشتگوێخرا و ئەو قۆناغانەی بۆ کورد دانرابوو لەماوەیاندا سوود لەو هەل و دەرفەتە وەربگرنۆ کە بۆی ڕەخسابوو هیچی نەهێنرایە دی وەکو لەباسی پەیمانی سیڤەردا بەدووروودرێژی باسمانکردووە، ساتێك بڕیاردرا لەجیاتی سیڤەر پەیمانێکی تر ببەسترێت کە جێگەی ئەو بگرێتەوە، تورکەکان هەرچی توانای خۆیان هەبوو هەموویان بۆئەوە تەرخانکرد پەیمانێکی تازەی وا بێتە پێشەوە بەهیچ شێوەیەك بەمووش بەلای ناوەڕۆکی مادەکانی سیڤەردا نەچێت، بێگومان ئەوەی تورکی والێکرد بەئاسانی بەو ئەنجامە بگات بریتی بوو لەوەی بارودۆخی دەوڵەتە هاوپەیمانەکان و هەڵوێستیان بەرامبەر بەتورکەکان بەتەواوەتی گۆڕابوو ئینگلیزی کەڵەگای کۆبونەوەکانی لۆزان لەژێرەوە هەموو شتێکی لەسەر حسابی کورد لەگەڵ کەمالیەکاندا بڕیبووەوە و مەبەستەکانی خۆی مسۆگەر کردبوو کە بریتی بوو لەوازهێنانی تورك لەداواکردنەوەی ویلایەتی موسڵ و دەستکردنی کەمالیەکان بەپاشگەزبوونەوە لەو دۆستایەتیەی لەگەڵ سۆڤیەتەکاندا هەیانبوو.

تورکیش ئەوەی مسۆگەرکردبوو کە حکومەتی بەریتانیا بەهیچ جۆرێك بایەخ نادات بەکورد وەکو ئەوەی لەسیڤەردا بایەخی پێدابوو و حکومەتی بەریتانیاش بەڵێنی پێدابوو بەشێوەیەکی ڕەسمی دان بەحکومەتی تورکیادا ئەنێت و کوردیش لەکۆبونەوەکانی لۆزاندا بەهیچ شێوەیەك جوڵەیان لێنەهات و ئەگەر لەسیڤەردا شەریف پاشای خەندان و بەدرخانیەکان و ژمارەیەك لەڕۆشنبیرانی کورد لەچالاکیدا بوون لەمەی لۆزاندا ئەوەی لەکوردەکانەوە ڕوویدا بریتی بوو لەهەڵوێستی ئەو کوردانەی لەئەنجومەنەکەی تورکەکاندا بوون و هەر لەکۆنەوە لەکۆنگرەکانی ئەرزڕوم و سیڤەردا هاوکاریان بوون کە ئەو هەڵوێستەشیان بریتی بوو لەهەڵوێستێکی چەوت و ناڕێکی کوشندە کە کورد بەدەمی خۆی وازی لەمافی خۆی هێنا.

هەوڵئـەدەین لـەم باسـەدا چـەند بەڵگەیـەك بخەینـە پێشچـاو کـە هـەموویان نیشـانەی کـورتبینی و دەربڕینــی ئەقڵیــەتێکی عەشـایری و دەرەبەگایــەتی و لوتبـەرزی ئـەو کوردانـەی خۆیان لـەهاوکاریکردنی خـەبات و تێکۆشـان و چالاکی لـەپێناوی دەسـتگیربوونی مـافی کـورد دوورخسـتبووەوە و لاموایـە ئـەو هـەموو شۆڕشانەی دوای مۆرکردنی پـەیمانی لـۆزان کرا وەکو لەدواییدا بـەزنجیرە باسـی هـەموویان دەکـەین هیچیان بەقەد ئـەوە سوودی نـەبوو ئەگـەر لـەو ڕۆژە گـرنگ و ناسـکەی بەسـتنی پـەیمانی لۆزانـدا بکەوتنایەتـە خۆیـان و هاوکاری و تـەبایی و یـەکگرتنی خۆیـان بـۆ دوژمنـی داگیرکـەر و بـۆ ئـەو دەوڵەتانـەش کـە بووبـوون بەخاوەنی دەرکردنـی بڕیـار دەربڕیایـە ئەوسا بڕوا ناکـەم پـەیمانی لـۆزان هـەروا بەئاسانی بەپێی داخوازیەکانی تورك سەریبگرتایە.

لــەم کورتــە باســانەی داهــاتوودا نمونــەی ئــەو کەمتەرخەمیــەی کــورد و ساویلکەییەی کورد دەردەکەون: لەدوکیومێنتی ژمارە (Fo.٣٧٥-٦٣٤٦)دا نامەیەکی (سیر هارۆلد رمبولـد)ی مەندوبی سامی بەریتانیای تیادایە لەڕۆژی ١٩٢١/٣/٢دا ناردویـەتی بـۆ وەزیـری دەرەوەی بـەریتانیا وتویـەتی: ((ئـەو کوردانـەی کـراون بەئەنـدامی ئەنجومـەنی میللـی تـورك لەئەنقـەرە کـە خۆیـان وا پیشـانئەدەن گوایا نوێنـەری کـوردن، لەڕاسـتیدا هـیچ توانـا و دەسـەڵاتێکی ئـەوتۆیان نیـیە بـەناوی نوێنەری کوردەوە قسەبکەن)).

بـەڵام سـەیر ئەوەیــە سـاتێك لـەلۆزان نوێنــەرانی دەوڵەتـە هاوپەیمانـەکان و دەوڵەتەکانی تر خـەریکی گفتوگۆ بوون دەربـارەی ئـەو ڕەشنوسـەی ئامادەکرابوو لێیبکۆڵرێتـەوە و ساتێك لەمادەیەکیدا پێویستی بەوە هـەبووە کـە بیروبۆچوونی کـورد دەربـارەی وەربگیرێـت، وەزیـری دەرەوەی بـەریتانیا کـە (لـۆرد کـرزن) بـوو لەگـەڵ ئەوەشـدا ئـەو تەلگرافـەی (سـیر هارۆلـد رمبـو)ی پێگەیشـتبوو و سـوور دەیزانـی ئەوانـەی هاوکـاری کەمالیـەکان بـوون بەنوێنـەری کـورد نـەدەژمێردران و نوێنــەری ڕاســتی کــورد بریتــی بــوو لــەو هــەموو ســەرکردە و ڕۆشــنبیر و سیاسەتمەدارانەی کورد کـە لەهەڵوێستی تورکە کەمالیەکان ناڕازیبوون و گـەلێك کۆمــەڵ و ڕێکخـراوی خۆیـان هــەبووە کــە هــەر کۆمــەڵ و ڕێکخـراوە پرۆگـرام و پەیڕەوی خۆی هەبووە دەربارەی مافی چارەنوسی کورد کەچی لەسـەر پێشنیازی نوێنەری بەریتانیا کە (لۆرد کـرزن) بووە، داواکرابوو بیروبۆچونی ئـەو کوردانـەی لەئەنجومەنەکەی کەمالیەکاندا بوون وەربگیرێت کە خۆی باشی زانیبوو ئەوانـەی

نوێنـەری کـورد نـەبوون کـە ئـەم هەڵوێسـتە لەلۆزانـدا بـەکارتێکردنی نوێنـەری بـەریتانیا کارێکی وایکـرد مەبەستی تورکـەکان سـەربگرێت وەکو لەدواییـدا ئـەم ڕاستیە ڕووندەبێتەوە.

بێگومـان ئـەو پێشـنیازەی (لـۆرد کـرزن) و ئـەو دەستپێشـخەریەی کـە تـەنها بیروبۆچونی کوردەکانی ناو ئەنجومەنەکەی کەمالیەکان وەربگیرێت و بیروبۆچونی نوێنـەرانی ڕاستی کـورد بخرێتـە لاوە، هـەر بـەخۆڕایی نـەهاتبووە ئـارلوە بـەڵکو لەلایەکـەوە کـورد لـەناو خۆیـدا کۆمـەڵ و ڕێکخراوێکـی یـەکگرتووی نـەبووە لـەو ڕۆژانەدا کە بەناوی کوردەوە خواستەکانی میللەتی کورد بخاتە پێشچاو و ئەو تەقەلا بێسوودانەش کە لەدواییدا دران بەناردنی نامە و سکالاً بۆ کۆمەڵی گـەلان (عصبە الامم) بەکەڵکی هیچ نەهات و تازە کار لەکار ترازابوو، لەلایـەکی تریشـەوە وەکو بەرلەمە باسمانکردووە ئینگلیزەکان لەگەڵ تورکەکاندا لەسـەر هـەموو شتێك ڕێککەوتبوون.

پرۆفیسۆر حەسرەتیان لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٤٥ لەلاپەڕە (٤٢)دا وتویەتی: کاتێـك لەلۆزانـەوە تـەلگراف نێـردرا بـۆ ئەنجومـەنی میللـی تـورك بۆئـەوەی بیروبۆچوونی کوردەکـانی ئـەو ئەنجومەنـە وەربگرێت دەربـارەی ئـەوەی ئایـا ئـەو کوردانـە دەیانـەوێ کـورد لـەتورکیا جیابێتـەوە، مسـتەفا کـەمال دەمودەسـت کۆبونەوەیەکی بەپەلە سازدەکات بۆ ئەنجومەن و داوا لـەکوردەکان دەکات خۆیـان وەڵامـی تەلگرافەکـە بدەنـەوە و لەئەنجامـدا (حسـێن عـەونی بـەگ) کـە نوێنـەری ئەرزڕوم بووە وتویـەتی: ئەم وڵاتـە هی کـورد و تورکـە و تـەنها هـەر ئەوان لەسەر شانۆی ئەم ئەنجومەنە مـافی قسـەکردنیان هەیـە و ئائیبـەکانی دەرسیم کـە بریتی بـوون لەحسـێن خـەیری، رامـز و بـوزان بـەگ و شـاهین بـەگی نوێنـەری ئورفـە و نوێنـەرانی تـری (پـالو، وان، بـەدلیس، دیاربـەکر، مەلاتیـە) هـەموویان بـوون بەلایـەنگری قسـەکانی حسێن عـەونی کـە بەحسـاب ئەمانـە هـەموویان حکومـەتی تورکیان بەدوژمنی ئیمپریالیزمی بەریتانیا دەزانی.

پرۆفیسـۆر حەسـرەتیان لەباسـەکەیدا لەسەرپرۆیشـتووە و وتویـەتی: ((ئـەو ئائیبانە لەناو ئەنجومەندا هەرچەند جاروبار لەقسەکردنیاندا باسی مافی کوردیـان دەکرد، بەڵام ئەو قسانە لەجێی خۆیاندا نەکرا چونکە لەو تەلگرافەی بۆ لۆزانیان ناردبوو بـەناوی خۆیانـەوە بەسوسـەش باسـی مـافی کوردیـان نـەکردبوو، بـەڵکو تـەنها وتبوویـان کوردەکـانی ئەنـدامی ئەنجومـەنی میللـی نایانـەوێ لـەتورکیا

حسابی بۆ بکەن و دەمێك بوو نەخشەی توانەوەی کوردیان کێشابوو لەبۆتەی نەتەوەی تورکدا.

لەڕاستیدا پرۆفیسۆر حەسرەتیان بەتەواوەتی باری ئەو ڕۆژانەی کورد و درۆودەلەسەکانی تورکی باش هەڵسەنگاندبوو، هەندێ لەڕۆشنبیرانی ئەو ڕۆژانەش لەمەبەستە سەرەکیەکانی تورك گەیشتبوون بەلاّم کاتێك کەوتنە خۆیان و دەستکرا بەشۆڕشەکانی کورد وەکو شۆڕشی پیران و ئاگریداغ و دەرسیم کە تورك بووبوو بەخاوەنی هەموو جۆرە چەکێك و کورد لەو ڕاپەڕین و شۆڕشانەیدا لەماڵوێرانی و ئاوارەیی و دەربەدەری هیچی تری دەستگیر نەبوو، تورکیش کە بەناو لەپەیمانی لۆزاندا بڕیاری لەسەر ئەو مادانەی بەرلەمە باسمانکردن وەکو مادەکانی (٣٧،٣٨،٣٩،٤٤) ئەوانە لای تورك هەمووی پەشمبوو دەیانزانی لەدواڕۆژێکی نزیکدا هەمووی دیزەبەدەرخۆنە دەکەن و کە کاتی خۆی هات لەڕێگەی ئەو پارلەمانەی خۆیان دروستیانکردبوو، یاسای ژمارە (٨٨)یان دەرکرد کە بەپێی ئەو یاسایە دەستوورێکی هەمیشەییان بۆ تورکیا دانا و لەژێر سایەی ئەو دەستوورەدا دەیان بڕیار و یاسای تریان دەکرد کە هەمووی بۆ لەناوبردنی کورد بوو وەکو لەشوێنی خۆیدا باسی ئەو یاسایانە دەکرێت لەبەرگی سێهەمدا.

## بەشی هەشتەم

### پاشگەزبوونەوەی تورك لەو بەڵێنانەی بەکوردیان دابوو

تورکـەکان پاشـئەوەی بەشـێکی زۆری ئـەو نەخشـانەی کێشـابوویان بـۆ چەسپاندنی خۆیان و دەوڵەتەکەیان هێنابوویاننـەدی، ئیتر حسابی ئەوە هاتبوو دەست لەکوردەکانیش بوەشێنن پاشئەوەی بۆیاندەرکەوت بەو هێزانەی هـەیانبوو بەئاسانی دەتوانن هەموو جموجوڵێکی کورد خامۆش بکەن و بەپێی ئەو یاسایەی بەناوی (اقرار السکون)ەوە دەریانکردبوو هەر ڕۆژە بیانوویەکیان بەکورد دەگرت و لـەو هـەموو بەڵێنانـەی لـەکاتی کۆنگرەکـانی ئـەرزڕوم و سێواسـدا و لـەو هـەموو بەڵێنانـەی لەئەنجومـەنی بـاڵای میللیـدا دابوویـان بـەکورد و خـاکی تورکیایـان بەخاکی دوو نەتەوەی وەك برا باسدەکرد، وردە وردە مەبەستە ناپاکەکانی خۆیان ئاشـکراکرد و هەرچـی کۆمـەڵ و ڕێکخراوەکـانی کـورد هـەبوو هـەموویان هەڵوەشـانەوە و دەرکردنـی ڕۆژنامـە و گۆڤـار و بڵاوکـراوەی کوردیـان هـەموو قەدەغەکرد و بەئاشکرا بـەکوردیان وت تاقە ڕێگەیەك کە بۆتـان هـەبێ بیگرنەبەر ئەوەیە واز لەزمانی باوباپیرانی خۆتان بهێنن و بەوە قایل بن کە بەڕەگـەزی تورك بژمێردرێن و جارێکی تر بیر لەوە نەکەنەوە داوای مافی نەتەوایەتی خۆتان بکەن.

دەربارەی ئـەو هەڵوێستە تازەیـەی کەمالیەکان بەرامبـەر کورد، دکتـۆر عـەزیز شەمزینی لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٤٢ ئاماژەی بۆ یاداشتەکانی عـەزیز یامولکی کـردووە (کوردسـتان و کـورد اختشاشـلری) کـە لـەوەدا باسـی چـۆنیەتی پاشگەزبوونەوەی کەمالیەکانی کردووە لەو بەڵێنانەی بەکوردیان دابوو، وە لەباتی ئەوە مستەفا کەمال و عیسمەت ئینونۆ سیاسەتێکی ڕەگەزپەرستانەیان گرتەبەر و بەئاشکرا یەکێکی وەکو (یعقوب قدری) کە ئەندامی ئەنجومەنەکەی مستەفا کەمال بوو لەوتارێکدا وتبووی: گڕی سووری کڵپەی ئـەو ئاگرانەی ڕوویداوە (مەبەستی ڕاپـەڕین و بزوتنـەوەکانی کـورد بـووە لـەدوای پاشـگەزبوونەوەی تـورك کـە بریتـی بـوون لەڕاپـەڕینی یەکـەمی دەرسـیم و کـوجگیری کـە لـەدوای ئـەم بەشـە باسـێکی تایبـەتیمان بۆ تـەرخان کـردووە) تـەنها بریتـی نییـە لەکێشـەکە، بـەڵکو سـەرەتای ڕووبەڕووبونـەوەی دوو میللـەتی بەڕەگـەز لەیـەکتر جیـاوازن، ڕەگـەزی کـورد کـە

ئەورووپاییەکان کورد وەکو خۆیان بەنەژادی (ئاری) ناسیوە و ڕەگەزی تورکیش دەبەنەوە سەر (مەغۆل نەژاد).

دەربارەی ئەو بۆچوونەی (یعقوب قدری) لەو ڕۆژانەدا ڕۆژنامەی (تورکیش ئیلری) وتویەتی: ((ئەوانەی بەڕەگەز تورك نین یان دەبێ لەناو بۆتەی تورکدا بتوێنرێنەوە یان دەبێ هەموویان لەناوبرێن)). دەربارەی ئەوەی ڕۆژنامەکە باسیکردووە، لەباسەکانی داهاتوودا گەلێك باس و وتاری تر لەلایەن کاربەدەستانی تورکەوە دەخوێنینەوە کە هەریەکەیان بەشێوەیەك باسی چۆنیەتی توانەوەی کوردیان کردووە.

دکتۆرە دوریە محەمەد عەلی عەونی لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٣٥ دەربارەی پاشگەزبوونەوەی تورك لەبەڵێنەکانیان بەرامبەر کورد وتویەتی: کەمالیەکان بۆ پینەکردنی ئەو هەموو شکست و دۆڕاندنانەی لەشەڕی یەکەمی جیهانیدا توشیان بووبوو دەستیانکرد بەبڵاوکردنەوەی هەندێ بیروبۆچوونی ڕەگەزپەرستی و فاشستیانە و شتی وایان بڵاودەکردەوە کە خۆشیان نەیاندەزانی بناغەی قسەکانیان کامەیە، بۆ نمونە دەیانوت:

١-هەموو شارستانێتی جیهان بناغەکەی لەلایەن ڕەگەزی تورکەوە داڕێژراوە.

٢-بیردۆزی ڕۆژ: بەپێی بۆچوونیان زمانی تورکی دایکی هەموو زمانەکانی جیهانە و تیشکی ڕۆژی شارستانێتی لەجیهاندا هەمووی بەهۆی ئەوانەوە گەیشتۆتە وڵاتانی تر، وەکو چین، میسر، هیند، وڵاتی ڕافیدەین (مەبەست عێراقە)، ئێران، یۆنان و لەسەرەتادا ڕۆشنبیری تەنها هەر لەتورکەوە دەستیپێکردووە (وادیارە ئەو هەموو کوشتار و تاڵانی و خوێنڕێژیەی بەدرێژایی مێژوو لەناو میللەتاندا کردبوویان ئەوەیان بەشارستانێتی و ڕۆشنبیری داناوە و بەمە هێشتا ئەوان ئەو میللەتانەی کوشتاریان لێکرابوون بەقەرزاربار دادەنێن.

دکتۆرە دوریە محەمەد عەلی عەونی ئاماژەی بۆ نوسینەکانی (ئیسماعیل بێشکچی) کردووە کە چۆن لەهەموویاندا ئەو درۆودەلەسانەی ڕەگەزپەرستەکانی تورکی بەدرۆخستۆتەوە، (لەڕاستیدا بێجگە لەو بەدرۆخستنەوەیە، هەموو کەسێکی شارەزا بەمێژووی بەسەرهاتەکانی جیهان و تاوانەکانی تورك، بەباشی لەوە گەیشتوون ئەو هەموو تەقەلایانەی تورك هەتا ئێستە داویانە و ئەو هەوڵ و کۆششانەش ئەو دەوڵەتانەی حکومەتەکانی تورك و هێز و سوپاکەیانیان کردووە بەگورزی دەستی خۆیان بۆ مسۆگەرکردن و دابینکردنی سیاسەت و بەرژەوەندیە

سەرمایەدارەکانی خۆیان تا ئێستە هیچی بەو مەبەستە نەگەیشتووە کە ولأتانی ئەورووپا والێبکات ئەوەی کە تورکەکان خەوی پێوەئەبینن ببن بەئەندامی یەکێتی ئەورووپا، هەتا ئێستە هیچیان بەهیچ نەکردووە و هەتا لەڕێبازی ڕەگەزپەرستێتی و فاشستێتی خۆیان لانەدەن، قەت بەو ئاواتەیان ناگەن).

دکتۆرە دوریە محەمەد عەلی عەونی لەکتێبەکەیدا لەسەری ڕۆیشتووە و وتویەتی بەپێی نەخشەی فاشستەکانی تورک هەوڵی سەرگرتنی دوو شتیان دابوو:

١-تواندنەوەی نەتەوەکانی تری غەیری تورك لەبۆتەی نەتەوەی تورکدا.

٢-یان لەناوبردن و نەمێشتنی هەرلایەك بەربەرەکانی ئەو تەقەلایانەی ئەوانی کردبێت. لەتواندنەوەیدا لەبۆتەی تورکدا و بۆ سەرگرتنی ئەم مەبەستە وەکو پێویستیەك سپێردرا بەسوپا و دەزگاکانی و هەموو جۆرە دەسەلأتێکی پێدرا بۆ بەجێهێنانی.

دکتۆرە دوریە محەمەد عەلی عەونی لەباسەکەیدا لەسەرینەڕوا و دەڵێت: بێگومان لەزەمانی مستەفا کەمالەوە بیروباوەڕی (جرمانی) کە هەندێ لەفەیلەسوفە ڕۆژئاواییەکان گرتبوویانەبەر و بیروبۆچوونی مۆسۆلینی و ستالین کارێکی زۆریانکردبووە سەر مستەفا کەمال و کەمالیەکان، بەلأم سەیر ئەوەیە بیروبۆچونەکانی فاشستە کەمالیەکان تەنها هەر کاری نەکردبووە سەر گەلی تورك، بەڵکو بیروباوەڕی (بعث العربي)ش هەمان ڕێبازی گرتبووەبەر و بریتی بووە لەلاساییکردنەوەی کەمالیەکان.

دەربارەی ئەوەی دکتۆرە دوریە باسیکردووە، لەڕاستیدا نەك تەنها هەر عەرەبەکان لاسایی کەمالیەکانیان کردبووەوە، بەڵکو کاریانکردبووە سەر (ڕەزا شا) و ئەویش تەقەلایەکی زۆری دابوو لاسایی مستەفا کەمال بکاتەوە و هەردووکیان لەڕووەوە لەیەکتر نزیکبوونەوە و هەردوولایان زیارەتی یەکتریان کردبوو بۆئەوەی هەریەکەیان بەچاوی خۆی ببینێت، ولأتی بەرامبەرەکەی لەڕێگەی ئەو بیروباوەڕەوە تا چ ڕادەیەك توانیبووی پێشبکەوێت.

ئەوەی شایانی باسە لێرەدا ئەوەیە دەوڵەتە سەرمایەدارەکانی ئەو ڕۆژانە ڕێگەیان لەهیچ جۆرە بیروباوەڕێك نەدەگرت کە ببوایە بەهۆی ئەوەی حکومەتەکانی ئەو ناوچەیە لەیەکتر نزیك ببنەوە بۆ ڕێگرتن لەبلأوبوونەوەی بیروباوەڕی مارکسی و لەپەرەسەندنی بیروباوەڕی بولشەوی کە سەرودڵی دەوڵەتە

سەرمایەدارەکانی ئەو ڕۆژانەی گرتبوو، بێگومان دروستبوونی پەیمانی (سعداباد) کە لەساڵی (١٩٣٦)دا مۆرکرا و تورکیا و ئێران بەگەرمی ئەندامێتی ئەو پەیمانەیان قبوڵکرد، یەکێك بوو لەو تەقەلایانەی حکومەتەکانی دژی سۆڤیەت بەتایبەتی بەریتانیا زۆر سەرگەرم بوو لەمۆرکردنی ئەو پەیمانەدا.

ئەوەی لێرەدا مەبەستمانە ئاماژەی بۆ بکەین بریتیە لەسەرەنجامی ئەو پاشگەزبوونەوەیەی تورکە کەمالیەکان لەو بەڵێنانەی بەکوردیان دابوو کە ئەنجام بەوە گەیشت میللەتی کورد لەباکووری کوردستاندا ناچاربوو بکەوێتە خۆی بۆئەوەی تەقەلاکانی تورکەکان پوچەڵ بکاتەوە، ئەگەرچی بەداخەوە هەموو ڕاپەرینەکانی کوردی باکوور تا شەڕی دوەەمی جیهانی هیچیان سەرینەگرت و کورد تووشی ماڵکاول و کوشتار و ئاوارەبوونێکی زۆر هات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەگەڵ ئەو هەموو جەور و ستەمەی لەکورد کرا، نەتوانرا ئەو هەستەی لەدڵ و مێشکی کوردی باکووردا بوو لەناوبچێت و جارێکی تر باسەکەی (کاپتن مای) کە ئەفسەرێکی سیاسی بەریتانیا بووە لەباشوری کوردستاندا لەساڵانی (١٩١٩-١٩٢٠)دا لەکتێبەکەیدا (Two Years in Kurdistan–دوو ساڵ لەکوردستاندا) کە لەو کتێبەیدا وتویەتی: (ئیمڕۆ کورد لەباکوری کوردستاندا نوستووە، بەڵام ئەوکاتەی خەبەری ئەبێتەوە بناغەی حکومەتی تورکیا دەهێنێتە لەرزە).

## بەشی نۆهەم

### سەرەتای بزوتنەوەکان لەباکوری کوردستاندا دوای پاشگەزبونەوەی تورك لەبەڵێنەکانی

دوایئەوەی کورد هەستی بەوەکرد تورکیا بەئاشکرا نیازی وایە و بڕیاریداوە کوردیش بەدەردی ئەرمەنیەکان بەرێت و ئەگەر بەخۆشی کوردی پێنەتوێنرایەوە لەبۆتەی تورکدا ئەوا بەزەبری هێزەکانی سوپا لەناویئەبات و ناچاری دەکات مل بۆ داخوازی تورك کەچبکات و بۆ گەیشتن بەو مەبەستە لەسەرەتادا گەلێك یاسای دەرکرد و بەپێی ئەو یاسایانە دەسەڵاتێکی زۆر درا بەسوپا و بەکاربەدەستانی تورك لەو ناوچانەدا کە خەریکی جموجۆڵ بوون لەپێشدا لەناوچەی (مەلاتیە) و لەدواییدا لەناوچەکانی دەرسیم و کوجگیریدا کە یەك لەدوای یەك باسی بزوتنەوە و ڕاپەڕینی هەرسێ ناوچەکە دەکەین کە بەداخەوە لەهەرسێکیاندا ڕووندەبێتەوە هەموویان بریتی بوون لەڕاپەڕینێکی ناوچەیی و عەشایری و لەڕاپەڕینێکی لەیەکتر دابڕاو و هەرلایەك بۆ خۆی و بەجیا دەستیدایە چەك و ڕووبەڕووی سوپای تورکی مەشقپێکراوی پڕ چەك بوونەوە و نەتوانرا بەرامبەر بەو زەبروزەنگەی تورکەکان بەرامبەر کوردی ناوچەکە دەیاننواند ڕێکخراوێکی سیاسی پێکبێنن کە سەرکردایەتیەکی یەکگرتووی هەبووایە، بۆیە ئەنجامی هەرسێ ڕاپەڕینەکە بەوە گەیشت تورکەکان یەك لەدوای یەك هەرسێ ڕاپەڕینەکەی دامرکاندەوە و زیانێکی زۆری بەکوردی ئەو ناوچانە گەیاند.

دەربارەی یەکەم بزوتنەوەی کورد لەناوچەکەدا، لەدوکیومێنتی ژمارە (Fo.٣٧١-٦٣٤٦)ی ڕۆژی ١٩٢١/٥/١١دا نامەیەکی مەندوبی سامی بەریتانیای باسکردووە کە ناردبووی بۆ وەزیری داگیرکراوەکان (کە لەو ڕۆژانەدا چرچڵ بووە) بۆ وەڵامی نامەیەکی ئەم وەزارەتەکە لەڕۆژی ١٩٢١/٤/٢١دا (No.٣٥٨-ژمارەی نامەکە) ناردبووی بۆ مەندوبی سامی دەربارەی بزوتنەوەی کورد و لەو نامەیەدا مەندوبی سامی وتبووی: ((هەتا ئێستە هیچ ئاگاداربوون و زانیاریەکی تەواوم لانیە دەربارەی بزوتنەوەی کوردەکان دژی تورکە کەمالیەکان لەڕۆژهەڵاتی سێواسدا، بەڵام وادیارە گرنگێتی ئەو ڕاپەڕینە لەوەدا دەردەکەوێت کە تورکەکانی ئەنقەرەی خستۆتە مەترسیەوە و وایلێکردوون هێرشێکی گەورەی سەربازی

بکەنە سەر ناوچەکە، بەڵام من هێشتا سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوی ئەوتۆم لەبەردەستدا نییە بزانم ئاخۆ ئەو بزوتنەوەیە تەشەنەی کردووە بۆ ناوچەکانی (قزلباش-مەبەستی عەلەویەکان)ە کە زۆربەیان لەناوچەی دەرسیم و دەوروبەریدا دەژین یان بزوتنەوەکە بریتیە لەڕاپەڕینێکی ناوچەیی و لەوە زیاتر هیچ حسابێکی تری بۆ ناکرێت و بێگومان هێزە پۆشتە و پەرداخەکانی تورك زۆر بەئاسانی دەتوانن ئەو بزوتنەوەیە دامرکێننەوە)).

دەربارەی ئەو بزوتنەوەیەی لەو دوکیومێنتەدا باسیکراوە، ڕۆبەرت ئولسون لەلاپەڕە (٢٦)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٨٤ وتویەتی: ((لەناوچەکانی دەرسیمدا، ناکۆکی نێوان سونی و شیعەکان و ناکۆکی نێوان ئەوانەی لەسوارەی حەمیدیدا بەشداربوون لەگەڵ ئەوانەی لەو سوارەیەدا بەشدارنەبوون شتێکە بەئاشکرا هەستی پێدەکرێت لەناوچەکەدا (لەبەرگی یەکەمدا باسێکی تایبەتی بۆ سوارەی حەمیدیە تەرخانکراوە، لەوەدا بەدوورودرێژی باسی ئەو کێشە و ئاڵۆزیانەمان کردووە کە لەناو کورددا پەیدابووبوو بەهۆی ئەو ڕێکخراوەوە)).

نوسەری سەرچاوە/٤٤ لەباسەکەیدا لەسەری ڕۆیشتووە و وتویەتی: ((لەسەرەتای هاوینی ١٩١٩دا وەختێك مستەفا کەمال و تاقمەکەی دەستیانکرد بەڕاپەڕین دژی دەوڵەتانی هاوپەیمان، هەروەکو (شریف فرات-Sharif Firat) باسیکردووە لەکتێبەکەیدا ئەوانەی لەکاتی خۆیدا لەسوارەی حەمیدیەدا بەسەرکردایەتی (خالید بەگ جبران) تیایدا بەشداربوون، هیچیان نەبوون بەلایەنگری مستەفا کەمال بەڵکو بەنهێنی بڕیاریاندا ببن بەلایەنگری بۆچوونی کوردە قەومیەکان کە بۆ سەربەخۆیی کورد تێدەکۆشان)). بەڵام (مارتن ڤان برونسون) دەربارەی ئەو بۆچونەی (شریف فرات) کە سەرچاوە/٤٤ ئاماژەی بۆ کردووە وتویەتی: ((شەریف پاشا لەو بۆچونەیدا تەواو بۆی نەچووە و بەهەڵەدا چووە چونکە نەك تەنها هەر ئەوانەی سوارەی حەمیدیە، بەڵکو ئەوانەی تریش کە لەحەمیدیەدا بەشدار نەبووبوون هەموویان لایەنگری کوردە قەومیەکان بوون)).

مارتن لەباسەکەیدا لەسەریئەڕوا و ئەڵێت: ((خالید بەگ جبران لەکاتی خۆیدا دەیزانی ئەگەر ئەرمەنیەکان لەشۆڕشەکەیاندا دژی تورك بشکێن، ئەوا دوای ئەوان نۆرەش دێتە سەر کورد کە ناچاردەبێ ڕووبەڕووی تورکە قەومیەکان ببێتەوە، شێخ محەمەدی برای شێخ سەعیدی پیران کە چاوی بەخالید جبران دەکەوێت لەژێر چادرەکەیدا پەستومات دانیشتووە شێخ محەمەد کە هۆی ئەو ماتبوونەی

لێدەپرسێت لەوەڵامدا پێی‌دەڵێت: ئیمڕۆ کەوا ئێمە شیرەکانمان تیژکردووە (بێگومان مەبەستی تیژکردنی سوارەی حەمیدیە بووە دژی ئەرمەنیەکان کە سوارەی حەمیدیە هاوکاری تورك بووە لەو شەڕەدا کە تورك و ئەرمەنی کردبوویان) بەداخەوە ڕۆژێك دێت ئەو شیرە ئاڕاستەی خۆشمان دەکرێت)).

ڕۆبەرت ئولسون دەربارەی ئەو قسەیەی (مارتن ڤان برونسون) ئاماژەی بۆ کردووە دەڵێ: ئەگەر ئەو قسەیەی خالید بەگ جبران ڕاست بووبێت کە وای وتووە هەندێ ڕاستی دەربارەی کوردە قەومیەکان ڕووندەبێتەوە لەماوەی سالانی (١٩١٨-١٩١٩)دا کە بریتین لە:

<u>یەکەم:</u> دەردەکەوێ کوردە قەومیەکان درەنگ لەو مەترسیەی تورك گەیشتبوون و ئەو ترسەشیان ڕاست نەبووە کە هەیانبووە بەرامبەر بەئەرمەنیەکان، ئەوانەی لەویلایەتەکانی ڕۆژهەلاتدا مابوونەوە لەدوای ئەو کوشتارەی تورکەکان لەساڵی ١٩١٥دا لەئەرمەنیەکان کرابوو کە ئەو دوژمنایەتیەی نێوان کورد و ئەرمەنی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دوژمنایەتیە تەقلیدیەی لەنێوان کورد و ئەرمەنیدا لەساڵی (١٨٧٨)ەوە پەیدابووبوو.

بەرلەوەی بچینە سەر باسی دوهەم کە ڕۆبەرت ئولسون باسیکردووە، بەپێویستم زانی هەندێ ڕاستی بخەمە پێشچاو: ئەگەر ڕۆبەرت ئولسون مەبەستی ئەو تێکچوونەی نێوان بەدرخان پاشا و ئەرمەنیەکان بووبێت لەزەمانی بەدرخان پاشادا، کە لەبەرگی یەکەمدا لەباسی شۆڕشەکەی بەدرخاندا بەدووروودرێژی باسی ناکۆکی نێوان بەدرخان و ئەرمەنیەکانمان کردووە کە بەهۆی هاندانی میسنیرەکانەوە ڕوویدابوو کە ئەرمەنیەکانیان هاندابوو مل بۆ بەدرخان پاشا کەچنەکەن لەدانی باجی ساڵانە کە لەهەموو دانیشتوان دەسێنرا بۆ بەڕێوەبردنی دامودەزگاکانی، کە ئەمەش بەر لەساڵی (١٨٧٨) بووە، چونکە بەدرخان پاشا بەر لەساڵی (١٨٧٨) بەدە ساڵ بەئاوارەیی کۆچی دوایی کردبوو، خۆئەگەر مەبەستی ساڵی (١٨٧٨) زەمانی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری بووبێت کە لەو ماوەیەدا دوو ڕاپەڕینی کردبوو دژی شای ئێران و دژی حکومەتی عوسمانیش، لامواییە پەیوەندی نێوان شێخ عوبەیدوڵڵا و ئەرمەنیەکان بەجۆرێك نەبووە کە دوژمنایەتیەکی تەقلیدی لێوە پەیدابووبێت.

تەنها ماوەتەوە سەر باسی ئەو کوشتارەی لەساڵانی (١٨٩٤-١٨٩٥)دا لەئەرمەنیەکان کرابوو لەلایەن حکومەتی عوسمانیەوە کە سوارەی حەمیدیەش

ژمارەیەکی کوردی تیادابووە کە ئەو هێزەش هەر بەشێك بووە لەسوپای تورك و ئەگەرچی خالید بەگ جبران یەکێك بووە لەسەرکردەکانی، بەڵام ئەو هێزی سوارەیە یەکسەر لەژێر بەڕێوەبەرایەتی سوپای تورکدا بووە وەکو هێزێکی ڕەسمی حکومەت و تەنها هەر کوردی تیادا نەبووە.

بێجگە لەوە بەرلەمە لەباسی دوهەمی بەشی شەشەمدا (کوشتاری ئەرمەنیەکان لەلایەن تورکەوە) لەو ڕاپەڕینەی ئەرمەنیەکان کردیان لەساڵی ١٩١٩دا پاشئەوەی ڕوسەکان لە(قارس)دا بەسەر تورکەکاندا سەرکەوتن، ڕێگەیان بۆ ئەرمەنیەکان خۆشکرد حکومەتێکی کاتی دروستبکەن و بەپێچەوانەی ئەوەی کورد یارمەتیەکی زۆری ئەرمەنی دابوو وەکو لەو باسەی کوشتاری ئەرمەنیدا بەدوورودرێژ باسمانکردووە.

دوهەم: لەساڵی ١٩١٩دا زۆری وەکو خالد جبران هێشتا لەناو سوپای تورکدا مابوون، کە هەستکرا تورك هەڵوێستی بەرامبەر بەکورد باش نیيە و نیازی لەناوبردنێتی، ئەو ئەفسەرانەی کورد دەیانتوانی عەشایەرەکانی کورد ڕێکبخەن و ئامادەیان بکەن بۆ شۆڕش و ڕاپەڕینێك دژی تورکە قەومیەکان. هەرچەند خالید بەگ و هەندێ لەوانەی هاوبیری بوون لەساڵی ١٩٢٠دا دەستیانکردبوو بەپروپاگەندەکردن دژی کەمالیەکان و توانیبوویان پیاوە ئاینیەکانیش ئاگاداربکەن لەنیازی ئەو کەمالیانە بەڵام هیچی وا نەکرا و بەپێچەوانەوە تورکە کەمالیەکان توانیبوویان کوردەکان بەوە لەخشتە ببەن کە هەندێکیان جلی کوردیان لەبەردەکرد و لەناو عەشایرەکانی کوردا شیعریان بەکوردیش دەخوێندەوە و بەمە توانیبوویان دەستی زۆر کورد بڕن و لەکۆنگرەکانی ئەرزڕوم و سێواسدا بیانکەن بەئەندام و لایەنگری خۆیان.

لەڕاستیدا ئەم بۆچوونەی دوهەمی ڕۆبەرت ئولسون لەشۆڕشەکانی مەلاتیە و دەرسیم و کوجگیری و لەوەی شۆڕشی پیرانیشدا بەدیدەکرێت و ناوی ئەو هەموو ئەفسەرە کوردانەی لەباسی دادگاکردنی شۆڕشگێڕانی پیراندا هاتووە و گیراون و هەڵواسراون ئەو ڕاستیە دەردەخات کە ئەو ئەفسەرانە لەشۆڕشەکاندا هیچیان ڕۆڵێکی وایان نەبووە ئەگەرچی لەدامەزراندنی کۆمەڵی ئازادیدا کە نەخشەی شۆڕشی پیرانیان کێشابوو ژمارەیەکیان تیایدا بەشداربوون و ئەمانەش بەر لەدەستپێکردنی شۆڕش هەموو گیران و لەنابران.

هەرچۆنێك بووبێت هەردوولا چ كورد و چ ئەرمەنی هەریەكەیان لەقۆناغێكدا هەڵەیەكی گەورەیان كردووە بەرامبەر بەیەكتری و ئەو بۆچوونەی خالید بەگی جبرانیش بەتەواوەتی هاتەدی كە وتبووی لەدوای ئەرمەنیەكان نۆرەش دێتەسەر قەلاچۆكردنی كورد بەپێی ئەو سەرچاوانەی لەبزوتنەوەكانی كورد دواون لەنێوان ماوەی پاشكەزبوونەوەی تورك لەبەڵێنەكان و دەستپێكردنی شۆڕشی پیراندا دەتوانین ئەو بزوتنەوانە بكەین بەسێ بەشەوە:

یەكەم: راپەڕین و بزوتنەوەی مەلاتیە.

دوهەم: راپەڕین و بزوتنەوەی یەكەمی دەرسیم.

سێیەم: راپەڕین و شۆڕشی كوجگیری.

## باسی یەکەمی بەشی نۆهەم

### ڕاپەڕین و بزوتنەوەی مەلاتیە

دەربارەی ڕاپەڕین و بزوتنەوەی مەلاتیە، ڕۆبەرت ئولسون لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٨٤ باسی خالید بەگ جبرانی کردووە کە لەساڵی ١٩٢٠دا پەیوەندیکرد بەوانەوە کە ئامادەبوون بەشداریبکەن لەبەرپابوونی شۆڕشێك دژی تورکە کەمالیەکان و بۆ ئەو مەبەستە پەیوەندی بە(جمعیتی کورد تعالی) کرد و لەگەڵ شێخ عەبدولقادری شەمزینیشدا باسی هەمان شتی کردبوو کە لەئەنجامی ئەم جموجوڵەدا لەدواییدا کۆمەڵی ئازادی پێکهێنرا (لەباسی شۆڕشی پیراندا بەدوورودرێژ باسی کۆمەڵی ئازادی دەکەین).

لەکۆتایی ساڵی ١٩٢٠دا خالید بەگ جبران وەکو ڕۆبەرت ئولسون باسیکردووە، سەردانی هەندێ لەعەشیرەتەکانی کرد لەناوچەکانی (Varto–ڤارتۆ) و (Bulamik) و ملازگرد و (Hinis–هینیس) و (Solham–سولهام) و (چاپ کچور)ی کردووە و لەو گەشتەیدا لەگەڵ شێخ و مەلاکان و دانیشتوانی گوندەکان گفتوگۆی کردووە بەلام لەگەڵ دانیشتوانی ناوچەی عەلەوی نشینەکان لەتەقەلاکەیدا سەرکەوتوو نەبوو (لەبەرگی یەکەمدا لەباسی سوارەی حەمیدیەدا باسی ئەوانەی سوارەی حەمیدیە کرا کە سونی مەزهەب بوون لەگەڵ عەلەویەکاندا ناڕێك بوون کە وەکو وتمان خالید بەگ جبران یەکێك بووە لەسەرکردەکانی سوارەی حەمیدیە و لەئەنجامی ئەو جموجوڵەی خالید جبران، تورکەکان لێی کەوتنە گومانەوە و دوریانخستەوە بۆ ناوچەی (ئەرزڕوم) و لەوێ کارێکی تایبەتیان پێسپارد بۆئەوەی هیچ پەیوەندیەکی نەمێنێت بەو ناوچانەوە کە نیازبوو جموجوڵی تیادا بکرێت.

پرۆفیسۆر حەسرەتیان لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٤٤ وتویەتی: تورکەکان خالید بەگیان کرد بەسەرۆکی دادگای محاسەبەی فەیلەقی عەسکەری و لەئەرزڕوم هەروەکو هەندێ سەرچاوە باسیانکردووە لەدواییدا لەساڵی ١٩٢٢دا لیژنەیەکی پێکهێنا بەنهێنی لەئەرزڕوم بەهاوکاری (یوسف ضیاء بگ) کە ئەمەی دوایی لەبەرئەوەی بووبوو بەهاوبیری نەیارەکانی مستەفا کەمال بۆیە لە(ئەنجومەنی باڵای میللی) دەرکرابوو، بەو پێیە بەهەردووکیان توانیبوویان لە٨٠٪ی کوردی

ناوچەکە بکەن بەلایەنگری خۆیان بۆ بەرپاکردنی بزوتنەوەکانی دەرسیم و کوجگیری (کە لەدوای ئەمەی مەلاتیە باسی هەردووکیان دەکەین).

دەربارەی ئەو رۆژانە پرۆفیسۆر حەسرەتیان لەکتێبەکەیدا باسی راپۆرتی وەکیلێکی موخابەراتی ئینگلیزی کردووە کە ناردوویەتی بۆ وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا و لەو راپۆرتەیدا وتویەتی: لەگەڵ عەبدولقادر (مەبەست شێخ عەبدولقادری شەمزینیە) و چەند کەسێکی لایەنگری ئەو گفتوگۆم کرد و پێشنیازم کرد بچنە کوردستان (شێخ عەبدولقادر لەو رۆژانەدا لەئەستەمبوڵ بووە) بۆئەوەی دەسەڵاتی خۆیان لەوێ بەکاربێنن و قسەکانم کاریتێکردن و تێمگەیاندن ئێمە دەمانەوێ فێڵ لەتورکەکان بکەین.

راپۆرتەکە لەسەرپێئەڕوا و بەوەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا دەڵێت: بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا نابێ بڕوایەکی تەواومان بەکورد هەبێت و ئێمە لەم تەقەلادانەمان تەنها دەمانەوێ تورکەکان لاوازبکەین بۆیە هاندانی کورد دژی تورکەکان بۆ ئەو مەبەستە شتێکی بێسوود نییە (کەواتە ئەو کابرایە ویستبووی ئینگلیزەکان فێڵ لەکورد بکەن نەك لەتورك).

پرۆفیسۆر حەسرەتیان لەکتێبەکەیدا باسی راپۆرتێکی تری هەمان وەکیل و کارگوزاری ئینگلیزی کردووە کە لەم راپۆرتەیدا وتویەتی: هێشتا کوردەکان دژی مستەفا کەمال رانەپەریون، بەڵام (مێجەر نویل) هیوادارە ئەو راپەرینە دەستپێبکرێت. حەسرەتیان ئاماژەی بۆ تەلگرافی ژمارە (٥٢٩)ی رۆژی ١٩١٩/٩/٦ کردووە کە سەرکردەی فەیلەقی یازدەهەمی تورك ناردبووی بۆ (کازم قەرە بەکر)ی سەرکردەی فەیلەقی سێهەم دەربارەی ئەوەی (نویل) لەلایەن حکومەتی سوڵتانەوە لەئەستەمبوڵ دەسەڵاتی ئەوەی پێدراوە سەرژمێری دانیشتوانی تورك و کورد بکات لەناوچەکەدا و جەلادەت و کامەرانی کوڕانی بەدرخان چۆن بەپیریەوە لەلایەن (خەلیل رەحیم بەگ)ی موتەسەریفی مەلاتیەوە پێشوازیی لێکرا.

حەسرەتیان لەکتێبەکەیدا دەڵێت: لەهەمان کاتدا (عەلی غالب بەگ) گەیشتە (العزیز-خاربت) بەبیانووی ئەوەی بەشوێن ئەو چەتە و رێگرانەدا دەگەڕا پەلاماری پۆستەی حکومەتیان دابوو لەرێگادا، لەو رۆژانەشدا سەرۆکەکانی کورد لەگوندی (شێرۆ)ی نزیکی مەلاتیە کۆبونەوەیەکیان کرد و لەو کۆبونەوەیەدا بڕیاردرا (خەلیل رەحیم بەگ) بکرێت بەحاکمی گشتی کوردستان و بەناوی

لیژنــەی پاراســتنی مــافی کــوردەوە بناغــە ســەرەکیەکانی ئــەو بنەمایانــە دەستنیشانکرابوو کە پێویست بوو بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی سەربەخۆ و دەربارەی ئەوە نامە نێردرا بۆ چەند سەرۆکێکی کورد و لەو نامەیەدا وترابوو: ((کـورد ئیمـڕۆ لـەبارودۆخێکی زۆر سـەخت و دژواردا دەژی و بـەهۆی جـەور و ستەمی تورکەوە لـەژێر بارێکی گراندایـە و ئێجگار پەرێشانە، بۆیـە دەبیٚ سوود لـەکات و هەلوێست وەربگیرێت و دەستبکرێت بەڕاپـەڕین بۆ ڕزگارکردنی کـورد لەدیلێتی و بەندایەتی تورك و ئیتر لەمەودوا پێویستە لەسەرتان هەموو یاساکانی تـورك پشتگوێ بخـەن کـە بوونەتـە هـۆی بـارێکی گـران بەسـەر شـانی کـوردەوە لەکوردستاندا)).

ئەم کۆنگرەیـەی ئێمـە بـۆ مەبەسـتی چاککردنی بـاری ژیـانی کـوردە لـەڕووی ئابووری و کۆمەڵایەتیەوە و ڕۆحییـەوە و لەئێستەوە دەستیکردووە بەهـەنگاونان بـەرەو پێشـەوە بـۆ سـەرگرتنی ئـەو مەبەسـتانە و بـەزووترین کـات یاسـایەکیش دەردەچێت کە ناوەڕۆکەکـەی لەگـەڵ بـارودۆخی کوردسـتاندا بگونجێت، بـەڵام تـا ئەوانە جێبەجێ دەکرێن پێویستە.لەئێستەوە ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بنرێت:

١-هەتا ماوەیەکی تر دادگاکانی ناوچەکانمان بۆیان هەیە هـەروەکو جاران کاروبـاری خۆیان بەن بەڕێوە.

٢-پۆلیس و جەندرمە لەژێر دەسەڵاتی خۆمدا دەبێت (دیارە مەبەست خەلیل ڕەحیم بـەگ بووە کە ئیعلان کرابوو بووە بەحاکمی گشتی کوردستان لەکۆبونەوەکەی گوندی شێرۆدا).

٣-ئەو چەك و جبەخانانەی حکومەت ناردویەتی بـۆ هێزەکـەی هـەمووی لـەژێر دەسـتی خۆمدا دەبێت.

٤-لێخۆشبوونێکی گشتی بلاّودەکرێتەوە.

٥-دەستبەجێ وێنەی (تەلعەت، ئەنوەر، جـەمال ئەمانـە هـەموویان ئەنـدامی ڕێکخـراوی تورکی فتاە بوون کە زۆر دژی کورد بوون لـەکاتی خۆیـدا) لادەبـرێن و هـیچ قوتابخانەیـەك نابیٚ بکرێتەوە لەناوچەکەدا ئەگەر بەکوردی دەرسی تیادا نەوترێتەوە.

حەسرەتیان لەباسەکەیدا دەڵێ: هەر لەسەرەتای سـاڵی ١٩١٩ بەدواوە مستەفا کەمال ئاگاداری ئەو بزوتنەوەیەی کورد بوو، سەرکردەی فیرقـەی (١٣) لەدیاربـەکر وریـای ئـەو کوردانـە بـوو لەئەستەمبوڵەوە هاتبوونـە مەلاتیـە (بەرلـەمـە باسـی ئـەوە کـرا چـۆن وەکیلێکـی موخابـەراتی بـەریتانیا بەشـێخ عەبـدولقادر و تـاقمێکی سـەر بەوی وتبوو بچنە کوردستان) وە پێویستە هـەموویان بگرێت، بەڵام سـەرکردەی

فیرقەی (١٣) داخوازیەکەی مستەفا کەمالی بەجێنەهێنا بۆیە مستەفا کەمال لەجیاتی ئەو سەرکردەی فەوجی یازدەهەم کە (ئەلیاس بەگ) بوو لەحامیەی (العزین) ناردی بەخۆی و (٥٢) ئێستر سوارەوە بەدوو ڕەشاشەوە لە ١٩١٩/٩/٩دا ڕوویانکردە دیاربەکر و لەهەمان ڕۆژدا مستەفا کەمال دوو کەتیبەی سوارەشی نارد بۆ ناوچەکە و کەتیبەیەکی تریش لە(سوێرک)ەوە بەرەو ئەوێ نێردرا لەگەڵ تاقمێك ئەفسەر بەئوتومبێل لە(سێواس)ەوە ڕوویانکردە (مەلاتیە).

ساتێك کوردەکان بەمەیانزانی ڕوویانکردە (کیاخت) و خۆیان ئامادەکرد بۆ ڕاپەڕین و پەیوەندیان بە(بیل)ەوە کرد لەحەڵەب کە لەوێ (ئەنتلجس سێرڤس)ی بەریتانیا بوو، وەڵامەکەی (بیل) بۆیان تەنها بریتی بوو لەوەی کورد نابێ هیچ جۆرە شۆڕشێك بکات و لەگەرمەی ئەو ڕووداوانەدا حکومەتی ئەنقەرە (تۆفیق بەگ)ی سەرکردەی جەندرمەی کرد بەموتەسەڕیفی مەلاتیە (کە دیارە لەجیاتی خەلیل ڕەحیم بەگ دانراوە)، وە تورکێکی قەومیش (ناوەکەی نەوتووە) کرا بەوالی (العزین)، هەرچی هێزی حکومەت لەمەلاتیە و دەوروبەریدا بوو هەمووی خرایە ژێر دەسەڵاتی والی تازەوە و والی بڵاویکردەوە هەرکەس ببێت بەلایەنگری یاخیبووەکان بەتوندی سزا دەدرێت.

ئەلیاس بەگ لەشەوی ١٢/١١ی مانگی ئەیلولی ١٩١٩دا تەلگرافێکی بۆ ئەنقەرە دەربارەی هەڵوێست و حکومەتی ئاگادارکرد کەوا (خەلیل ڕەحیم بەگ) و هاوکارەکانی لەشوێنێکدا کە پێنج سەعات دوورە لەمەلاتیەوە گردبوونەتەوە و عەشیرەتەکانی دراوسێی ئەو ناوچەیە هەتا (سویرک) لەگەڵ ئەوانەی دەرسیمیشدا خۆیان ئامادەکردووە بۆ بەشداربوون لەیاخیبوونەکەدا. مستەفا کەمال داوای لەڕەشید پاشای موتەسەڕیفی (سێواس) کرد ئەو سەرۆك عەشیرەتانەی بۆ بنێرێت کە خەریکی پڕوپاگەندەن دەربارەی دروستکردنی حکومەتێکی کوردی و مستەفا کەمال هەوڵێکی زۆریدا کوردەکانی دەرسیم نەبن بەلایەنگری یاخیبووەکان و ڕەشید پاشا تەنها توانی (عەلی شان) ڕازیبکات چاوی بەمستەفا کەمال بکەوێت و لەکۆبونەوەی سێواسدا داوا لە(عەلی شان) کرا زانیاریەکی تەواو بدات دەربارەی مەبەست و خواستی کوردەکان لەگەڵ چالاکی کۆمەڵەی (ڕاپەڕین و بوژانەوەی کوردستان-لەڕاستیدا هیچ سەرچاوەیەك باسی کۆمەڵەیەکی نەکردووە لەو ڕۆژانەدا بەو ناوەوە، تەنها باسی ناوی کۆمەڵەی ئازادی هەبووە کە لەدواییدا لەباسی شۆڕشی پیراندا باسی ئەو کۆمەڵە دەکەین).

هەروەکو حەسرەتیان باسیکردووە (عەلی شان) بۆ وەڵامی ئەو پرسیار و داخوازییانەی لێیکرابوو بەمستەفا کەمالی وتبوو: بەپێی مادەکانی بنەماکانی ولسنی سەرۆک کۆماری ئەمریکا ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵات دەخرێنە سەر ئەرمینیا و دیارە هیچ حسابێکیش بۆ کورد ناکرێت بۆیە کوردیش هەوڵئەدات ئیدارەیەکی حوکمی زاتی بۆ خۆی لەکوردستاندا پێکبێنێت لەو ویلایەتانەی زۆربەی دانیشتوانی کوردبن لەژێر سایەی سوڵتانی ئەستەمبوڵدا. مستەفا کەمال بەعەلی شان ئەڵێت بنەماکانی ولسن لای ئێمە ناخوا و کارناکات.

حەسرەتیان لەکۆتایی ئەو باسەدا وتویەتی: (بزوتنەوەکەی مەلاتیە هەرچیەک بووبێت بەڵام شتێکی بێ ئەنجام بوو چونکە عەشیرەتەکانی دراوسێ (مەبەست عەلەویەکان)ە ئامادە نەبوون هاوکاری بکەن و هەر لەسەرەتاوە ڕایانکرد بۆ (ئورفە) و لەوێشەوە چوون بۆ (حەڵەب) و مێجەر نویلیش دوورخرایەوە، بەوجۆرە سەرنەکەوتنی یەکەم تەقەلای کورد لەمەلاتیەدا بەسەرکەوتن دادەنرێت بۆ مستەفا کەمال و تاقمەکەی.

## باسی دوهەمی بەشی نۆهەم

### ڕاپەڕین و بزوتنەوەی یەکەمی دەرسیم

دوای ئەو بزوتنەوە سەرنەکەوتووەی مەلاتیە کە عەلەویەکانی دەرسیم تیایدا بەشدار نەبوون ئینجا نۆرە هاتە سەر بزوتنەوە و ڕاپەڕینێکی تر کە ئەمجارە عەلەویەکانی ناوچەی دەرسیم دەستیانپێکردبوو. دەربارەی ئەو ڕاپەڕینە دوو سەرچاوە بەدوورودرێژی باسیانکردووە، هەریەکەیان بەشێوەیەك و هەوڵئەدەین کورتەی هەردوو باسەکە بخەینە پێشچاو یەکەمیان ئەوەی پرۆفیسۆر حەسرەتیان کە لەدوو سەرچاوەدا (٤٥، ٤٦) باسیکردووە و دوهەمیان ئەو باسەی (ڕۆبەرت ئولسون) سەرچاوە/٨٤.

پرۆفیسۆر حەسرەتیان لەسەرەتادا لەسەرچاوە/٤٩دا ئامـاژەی بۆ باسێکی (فرونزە) کردووە کە وتویەتی: ((قزلباشەکان (مەبەست عەلەویەکان)ە سەربازیان نەدەدا بەحکومەت لەبەرئەوە حکومەت هەمیشە بەچاوێکی نەیارانەوە سەیریان دەکردن و ئەوانیش هەڵوێستیان بەرامبەر حکومەت هەر بەو شێوەیە بووە)).

حەسرەتیان لەلاپەڕە (٣٧)ی ئەو سەرچاوەیەدا وتویەتی: ((لەدوای مەلاتیە بڕیاردرا ناوچەی دەرسیم بکرێت بەمەڵبەندی بزوتنەوەیەکی تری کورد و لەسەرەتای ساڵی ١٩٢٠دا لە(تەکیەی حسێن عەبدوڵلاّ) لەناوچەی ئێڵجەی سەر بەقەزای (کنغال) سەرۆکەکانی کوردی ناوچەکە کۆبوونەوە و سوێندیان خوارد و بڕیاریانـدا خەباتێکی چەکدارانە بکەن بۆ دروستبوونی حکومەتێکی کوردی سەربەخۆ لەویلایەتەکانی (دیاربەکر، وان، سێواس، العزیز، دەرسیم، کوجگیری) و لەو کۆبونەوەیەدا سەرۆکی عەشیرەتەکانی (جانیکان) و (کورشیان) و چەند عەشیرەتێکی تر ئامادەبوون و هەموو لەو کۆبونەوەیەدا خۆیان ئامادەکرد و بڕیاریاندا چەك ئامادەبکەن بۆ دەستپێکردنی شۆڕش و دەنگوباس بلاّوبووەوە کە ژمارەی چەکداران لەناو هێزەکانی کورددا لەناوچەکانی ڕۆژئاوای دەرسیمدا گەیشتبووە (٤٥) هەزار چەکدار و لە(العزیز) لقێکی ئەو کۆمەڵەیان پێکەوەنا (لەوەرگێڕانە عەرەبیەکەی حەسرەتیاندا بە–جمعیة نهضة کردستان–ناوبراوە).

پاشئەوە لەتشرینی دوهەمی ساڵی (١٩٢٠)دا لە(حزرت–کە ناوەندی دەرسیم بووە) کۆبونەوەیەك کرا لەلایەن کوردەکانی دەرسیم و چمشکزك (جمکان) و

بڕیاردرا خەڵکێکی زۆر ئامادەبکرێت بۆ داواکردنی مافی نەتەوەی کورد و بڕیارەکانی ئەو کۆبونەوەیە لەگەڵ یاداشتێکدا درا بەحکومەتی ئەنقەرە و داوای لێکرا بەدەستوبرد وەڵامی داخوازیەکانی دانیشتوانی دەرسیم بدرێتەوە لەگەڵ بەردانی هەموو گیراوەکانی ناو زیندانەکانی (العزیز، مەلاتیە، سیۆاس، ئەرزنجان) لەگەڵ کێشانەوەی هێزەکانی حکومەت بەگورجترین کات لەناوچەکانی (کوجگیری-دەرسیم).

بۆ وەڵامی ئەمە حکومەتی ئەنقەرە وەفدێکی نارد بۆ دەرسیم و دانی بەعەدالەتی داخوازیەکانی کوردا نا و لەهەمان کاتدا ئامۆژگاریشی کردن شۆڕش نەکەن، بەڵام سەرۆکەکانی کورد ئەو وەفدەیان دەرکرد و لەڕۆژی ٢٥/١١/١٩٢٠دا بەئیمزای سەرۆک عەشیرەتەکانی ڕۆژئاوای دەرسیم تەلگرافێکیان نارد بۆ ئەنجومەنی باڵای تورك پێیان ڕاگەیاندبوو پەیمانی سیڤەر بڕیاری دامەزراندنی حکومەتێکی سەربەخۆی داوە بەکورد کە ویلایەتەکانی (دیاربەکر، العزیز، وان، بدلیس) دەگرێتەوە لەبەرئەوە پێویستە ئەو دەوڵەتە پێکبێت و بەپێچەوانەوە کورد ناچاردەبێ دەست بداتە چەك بۆ دەستگیربوونی مافەکانی.

حەسرەتیان لەباسەکەیدا دەڵێت: دانیشتوانی دەرسیم وەڵامی ئەو تەلگرافەیان لەئەنقەرەوە بۆ نەهاتەوە بەڵام سوڵتان لەئەستەمبوڵ کە دەیویست کوردەکان بخەڵەتێنێت لەڕێگەی موتەسەریفی (العزین)ەوە ڕایگەیاند ئەو داخوازیانەی کورد پەسەند ئەکات (لەڕاستیدا حکومەتەکەی سوڵتان لەئەستەمبوڵ هیچ توانا و دەسەڵاتێکی نەمابوو لەو ڕۆژانەدا بۆیە ئەو ڕاگەیاندنانەی خۆی بەو شێوەیە ناردبوو).

حەسرەتیان لەلاپەڕە (٣٨)ی کتێبەکەیدا باسی تورکەکانی کردووە چۆن هەوڵیاندابوو بەبەرتیل و دەم چەورکردن هەندێ لەسەرۆك عەشیرەتەکان بەلای خۆیاندا بەکێشبکەن و والی (العزین) بەناوی مستەفا کەمالەوە بەیانێکی بڵاوکردەوە (کەوا مجوئاغا) و (دیاب ئاغا) کراون بەمەندوبی دەرسیم لەئەنجومەنی میللی تورکدا و بۆ ئەو مەبەستە گەلێك نوێنەری تری کوردیش بەڕێگەوەن لەکوردستانەوە بچنە ئەنقەرە و لەوێ بڕیارێك دەردەچێت سوود و چاکەی کوردی تیادا دەبێت و داخوازیەکانیان بەجێدەهێنرێت.

حەسرەتیان دەڵێت: بەو جۆرە (مجوئاغا) و (دیاب ئاغا) بەقسەی تورکەکان خەڵەتێنران و چوونە ئەنقەرە و بەناوی نوێنەرایەتی دەرسیمەوە بەدەستی خۆیان

تووشـی داووتەڵـەی تورکـەکان کـرد و لەترسـی جـەور و سـتەمی تـورک بـوون بەکوتـەکی دەسـتی کاربەدەسـتانی ئەنقـەرە کـە نەخشـەی توانـەوەی کوردیـان کێشابوو.

تورکەکان بێجگە لە(مجوئاغا و دیاب ئاغا) چەند کەسێکی تری کوردیان لەناو ئەنجومەنەکەیان دانا وەکو (مستەفا زەکی بەگ، رامز بەگ، عەبدولخالق تۆفیق بـەگ، حسێن خـەیری بـەگ) بـەڵام دەرسـیم سـەری بـۆ تـورك دانەنەوانـد چـونکە دەسەڵاتی (سەید ڕەزا) بوو کە مرۆڤێکی بەناوبانگی ناسراو بوو، هەر لەسەرەتاوە داوای لەتورکە کەمالیەکان کردبوو مافی کورد لەشێوەی فیدرالیدا بدرێت لەناو چوارچێوەی حکومـەتی تورکیـادا (لـەم ڕاپەڕینـەی یەکـەمی دەرسـیمدا تـەنها حەسرەتیان ئەم کورتە باسەی دەربارەی سەید ڕەزا خستۆتە بەرچاو و لەوەش ناچێت لەم ڕاپەڕینەدا ڕۆڵێکی سەرەکی هەبووبێت، بەڵام لەشۆڕشی دەرسیمدا ساڵی ١٩٣٧ کـە لەبـەرگی سـێهەمدا لـەدوای شۆڕشـی ئـارارات باسـی دەکـەین، لەوەیانـدا باسـی خـەبات و شـەهیدبوونی سـەید ڕەزا دەکرێـت لـەپێناوی مـافی کورددا).

حەسرەتیان لەتەواوکردنی باسەکەیدا وتویەتی: ((تورکەکان خۆیان پێنەگیرا و پەردەی درۆودەلەسەیان لەڕووی خۆیان هەڵماڵی و داوایان لەچەکدارەکانی کورد کـرد خۆیـان و چـەکەکانیان بـدەن بەدەسـتەوە و بـۆ چاوترسـاندنی کـورد (عقیـد خـالص)ی سـەرکردەی هێـزی تـورك لـە (١٩٢١/٣/١٤)دا چـەند ناسـراوێکی کوردی لەدانیشتوانی (عمرانیە) گرت و ناردنی بۆ (زارا) و کە چەکدارە کوردەکانی شاری (یـازی حـاجی) بەمـەیانزانی پـەلاماری تورکەکانیانـدا و هـەموویان لـەناوبردن و گیراوەکانیان ئازادکرد.

ئەم ڕووداوە سەرەتای هەڵگیرساندنی شەڕی کورد و تورك بوو لەو ناوچەیەدا و هێزەکـانی کـورد دوایـان لـە(عقیـد خـالص) کـرد فەوجەکـەی بەبێ‌مـەرج بـدات بەدەستەوە، بەڵام ئەو داوایکرد بەبێ‌شەڕ ڕێگە بەفەوجەکەی بدرێت ئەو ناوچەیە بەجێبێڵێت و بگەڕێتەوە بۆ سێواس، لەدوای ئەمە چەکدارەکانی مەحمودبەگ و عیزەت بەگ ئابلۆقەی (عمرانیە)یاندا و بەهاوکاری دانیشتوانی ناوچەکە فەوجەکە ناچـارکرا خـۆی بـدات بەدەستەوە و لـەدوای شـەڕێك کـە تـەنها ڕۆژێکـی خایانـد دادگایەکی سوپایی لەلایەن کوردەکانەوە دامەزرا بۆ دادگاکردنی تاوانبارەکان کە یـەکێك لەوانـە (عقیـد خـالص) بـوو لـەدوای دادگـاکردنی لـەناو شـاری (عمرانیـە)دا

درایە بەر گوللە و ئالأی کوردستان لەناو شارەکەدا هەڵکرا و لەو شەڕەدا کورد چەك و جبەخانەیەکی زۆر و (١٠٠٠) ئەسپ و چەند ئێستریکی دەستگیربوو، ئەوانەی کورد و چەرکەس بوون لەو فەوجەدا ڕێگەیان پێدرا بچنە ناو هێزەکەی شۆڕشگێڕانەوە و ئەوانیتریش بەردران.

ئەم ڕووداوە لەهەموو ناوچە کوردنشینەکاندا دەنگیدایەوە و لەئەنجامدا کوردی کوجگیری بوون بەلایەنگری شۆڕشگێڕەکان و بەهاوکاریکردنی هەندێ لەچەکدارەکانی دەرسیم و عەشیرەتی (ئوفاجیك) توانرا لە (١٩٢١/٣/٨)دا ناوچەکە لەتورك ڕزگاربکرێت و بەسەر هێزەکەی (کیماخ)دا سەرکەوتن و قایمقام و سەرکردەی جەندرمەکان گیران و ئەو پردەی بەسەر فوراتدا تێکدرابوو چاکیانکردەوە و بەسەریدا پەڕینەوە بۆ قەزای (کورتشای) و نوێنەری تورکی ئەوێ گیرا و نێردرا بۆ دادگای عمرانیە و کوردەکان توانیان دەستبەسەر قەزای (کنغال، کوجنسار، دیفریغی، زارا، رفاحیە، کورتشای، کیماخ)دا بگرن. دوای ئەو سەرکەوتنانە سەرۆکەکانی کورد ڕۆژی ١٩٢١/٣/١١ تەلگرافێکیان نارد بۆ ئەنجومەنی میللی تورك لەئەنقەرە و داوایانکرد ویلایەتێکی یەکگرتووی سەربەخۆ لەقەزاکانی (کوجگیری، دیفریغی، رفاحیە، کوردتشای، کیماخ) پێکبهێنرێت و کور یلد کرێت بەوالی.

حەسرەتیان لە/ سەپەڕ (٤٠)ی کتێبەکەیدا دەڵێ: تورکەکان بۆ تێکدانی کورد لەناوخۆیان وەفدێکیان نارد بۆ ویلایەتەکانی ڕۆژهەلأت بەسەرۆکایەتی (شفیق) کە خەڵکی (بەدلیس) بوو، ساتێك ئەو وەفدە کە هەندێ لەئاغاکانی کوردیشیان تیادابوو گەیشتە (بوغازفیران) کە دانیشتووەکانی کورد بوون لەڕۆژی ١٩٢١/٣/١٥دا، ئەو شەفیقە خۆی وەکو کوردێك پیشاندرابوو، خۆشی بەدۆستی کورد دەزانی و ڕایگەیاندبوو حکومەت دەسەلأتی پێدابوو گفتوگۆ لەگەڵ سەرکردەکانی کورددا بکات و داوای کردبوو لەکاتی گفتوگۆکردندا شەڕ بوەستێنرێ، ئا لەوکاتەدا (حیدر بەگ) چووە پاڵ شەفیق کە ئەمە بوو بەهۆی لێکپچڕاندنی کورد لەناو خۆیدا و لەژێریشەوە (نورالدین پاشا) سەرکردەی هێزەکانی ناوەڕاست خۆی ئامادەکردبوو بۆ لێدانی هێزەکانی کورد و لەولاشەوە فەوجی سوارەی ژمارە (٥٣) لە(ئیوزغات)ەوە ڕوویکردە (سیڤاس) و بەرلەمەش کەتیبەکانی فیرقەی پێنجەم لە(ئەماسیە)وە گەیشتبوونە (سیڤاس) لەگەڵ دوو کەتیبەی فەوجی دوهەمی فیرقەی پێنج و هەرچی جەندرمەکانی ناوچەکانی

(سێواس، بایبورت، غیرسونی، شایین قرەحصار، چمشکزك، ئازیگری، میزریفون، توکات، ئەرزنجان) بوو حکومەت هەمووی ئامادەکردبوو، لەڕۆژی ١٩٢١/٣/١٥دا ئەو هێزانەی تورك ئابڵوقەی ویلایەتەکانی (سێواس، العزیز، ئەرزنجان)یاندا و بۆ تاقیکردنەوەی نیاز و مەبەستی کوردەکان، حکومەت تەلگرافێکی نارد بۆ سەرۆکەکانی دەرسیم و داوای لێکردن هەڵوێستی خۆیانیان بۆ ڕوونبکەنەوە و ئاگاداریان بکەن هێشتا هەر سوورن لەسەر قسەکانیان و سەرۆکە کوردەکانیش وەڵامی تەلگرافەکەیان بەم جۆرە دابووەوە: ((ئێمە بەتەواوەتی لێمان ڕوونە حکومەت نیازیوایە کورد لەناوببات و تۆوی نەمێنێت هەروەکو چۆن ئەرمەنیەکانیان لەناوبرد، لەبەرئەوە درێژە بەخەباتی خۆمان ئەدەین بۆئەوەی مافی خۆمان دەستگیربێت)).

حکومەت بەتەواوەتی کەوتەخۆی و هەرچی هێزی هەبوو ناردی بۆ دەرسیم و بەپەلە فیرقەی چواردەهەمی سوارە و لیوای ژمارە سیازدەی نارد و لە(العزیز) و (ئەرزنجان)یشەوە هێزی نارد بۆئەوەی ڕێگە لەچەکدارەکانی کورد بگرن بەرەو ڕۆژهەلأت بڕۆن و ئەو هێزە زۆرەی حکومەت ڕێگەی (سێواس، کنغال، مەلاتیە، العزیز) و (سێواس زارا)ی گرت و پردەکانی سەر ڕووباری فوراتی خستە ژێر دەستی خۆیەوە و ئەو ڕێبازانەی دەرسیمی دەبەست بە(العزیز، ئارابکیر، مەلاتیە، ئەرغنین، کیماخ)ەوە هەمووی گرت و لەگەڵ ئەو هەموو سەرماوسۆڵەی ئەو ڕۆژانەدا شەڕێکی قورس ڕوویدا و ئەو کوردانەش بەبەڵێن و پەیمانە درۆکانی تورك خەڵەتابوون چوونەپاڵ شۆڕشگێڕان و یەکێکی وەکو (حیدر بەگ)یش کەمال چووبووە لای شەفیق (وەکو بەرلەمە باسیکرا) ئەویش چووە لای شۆڕشگێڕەکان.

شەڕ لەهێڵی (سێواس، کوج حصار، زارا، کنغال) زۆر گەرم بوو، گەورە و بچوکی کورد لەو شەڕەدا بەشدارییانکرد و هێرشەکانی حکومەت یەك لەدوای یەك شکێنران، بەڵام حکومەت زۆر پڕچەك بوو، ژمارەیەکیش لەسەرکردەکانی کورد لەم شەڕەدا شەهیدکران، بۆیە زۆری پێنەچوو باری کورد قورس و ئاڵۆز بوو، ناچاربوون هەموو ژن و منداڵەکانیان بگوێزنەوە بۆ دەرسیم.

حەسرەتیان لەلاپەرە (٤٥)دا لەباسی (حیدر بەگ)دا وتویەتی: حەیدەر بەگ بەخۆی و دوو هەزار چەکدارەوە ڕوویکردە ئەرزنجان و (بیولیوبیور) بۆئەوەی لەگەڵ هێزەکەی لەگەڵ هێزی دەرسیمیەکان یەکبگرێتەوە و لەڕێگایدا کەمال بەدەربەندە شاخاویەکانی (بیولیور-ماماخاتون) تێدەپەڕی، (کیورپاشا)ی

سەرۆکی عەشیرەتی (قریشان) لەجیاتی ئەوەی یارمەتی شۆڕشگێڕانی کورد بدات بەخۆی و چەند هەزار چەکدارێکەوە ڕووبەڕووی هێزەکەی (حیدر بەگ) بووەوە و هەڕەشەی لە(حیدر بەگ) کرد ئەگەر بەناوچەی دەسەڵاتی ئەودا تێپەڕبکات دەچێت بەگژیا، حەیدەر بەگ بەرامبەر بەوە ناچاربوو لەشاخەکانی (کوجگیری)دا شەڕێکی خوێناوی دژی هێزەکانی حکومەت بکات لەو شوێنانەدا کەمال دەستدرێژیان کردبووەسەر دانیشتوان و هەموو شوێنێکیان کاولکردبوو. لەدوای ئەو هەڵوێستە ناجوامێرانەیەی (کیور پاشا) نۆرە هاتە سەر (عوسمان توپاڵ ئاغا-کە لەباسی پەیمانی لۆزاندا باسکرا یەکێك بووە لەپیاوکوژەکانی مستەفا کەمال) کە بەوپەڕی دڕندەیەتیەوە دژی شۆڕشگێڕان شەڕیکرد.

حەسرەتیان لێرەدا ئاماژەی بۆ لاپەڕە (٢٧٨)ی کتێبەکەی (م. ف. فرونزە) کردووە بەناوی (گەشتێك بۆ ئەنقەرە) کە لەمەدا فرونزە بەدووروودرێژی باسی تاوان و دڕندەیەتی هێزەکەی تورکی کردووە بەهۆی (عوسمان توپاڵ)ەوە لەناوچەی (اللاض-اللاز) کە تاقمێکی کرێگرتەی دژی شۆڕشگێڕانی کورد بەکارهێنابوو. حەسرەتیان لەلاپەڕە (٤٦)ی کتێبەکەیدا باسی (نورالدین پاشا)ی کردووە چۆن هەوڵیدابوو شۆڕشەکەی بۆ ئێجگاری لەناوببات و داوای لەکوردەکانی ناوچەی سێواس کردبوو لەوانەی سەر بەحکومەت بوون پەیوەندی بەحەیدەر بەگەوە بکەن و ڕازیبکەن بچێتە سێواس بۆ گفتوگۆکردن و ئەمجارەش دوبارە حەیدەر بەگ فریودرا و بەخۆی و هەزار چەکداریەوە چووە لای سەرکردەی سوپا لەسێواس و دەموودەست گیرا و خۆی و (٤٠) چەکداری گیران و ئەوانیتریشیان بڵاوەپێکردن بەسەر شوێنەکانی تردا.

حەسرەتیان لەهەمان لاپەڕە (٤٦)دا ئەڵێ: دوبارە ئەم خیانەتە تازەیەی حەیدەر بەگ کارێکی زۆر کوشندانەی کردەسەر بزوتنەوەکەی کورد و هەلێکی باشی ڕەخساند بۆ تورکەکان بەوپەڕی دڕندەیەتیەوە دەست لەکوردی ناوچەکە بوەشێنن و ئەنجامی ئەمە بەوە گەیشت ژمارەیەکی زۆری کورد ساردبوونەوە و لەبزوتنەوەکەی خۆیان دوورخستەوە و پاشماوەی چەکدارەکانی شۆڕش کە لەلایەن (عەلی شیر، نوری، صابر، محمد علی، جنگین، حموتار بازالی، کامل عزیز، دیلو، باشو عباس) و چەند شۆڕشگێڕێکی تر دەبران بەڕێوە وردە وردە ڕوویکردە کزی و ئەوی مابوو بەناچاری ڕوویکردە شاخەکانی دەرسیم و لەوێش تووشی هەزار دەردەسەری بوون. (ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێت لەم باسەی حەسرەتیاندا

ئەوەیــە هــەروەکو لەدواییــدا لەشۆڕشــی کوجگیریشــدا بۆمــان ڕووندەبێتــەوە، شۆڕشەکەی دەرسیم و کوجگیری بەیەکەوە گرێداوە لەکاتێکدا سەرچاوەکانی تر کە باسی شۆڕشی کوجگیریان کردووە بەجیا باسی هەردووکیان کردووە).

پرۆفیسۆر حەسرەتیان لەتەواوکردنی باسەکەیدا دەڵێ: لەدوای تەواوبوونی شەڕ، سەرکردەی هێزەکانی تورك بەیانێکی دەرکرد دەربارەی ئەو زیانانەی لەکورد کەوتبوو کە بریتی بووە لە(۱۱۳) کوژراو و (۱۱۳) بریندار و (۱۵۹) دیل کە لەناو دیلەکاندا سەرکردەکانی کوجگیری وەکو (عظمت، بحری بگ، ثابت بگ، خیلیك علی، حمو، عزیز، تاکی، حیدر بگ، پهلوان، حسین، عاشور) و حکومەت دووهەزار تفەنگ و جبەخانەی لەکوردەکان دەستکەوتبوو.

هەروەکو حەسرەتیان لەلاپەڕە (٤٧)ی سەرچاوە/٤٩دا باسیکردووە، لەدوای دامرکانەوەی شۆڕش نزیکەی (٤٠٠) کورد دران بەدادگای سوپایی لەسێواس و حەیدەر بەگ و سەعید بەگ و پازدە کەسی تریان لەسێدارەدا و بڕیاری هەڵواسینی (علی شیر، م. نوری، مەحمود مستەفا پاشا ئوغلو، حمو تار بازالی، دیلو، صبری) و (٩٥) شۆڕشگێڕی تر درا کە ئەمانە بەغیابی حوکمدران و ژمارەیەکی تریش بەزینداکردن لەپێنج ساڵەوە بۆ زیندانی هەمیشەیی حوکمدران. (حەسرەتیان لەباسەکەی تریدا کە لەسەرچاوە/٤٥دا باسیکردووە وتویەتی دادگا (١١٠) کەسیشی بەردا).

حەسرەتیان لەلاپەڕە (٤٨)ی سەرچاوەکەدا ئەڵێ: ((لەکاتی ئەم شەڕەدا و کە شەڕ بڕایەوە تورکەکان لەبەرئەوەی ناچاربوون هێزەکانیان ئاڕاستەی یۆنانیەکان بکەن کە پەلاماری تورکیایان دابوو، لەسەر پێشنیازی مستەفا کەمال ئەنجومەنی میللی تورك بەبڕیارێك ئەو بڕیارانەی لەدادگاکەی (سێواس)ەوە دەرچووبوو هەڵیوەشاندەوە بەڵام ئەم هەڵوەشاندنەوەیە ئەوانەی نەگرتەوە کە چەکیان دانەنابوو.

حەسرەتیان لەکۆتایی ئەم باسەدا لەهەردوو کتێبەکەیدا سەرچاوە (٤٥، ٤٩) وتویەتی: ((هەرچەند تورکەکان توانیبوویان ئەم ڕاپەڕینە خامۆش بکەن، بەڵام ئاڵای کوردستان لە(ئاغدا) هەر دەشەکایەوە کە حکومەت لەو ڕۆژەدا هێشتا دەستی نەگەیشتبووە ئەو ناوچەیە کە لەژێر دەسەڵاتی (سەید ڕەزا)دا بوو، بەڵام ئەمەش هەتا ماوەیەکی کاتی بڕیکرد)).

لەدوای ئەو باسەی پرۆفیسۆر حەسرەتیان دەچینە سەر باسە دووروودرێژەکەی (ڕۆبەرت ئولسون)، سەرچاوە/٨٤ و هەوڵئەدەین کورتەیەکی ئەو باسەی پێشکەش بکەین کە وتویەتی: ((لەدوای پەیمانی (مودراس) نوری دەرسیمی و مستەفا پاشای کوجگیری چوونە ئەستەمبوڵ و لەوێ بۆیان دەرکەوت کە بەشتێکی ڕاستی نازانن ئەگەر لەگەڵ بۆچوونەکەی شێخ عەبدولقادری شەمزینیدا هاوبیربن کە داوای ئۆتۆنۆمی دەکرد بۆ کورد، لەبەرئەوە لەئۆکتۆبەری ١٩٢٠دا نوری دەرسیمی چوو بۆ (عمرانیە) کە گەورەترین شاری کوجگیریەکان بوو، لەوێ دەستکرا بەدامەزراندنی لقی کۆمەڵی (تعالی کورد) کە (ڕۆبەرت ئولسون) بە(Society for the rise of Kurdistan) ناویبردووە.

مستەفا کەمال کە بەم چالاکیانەی کوردی زانی، لەسیبتەمبەری ١٩١٩دا لەگەڵ (علی شان)ی کوڕی مستەفا پاشای کوجگیریدا کەوتە گفتوگۆکردن (لەباسەکەی حەسرەتیاندا وتویەتی بەهۆی ڕەشید پاشای موتەسەڕیفی سێواسەوە مستەفا کەمال چاوی بەعەلی شان کەوتبوو)، لەو گفتوگۆکردنەدا عەلی شان بەمستەفا کەمال دەڵێ: ئەوەی ویلسن بەکەڵکی کورد نایەت بۆیە باشترین شت ئەوەیە کورد لەگەڵ تورکە قەومیەکاندا هاوکاری بکات و شێخ عەبدولقادر ئالەتی دەستی (فەرید پاشایە-مەبەست داماد فەرید پاشایە کە سەدری ئەعزەم بووە لەپاشماوەکەی خەلافەتی عوسمانی لەئەستەمبوڵدا) کە فەرید پاشاش ئالەتی ئینگلیزەکانە و کوڕانی بەدرخان پاشا و هەندێ لەبنەماڵەی جەمیل پاشا (مەبەستی جەمیل پاشای دیاربەکری باوکی ئەکرەمی جەمیل پاشا و قەدری جەمیل پاشا-زنار سلۆپی‌یە) ئەمانە نەخشەی ئەوەیان کێشاوە بەهاوکاریکردن لەگەڵ والی (العزیز-بۆتان) لەسێواس هەموویان لەئێمە بدەن، مستەفا کەمال بەعەلی شان ئەڵێت: لەکۆنگرەی ئەرزڕومدا ڕۆژی ١٩١٩/٨/٧ هەموو کوردەکان بەڵێنیانداوە هاوکاریمان لەگەڵدا بکەن و فەرید پاشا ئەو توانا و دەسەڵاتەی نیە بنەماکانی ویلسن بەکاربێنێت بۆ ئێوە.

ڕۆبەرت ئولسون دەڵێت: لەڕاستیدا مستەفا کەمال لەو ڕۆژانەدا هەوڵێکی زۆری دابوو بەپایە و بەبەرتیل ژمارەیەك لەکورد بکات بەهاوکاری خۆی و بەرامبەر بەو تەقەلادانەی مستەفا کەمال لاوە کوردەکان لەسەرەتای ساڵی ١٩٢٠دا کۆبونەوەیەکیان کرد بۆئەوەی هاوکاری لەگەڵ کوردەکانی دیاربەکر و بەدلیس و وان و ناوچەکانی تردا بکرێت و ڕۆبەرت ئولسون ئاماژەی بۆ کتێبەکەی نوری

دەرسیمی کردووە کە وتویەتی: ((کوردەکان لەساڵی ١٩٢٠دا توانای ئەوەیان هەبووە (٤٥) هەزار چەکدار لەڕۆژهەڵاتی دەرسیم و هەمان ژمارەش لەخۆرئاوایدا ئامادەبکرێت کە لەو ڕۆژانەدا ڕۆژهەڵات و باکووری ناوچەی ویلایەتی سیڤاسیش هەر لەژێر دەسەڵاتی کورددا بووە)).

لەمانگی تەموز و ئابی ١٩٢٠دا کوردەکان هەروەکو ڕۆبەرت ئولسون باسیکردووە پەلاماری عەماری چەکەکانی تورکیاندا و لەپۆلیسخانەدا هەندێ تورك دەردەکران. تورکە کەمالیەکان بۆ چارەسەرکردنی ئەو هەڵوێستە تازەیە چەند کوردێکیان لەخۆیان نزیك کردەوە بۆئەوەی کاروباری ناوچەکەیان پێبەن بەڕێوە، (عەلی شان)یانکرد بەقایمقامی (رفاهیە-رفاحیە) و حەیدەری برای کرا بەسەرۆکی شارەوانی شاری (عمرانیە).

عەلی شان لەگەڵ چەند سەرکردەیەکی تری کورد چوونە (Hazart-هازارت) لەتونجلی بۆ زیارەتی ئەو عەشیرەتانەی زۆر سەرگەرمی ئەوە نەبوون کورد داوای سەربەخۆیی بکات و لە(چمشکزك) کۆبونەوەیەك کرا و ئەوەی ئامادەبوو لەو کۆبونەوەیەدا لەئەنجامدا بڕیاردرا هەموو بین بەلایەنگری داواکردنی سەربەخۆیی و لە ١٩٢٠/١١/١٥دا سەرکردەکانی کورد لەکۆبونەوەیەکیاندا چەند داخوازیەکیان پێشنیازکرد کە بیدەن بەحکومەتی کەمالیەکان لەئەنقەرە و داوایان لەحکومەت کرد پێویستە هەتا ٢٤ی ئەو مانگە وەڵامیان بدرێتەوە، کە داخوازیەکان بەم جۆرەی خوارەوە بووە:

١-ئایا حکومەتی ئەنقەرە بڕیارێك دەردەکات بۆ دانانان بەدانی ئۆتۆنۆمی بۆ کورد وەکو ئەوەی سوڵتان لەئەستەمبوڵ ئامادەیی خۆی پیشاندابوو بۆ قبوڵکردنی؟

٢-دەبێ حکومەت دان بەوەدا بنێت کاروباری ئۆتۆنۆمی لەلایەن کورد خۆیەوە دەبرێت بەڕێوە.

٣-پێویستە گیراوەکانی ناو زیندانەکانی (العزیز، مەلاتیە، سیڤاس، ئەرزنجان) بەربدرێن.

٤-پێویستە فەرمانبەرانی تورك لەو شوێنانەی زۆربەی دانیشتوانیان کورد بن لابرێن.

٥-سوپای حکومەت کە نێردراوە بۆ (کوجگیری) بکێشرێتەوە.

حکومەت بەرامبەر بەو داخوازیانە لیژنەیەکی لە(العزین)ەوە نارد بۆ دەرسیم بۆ گفتوگۆکردن بەڵام ڕێگەنەدرا بەو لیژنەیە بچێتە دەرسیم. لە٢٥ی نۆڤەمبەردا

دوباره کوردەکان تەلگرافێکی تریان نارد بۆ حکومەتی ئەنقەرە و داوایانکرد ئەگەر دان نەنرێت بەسەربەخۆیی کورددا لەویلایەتەکانی (دیاربەکر و العزیز و بەدلیس و وان) هەروەکو چۆن لەپەیمانی سیڤەردا بڕیاری لەسەردرابوو ئەوا سەرۆك عەشیرەتەکانی ڕۆژئاوای دەرسیم دەستدەکەن بەشۆڕش بۆ سەرگرتنی ئەو مەبەستە (ئەمەی لەم تەلگرافەدا هاتووە دەربارەی سەربەخۆیی کورد لەگەڵ ناوەڕۆکی تەلگرافی یەکەمیاندا یەکناگرێتەوە).

ڕۆبەرت ئولسون لەباسەکەیدا دەڵێت: بەرامبەر بەمە، تورکەکان هێزەکانی خۆیان لەسێواس کۆکردەوە و بەهێزیانکرد ئەگەرچی بەهۆی باران و بەفرەوە ڕێگاویان گیرابوو، توانای یارمەتیان نەبوو بینێرن بۆ هێزەکانی تریان لەکوجگیری. هەندێ لەشۆڕشگێڕەکانی کورد وایان پەسەندکرد شۆڕش لەبەهاری ١٩٢١دا دەستپێبکات و لەپێشدا لەدەرسیم ئیعلانی ئەو شۆڕشە بکرێت و بڕیاردرا ئالآی کورد لە(هۆزان-تونجلی) هەڵبکرێت و هێزی کورد بەرەو (ئەرزرۆم-العزیز) بڕوات و لەمەلاتیەشەوە بەرەو سێواس و لەوێوە داوا لەحکومەت بکرێت دان بەسەربەخۆیی کوردا بنێت. دەربارەی هەڵکردنی ئالآی کورد لە(هۆزان-تونجلی) کە ڕۆبەرت ئولسون باسیکردووە، حەسرەتیان وەکو بەرلەمە باسکرا وتویەتی بەیداغی کورد لەئاغدا هەڵکرا کە لەناوچەی دەسەڵاتی سەید ڕەزادا بوو.

ڕۆبەرت ئولسون لەباسەکەیدا دەڵێت: لەناو سوپاکانی تورکدا کوردەکان هەندێ لایەنگریان هەبوو، بۆیە لایانوابوو حکومەت ناچاردەبێت داخوازیەکانیان قبوڵبکات، بەڵام دواخستنی شۆڕش لەلایەن کوردەکانەوە بۆ بەهاری (١٩٢١) هەلێکی زۆر باش و لەباری بۆ تورك ڕەخساند چونکە توانیبوویان لەو ماوەیەدا هەموو ناوچەکە ئابلۆقە بدەن و چەند سەرۆك عەشیرەتێکیان گرت و بەتەواوەتی خۆیان ئامادەکرد بۆ لێدانی کورد.

حکومەت دەزگاکەی خۆی لە(العزیز)ەوە گواستەوە بۆ ناوچەی (Pertek-پیرتیك) و (Meco Agha-میکۆ ئاغا) کە تازە کرابوو بەئەندامی ئەنجومەنەکەی مستەفا کەمال، بڵاویکردەوە مستەفا کەمال ئامادەیە داخوازیەکانی کورد بەجێبێنێت و دیاربوو هەندێ کورد بەم قسانە خەڵەتێنرابوون و بۆ زۆرتر خەڵەتاندنی کورد مستەفا کەمال چەند کوردێکی تریشی کردبوو بەئەندامی ئەنجومەنەکەی وەك مستەفا دیاب ئاغا، ئەحمەد رامزی بینباشی، حسێن خەیری

مێجەر لەسوپادا. (لەباسەکەی حەسرەتیاندا میکۆ ئاغا بەمجوئاغا ناوی هاتووە و لەباسی مستەفا ئاغا دیابدا بەدیاب ئاغا ناویبردووە کە باوکی مستەفا ئاغا بووە، کە بەڕاستی جیاوازی ناوی کەس و شار و ناوچەکان لەبەینی سەرچاوەکاندا ئەرکێکی زۆر گران بوو بۆیە هەمووی بەمن ڕاست نەکراوەتەوە).

نوری دەرسیمی کە ڕۆبەرت ئولسون سودێکی زۆری لێوەرگرتووە لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٨٤ وتویەتی: ژمارەی ئەندامەکانی ئەنجومەنەکەی مستەفا کەمال (کە مەبەستی ئەنجومەنی بالآی میللیە و وەکو لەشوێنی خۆیدا باسمانکردووە لەدواییدا کە مستەفا کەمال ئیشی بەو ئەنجومەنە نەما هەڵیوەشاندەوە) کە ژمارەیان (٤٣٧) ئەندام بووە لەوانە (٧٢)یان کورد بوون و نوری دەرسیمی لەکتێبەکەیدا دەربارەی ئەو ئەندامە کوردانە وتویەتی ئەو ئەندامانە پێیانڕاگەیاندم کە زۆر هیوادارن کوردەکان بەشێوەیەکی ئاشتی بگەن بەمافی خۆیان.

ڕۆبەرت ئولسون دەربارەی قسەی ئەو نوێنەرانەی کورد وتویەتی: لەڕاستیدا ئەوانە بۆ پینەکردنی ئەو شەرمەزاریەی خۆیان تووشی خۆیان کردبوو ویستبوویان بیانوو بۆ نوری دەرسیمی بهێننەوە و پاکانە بۆ خۆیان بکەن. ڕۆبەرت ئولسون دەڵێت: مستەفا کەمال داوای لە(عەلی شان) کردبوو بچێتە ئەنقەرە بیکەن بەموتەسەڕیفی سێواس و بەڵێنی ئەوەشی پێدابوو کوردێکی باشیش بکرێت بەجێگری موتەسەڕیفی دەرسیم، بەڵام عەلی شان و سەید ڕەزا بەمستەفا کەمالیان وتبوو کورد داوای سەربەخۆیی دەکات و هیچ کوردێکیش ئامادە نی‌یە حکومەتی ئەنقەرە بیکات بەموتەسەڕیف (دەربارەی سەید ڕەزا هیچ سەرچاوەیەك باسی ئەوەی نەکردووە لەکاتی یەکەم شۆڕشی دەرسیمدا چاوی بەمستەفا کەمال کەوتبێت و لەگەڵ عەلی شاندا ئەو قسەیەی بەمستەفا کەمال وتبێت دوور نی‌یە بەنامە یان لەڕێگەی عەلی شانەوە ئەو قسەیەی ناردبێت بۆ مستەفا کەمال).

دەربارەی نوری دەرسیمی وەکو ڕۆبەرت ئولسون باسیکردووە، مستەفا کەمال لەساڵی ١٩٢٠دا بڕیاری گرتنی نوری دەرسیمی دەرکردبوو بەتاوانی ئەوەی (١٢٠٠) کرێکاری ناو کانە مەعدەنەکانی (Balya)ی چەکدارکردبوو، ساتێك نوری دەرسیمی بەو بڕیارەی زانی وازی لەکاروباری خۆی هێنا و دەستیکرد بەڕێکخستنی کاروباری عەشیرەتەکانی کورد بەڵام لە ١٩٢٠/١٢/٢٠دا گیرا و

ساتێك لەزینـدانی سێواسـدا دەبێ والی سێواس کـە (ڕەشید بـەگ-ڕەشید پاشا) بووە هەوڵێکی زۆری لەگەڵ نوری دەرسیمیدا دابوو نەسیحەتی کوردەکان بکات بێ بەدڵسۆزی حکومەتی ئەنقەرە بەتایبەتی لەو ڕۆژانەدا کە هێشتا تورکیا لەژێر هەڕەشەی بێگانەدا بووە بەڵام هەوڵەکەی دیارە بێسوود بووە.

وێنەیەکی نوری دەرسیمی لەزینداندا

تورکەکان بێجگە لەمە هەوڵیاندا کوردەکان لەناوخۆیاندا تێکبدەن و بیانکەن بەگژیەکتردا، هەندێکیان گرتن و ژمارەیەکیشیان دوورخرانەوە بۆئەوەی پەیوەندیان لەگەڵ دانیشتوانی ناوچەکانی خۆیاندا نەمێنێت و داواشیان لەچەکدارانی کورد کرد بێمەرج خۆیان بدەن بەدەستەوە (لەسەرەتای دەستپێکردنی شۆڕشی کوجگیریدا دەگەڕێینەوە سەر باسی ئەنجامی ئەم داواکردنەی تورك لەکورد بۆ بەدەستەوەدانی چەك).

دەربارەی هۆی سەرنەکەوتنی شۆڕشی دەرسیم، پرۆفیسۆر حەسرەتیان و ڕۆبەرت ئولسون هەریەکەیان باسی چەند هۆیەکیان کردووە، پرۆفیسۆر حەسرەتیان لەلاپەڕە (٣٨)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٤٥ وتویەتی:

١-دەوڵەتە ئیمپریالیزمەکان کە لەپەیمانی سیڤەردا چەند مادەیەکیان تەرخانکردبوو بۆ سەربەخۆیی کورد کە کاتی بەجێهێنانی ئەو مادانە هات هیچ

جۆرە یارمەتیەکی کوردیان نەدا و ڕێگەیان لەتورکە کەمالیەکان نەگرت بەو شێوە دڕندانەیە ڕەفتار لەگەڵ کورددا بکەن.

٢-تورکەکان زۆر زوو لەوە گەیشتبوون ئەگەر زوو نەکەونە خۆیان دژی کورد ئەوا دوورنی‌یە ئەوەی لەپەیمانی سیڤەردا بڕیاری لەسەردرابوو بۆ کورد دەهاتەدی بۆیە بەوپەڕی خێرایی و دڕندەیەتیەوە کەوتنە خۆیان بۆ تێکدانی ڕیزەکانی کورد لەناوخۆیان و بۆ لێدانیان بەرلەوەی یەکبگرن.

پرۆفیسۆر حەسرەتیان بێجگە لەو دوو هۆیەی باسیکردووە وتویەتی لەڕاستیدا کورد خۆشی لەسەرنەکەوتنەکەیدا کەمتەرخەم بووە کە شێوەی ئەو کەمتەرخەمیەی بەم شێوەیە باسکردووە:

<u>یەکەم:</u> عەشایری و دەرەبەگێتی کە باڵی ڕەشی کێشابوو بەسەر کۆمەڵگاکانی کورددا هۆیەکی سەرەکی بووە بۆ نەبوونی تەبایی و یەکگرتنی کورد لەناوخۆیدا کە نەیتوانیبوو بەشێوەیەکی یەکگرتوو ڕووبەڕووی دوژمنەکەی خۆی ببێتەوە، بێجگە لەمە کێشەی نێوان جەماوەری ڕەش‌وڕوتی کورد و سەرۆکە کوردەکان هۆیەکی کاریگەر بووە بۆ لاوازبوونی توانا و دەسەڵاتی کورد بەرامبەر بەدوژمنەکەی و سەرەڕای ئەمەش زۆرجار سەرۆك عەشیرەتەکانی کورد لەپێناوی پاراستنی مافی چینایەتی خۆیاندا لەڕێبازی شۆڕشی کورد لایانداوە و چوونەتەپاڵ تورکەکان کە بەئاشکرا دەیانزانی تورك چەند نەیار و دوژمنی میللەتەکەیانە.

<u>دوهەم:</u> لەیەکنەچوون و کێشەی مەزهەبی (مەبەست کێشە و ناڕێکی نێوان عەلەوی و سونی، کە ئەو کێشەیە لەپێکهێنانی سوارەی حەمیدیەوە تەواو پەرەیسەندبوو) کارێکی زۆری کردبووە سەر لاوازکردنی بزوتنەوە و شۆڕشی کورد (کە لەڕاستیدا ئەم کێشەیە نەك تەنها لەمەی دەرسیم و لەوەی کوچگیریدا کە لەدوای شۆڕشی دەرسیم باسیدەکەین، لەشۆڕشەکەی شێخ سەعیدی پیراندا ئەو کێشەیە ئەوەندە کاریگەر بووە پشتی شۆڕشەکەی شکاندبوو وەکو لەباسی شۆڕشی پیراندا ڕووندەبێتەوە).

<u>سێهەم:</u> کوردەکان بۆ بەڕێوەبردن و سەرپەرشتیکردنی شۆڕش ڕێکخراوێکی سیاسی ئەوتۆیان نەبوو نەخشەی شۆڕشەکە دەستنیشان بکات بۆیە لەشۆڕشێکی ناوچەگەری بەولاوە تێپەڕینەکرد و نەتەقیبووەوە بۆ شۆڕشەکانی تری کوردستان.

چوارەم: لەهەموویان گرنگتر ئەوەبوو سەرکردەکانی شۆڕش زۆر کورتبین بوون دەربارەی ئامانج و هیوا سەرەکیەکانی کورد کە ئەمە زۆر گرنگ بووە لەبەرژەوەندیە تایبەتیەکانی ئەو سەرکردانە کە تەنها هەر بەچاویلکەی سوود و بەرژەوەندیەکانی خۆیان ڕوانیویانەتە شۆڕشەکە. پشتبەستنی زۆربەی سەرکردەکان کە چاویان بڕیبووە ئەوەی دەوڵەتە ئیمپریالیزمەکان دەستی یارمەتیان بۆ درێژدەکەن تووشی هەڵەی زۆر گەورەی کردبوون کە ئەم کەموکوڕیانە بەئاشکرا لەپەیمانی لۆزاندا ڕەنگیدایەوە و مافی کوردی تیادا فەرامۆشکرا.

حەسرەتیانیش وەکو ڕۆبەرت ئولسون ڕەخنەی لەسەرکردەکانی کورد گرتووە کە پشتیان بەخۆیان نەبەستبوو و نەیانتوانیبوو حساب بۆ ئەوە بکەن ئایا بەو شۆڕشە ناوچەگەرییەیان و بەو کەموکورتی و بێچەکیەی هەبوو دەیانتوانی شۆڕشێك بەرپابکەن دژی سوپایەکی بەهێزی مەشقپێکراوی پڕچەك. لەباسی هەڵسەنگاندنی هەردوو شۆڕشەکەی دەرسیم و کوجگیریدا، لەکۆتایی باسی شۆڕشەکەی کوجگیریدا دێینەوە سەر باسی ئەو ڕەخنانەی لەهەردووکیان گیراون.

## باسی سێههمی بهشی نۆههم

### ڕاپهڕین و شۆڕشی کوجگیری

ڕاپهڕین و شۆڕشی کوجگیری هەتا ڕادەیەك دەتوانرێ هەر بەدرێژەپێدانی شۆڕشی یەکەمی دەرسیم بژمێردرێت هەروەکو حەسرەتیان لەکتێبەکەیدا وەکو یەك زنجیرە باسی هەردووکیانی کردووە. ڕۆبەرت ئولسون لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٨٤ لەلاپەڕە (٣٢)دا باسی ئەوەی کردووە چۆن تورکەکان لەدوای دامرکانەوەی شۆڕشی دەرسیم داوایان لەکورد کردبوو پێویستە چەکدارەکان بەبێ مەرج چەکەکان بدەن بەحکومەت، بەڵام کوردەکان گوێیان نەدایە ئەو داخوازیە و لەمانگی مارتی ١٩٢١ بەدواوە خۆیان کۆکردەوە و شۆڕشێکی تری بەرپاکرد لەناوچەی کوجگیری و حکومەتی تورك ناچاربوو هێزێکی زۆر بنێرێتە سەر کوردەکان و داواشی لەکوردەکانی ئەرزنجان و مەلاتیە کرد هێزەکانی خۆیان بنێرن بۆ هاوکاریکردن لەگەڵ حکومەتدا، بەڵام سەرما و بەفر و سەهۆڵبەندان ڕێگەی ناردنی هەموو هێزێکی گرت و بەرامبەر بەو تەقەلایەی حکومەت کوردەکانیش داوای یارمەتیان لەو فەرەنسیانە کرد کە لە(ئورفە) و (غازی عینتاب)دا بوون، بەڵام لاوە سەرگەرمەکانی کورد ڕازینەبوون یارمەتی لەبێگانەوە وەربگرن و دەیانویست خۆیان ڕووبەڕووی دوژمن ببنەوە و لەڕاستیدا کورد لەناوچەکەدا ژن و منداڵیش ئەوی توانای چەکهەڵگرتنی هەبوایە بەشداریکرد و دەستکرا بەئامادەکردن و ناردنی چەك و خواردەمەنی بۆ شۆڕشگێڕەکان دابینبکەن، بەڵام بەفرێکی زۆر چیای (Munzun)ی داپۆشیبوو، بۆیە ڕاپەڕینەکە خرایە سەرەتای وەرزی بەهار.

(لاموایە ئەگەر داوای یارمەتیش لەو فەرەنسیانە بکرایە کورد هیچی لێیانەوە دەستگیر نەدەبوو، چونکە لەدوای سەرنەگرتنی پەیمانی سیڤەر بارودۆخی پەیوەندی تورك و فەرەنسا گۆڕانکاریەکی تەواوی بەسەرداهاتبوو کە لەسوودی تورکەکاندا بوو وە لەگەڵ فەرەنسیەکاندا پەیمانێکی دۆستانەیان مۆرکردبوو کە بەرهەمی ئەو دۆستایەتیە بەتایبەتی لەشۆڕشەکەی پیراندا ڕووندەبێتەوە کە لەشوێنی خۆیدا باسیدەکەین چۆن فەرەنسیەکان ڕێگەی شەمەندەفەری

(حەلەب)یان دا بەتورکەکان هێزەکانی خۆیانی پێبگوێزنەوە و لەپشتەوە لەکورد بدەن).

ڕۆبەرت ئولسون لەباسەکەیدا دەڵێت: ((شۆڕشگێڕەکان ئاگاداری ئەوەبوون چۆن هەندێ لەدەرەبەگ و خاوەن موڵك لەژێرەوە بووبوون بەهاوکاری حکومەت بۆیە دەستیانکرد بەگرتنی ئەو خاوەن موڵکانە. لە١٥ی مارتی ١٩٢١دا حکومەت ئیعلانی عورفی کرد لەناوچەکانی (العزیز، ئەرزنجان، سیڤاس) و کوردەکانیش لایانوابوو بەهۆی ئەوەی حکومەت تووشی بووبوو بەشەڕی یۆنانەوە بۆیە ناپەرژێتە سەر شەڕی کورد، بەڵام حکومەت بەپێچەوانەوە جگە لەمێزەکانی خۆیان بەسەرکردایەتی (توپال عوسمان پاشا-عوسمانە شەل) هێزێکی (چەرکەس)یشیان نارده سەر کوردەکان و هەندێ لەعەشیرەتەکانی کوردیش کە نیاز وابوو یارمەتی کورد بدەن کەچی هیچیان بۆ کورد نەکرد و لەجیاتی ئەوە خۆیان لەو یارمەتیدانە شاردەوە و ئەو کوردانەش کە لەناو ئەنجومەنەکەی مستەفا کەمالدا بوون هیچیان ورتەیان لێوەنەهات)).

بێجگە لەوەی ڕۆبەرت ئولسون باسیکردووە، لەو شەڕەی کە تووشی تورك بووبوو لەگەڵ یۆنانیەکاندا کە کورد لایوابوو لەبەر ئەو شەڕە ناپەرژێتە سەر کورد، لەباسی شەڕی تورك و یۆناندا باسی ئەوەمانکردووە چۆن کوردەکان هەندێکیان خزمەتێکی زۆری تورکە کەمالیەکانیان کردبوو لەو شەڕەدا و کە شەڕ تەواوبوو لەکاتی لابردنی پەردەی سەر ڕووی سەربازی نەناسراو سەرکردەی هێزەکەی تورك وتبووی: بێگومان ئەم سەربازە نەناسراوە دەبێ کورد بووبێت ڕۆبەرت ئولسون لەلاپەڕە (٦١)ی کتێبەکەیدا باسی هەڵوێستی ئینگلیزی بەم شێوەیە کردووە: ((لەمانگی حوزەیرانی ١٩٢١دا (سێر پرسی کۆکس (کە مەندوبی سامی بەریتانیا بووە لەبەغداد) ئاگادارکرا لەو بزوتنەوەیەی لەکوچگیری دەستیپێکردبوو، ئەویش تەلگرافێکی نارد بۆ وەزارەتی داگیرکراوەکان (مستعمرات) و ئاگاداریکرد دوورنیە کوردەکان لەناوچەی (ئەنادۆڵ)دا دەستبکەن بەپشێوی و بزوتنەوە دژی تورکە کەمالیەکان و لە١٣ی هەمان مانگدا وەڵامی (چەرچڵ) ئەوەبوو باشترین شت ئەوەیە حکومەتێکی لێکدابڕ (Buffer)ی کوردی دروستبکرێت بۆئەوەی بکەوێتە نێوان تورك و عەرەبەوە.

ڕۆبەرت ئولسون پاشئەوە باسی نامەیەکی (سێر پرسی کۆکس)ی کردووە کە لەو نامەیەدا وتویەتی: ((ئایا دەتوانرێ کوردە قەومیەکان دژی تورکە کەمالیەکان

بەکاربهێنرێن؟ ئەگەر ئەوە کرا پێویستە هەندێ شت بخرێتە بەرچاو کە یەکێك لەمانە ئەوەیە جزیرەی ئیبن عومەر داگیربکرێت و کوردەکان پرچەك بکرێن بەمەرجێك گەرەنتی ئەوە هەبێت دوای داگیرکردنی جزیرەی ئیبن عومەر کوردەکان ئەو چەکانە نەدەن بەفەرەنسیەکان، بەلاّم (پرسی کۆکس) هەرخۆی وەلاّمی پرسیارەکەی داوەتەوە و وتویەتی من لەگەلّ ئەم بۆچوونەدا نیم چونکە بەمە بەریتانیا بەخۆڕایی کێشەیەك بۆ خۆی پەیدادەکات)). ڕۆبەرت ئولسون دەڵێت: (Rayan) بەبەدرخانیەکانی وتبوو دوورنییە حکومەتی بەریتانیا یارمەتی کورد بدات بەمەرجێك ڕاپەڕینەکەی لەو شوێنانەدا نەبێ نزیکی سنووری عێراق بێت.

دەربارەی دەستپێکردنی شۆڕشی کوجگیری قەدری جەمیل بەگ (زنار سلوپی) لەلاپەڕە (٩٤)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٥٧ وتویەتی لەئەنجامی چالاکی (عەلی شان بەگی کوڕی مستەفا پاشای زازا) لەگەڵ سەرۆکی عەشیرەتەکانی (کوجگیری، زازا، دیڤریغی، کانغال، رفاهیە، خافیك، دومرچوك) لەساڵی (١٩١٨) بەدواوە لەناوخۆیان جۆرە یەککگرتنێکیان پێکەوەنابوو بۆ تێکۆشان و خەباتکردن لەپێناوی سەرگرتنی ئاواتەکانی میللەتی کوردا و لەساڵی ١٩٢٠دا قوربانیەکی زۆریان بۆ ئەو مەبەستە پێشکەشکرد، بەلاّم بەداخەوە لەگەلّ ئەو هەموو فیداکاریانەشدا کورد هەر نەگەیشت بەئامانجی خۆی چونکە لەسەرەتاوە ژمارەیەك لەسەرۆکەکانی کورد لەکاتی پێویستدا پڕ بەدڵ بەشداری و هاوکاریان نەکرد کە هۆی ئەمەش نەبوونی ڕێکخراوێکی ڕێکوپێکی ئەوتۆ بوو بتوانێت سەرپەرشتی ڕاپەڕین و بزوتنەوەکەی کورد بکات و بەپێچەوانەوە هەندێکیان چوونەپاڵ مستەفا کەمال بەبیانووی ئەوەی دەوڵەتە گەورەکان دەیانەوێ لەناو جەرگەی خاکی کوردستاندا دەوڵەتێکی ئەرمەنی دامەزرێنن.

هەرچەند لە(حوزات هەندێ سەرچاوە بە(Hazart) ناویانهێناوە) کۆبونەوەیەك کرا لەو کۆبونەوەیەدا (عەلی شان بەگ)ی کوڕی مستەفا پاشای زازا لەدەرسیم ئامادەیی خۆی پیشاندابوو بۆ ڕاپەرینێك دژی تورك بەنیازی پێکهێنانی حکومەتێکی کوردی سەربەخۆ، بەلاّم لەگەلّ ئەوەشدا پەیوەندی نێوان ئەوانەی کۆبوبونەوە بەهێز نەبوو هەرچەند لەسەرەتادا توانیبوویان دەست بەسەر هەندێ ناوچەدا بگرن. بەرامبەر بەو بزوتنەوە و چالاکیەی کورد حکومەتی تورك دەستیکرد بەفرۆفێڵ کردن بۆ دەستبڕینی کورد.

دەربارەی ئەو فرۆفێڵەی (زنار سلوپی) باسیکردووە، لەدوکیومێنتی ژمارە (No.E٣٥٥٣-٩٥-٩٦ .Fo.٣٧١-٧٧٨١) مانگی مارتی ١٩٢٢دا وتراوە: ((لە ١٩٢٢/٣/٢٢دا مەندوبی سامی بەریتانیا لەئەستەمبوڵ لەسەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوەوە ئاگادارکراوە لەوەی ئەنجومەنی باڵای میللی لەئەنقەرە لەناو خۆیدا لەبارودۆخی کورد و کێشەی کورد کۆڵیوەتەوە و ڕەشنوسی یاسایەکی ئامادەکردووە بەناوی دامەزراندنی ئیدارەیەکی تورکی لەکوردستاندا کە لەلایەن لیژنەیەکەوە ئامادەکرابوو کە بریتی بوون لە(ساڵح ئەفەندی نوێنەری ئەرزڕوم) و (یوسف عیزەت پاشا نوێنەری سینوب) و ڕاغب بەگ و حەمدی بەگ.

ئەو لیژنەیە بەرلەوەی لیستەکە ئامادەبکەن چووبوون بۆ کوجگیری بۆئەوەی لەوێ لەهۆی ڕاپەڕینەکەی کورد بکۆڵنەوە، لەکاتی باسکردنی ڕەشنوسی ئەو لیستە لەلایەن ئەنجومەنی میللیەوە زۆربەی ئەندامان دژی ناوەڕۆکەکەی بوون و لەسەرەتادا ساڵح ئەفەندی بەچەند قسەیەکی خۆش مادەکانی ڕوونکردەوە و بەئەندامەکانی وت کێشەی کورد بەو شێوەیە چارەسەر ناکرێت کە هەندێ لەکاربەدەستانی حکومەت دەیانەوێ بیکەن و ئەو هەرا و ئاژاوەیەی مستەفا پاشای کورد (مەبەست مستەفا پاشا یامولکی‌یە کە لەکۆتایی ئەم باسەدا باسی ئەمەی مستەفا یامولکی دەکرێتەوە) ناریەتیەوە پێویستی بەوە هەیە لەپێشدا هەموو گیراوەکان لەوانەی لەشەڕی کوجگیریدا گیراون بەربدرێن.

هەرچەند قسەکانی ساڵح ئەفەندی لەلایەن نوێنەرانی (حزبی دفاعی وطنی) لەناو ئەنجومەنەکەدا دەیانبڕی بەڵام ئەندامانی تر وەکو (عبدالغفور بەگ)ی نائیبی کراس و لوتفی بەگی نائیبی مەلاتیە و حەیدەر بلال نائیبی وان و ئەمین پاشای نائیبی سێواس و راسم بەگەوە پەسەند دەکرا و ئەنجامی باسەکە بەوە کۆتایی پێهێنرا بڕیاردرا (جەواد پاشا) ڕاپۆرتێك دەربارەی ئەمە ئامادەبکات لەو دوکیومێنتەدا باسی مادەکانی ڕەشنوسی ئەو یاسایەی بەم جۆرە باسکردووە:

١-ئەنجومەنی باڵای نیشتمانی میللی وا بەباش دەزانێت دەزگایەکی بەڕێوەبەرایەتی ناوخۆ بۆ کورد سازبکرێت بەشێوەیەکی ئەوتۆ لەگەڵ خورەوشتی نەتەوایەتیان یەکبگرێتەوە.

٢-حاکمێکی گشتی بۆ ئەو ناوچانە هەڵبژێردرێت کە زۆربەی دانیشتوەکانیان کوردبن و جێگرێك و موفەتیشێك کە هەردووکیان تورك بن یا کوردبن دابنرێن (لەمادە (٥)دا زیاتر ئەمە ڕوونکراوەتەوە).

٣–ئەنجومەنی بالأی میللی ئەو حاکمە گشتیە هەڵدەبژێرێت بەمەرجێك ئەو حاکمە لەوانەبێ ناوبانگێکی پاك و باشی هەبێت و شارەزایی بەڕێوەبردنی کاروبار بێت.

٤–حاکمی گشتی بۆ ماوەی سێ ساڵ هەڵدەبژێردرێت و دوای تەواوبوونی ئەو سێ ساڵە ئەگەر دانیشتوانی کورد نەیانویست ئەو حاکمەی پێشوو لەسەر کار بمێنێتەوە، ئەوسا ئەنجومەنی نیشتمانی کورد (Kurdish National Assembly) بۆی هەیە حاکمێکی تازە دانێت بەمەرجێك ئەنجومەنی بالأی میللی (ئەوەی ئەنقەرە) دانانی ئەو حاکمە تازەیە پەسەندبکات.

٥–لەگەڵ ئەوەشدا جێگری حاکمی گشتی و پشکنەر (مفتش) لەلایەن ئەنجومەنی نیشتمانی کوردەوە هەڵدەبژێردرێت، بەڵام پێویستە دانانی ئەو کەسانە لەلایەن ئەنجومەنی بالأی میللیەوە (ئەوەی ئەنقەرە) پەسەندبکرێن.

٦–ئەندامانی ئەنجومەنی نیشتمانی کورد لەدانیشتوانی ناوچەکانی ڕۆژهەلأت بۆ ماوەی سێ ساڵ هەڵدەبژێردرێن. پێویستە لەسەر ئەم ئەنجومەنە هەموو ساڵێك لەسەری مانگی مارتدا بۆ ماوەی چوار مانگ کۆببێتەوە بۆ بەجێهێنانی پێویستیەکانی سەر شانی، بەڵام ئەگەر لەو ماوەیەدا کاروبارە پێویستیەکانی خۆی پێتەواونەکرا، بۆی هەیە بۆ تەواوکردنیان درێژە بەکۆبوونەوەکانی بدات بەمەرجێك حاکمی گشتی بڕیار لەسەر ئەوە بدات.

٧–ئەنجومەنی نیشتمانی (مەبەست ئەوەی کوردە) بۆی هەیە بودجە (میزانیە)ی دەرامەت و خەرجی ساڵانەی ناوچەکە بپشکنێت و دەسەڵاتی ئەوەی هەیە لەهەموو گلەیی و ڕەخنەیەك بکۆڵێتەوە.

٨–ئەنجومەنی بالأی میللی (ئەوەی ئەنقەرە) بۆی هەیە لەو کێشە و ناکۆکیانە بکۆڵێتەوە کە لەنێوان ئەنجومەنی نیشتمانی کورد و حاکمی گشتیدا ڕوودەدات.

٩–تا ئەوکاتەی دەستنیشانی هێڵی سنوور دەکرێت (مەبەست سنووری ئەو چوارچێوەیەی بۆ ناوچە کوردیەکان دادەنرێت کە یاساکە بیانگرێتەوە) ناوچە ئیداریەکانی کوردستان بریتی دەبن لەویلایەتەکانی (provinces–وان)، دیاربەکر، سنجاقی دەرسیم و هەندێ قەزا و ناحیەی تر.

١٠–لەو ناوچانەدا کە ئیدارەی کوردییان تیادا پێکدێت، دادگایەك دادەمەزرێنرێت بەمەرجێك نیوەی ئەندامەکانی کوردبن و نیوەکەی تری تورك

بێت، بەڵام ئەگەر ئەندامێکی تورك خانەنشین کرا پێویستە کوردێك جێگەی بگرێتەوە.

١١-لەڕۆژی کارپێکردنی ئەم یاسایەوە هیچ جۆرە باجێکی تازە نابێ بسێنرێت لەو جۆرە باجانەی ساتی خۆی بەناوی شەڕەوە (مەبەست شەڕی جیهانیە) دانرابوو یان بەهەر بۆنەیەکی ترەوە بووبێت و پێویستە لەساڵێکدا تاقە جارێك زیاتر باج نەسێنرێت و لیژنەیەکی تایبەتی لەلایەن ئەنجومەنی باڵای میللی و ئەنجومەنی نیشتمانی کوردەوە پێکدەهێنرێت بۆئەوەی ڕادەی ئەو بەشەی لەبودجەی ئەو شوێنانەی ئەم یاسایە دەیانگرێتەوە بدرێت بەحکومەتی مەرکەزی.

١٢-هێزێکی جەندرمە بۆ دابینکردنی ئاسایش پێکدێت و ئەنجومەنی نیشتمانی کورد بڕیار لەسەر شێوە و چۆنیەتی بەڕێوەبردنی کاروباری ئەو هێزە دەدات و سەرکردەی ئەو هێزە لەسەرەتادا تورك دەبێت هەتا ئەوکاتەی پێویستی بەمانەوەی ئەو تورکە نامێنێت.

١٣-هەموو ئەفسەر و سەربازەکانی کورد لەناو سوپای حکومەتدا هەریەکەیان لەشوێنی خۆی دەمێنێتەوە هەتا بڕیارێکی تازە دەربارەیان دەردەچێت بەپێی بڕیارێکی تایبەتی کە بۆ مەبەستی چەسپاندنی ئاشتی بڵاودەکرێتەوە.

١٤-لەپاش دەرچوونی ئەو بڕیاری ئاشتیە (کە بەیاساش ناویهێناوە) پێویستە نرخی ئەو ئاژەڵ و مەڕومالآت و بەرزەولآخ و کەلوپەلانەی لەخەڵك سەندرابوون هەمووی دەستنیشان بکرێت و لەماوەی دوازدە مانگدا نرخەکانیان بدرێت بەخاوەنەکانیان.

١٥-زمانی ڕەسمی زمانی تورکی دەبێت لەناو ئەنجومەنی نیشتمانی کورددا و لەناو دەزگا ڕەسمیەکاندا، بەڵام دەتوانرێ لەقوتابخانەکاندا زمانی کوردی بخوێنرێت بۆ فێربوونی ئەو زمانە و حاکمی گشتی دەسەڵاتی گەشەپێدانی ئەو زمانەی پێدەدرێ، بەڵام نابێ ئەمە بکرێت بەبناغەیەك بۆئەوەی لەدواڕۆژدا زمانی کوردی بکرێت بەزمانێکی ڕەسمی لەناو ئەو حکومەتە ناوخۆییەدا (کە لەم مادەیەدا بەئاشکرا ناوی حکومەت هاتووە).

١٦-یەکەم پێویستی و ئەرکی سەرشانی ئەنجومەنی نیشتمانی کورد ئەوەیە زانکۆیەك لەو ناوچانەدا دروستبکرێت کە لەو زانکۆیەدا کۆلیجی یاسا و پزیشکی تیادابێت.

١٧-ئەنجومەنی نیشتمانی کورد بۆی نییە بەبێ پرس و ڕەزامەندی ئەنجومەنی باڵای میللی لەئەنقەرە هیچ جۆرە باجێك لەخۆیەوە دابنێت.

١٨-نابێ هیچ جۆرە ئیمتیازێك لەو ناوچانەدا بدرێت بەهیچ لایەك بێئەوەی پێشەکی ڕەزامەندی ئەنجومەنی باڵای میللی لەئەنقەرە وەرنەگیرێت.

لەکۆتایی دوکیومێنتەکەدا مەندوبی سامی بەریتانیا لەئەستەمبوڵ (Horas Rumbold) وتویەتی: ((لەخوێندنەوە و ناوەڕۆك و نیاز و مەبەستی ئەو یاسایەوە ڕووندەبێتەوە بۆچی کوردەکان بەو یاسایە قایل نەبوون)). مەندوبی سامی لەمەدا هەر ئەوەندەی وتوە: ((کورد لەنیاز و مەبەستی تورك گەیشتبوو بۆیە ئەو پێشنیازانەی قبوڵ نەکردبوو بەبێئەوەی بەڵگەیەك بدا بەدەستەوە چۆن و کەی کورد ئەو پێشنیازەی پەسەند نەکردبوو وە هیچ سەرچاوەیەکی تریش بەڕوونی لەوە نەکۆڵیوەتەوە)).

لەدوای ئەو باسە دوورودرێژەی ڕۆبەرت ئولسون لاموایە شتێکی زۆر گرنگ و پێویستە کە ئیمڕۆ لەدوای پتر لەتێپەڕبوونی سێ چارەکی سەدەی پێشوو شتێکی زۆر گرنگ و پێویستە ئەو باسە بخرێتە ژێر نەشتەری لێکۆڵەرەوەکان و بارودۆخی ئەو ڕۆژانە هەمووی شیبکرێتەوە بۆئەوەی سوود و وانە لەو هەڵە و کەموکوڕیانە وەربگیرێت کە لەکورد ڕوویداوە و بایەخیشی پێنەدراوە و هەموو جارێك بەسەرهات و ڕووداوەکانی یەك لەدوای یەك پڕن لەفۆتۆکۆپی ئەو هەڵە زەق و ئاشکرایانەی جار لەدوای جار دوبارە دەبنەوە، لاموایە بەشێوەیەکی سەرپێی دەتوانرێ هەندێ پرسیار دەربارەی ئەوە بخرێتە بەرچاو:

١-ئایا حکومەتی بەریتانیا خۆی هیچ ڕۆڵێکی نەدیوە لەڕێگەنەدان بەنزیکبوونەوەی تورك و کورد و لەسەرنەگرتنی ئەو یاسایەدا وەکو سیاسەتێکی ڕوون و ئاشکرای حکومەتی بەریتانیا لەمانەوەی دوژمنایەتی نێوان تورك و کورددا کە چەندەها جار کاربەدەستان و سیاسەتمەدارانی ئینگلیز بەئاشکرا وتویانە بەکارهێنانی کورد دژی تورك شتێکی بێسود نییە بۆیان لەکاتی خۆیدا.

٢-مەبەستی تورك چیبووە لەئامادەکردنی ڕەشنوسی ئەو یاسایە لەلایەن ئەنجومەنی باڵای میللیەوە و ئایا نیازیان پاك بووە لەم کارەیاندا؟

أ-دەربارەی مەبەستی تورکەکان، شتێکی ئاشکرایە لەو ڕۆژانەدا هێشتا خۆیان نەگرتبوو بەتەواوەتی، تازە لەکوشتاری ئەرمەنیەکان بووبوونەوە، تووشی شەڕێکی گران و قورس بووبوون لەگەڵ یۆنانیەکاندا و پێویستیان

بەهاوکاریکردنی کورد هەبوو وەکو لەباسی ئەم شەڕەدا بەدووروودرێژ باسکراوە، دەسەلأتی خەلیفە هێشتا لەئەستەمبولّ و دەوروبەریدا مابوو بەپشتگیریکردنی ئینگلیز، مادەکانی پەیمانی سیڤەر وەکو مار ئالأبووە گەردنیان و بەچوارپەل سمکۆلّیان دەکرد بۆ زیندەبەچالّکردنی لەپەیمانێکی تازەدا کە لەدواییدا نەخشەی ئەمەشیان کێشا، بۆیە هەتا گەیشتن بەبەجێهێنانی هەموو مەبەستەکانیان نەیانویست لەو ڕۆژانەدا بەرەیەکی تریش لەگەلّ کورددا بکەنەوە کە لەڕاستیشدا ناچاری ڕووبەڕووبونەوە بووبوون لەڕاپەڕینەکانی مەلاتیە و دەرسیم و کوچگیریدا.

ب-دەربارەی ئەوەی ئایا نیازیان پاك بووە لەباسکردنی ئەو یاسایەدا، هیچ گومان لەوەدا نییە تورکی ڕەگەزپەرست لەهیچ هەنگاوێکیدا نیازی پاك نەبووە بەرامبەر کورد و ئەگەر بەدلّ بیانویستایە ئەو یاسایە سەربگرێت دەیانتوانی ئەو (٧٢) کوردەی ئەندامی ناو ئەنجومەنەکەی بوون و لەڕێگەی ئەو سەرۆك عەشیرەتانەی ئابڕووی خۆیان بردبوو بەوەی شانبەشانی هێزەکانی حکومەت لەزۆر شەڕدا دژی هاولأتیەکانی خۆیان شەڕیان دەکرد، بەمانە بەهەموویان دەیانتوانی ئەو دەزگایانە پێکبێنن کە لەمادەکانی ئەو یاسایەدا پێشنیازی دامەزراندنیان کرابوو.

ج-بێگومان تورکەکان زۆر بەباشی شارەزای هەلّوێستی کورد بوون بەرامبەر بەڕووداوەکان کە هەندێکیان داوای سەربەخۆییان دەکرد و تاقمێکی تریش داوای ئۆتۆنۆمیان دەکرد و لەوە گەیشتبوون ئەنجامی ئەو باسکردنەی ناو ئەنجومەنەکەیان دەبێتە هۆی ناکۆکی و تێکدانی ڕیزەکانی کورد و هەرلایەك بەشێوەیەك خواست و مەرامی خۆی دەردەبڕێت و لەئەنجامدا لەسەر هیچ شتێکی یەکگرتوو ڕێکناکەون و ئەمە درێژەدەکێشێ هەتا ئەوکاتەی خۆیان بەتەواوی بەهێزدەکەن و هەموو داخوازیەکانی کورد پشتگوێ دەخەن.

بەکورتی وەلأمێکی ڕوون و ئاشکرا بۆ ئەو پرسیارانە لەدوو شتدا بەتەواوەتی ڕووندەبێتەوە ئەویش بریتیە لەوەی نە سیاسەتی حکومەتی بەریتانیا لەو ڕۆژانەدا کە نەخشەکێشی هەموو ڕووداو و بەسەرهاتەکان بوون و هەموو شتێکیان دەبەستەوە بەسوود و بەرژەوەندیەکانی خۆیان و نە تورکی ڕەگەزپەرستی تینوو بەخوێنی کورد چاوی بەرایی‌دەهێنا کورد بەهیچ مەرام و مافێکی خۆی بگات و هەروەکو زەردەمار لەگەردنی کورددا ئالأبوو، هەموو ئاواتی

ئەوەبوو کورد ڕیشەکێش بکات و شتێك لەناودا نەهێڵێت کە پێی‌بوترێ کورد و کوردستان.

مستەفا پاشا یامولکی کە خۆی یەکێك بووە لەوانەی دەستی هەبووە لەڕاپەڕینی ئەو ڕۆژەدا کە وەکو بەرلەمە (سالح ئەفەندی) لەئەنجومەنی بالای میللیدا لەئەنقەرە مستەفا پاشا یامولکی بەئاژاوەچی تاوانبارکردبوو لەڕاپەڕینەکانی ئەو ڕۆژانەدا، لەدواییدا کە گەڕایەوە بۆ باشوری کوردستان لەڕۆژنامەی (بانگ کوردستان) ژمارە ٤ی ڕێکەوتی ١٩٢٢/٨/٢٨دا کە خۆی خاوەنی ڕۆژنامەکە بووە، لەو ڕۆژنامەیەدا باسێك بلاوکراوەتەوە دەربارەی مستەفا پاشا کە تیایدا وتراوە: ((مستەفا پاشا کوردستانی بە(دار الحرب) وەسف کردووە و وتویەتی ئەوی لەو ڕۆژانەدا کوردستانی دیبێت (مەبەستی باکوری کوردستان بووە) خوێن لەدلی تکاوە بەرامبەر بەو پەرێشانیەی بەسەر کورددا هاتبوو، لەئەنجامی ئەوەدا هەزار کورد بەوانەی تۆپ و مەترەلیۆز لەوانەی هەتیو و بێکەس و پیروپەککەوتە بوون لەناوچوون و ئەوانەی مالّ و مولکیان تالانکرابوو لەناو بەفر و سەهۆلبەندانی ناو شاخەکاندا ئاوارەکرابوون و لەسەرما و لەبرسا مردن و ئەوی گەیشتبووە ئەستەمبولّ هەروەکو زەمانی جاهیلیەت ئاوارەکران، بەسەر مالاندا دابەشکرابوون و زۆربەی ئەوانەی لەناز و نیعمەتدا پەروەردەکرابوون لەبەر نەبوونی و برسێتی پەرێشان بوون و هەرچەند جەمعیەتی کوردستان لای هەندێ لەو دەولەتانەی خۆیان بەخاوەن ویژدان دەزانن داوایانکردبوو فریای کورد بکەون و ڕزگاریبکەن لەکوشتار و برسێتی و ژمارەیەکی زۆر لەخانەوادەکانی کوردی دەوروبەری ئەرزڕوم و خەرپوت و شوێنەکانی تر لەشوێنی خۆیان هەلکەندرابوون و هەر پێنج شەش خێزانێك لەناوچەکانی تورکنشیندا بەزۆرەملێ نیشتەجێکرابوون بۆئەوەی ناچاربن زمانی تورکی فێربن و زمانەکەی خۆیان بیربچێتەوە و لەبۆتەی تورکدا بتوێنرێنەوە)).

مستەفا پاشا لەکۆتایی ئەو باسەیدا ئەم دوو شیعرەی خۆی بلاوکردۆتەوە:

لەکوێیە قەوم و خوێشانم ببینن چۆن پەرێشانم؟

ئەز وونم) لێدەدەن بۆچی؟ بلێم چی تورکی نازانم

بەحالّم مەرحەمەت توخودا، زوبان نەزان و بیمارم

لەکوێ ما دایکی خەمخوارم ببینێ چاوی گریانم؟!

مستەفا پاشا دەلێ: ئەوی ئەم دیمەنەی نەبینیبێت نازانێ کورد چەند پەرێشان بووە بەدەست تورکەوە.

## هەڵسەنگاندنی ڕاپەڕین و شۆڕشەکەی دەرسیم و کوجگیری

وەکو لەباسی هەردوو شۆڕشەکەدا سەرچاوەکان باسیانکردووە، بۆمان دەردەکەوێ ساتێك کوردەکانی ناوچەکانی دەرسیم و کوجگیری لەنیاز و مەبەستی تورکەکان گەیشتبوون چۆن دەستیکردبوو بەفرۆفێڵ و دەستبڕینی کورد ئیتر خۆیان پێنەگیرا و ناچاربوون بۆ پاراستنی خۆیان دەستیاندایە چەك و ڕووبەڕووی هێزەکانی تورك بوونەوە لەناوچەکەدا و ئەو دوو ڕاپەڕینەی دەرسیم و کوجگیری ڕوویدا کە سەرەنجامەکەی بەوە گەیشت تورکەکان توانیبوویان هەردووکیان دابمرکێننەوە.

بۆ هەڵسەنگاندنی هەردوو ڕاپەڕین و شۆڕشەکە و دەستنیشانکردنی ئەو ڕەخنانەی لەشۆڕش و شۆڕشگێڕان گیراوە دەتوانین بەکورتی ئاماژە بۆ هەندێکیان بکەین:

یەکەم: ڕاپەڕین و بزوتنەوەی هەردوو شۆڕشەکە بەتێکڕایی بریتی بووە لەبزوتنەوەیەکی هەرەمەیی ناوچەیی بێسەروبەر کە هیچ ڕێکخراوێکی سیاسی یان حیزبێك سەرپەرشتی نەکردبوو، بەڵکو هەر سەرکردەی عەشیرەتێك بۆ خۆی، بەهێزەکانی خۆی لەشوێنێکدا پەلاماری هێزەکانی تورکی داوە و لەسەرەتادا هەندێ سەرکەوتن و بەرەوپێشەوەچونی دەستگیربووە، بەڵام هێزە چەکدارەکانیان بەرگەی سوپای تورکی پڕچەك و مەشقپێکراوی نەگرتووە و هەردوو شۆڕشەکە لەناوبراوە.

دووەم: لەسەرچاوەکاندا کە باسی هەردوو شۆڕشەکەیان کردووە تەنها لەناوی (خالید بەگ جبران) بەولاوە کە ئەفسەرێکی لێهاتووی ناسراوبووە باسی هیچ ئەفسەرێکی تری کورد نەکراوە، لەگەڵ ئەوەشدا لەو سەرچاوانەی لەباسەکانی پێشوو و داهاتوودا دێنە بەرچاو ناوی چەند ئەفسەرێکی پایەبەرزی کورد بەتایبەتی لەناو ڕێکخراو و حیزبەکانی باکوری ئەو ڕۆژانەدا هاتووە و زۆریان گەیشتبوونە پلەی (میرئالای) و خالید بەگ خۆشی وەنەبووبێ لەو ئەفسەرانە بووبێت کە لەلایەن زۆربەی عەشایرە عەلەریەکانەوە خۆشەویست بووبێت چونکە هەر بەچاوی یەکێك لەسەرکردەکانی حەمیدیەی دوژمن بەعەلەوی تەماشاکراوە و مستەفا کەمال هەرزوو لەچالاکی خالید بەگ جبران گەیشتبوو بۆیە دوریخستبووەوە بۆ ناوچەیەکی دوور کە هیچ پەیوەندیەکی بەو ناوچانەوە نەمێنێت کە شۆڕشەکانی تیادا دەستپێکردبوو.

ئەوانەی کە سەرکردایەتی شۆڕشەکەیان کردبوو بەتایبەتی ئەوەی کوجگیری کە تاڕادەیەك پەرەیسەندبوو بریتی بوون لەچەند سەرۆك عەشیرەتێك کە شارەزای لەشکرکێشی شۆڕش نەبوون بەهەڕەمەیی دەستیان بەشۆڕشەکە کردبوو، زۆریان هەر لەسەرەتاوە دڵنیا نەبوون لەسەرکەوتنی شۆڕشەکەیان و جێگۆڕکێیان کردووە و لەلایەنگرێتی شۆڕش پاڵیانداوەتەوە یان چوونەتە پاڵ هێزەکانی دوژمن وەکو لەباسەکاندا دێنە بەرچاو کە نمونەی ئەمە لە(حەیدەر بەگ)دا ڕووندەبێتەوە کە وەکو پرۆفیسۆر حەسرەتیان لەلاپەڕە (٤٥)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٤٩ وتویەتی ئەو کارەی (حەیدەر بەگ) خیانەتێکی گەورە بوو لەشۆڕشەکە و بوو بەهۆی سەرکەوتنی تورکەکان.

سێیەم: لەهەمووی کوشندەتر و زیانبەخشتر ئەو کێشەیە بووە لەکۆنەوە لەناو عەلەوی و سونیەکاندا پەیدابوو لەڕێگەی عوسمانیەکانەوە بەهۆی ڕەفتار و کردەوەی سوارەی حەمیدیەوە، بۆیە دانیشتوانی ناوچەکە تا ماوەیەکی زۆر بەهۆی ئەو کێشەیەوە دڵیان لەیەکتری پاکنەبووەوە و زۆرجار لایەکیان لەڕقی لاکەی تر یان بەشداری نەکردووە لەشۆڕشدا یان لایەنگری دوژمنانی شۆڕشەکە بووە.

چوارەم: هەروەکو تورك چۆن توانیبووی ناکۆکی نێوان سونی و عەلەویەکان بۆ سوودی خۆی بەکاربێنێت، توانیبووی مەترسی بخاتە دڵی ژمارەیەکی زۆر لەو کوردانەی گوایە ناوچەکانیان بەپێی مادەکانی سیڤەر دەخرێتە ژێر دەسەڵاتی ئەرمەنیەوە و بەمە توانیبوویان کورد بکەن بەدوو بەشەوە و (٧٢) کوردیان کردبوو بەئەندامی ئەنجومەنەکەی خۆیان کە لەکاتی کۆنگرەی لۆزاندا ئەو کەتن و خیانەتەی لەکورد کرا بەهەندیٚ لەو کوردانەیان کرد، بەرامبەر بەمەی تورك لەهیچ کاتێکدا کورد ئەوەندە زرنگ نەبووە لەڕووی سیاسیەوە لەهەل و دەرفەت سوود وەربگرێت.

بۆ نمونە لەکاتی پەیمانی لۆزاندا باسی کێشەیەکی پڕ لەئاڵۆزی نێوان تورکە کەمالیەکان کراوە کە لەباسی لۆزاندا لێیدواوین و ڕۆبەرت ئولسون لەلاپەڕە (١٢٣)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٨٤ دەربارەی ئەمە وتویەتی لەم شۆڕشانەدا و پاشئەوەش لەوەی شێخ سەعیدی پیراندا کە یەکسەر لەدوای شۆڕشی کوجگیری دەستیپێکرد، کاربەدەستانی تورك لەناوخۆیاندا لەکێشەیەکی سەختدا بوون و تاقمێکیان سەر بەمستەفا کەمال بوون لەبۆچونەکانیاندا بەڵام تاقمێکی تریان وەکو (کازم قەرەبەکر پاشا، عەلی فوئاد، ڕەوف، ئوربەی، ڕەئفەت بیلی، عەدنان ئەدیڤار، خالید ئەدیب) و هەندێکی تر تەواو لەگەڵ مستەفا کەمالدا ناڕێکبوون،

بەڵام کورد لەشۆڕشی کوجگیریدا نەیتوانیبوو سوود لەو هەلودەرفەتە وەربگرێت و ڕۆژنامەکانی تورکیش هەندێکیان بەئاشکرا کەوتبوونە ڕەخنەگرتن لەمستەفا کەمال و مستەفا کەمال لەکۆبونەوەیەکیدا ئەو ڕۆژنامانەی تاوانبارکردبوو، بەئاشکرا عیسمەت ئینونو ڕەخنەی لە(حسێن جاهید یالچین) گرتبوو کە خاوەنی ڕۆژنامەی (طنین–Tanin) بوو لەگەڵ (ئەحمەد یالمان)ی سەرنوسەری ڕۆژنامەی (وطن) و (شەریف ئەدیب)ی سەرنوسەری ڕۆژنامەی (Sebil Urresat) کە ئەمەیان لایەنگری پیاوە ئاینیەکان بوو، هەموویان بەوە تاوانبارکران کە نوسینەکانیان سوودی یاخیبووەکانی تیادایە (مەبەست شۆڕشگێڕانی کوردە).

پێنجەم: یەکێك لەو ساویلکەیی و کورتبینیەی کورد ئەوە بووە هەمیشە خۆی بەلاواز زانیوە و لای وابووە بەتەنها خۆی ناتوانێت بەسەر دوژمندا زاڵبێت بۆیە چاوی بڕیوەتە دەستی بێگانە بۆئەوەی یارمەتی بدات کە بەدرێژایی مێژوو تا ئێستە ڕووینەداوە هیچ لایەکی بێگانە بەدڵ یارمەتی کوردی دابێت کە ئەو هەڵوێستەی کورد لەمەدا ڕووندەبێتەوە کە لای وابووە حکومەتێکی وەکو بەریتانیا دەتوانێت یارمەتی بدات و بیگەیەنێتە ئامانجەکانی لەکاتێکدا زۆر ڕوون و ئاشکرایە ئینگلیز لەهیچ هەڵوێستێکیدا لایەنگری کورد نەبووە هەروەکو لەدوکیومێنتەکانی خۆیاندا بەئاشکرا دانیان پیادانا‌وە و لەزۆر شوێنیدا نمونەی ئەو دوکیومێنتانەمان بلاوکردۆتەوە و لەلایەکی تریشەوە هێنانی (مێجەر نویل) بۆ ناوچەکەش هەر بەمەبەستی دەستبڕینی کورد بووە و کوڕانی بەدرخان کە لەگەشتەکەیدا لەگەڵیدا بوون لایانوابوو ئینگلیزەکان بۆیە هێنابوویان بۆئەوەی حکومەتێکی کوردیان بۆ دامەزرێنێت کە لەئەنجامدا دەرکەوت شتەکە بەو شێوەیە نەبوو، زۆری پێنەچوو مێجەر نویلیان کێشایەوە بێئەوەی لەکاتی مانەوەیدا لەزیان بەولاوە هیچ سوودێکی تری بۆ کورد نەبوو.

# بەشی دەهەم

## شۆڕشی پیران

لــەدوای بزوتنــەوە و ڕاپەڕینــە ســەرنەکەوتوەکانی مەلاتیــە و دەرســیم و کوجگیری، کە هەریەکەیان بریتی بوو لەڕاپەڕینێکی ناوچەیی، تورکە کەمالیەکان بەدامرکانــەوەی ئــەو ڕاپەڕینانــە وازیاننــەهێنا، بــەڵکو هــەنگاو بەهــەنگاو دەستی خۆیان ئاشکراکرد بۆ لەناوبردنی کورد یان توانەوەی لەبۆتەی نەتەوەی تورکدا و کــوردیش ئــەو ڕاســتیەی بەباشــی بــۆ ڕوونبــووەوە بۆیــە کەوتــە خــۆی بــۆ پارێزگــاریکردن لــەخۆی و نیشــتمانەکەی و جموجــوڵی ئــەمجارەی بــۆ ڕوبەڕوبونــەوەی تــورك شــێوەیەکی فراوانتری گرتەبــەر و بــۆ یەکــەمجار لــەباکوری کوردستاندا شۆڕشێك بــەرپاکرا بــەپێی نەخشــەیەك کــە لەلایــەن حیزبێکــەوە یــان (کۆمــەڵێك)ەوە سەرپەرشتیکردنی بــەجێهێنانی دەکــرا کــە بریتــی بــوو لەکۆمــەڵی (ئازادی).

هەرچــەند ئــەم کۆمەڵــە لەســەرەتادا لەچالاکیدا بــوو وەکــو لەشــوێنی خۆیــدا باسیدەکەین، بەڵام شۆڕشەکە هێشتا لەسەرەتایدا بوو ژمارەیەك لەسەرکردەکانی گیران و هەڵواسران و کوردێکی زۆریش لەوانەی ئومێد وابوو لەو شۆڕشە تازەیەدا کــە بەشۆڕشــی (پــیران) ناســراوە، لەناســکترین کاتــدا لەشــۆڕش دوورکەوتنــەوە و هەندێکیشیان لــەجیاتی ئــەوەی تاســەر لەگــەڵ شۆڕشدا خــەبات بکــەن چوونەپاڵ دوژمن و ئــەنجامی ئــەم شۆڕشــەش بەداخــەوە وەکــو شۆڕشــەکانی تــری لێهــات کــە ســەرکردایەتیەکی لێوەشاوەی ئــەوتۆی نــەبوو بتوانێــت زۆربــەی جــەماوەری کــورد لەخۆی کۆبکاتەوە و شارەزایی نەبوو لەکاروباری لەشکرکێشیدا و شۆڕشــەکە بــوو بــەوەی چــەند ســەرۆکێکی ئــاینی و عەشــایری سەرپەرشــتی بکــەن، هەرچــەندە زۆربەی ئــەو ســەرکردانە بەوپــەڕی دڵسۆزی و لەخۆبوردنــەوە چووبوونە پێشەوە، بــەڵام هەوڵــەکانیان بێســوود بــوو وەکــو لەباســەکانی داهــاتووی ئــەم بەشــەدا ڕووندەبێتەوە.

دەتوانین باسی شۆڕشەکە و هۆی دەستپێکردنی و چۆنیەتی دەستپێکردنی و قۆناغەکانی و هەڵە و ناڕێکیەکانی و شکاندنی و سەرەنجامی ئەو شکاندنە بکەین بەم باسانەی خوارەوە:

١-بنەماڵەی شێخ سەعیدی پیران-کە شێخ سەعید سەرکردەی شۆڕشەکە بووە.

٢-هەڵوێستی حکومەتی تورک بەرامبەر بەکورد لەو ناوچەیەدا کە شۆڕشی تیادا بەرپاکرا، بەرلەوەی شۆڕشەکە دەستپێبکات و لەکاتی شۆڕشەکەشدا.

٣-کۆمەڵی ئازادی، چۆنیەتی پێکهاتنی، ئەندامەکانی.

٤-ڕووداوی (بیت الشباب) کە بوو بەهۆی ئەوەی شۆڕشی پیران پێشوەخت دەستپێبکات.

٥-هەڵوێستی تورک دوای (بيت الشباب) و ڕووداوەکەی پیران.

٦-خۆئامادەکردنی کورد بۆ ڕووبەڕووبونەوەی هێزی حکومەت و دەستپێکردنی شۆڕشی پیران و شکاندنی شۆڕشی پیران و دەستگیرکردنی سەرکردەکانی.

٧-هەڵوێستی حکومەت بەرامبەر بەشۆڕشگێڕان و بەرامبەر دانیشتوان دوای شکاندنی شۆڕشەکە:

أ-دادگایکردنی شۆڕشگێڕان.

ب-سزادانی دانیشتوان و ڕاگویزانی بەکۆمەڵ.

٨-هەڵوێستی دەوڵەتان بەرامبەر کورد لەشۆڕشەکەدا:

أ-هەڵوێستی سۆڤیەت.

ب-هەڵوێستی حکومەتی بەریتانیا.

ج-هەڵوێستی حکومەتی فەرەنسا.

٩-بارودۆخی ناوچەکانی شۆڕشی پیران لەدوای شکانی شۆڕش.

١٠-هەڵسەنگاندنی شۆڕشەکە و هۆی سەرنەکەوتنی و کەموکوڕیەکانی و ئەو ڕەخنانەی لەشۆڕشەکە گیراوە.

# باسی یەکەمی بەشی دەهەم

## بنەماڵەی شێخانی پیران-کە شێخ سەعید سەرکردەی شۆڕشەکە بوو

بنەماڵەی شێخانی پیران یەکێك بوون لەو بنەماڵە ناسراو و بەناوبانگانەی باکوری کوردستان کە لەناو کۆمەڵگاکانی باکوری کوردستاندا شوێنێکی ڕێزلێگیراو و تایبەتیان هەبووە لەپێناوی مافی کورددا خەباتێکی سەختیان کردووە و زیانێکی ماڵی و گیانی زۆریان لێکەوتوە.

هەرچەند شێخ سەعیدی پیران بەر لەشەڕی جیهانی و لەویش بەدواوە وەکو کوردێکی پاکی دڵسۆز لەناو کورددا شوێنی تایبەتی خۆی هەبووە، بەلاَم بەداخەوە لەو هەموو ڕاپەڕین و بزوتنەوانەی (مەلاتیە و دەرسیم و کوجگیری)دا هیچ هەنگاوێکی نەنابوو بۆ هاوکاریکردن لەو بزوتنەوانەدا کە دژی تورکە کەمالیەکان لەو ناوچانەدا کرابوون و هەر ئەم بەشدارنەبوونەش کە وای لەدانیشتوانی ئەو ناوچانەی بەر لەشۆڕشی پیران دژی تورك ڕاپەڕیبوون ئەوانیش لەکاتی شۆڕشی پیراندا نەك هەر ئەرکی سەرشانی خۆیان وەکو بەشێك لەمیللەتی کوردی چەوساوە بەجێنەهێنابوو، بەڵکو لەشوێنی خۆیدا ڕووندەبێتەوە ئەوانەی لەو ناوچانەدا لەئاینزای عەلەوی بوون و شێخ سەعیدی پیران و تاقمەکەشی لەئاینزای سونی بوون وەکو ڕەوشت و ڕەفتاری زۆر کاتی پیشەی میللەتی دواکەوتوو، بەهیچ جۆرێك خەمی ئەوەیان نەخواردبوو هاوکاری لەشۆڕشی پیراندا بکەن بەڵکو زۆریان دژی وەستابوون و بووبوون بەلایەنگری حکومەتی تورك. دەربارەی بنەماڵەی شێخانی پیران، وەکو سەرچاوەکان باسیانکردووە لەسەرنەوەن ناوبانگێتی ئەم بنەماڵەیە لە(شێخ عەلی) باپیری شێخ سەعیدەوە دەستپێکردووە.

ڕۆبەرت ئولسون لەلاپەڕە (٩٩)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٥٠ وا باسکراوە کە شێخ عەلی لەناوەڕاستی سەدەی هەژدەدا چۆتە (Palu–پالو) و لەوێ ئەرکی شێخایەتی بەجێهێناوە، بەلاَم ساتێك کێشە لەنێوان ئاغاکان و بەگەکانی ئەوێدا ڕوویدا کە شێخ عەلی ڕۆڵێکی گەورەی بینیوە لەڕوودانی ئەو کێشەیەدا ئیتر ناچاربووە (پالو) بەجێبێڵێت و ڕوویکردۆتە (Hinis–هینس) کە شوێنێکە لەناوچەی ئەرزڕوم و لەدوایئەوەی ژنیهێناوە لەوێ توانیویەتی کاربکاتە سەر

هەردوولا (مەبەست ئاغا و بەگەکانی پالو بووە) و لەسەر داخوازی هەردوولا جارێکی تر شێخ عەلی گەڕاوەتەوە بۆ پالو (دیارە شێخ عەلی ئاشتیکردونەتەوە).

بەپێی کتێبەکەی (ڕۆبەرت ئولسون) شێخ عەلی باپیری شێخ سەعید پێنج کوڕی هەبووە گەورەکەیان (مەحمود) بووە کە باوکی شێخ سەعید بووە و لەدوای مردنی شێخ عەلی گۆڕەکەی بووە بەمەزارێکی پیرۆز و هەروەکو پیاوچاك (Sant- قدیس) سەیری گۆڕەکەی دەکرا و بەمەزاران خەڵك دەچوونە زیارەتی مەزارەکەی و دیاری و بەراتیان دەبرد بۆ بنەماڵەکەی و بەمە ئەو بنەماڵەیە ئەوەندەی تر بوون بەدەستڕۆیشتوو و دەسەڵاتدار.

بەڵام (د. عوسمان عەلی) لەژمارە (١٤)ی گۆڤاری (ئاڵای ئیسلامی) ساڵی ١٩٩٨ ئاماژەی بۆ بۆچونێکی (عبدالملك فرات) کردووە، کە دکتۆر عوسمان عەلی دەڵێ (عبدالملك فرات) کوڕەزای شێخ سەعید بووە، بەپێی ئەوەی (عبدالملك فرات)، شێخ عەلی بە(شيخ علي السبطي نقشبندي) ناسراوبووە-کە سبط گوندێکە نزیکی دیاربەکر-لەگوندی (پالو) کە سەر بەویلایەتی (غنج) بووە، توانیبووی (زازا)کان لەخۆی نزیکبکاتەوە. دەربارەی (عبدالملك فرات) خۆی کە سەرچاوە/١٠٩ وەکو دکتۆر عوسمان وتویەتی کوڕەزای شێخ سەعید بووە، ڕۆبەرت ئولسون لەکتێبەکەیدا (بنەماڵەی شێخی پیران) سەرچاوە/٥٠ وتویەتی: (عبدالملك فرات) کە دایکی ناوی (عائشە هانم) بووە، عائشە خانم کچی شێخ سەعید بووە و خێزانی (شێخ صباح الدین)ی کوڕی شێخ (بهاء الدین) برای شێخ سەعید بووە (وەکو لەدواییدا باسدەکرێت شێخ (بهاء الدین) لەلایەن تورکەکانەوە لەماڵی خۆیاندا لەمینس شەهیدکراوە، بەپێی ئەمەی ڕۆبەرت ئولسون دەبێ (عبدالملك فرات) کچەزای شێخ سەعید بووە و برازازاشی بووە.

دەربارەی ناوی باوکی شێخ سەعید کە (مەحمود) بووە، پرۆفیسۆر حەسرەتیان لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٤٩ لەو باسەی ڕۆژهەڵاتناسەکانی ڕوس ئامادەیانکردووە (سەرچاوە/٦٣) هەردووکیان بۆچوونیان وەکو ڕۆبەرت ئولسون وایە، بەڵام هەروەکو (حامید گەوهەری) لەوەرگێڕانی کتێبەکەی (حسن عرفە) بۆ زمانی فارسی (کورد از بیرون)، چاپی سوید، (١٩٨٥) لەلاپەڕە (٥٠)دا بەهەڵە وتراوە شێخ سەعید کوڕی عەلی ئەفەندی بووە کە لەڕاستیدا کوڕەزای بووە.

(کریس کوچرا)ش لەپەراوێزی لاپەڕە (١٣٨)ی کتێبە وەرگێراوەکەیدا بۆ کوردی لەلایەن (محمد ریانی) سەرچاوە/٤١ هەمان شتی ئەوەی (حامید گەوهەری) دوبارەکردۆتەوە کە بەپێی بۆچوونی ئەم دوو سەرچاوەیەی دوایی

باوکی شێخ سەعید و باپیریشی هەردووکیان ناویان (عەلی) بووە. ڕۆبەرت ئۆلسون لەکتێبەکەی تریدا سەرچاوە/٨٤ وتویەتی شێخ سەعید لەساڵی ١٨٦٥دا لەدایکبووە، بەپێی ئەمە دەبێ کە ساتێك شۆڕشی پیران لەساڵی ١٩٢٥دا دەستپێکردووە تەمەنی (٦٠) ساڵ بووبێت، بەپێی ئەم کتێبەی ڕۆبەرت ئۆلسون لەدوای لەدایکبوونی شێخ سەعید بەماوەیەك شێخ مەحمود گەڕاوەتەوە بۆ (هینس) کە تەکیەی شێخ عەلی لێبووە کە وەختی خۆی دروستیکردبوو، لەوێ شێخ سەعید لەژێر چاودێری باوکیدا قورئانی تەواوکردووە لەگەڵ کتێبە زانیاریە ئاینیەکاندا.

دوایئەوەی شێخ مەحمود کۆچی دوایی دەکات، شێخ سەعید جێگەی دەگرێتەوە و دەبێتە گەورەی ئەو بنەماڵەیە و بەسەرپەرشتیکەری تەکیەکەی باپیری و لەساڵی ١٩٠٧دا گەشتێك دەکات بەویلایەتەکانی ڕۆژهەڵاتدا و ئاشنایەتی پەیدادەکات لەگەڵ تاقمی حەمیدیەدا (مەبەست سوارەی حەمیدیە)یە، لەو ڕۆژانەدا نازناوی (بدیع الزمان)ی پێدراوە. ئەم نازناوە لەدوای (بدیع الزمان الهمدانی)یەوە بەچەند زانایەك دراوە کە شێخ سەعید یەکێك بووە لەوانە و لەبەرگی یەکەمدا باسی مەلا سەعیدی نەورەسیش کراوە کە هەمان نازناوی هەبووە.

دەربارەی ئەو نازناوەی شێخ سەعید، لەدوای گرتنی شێخ سەعید پاش شکانی شۆڕشەکەی، پیرەمێردی شاعیر کە دۆستی شێخ سەعید بووە بەشیعرێك باسی شێخ سەعیدی کردووە کە وتویەتی:

| | |
|---|---|
| کاك ئەحمەدەکەی خۆشەویستی خوا | زۆر کەس لەسایەی تۆوە نان دەخوا |
| کە لەزیندانیان تێکخزاندوین | سێدارەیان بۆ داچەقاندبووین |
| تۆ چووبوویتە لای (بدیع الزمان) | مژدەت دابوویە بەژیان و مان |

ڕۆبەرت ئۆلسون لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٥٠ باسی براکانی شێخ سەعیدی بەم جۆرە باسکردووە:

١-شێخ عادل-کە لەشەڕێکدا لەنزیکی (حەلەب) شەهیدکراوە.

٢-بهاو الدین-لەهینسدا شەهیدکراوە (بەرلەمە وتمان بهاو الدین باپیری عبدالملك فرات بووە).

٣-عبدالرحیم-لەبۆتان کۆچی دوایی کردووە (لەباسی دەهەمدا باسدەکرێت لە ١٩٣٧/٦/١٩ لەسێدارە دراوە).

٤-مەهدی.
٥-تاهیر.

لەهـەمان کتێبـی ڕۆبـەرت ئولسـون کـە لـەگۆڤاری (کوردنامـە)دا هەنـدێکی باسکراوە، ژمارە (٢،٣)، ئەیلولی ١٩٩٥ وتویەتی شێخ سەعید چوار کچ و شەش کوڕی هەبووە (لەبەشی نۆهەمی ئەم بەرگەدا-بارودۆخی ناوچەکە دوای شکاندنی شۆڕشەکە) باسی ئەو کەسوکارانەی شێخ سەعید دەکەین کە ڕۆبەرت ئولسون ئاماژەی بۆ کردون چییان بەسەرهاتووە.

ڕۆبـەرت ئولسـون لەباسـەکەیدا وتویـەتی شـێخ سـەعید کـارێکی وایکردبـوو کچەکانی خۆی ئەدا بەکوڕە شێخەکان مارەیان بکەن و بۆ براکانیشی ژن لەوان بێنن و کچی سەرۆك عەشایرەکان مارەبکەن بۆئەوەی دەسەڵاتی بنەماڵەکەیان بەهێزبێت و بەهۆی ئەو خزمایەتیە تازانەوە لایەنگر بۆ خۆی زۆربکات و خۆی کچێکی لەکرمانجیەکان هێنابوو کە لەعەشیرەتی (جبران) بوو بۆئەوەی سنوری دەسەڵاتی لەسنوری ناوچەکانی زازاش تێپەڕبکات کە ئەو ژنەی پوری خالید بەگ جبران بوو.

لەساڵی ١٩٢٥ کە شۆڕشەکەی دەستپێکرد هێشتا مرۆڤێکی بەتوانا و لەش ساغ بوو، پیاوێکی قۆز بوو، ڕیشی لەخەنە دەگرت و کلیشی دەکردە چاوی (لای هەندێ لەپیاوە ئاینیەکان کل شتێکی پیرۆز بوو لەکێوی تورەوە دەهێنرا). شێخ سەعید لەو ڕۆژانەدا بەدەوڵەمەندترین کەس دەژمێردرا لەکوردستاندا، نزیکەی سەدوبیست شوان سەرپەرشتی مەڕومالآت و گاوگۆتاڵەکەیان دەکرد و دەیانبردن بۆ شوێنی لەوەڕ کە لەوەڕگاکانی لەنێوان (پالو-هینس)دا بوو.

بەوپێیە شێخ سەعید لەدەوروبەری دیاربەکرەوە هەتا (حەلەب) بەپیاوێکی بەتوانا و دەسەڵاتدار ناوبانگی دەرکردبوو (دەربارەی ئەو مەڕومالآتە زۆرەی شێخ سەعید لەسەرچاوە/١٠٩دا لەگۆڤاری ئالأی ئیسلامدا باسی ئەوە کراوە کە ساتێك شێخ سەعید هەستی بەوەکردبوو تورکەکان نیازیان باش نەبوو لەگەڵیدا و خەریکبوون بیدەن بەدادگا، عەلی ڕەزای کوڕی ناردبوو بۆ حەلەب بۆئەوەی (٢٠) ڕانەمەڕ لەڕانەکانی بفرۆشێت بۆئەوەی پارەکەی تەرخان بکات بۆ پێویستیەکانی ئەو شۆڕشەی چارنەبوو دەبوایە لەگەڵ تورکەکان بیکردایە.

ڕۆبەرت ئولسون لەهەمان باسیدا لەسەرچاوە/٥٠ ئاماژەی بۆ باسێکی (مەلا حەسەن) ناوێك کردووە کە بۆ (مارتن ڤان برونسون)ی گێڕابووەوە کە وتبووی:

((شێخ سەعید مرۆڤێکی نەتەوەپەرست (Nationalist) بوو، هیچ کەسێکی بەفریو نەئەدا بۆ سودی تایبەتی خۆی و ڕەخنەیەکی زۆریشی لەو شێخانەی تری نەقشبەندی گرتبوو کە هەستی نەتەوایەتی کوردیان بایەخ پێنەدابوو، تەنها هەر بەو شتانەوە خەریك بوون کە سوودی تایبەتی خۆیانی تیادابوو، هەندێکیانی زۆرتر بەچەتە و ڕێگر دادەنا وەك لەوەی کاروباری ئاینی بەباشی و لەڕێگەی ڕاست و دروستەوە بەجێبێنن)).

دەربارەی ئەو هەستەی شێخ سەعید و ئەو بۆچونەی کە وەکو (مەلا حەسەن) باسیکردووە، شیعرێکی چوارخشتەکی (مەحوی) شاعیرم هاتەوە بیر کە ئەویش ڕەخنەی لەو جۆرە شێخانە بەم شێوەیە گرتووە:

شێخێک هەمەوەندێکی دەدا پەند و نەصیحەت
ئەو قورپەسەرەی دابووەبەر فەحش و فضیحت
خۆشی هاتەجواب و وتی: تۆ هەقتە فەقەت من
قطاعی طریقم نەکو قطاعی طریقەت

## باسی دوهەمی بەشی دەهەم

### هەڵوێستی حکومەت بەرامبەر کوردی ناوچەکە

### بەر لەشۆڕش و لەکاتی دەستپێکردنیدا

لەو باسەی سەرچاوە/٥٠دا ئاماژەی بۆ باسێکی (قاسم فرات) کردووە، کە ئەو باسەی (قاسم فرات) لەلایەن (میدیا غونشی)یەوە لەئەستەمبوڵ لەساڵی (١٩٩٥)دا بڵاوکراوەتەوە و وەرگێڕاوە کە لەگۆڤاری کوردنامەی ژمارە (٢،٣)ی ساڵی ١٩٩٥دا بڵاوبوەتەوە لەمانگەکانی تەموز و ئەیلولدا، بەپێی ئەوە (قاسم فرات) دەربارەی شێخ سەعیدی باپیری وتویەتی: ((بزوتنەوەکەی شێخ سەعید بزوتنەوەیەکی نەتەوایەتی و شۆڕشێکی نەتەوایەتی بوو هەرچەند هەوێنی بزوتنەوەکە بریتی بووە لەهەستێکی ئاینی. شێخ سەعید دژی ئەو یاسایانە ڕاپەڕیبوو کە مستەفا کەمال لەساڵی (١٩٢٤)دا دەریکردبوو بەپێی ئەو یاسایانە ئینکاری بوونی کوردی کردبوو، ئەمە بوو بەهۆی ئەوەی شێخ سەعید و هاوکار و هاوبیرەکانی خۆیان پێنەگیرێت و دەستبکەن بەشۆڕش. بەپێی دەستورەکەی مستەفا کەمال هەموو دانیشتوانی تورکیا دەبوایە خۆیان بەنەتەوەی تورك دابنێن و پێویست بوو هەموویان تەنها هەر بەزمانی تورکی قسەبکەن و بناغەی کۆمارەکەی لەسەرئەوە داڕێژرابوو میللەتی کورد لەبۆتەی تورکدا بتوێنرێتەوە، شێخ سەعیدیش وەکو ئەو هەموو کوردەی ناڕەزایی و بێزاری خۆیان بەرامبەر بەوە دەربڕیبوو بێدەنگ نەبوو، بۆیە ڕاپەڕینی کوردی بەجیهادێکی ئیسلامی دەزانی و ئەگەر بەرامبەر بەو تاوانە بێدەنگ بوایە خۆی بەگوناهکار دەژمارد و لەڕۆژی قیامەتدا بەرامبەر بەو بێدەنگیەی لێپرسینەوەی بەرامبەر دەکرا، بۆیە خۆی پێنەگیرا و بەئاشکرا بڕیاریدا بەرامبەر بەو زوڵم و ستەمە نەوەستێ و ئیعلانی جیهادی کرد)).

دەربارەی ئەو یاسا ناڕەوایەی بووبوو بەهۆی بێزاربوونی شێخ سەعید بەرامبەر بەڕەفتاری تورکەکان کە هەرچەند دەبوایە دەمێك بوایە هەر لەبزوتنەوەکەی (مەلاتیە-دەرسیم-کوجگیری)یەوە بێدەنگ نەبوایە کە نیازی تورکەکان ئاشکرابووبوون، بەڵام وادیارە دەرچوونی ئەو یاسایە هۆیەکی کاریگەر بووە بۆ بزواندنی هەستی شێخ سەعید و هاوکارەکانی و دەربارەی ئەو یاسایە لەدوو سەرچاوەدا کە بریتی بوون لەکتێبەکەی (مارتن ڤان برونسون) و کتێبەکەی

(ڕۆبەرت ئولسون) بەدوورودرێژی باسی ئەو یاسایە کراوە، لاموایە سەرچاوەی هەردووکیشیان هەر بریتی بێت لەدوکیومێنتی ژمارە (Fo.٢٧١-E.١١٩٣-H٩٣/٦٥) ساڵی (١٩٢٤)ی ناو ئەرشیفی بەریتانیا کە لەو دوکیومێنتەدا باسی سکالایەکی ئەندامانی کۆمەڵی (ئازادی) تیاداکراوە کە بریتیە لەوەی لەو دوکیومێنتەدا وتراوە کە ڕۆبەرت ئولسون هەمووی باسکردووە: ئەفسەرە کوردەکان (بێگومان مەبەستی ئەو ئەفسەرە کوردانە بووە کە لەکۆمەڵی ئازادیدا بوون)، یازدە هۆی سیاسیان خستبووە بەرچاو کە وای لەکورد کردبوو خۆیان ئامادەبکەن بۆ ڕووبەڕووبونەوەی سیاسەتی تورکەکان کە بەپێی ئەو سیاسەتەیان نەخشەیەکیان ئامادەکردبوو چۆن کورد ڕەفتاری لەگەڵدا بکرێت و لەبۆتەی نەتەوەی تورکدا بتوێنرێتەوە، کە ئەو یازدە هۆیانە بریتی بوون لە:

١-بەپێی ئەو یاسایەی حکومەتی تورکیا دەربارەی کەمەنەتەوەکان دەریکردبوو، حکومەت نەخشەی ئەوەی کێشابوو بەشێنەیی و بەپێی ئەو پرۆگرامەی ئامادەکرابوو کوردەکان لەناوچەکانی ڕۆژهەڵاتەوە بەکۆمەڵ بگوێزرێنەوە بۆ ناوچەکانی ڕۆژئاوای ئەناتولیا و تورک بهێنرێتە جێگەیان و لەشوێنی ئەواندا نیشتەجێبکرێن کە لەو ڕۆژانەدا ئەو تورکانەی لەکۆسۆڤۆ و ئەلبانیاوە بۆ ئەو مەبەستە بهێنرێن.

٢-هەڵوەشانەوەی خەلافەت بووبوو بەهۆی هەڵوەشانی ئەو شیرازەیەی تا ئەو ڕۆژە تورک و کوردی پێکەوە گرێدابوو.

٣-قەدەغەکردنی بەکارهێنانی زمانی کوردی و ناچارکردنی کورد کە دەبوایە لەناو دادگاکان و لەقوتابخانەکاندا تەنها هەر بەتورکی بێت، بەئاشکرا هەڕەشەکردنێکی تەواوبوو لەبوونی نەتەوەی کورد و لەتوانەوەیدا لەناو بۆتەی نەتەوەی تورکدا، بەتایبەتی داخستنی قوتابخانە ئاینیەکان کە تەنها شوێنێك بوون لەناویدا کورد دەرفەتی ئەوەی هەبێت بەزمانی خۆی دەرسی تیابخوێنێت و قسەی تیادابکات.

٤-قەدەغەکردنی ناوهێنانی وشەی کورد و کوردستان و گۆڕینی گەلێك شوێن کە ناوەکانیان ناوێکی کوردی بوون و کران بەتورکی، نیازێکی تری تورکی ئاشکراکرد بۆ لەناوبردنی کورد.

٥-فەرمانبەرە گەورەکان بۆ ناوچەکانی کوردستان وەکو والی و موتەسەڕیف تەنها هەر لەوانە دادەنران کە تورکی نەژاد بوونایە و لابردن و دورخستنەوەی

فەرمانبەرانی کورد بۆ شوێنە دوورەکان لەسەرەتادا و لابردنیان بۆ ئێجگاری لەپاش ماوەیەك کارێکی وایکردبوو کورد لەناو دەزگاکانی حکومەتدا نەمێنێت.

٦-ئەو هەموو باج و ڕەسمانەی لەدانیشتوانی ناوچە کوردنشینەکان دەسێنرا هیچی بۆ سودی ئەو دانیشتوانە تەرخان نەدەکرا و لەدادگاکاندا هیچ کەسێك بەبێ دانی بەرتیل بەکاربەدەستانی تورك مافی خۆی دەستگیرنابێتەوە.

٧-لەهەڵبژاردنی نوێنەرانی ویلایەتەکان لەناوچە کوردیەکاندا بۆ ئەنجومەنی ویلایەتەکە، حکومەت تەنها هەر ڕێگە بەوانە ئەدات هەڵبژێردرێن کە بەرەگەز تورك بن.

٨-سیاسەتی حکومەت بۆ تێکدانی عەشیرەتەکانی کورد لەناو خۆیاندا و هاندانی لایەك کە بچێت بەگژ لایەکی تردا بووە بەپیشەی حکومەت و ڕێگە لەوە دەگیرێت کە هیچ کوردێك هاوکاری لەگەڵ لایەکی تری کورددا بکات.

٩-هێرشبردن و دەستدرێژیکردنی سەربازەکانی تورك بۆ سەر دانیشتوانی ناوچە کوردن[illegible]ەکان بەبیانوی پشکنین و گەڕان بەدوای سەربازی ئیجباریدا ڕێگەی بۆ ئەو سەربازانە خۆشکردوە بەئارەزوی خۆیان سەرانە و بەرتیل لەخەڵك بسێنن و تالآنیان بکەن.

١٠-ئەو کوردانەی دەکرێن بەسەربازی ئیجباری لەناو سوپادا بەرپەری خراپی و بێویژدانیەوە ڕەفتاریان لەگەڵدا دەکرێت و سوکایەتیان پێدەکرێت و قورسترین و گرانترین ئەرکیان پێدەسپێردرێت.

١١-هەرچی سامانی کانەکانزاکانی کوردستانە هەمووی خراوەتە ژێر دەستی سەرمایەدارانی حکومەتی ئەڵمانیا و کورد لەهیچ کارێکدا ڕێگەی ئیشی پێنادرێت و هیچ سودێکی لێدەستگیرنابێت.

ڕۆبەرت ئولسون لەلاپەرە (١٩٣)ی سەرچاوە/٨٤دا بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی هەڵوێستی حکومەت ئاماژەی بۆ کتێبەکەی (مارتن ڤان برونسون) کردووە کە وتویەتی: لەڕاپۆرتێکی حکومەتی تورکیادا کە لەڕۆژی ١٩٢٤/١١/٨دا دەرچووە، باسی ئەوەی کردووە چۆن حکومەت کوردەکانی ناچارکردبوو هەموو دەغڵودانەکانیان بەزۆرەملێ بگوێزنەوە بۆ ناو عەمارەکانی حکومەت بەبیانوی ئەوەی ئەو دەغڵودانانەیان لێدەکڕێ و ئەو پسولانەی دەدران بەخاوەنەکانیان دەربارەی کێشی ئەو دانەوێڵە وەرگیراوانە هەمیشە بەکەمتر دەنوسران لەپسولەکاندا وەك لەکێشی ڕاستی و لەدانی پارەکەشیدا فروفێڵێکی زۆریان

لێدەکرا. شانبەشانی ئەمەش کاربەدەستانی حکومەت بۆ گواستنەوە کەلوپەلی خۆیان کوردەکانیان ناچاردەکرد ولاٌخیان بەخۆڕایی بۆ ئامادەبکەن بۆ ئەو گواستنەوەیە.

ڕۆبەرت ئولسون لەباسەکەیدا ئەڵێ بەرلەوەی کوردەکان ئەو یازدە هۆیەی وایلێکردبوون بێزاری خۆیان دەربڕن بەرامبەر بەحکومەت، حکومەتی تورك دوو یاسایان دەرکردبوو کە بریتی بوون لە:

١-لە ١٩٢٤/٢/٢٥دا لەهەموو ناوچەکانی ڕۆژهەلاٌتدا ئیعلانی عورفی کرا.

٢-لە ١٩٢٤/٤/٤دا ئەنجومەنی بالاٌی میللی بڕیار و یاسایەکی تریان دەرکرد ناوینرا (قانون استقلال) و بەپێی ئەمە هەموو جۆرە دەسەلاٌتێکی بێسنور درا بەو دادگایانەی لەئەنقەرە و دیاربەکر پێکهات و ئەوەی دیاربەکر بەسەرۆکایەتی (مەزهەر مفید) بوو کە خەڵکی (Donzil) بوو کە لەدواییدا ئەم دادگایە تەرخانکرا بۆ دادگاکردنی کورد وەکو لەکۆتایی شۆڕشی پیراندا باسدەکرێت.

## باسی سێههمی بهشی دهههم

### کۆمهڵی ئازادی، چۆنیهتی پێکهاتنی، ئهندامهکانی

لهبهشی سێههمی ئهم بهرگهدا بهدووروودرێژی باسی ئهو کۆمهڵ و ڕێکخراوه کوردیانهمان کرد که لهدوای شهڕی یهکهم لهباکوری کوردستاندا پێکهات که گهورهترین ئهو کۆمهڵ و ڕێکخراوانه بریتی بوو له(کورد تعاون و تعالی جمعیتی) بهسهرۆکایهتی شێخ عهبدولقادری شهمزینی و ئهمین عالی بهدرخان جێگری بوو، بهڵام بهداخهوه زۆری پێنهچوو ئهو کۆمهڵه لهناوخۆیدا بوو بهدوو بهشهوه و هیچ بهشێکیشیان لهبهر دوبهرهکی و ناکۆکی لهگهڵ لاکهی تردا نهپهرژانه سهرئهوهی کارێکی ئهوتۆ بکات سوود لهو ههل و دهرفهته لهباره وهربگرێت که بۆ کورد ڕهخسابوو، که ساتێك تورکهکان لهبهڵێنهکانیان پاشگهزبوونهوه ههروهکو لهبهشی ههشتهمدا باسمانکرد ساتێك کورد بهناچاری لهبزوتنهوه و ڕاپهڕینهکانی مهلاتیه و دهرسیم و کوجگیریدا ڕووبهڕووی سوپای تورك بووهوه، کورد ڕێکخراوێك یان کۆمهڵێکی سیاسی نهبوو سهرپهرشتی ئهو ڕاپهڕینانهی بکات بۆیه هیچیان لهسنوری بزوتنهوهیهکی ناوچهیی بهولاوه تێپهڕی نهکرد و کورد لهئهنجامی ههر سێ ڕاپهڕینهکهدا لهماڵکاولی و زیان بهولاوه هیچی تری دهستگیرنهبوو.

ساتێك کورد بهخۆی زانی ئهوا تورك بهئاشکرا خهریکه دهست دهخاته بینهقاقای و نیازیوایه بۆ ئێجگاری لهناویببات، ههندێ لهسیاسهتمهدارانی کورد لهوانهی دهرسیان لهسهرنهکهوتنهکانی ئهو سێ بزوتنهوهیه وهرگرتبوو، بیریان لهوه کردبووهوه ههر ڕاپهڕین و شۆڕشێکی تر بهبێئهوهی لهلایهن ڕێکخراوێکی سیاسیهوه سهرپهرشتی بکرێت بێئهنجام دهبێت و سهرناگرێت، بۆیه بیر لهپێکهێنانی (کۆمهڵی ئازادی) کرایهوه، ههرچهند بهداخهوه ئهم کۆمهڵهش بهرلهوهی بتوانێت کاروباری شۆڕش بباتبهڕێوه و سهرپهرشتی بکات حکومهت ئاگاداری چالاکیهکانی ئهو کۆمهڵه و ئهندامهکانی بوو، بۆیه بهرلهوهی شۆڕشهکه دهستپێبکات، ئهندامه چالاکهکانی سهرکردایهتی ئهو شۆڕشهی گرت و لهسێدارهیدان و لهئهنجامدا ئهمهی شۆڕشی پیرانی لێپهیدابوو، سهرهنجامهکهی ههروهکو ئهوهی کوجگیری بهسهرداهات ئهگهرچی شۆڕشی پیران بهقهواره و

بەژمارەی شۆڕشگێڕ و چەکدارەکانی زۆر جیاوازبوو لەوانەی بەرلەخۆی، کە لەدوا باسێکدا کە بۆ شۆڕشی پیران تەرخانکراوە دەچینەوە سەر ئەم باسە.

دەربارەی چۆنیەتی دروستبونی کۆمەڵی ئازادی و ئەندامەکانی و چالاکیەکانی و کاتی دامەزراندنی گەلێك سەرچاوە باسیانکردوە، مارتن ڤان برونسون و (Gerard Benecke) لەباسەکەیاندا سەرچاوە/١٠٥دا وتویانە کۆمەڵی ئازادی لەساڵی ١٩٢٣دا پێکهاتبوو، بەڵام ڕۆبەرت ئولسون لەلاپەڕە (٤١)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٨٤ وتویەتی ئەو سەربازانەی کورد کە بەشداربوون لەڕووداوەکەی (بیت الشباب)دا لەڕۆژی ١٩٢٤/٩/٤دا وتویانە کۆمەڵی ئازادی لەساڵی ١٩٢١دا دروستبوو (ئەو هەموو سەرچاوانە باسی کۆمەڵ و ڕێکخراوەکانی باکوری کوردستانیان کردووە و ئێمە لەباسی دوهەمی بەشی سێهەمی ئەم بەرگەدا باسمانکردون، هیچ سەرچاوەیەکم نەدی باسی دامەزراندنی کۆمەڵێکیان کردبێت بەناوی ئازادیەوە لەساڵی ١٩٢١دا.

بەڵام پرۆفیسۆر حەسرەتیان کە (باقی نازی) کتێبەکەی لەڕوسیەوە کردووە بەعەرەبی سەرچاوە/٤٩ لەو وەرگێڕاوەدا کۆمەڵەی ئازادی بە(جمعية استقلال) ناوبردووە، بەرامبەر بەو ڕۆبەرت ئولسون لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٨٤ کۆمەڵەکەی بە(Jewata Azadi Kurd–جڤاتا ئازادی کورد) ناوهێناوە و بەئینگلیزیەکەی بەرامبەر بەو ناوە بە(Society for Kurdish Freedom) ناوبردووە کە کوردیەکەی (سەربەستی و ئازادی) دەگرێتەوە و دوورنیێە لەوەرگێڕانی ڕوسیەکەی حەسرەتیانەوە بۆ عەرەبی ڕەنگە لەڕووسیەکەدا هەر بەمەبەستی ئازادی بووبێت کە لەعەرەبیەکەدا بووە بە(استقلال).

دەربارەی کۆمەڵی ئازادی و ئەندامەکانی و سەرکردایەتی کۆمەڵەکە، لەسەرچاوەکاندا وا دەردەکەوێت (خالید بەگ جبران) نەخشەکێشی دامەزراندنی کۆمەڵەکە بووە بەهاوکاری (یوسف ضیاء بەگ) کە دیارە ئەندامی سەرکردایەتی کۆمەڵەکە بووە. هەروەکو پرۆفیسۆر حەسرەتیان لەکتێبەکەیدا ئاماژەی بۆ لاپەڕە (٢٧)ی کتێبەکەی (شریف فرات) کردووە کە وتویەتی لەدوایئەوەی بەپێی بڕیاری مستەفا کەمال، (خالید بەگ جبران، یوسف ضیاء بەگ) گیران و دران بەدادگا ئیتر شێخ سەعید بووە بەسەرۆکی ئەو کۆمەڵە کە حەسرەتیان بەکۆمەڵی (استقلال) ناویهێناوە.

دەربارەی شێخ سەعید بەرلەوەی بکرێت بەسەرۆکی کۆمەڵی ئازادی، سەرچاوە/١٠٩ ئاماژەی بۆ دوکیومێنتی ژمارە (Fo.٣٧١-١٩٢٤.E١١) کردووە کە لەو دوکیومێنتەدا لەراپۆرتێکدا لەژێر ناوی (Report in Kurdish National Society) وتراوە شێخ سەعید ئەندامی کۆمەڵی ئازادی نەبووە، بەلأم پەیوەندیەکی زۆر بەهێزی هەبووە لەگەڵ (خالید بەگ جبران)دا کە ئاوەڵزاوای بووە (بەرلەمە لەباسی ژیانی شێخ سەعیددا باسی ئەوە کراوە کە شێخ سەعید پوری خالید جبرانی مارەکردبوو لەبەرئەوە نابێ ئاوەڵزاوای یەکتر بووبن، مەگەر شێخ سەعید ژنێکی تریشی بووبێت خوشکی ژنەکەی خالید جبران بووبێت کە هیچ سەرچاوەیەك باسی ئەمەی نەکردووە).

مارتن ڤان برونسون و هاورێکەی لەسەرچاوە/١٠٥دا وتویانە: ئەگەرچی ئازادی یەکەم رێکخراوی ناسیۆنالیستی کورد نەبوو، بەلأم لەرێکخراوەکانی بەرلەخۆی باشتر رێکخرابوو، زۆر لەئەندامەکانی ئەفسەری سوپا بوون یان شێخانی عەشیرەت بوون بەپێچەوانەی ئەوانیتر (مەبەست ئەو کۆمەڵ و رێکخراوە کوردیانە بووە لەدوای شەڕی جیهانی و بەرلەوەش کە لەبەرگی یەکەمدا و لەباسی دوەمی بەشی سێهەمی ئەم بەرگەدا بەدوورودرێژ باسمانکردون) کە ئەوانیتر بریتی بوون لەئەرستۆکراتیە شارنشینەکان.

پرۆفیسۆر حەسرەتیان ئاماژەی بۆ لاپەڕە (٣١١)ی کتێبەکەی (Toker Shegh Said Velsani) چاپی ئەنقەرە ساڵی ١٩٦٨ کردووە کە لەو کتێبەدا وتراوە (خالید بەگ جبران) رێبەری کۆمەڵی ئازادی توانیبووی (حاجی موسی) سەرۆکی عەشیرەتی (موتکا) لەکۆمەڵی ئازادی نزیکبکاتەوە (لەشوێنی خۆیدا باسی حاجی موسی بەگ کراوە لەکۆنگرەی ئەرزرومدا کە مستەفا کەمال نامەی تایبەتی بۆ ناردبوو لەگەڵ بڕیارەکانی ئەو کۆنگرەیەدا)، خالید بەگ هەوڵێکی زۆری دابوو سەرۆك عەشیرەتەکانی تری کوردیش لەکۆمەڵی ئازادی نزیکبکاتەوە و چەند ئەفسەرێکی کوردیش لەوانەی لەناو سوپای تورکدا مابوون بیانکات بەلایەنگری کۆمەڵی ئازادی کە چەند ئەفسەرێکی خەڵکی باشوری کوردستانیشیان تیادابوو، وە لەژوور هەموانەوە هەوڵێکی زۆری دابوو شێخ سەعید بکات بەلایەنگری کۆمەڵی ئازادی و لەهاوینی ساڵی ١٩٢٣دا (یوسف ضیاء بەگ) کە یەکێك بوو لەسەرکردەکانی کۆمەڵی ئازادی و لەسەرکردەکانی بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد لەو رۆژانەدا ناردبووی بۆ زیارەتی شێخ سەعید کە لە(خنس)دا بوو، لەوێ

(یوسف ضیاء بەگ) و شێخ سەعید لەسەر ئەوە ڕێکەوتن کە پێویستە کورد خۆی ئامادەبکات بۆ ڕاپەڕینێك بۆ ڕووبەڕووبونەوەی هەڵوێستی تورکەکان بەرامبەر کورد.

خالید بەگ جبران هەرچەند لەلایەن مستەفا کەمالەوە دوورخرابوەوە بۆ ئەرزڕوم بۆئەوەی پەیوەندی بەناوچەکانی کوردەوە نەمێنێت، بەڵام هەروەکو حەسرەتیان باسیکردوە لەزستانی (١٩٢٣-١٩٢٤)دا سەرکردەکانی کورد لە(پالو) گردبوونەوە بۆئەوەی لایەنگران کۆبکەنەوە بۆئەوەی بیروڕایان وەربگرن و هەتا دەهات ژمارەی لایەنگرانیان پەرەیدەسەند و لەبەهاری ١٩٢٤دا (یوسف ضیاء بەگ) بەناوی میوانداریێتی و سەردان چووەلای خالید جبران و هەردوکیان لەسەرئەوە ڕێکەوتن بەهاوکاری شێخ مەحمود لەباشوری کوردستاندا و لەکوردستانی ئێرانیش بەیارمەتی و هاوکاریکردنی سمکۆ بتوانن عەشایرەکان پرچەك بکەن و بڕیاریاندا یاداشتێك بدەن بە(عصبە الامم) و داوای لێبکەن یارمەتی کورد بدات و لەگەڕانەوەیدا (یوسف ضیاء بەگ) نامەیەکی خالید بەگی برد بۆ شێخ سەعید کە لە(کومسار) بوو لەناوچەی (خنس) و لەوێشەوە سەری لەچەند ناوچەیەك دا وەکو (غوکو، حاج عمر مکمان، ئوغلان، قاری، ئوفا، دارتوو، سەرۆك).

حەسرەتیان باسی چوونی (یوسف ضیاء بەگ)ی کردووە بۆ ئەستەمبوڵ بۆئەوەی لەوێ چاوی بەئەندامانی (حزبی جمهوری تقدمی) بکەوێت کە ماوەیەك بوو ئەندامەکانی لەگەڵ تاقمەکەی مستەفا کەمالدا لەسەر هەندێ شت ناڕێك بوون و ئەو حیزبە لەسەرەتادا هەڵوێستیان بەرامبەر کورد دوژمنانە نەبوو، لایەنگری ئەوە بوون ڕێز لەئاین بگیرێت و لەکاروباری وڵاتدا لامەرکەزیەت هەبێت بەئومێدی ئەوەی وەکو پێشوو لایەنگری ئەوە بن کێشەی کورد بەخۆشی چارەسەربکرێت، بەڵام کەمالیەکان لەسەرکردایەتی حیزبەکە کە (کازم قەرەبەکر پاشا)ی سەرۆك و (عەلی فوئاد پاشا)ی ئەمینی گشتی هەڵیانپێچابوون و ڕەخنەیەکی زۆریان لێگرتبوون کە هەڵوێستیان بەو شێوەیە خزمەتی کوردە یاخیبووەکان دەکات و لەئەنجامدا وایان لەوانیشکرد بەرپەری توندوتیژیەوە بیروباوەڕی خۆیان دەربڕن دژی کورد.

دەربارەی ئەندامە چالاکەکانی کۆمەڵی ئازادی، قەدری جەمیل پاشا لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٥٧ لەلاپەڕە (١٠٣) وتویەتی: پاشئەوەی لاو و ڕۆشنبیرەکانی کورد نیاز و مەبەستەکانی کەمالیەکانیان بۆ ئاشکرابوو ئیتر

لەدەوری کەسایەتیەکی ناسراوی ئەو ڕۆژانە گردبوونەوە کە خالید بەگ جبران بوو، کە جگە لەو چەند کوردێکی تریش لەچالاکیدا بوون وەکو (ئیحسان نوری پاشا) لەبەدلیس و مولازمی یەکەم ئیسماعیل حەقی شاوەیسی خەڵکی سلێمانی و خورشیدی خەڵکی (خرتو) و بەپێی بڕیاری لیژنەی ناوەندیی کۆمەڵ بڕیاردرا چەند لقێکی کۆمەڵ لەناوچە جۆر بەجۆرەکانی کوردستاندا بکرێتەوە و ئەرکی ئەو کارە سپێردرا بەئیسماعیل شاوەیس و ئەویش بۆ ئەم مەبەستە چووە دیاربەکر و لەوێ من (قەدری جەمیل پاشا) و دکتۆر فوئاد و ئەکرەمی جەمیل پاشا و قاسم بەگ و محەمەد ئەفەندی محامی (باقی توژو) و حاجی ئاغنی و ئەکرەمی جەمیل پاشا و چەند هاوڕێیەکی تر بەشداریمان کرد لەدامەزراندنی لقی دیاربەکر و لقەکە لەگەڵ مەرکەزی کۆمەڵ کە لەئەرزڕوم بوو، نامە و باسی ڕووداو و هەواڵەکانی بەشفرە دەنێردرا بۆ یەکتری و (تەیب عەلی) کە لاوێکی ئازا و لێهاتوو بوو کرا بەنوسەری لقی دیاربەکر.

دەربارەی ئیحسان نوری کە سەرچاوە/٥٧ ناویهێناوە، هەرچەند لەبەرگی سێهەمی ئەم کتێبەدا لەباسی شۆڕشی ئاراراتدا بەدوورودرێژی باسی ژیانی ئیحسان نوری سەرکردەی هێزەکانی ئارارات دەکەین، بۆیە لێرەدا تەنها ئەوی پەیوەندی بەشۆڕشی پیرانەوەیە باسیدەکەین.

ڕۆبەرت ئولسون لەلاپەڕە (١٩٤)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٨٤ لەڕیزی سەرنجەکانیدا، لەسەرنجی ژمارە (٢٦)یدا وتویەتی: لەو ڕاپۆرتەی لەلاپەڕە (٤٦)ی ناو دوکیومێنتی ژمارە (Air.٢٣-٤٣) کە لەمانگی سیپتەمبەری ١٩٢٥دا ئامادەکراوە، باسی ئیحسان نوری بەمجۆرە کردووە: ئیحسان نوری یەکێك بووە لەئەندامەکانی ڕێکخراوی (مێڤی) کە لەساڵی ١٩٠٨دا پێکهاتبوو، ساڵی (١٩١٠) کۆلێجی سەربازی تەواوکردبوو، وردە وردە پلەوپایەی لەناو سوپادا بەرەو پێشەوە چووە و لەساڵی ١٩١٩دا دژی هەندێ لەو ئەفسەرانەی لەگەڵیاندا بوو لە(غالیبولی) یاخیبوو (هیچ دوکیومێنتێك یا سەرچاوەیەکی تر باسی ئەو یاخیبوونە و هۆی یاخیبوونەکەی باسنەکردووە) و بۆ ماوەی دوو مانگ خۆی کرد بەسەرکردەی هێز و لەسزای ئەو یاخیبوونەیدا دادگاکرا و دوورخرایەوە بۆ بدلیس و کە گەیشتە بدلیس لەوێ پەیوەندی بەکۆمەڵی (Society of The Kurdish Rise of Kurdistan)ەوە کرد و دەسەڵاتی ئەوەی پێدرا لەبدلیس و سعرت و

دیاربەکر بەناوی کورد و کۆمەڵەوە کاربکات و لەوێوە ڕاپەڕینی (بیت الشباب)ی جێبەجێکرد (لەدواییدا باسی ئەو ڕووداوەی-بیت الشباب-دەکەین).

ڕۆبەرت ئولسون لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٨٤ دەربارەی ئیحسان نوری باسی ئەوەی کردووە چۆن تورکەکان دەیانویست درۆ بۆ ئیحسان نوری هەڵبەستن بۆئەوەی ناوی بزڕێنن و بڵاویاندەکردەوە کە ئیحسان نوری پیاوی خۆیانە و بۆ ئەو مەبەستە بەدرۆ بەشفرە چەند نامەیەکیان خستبووە ناو جانتایەکەوە و لەو نامانەدا وایان پیشاندابوو ئیحسان نوری لەژێرەوە پیاوی خۆیانە و بۆئەوەی لای خەڵك ناوی بزڕێنن و دڵی ئینگلیزەکانیشی لێکرمێبکەن و متمانەی پێنەکەن، ئەو جانتایەی ئەو نامانەی تیادابوو لەشوێنێکدا وایانکردبوو بکەوێتە دەست ئینگلیزەکان.

لەدوکیومێنتی ژمارە (Air.٢٣-٤٣٦) ڕۆژی ١٩٢٥/٢/٢٧دا بەم شێوەیەی خوارەوە دەستی تورکەکان دەربارەی ئیحسان نوری خراوەتەڕوو کە تیایدا وتراوە: ساتێك ئەو نامانەی ناو جانتاکە دەکەوێتە دەست ئەفسەرێکی لێپرسراوی بەریتانی دەنوسێت: ئەوەی لەم نامانەدا دراونەتە پاڵ ئیحسان نوری هەمووی بریتیە لەدرۆودەلەسە و بایەخ بەهیچیان نادرێت لەبەر ئەم دوو هۆیە:

١-تورکەکان بۆیە ئەم نامانەیان بەم شێوەیە نوسیوە و ڕێگەیانداوە وا بەئاسانی دەست ئێمە بکەوێت بۆئەوەی ئێمە بخەنە گومانەوە لەئیحسان نوری.

٢-نوسینی ئەو نامانە بەوجۆرە شفرەیە (دیارە بەئاسانی توانراوە شفرەکانی بخوێنرێنەوە) بۆئەوەی ئێمە هیچ جۆرە باوەڕێکمان بەئیحسان نوری نەبێت و سزای بدەین. (لەڕاستیدا بێجگە لەو دوو سەرنجەی ئەو ئەفسەرە باسیکردووە، تەنها کردنی ئیحسان نوری بەسەرکردەی هەموو هێزەکانی شۆڕشی ئارارات لەلایەن کۆمەڵی خۆیبوونەوە بەهێزترین بەڵگەیە بۆ ساختەچێتی و فڕوفێڵی تورکەکان).

دەربارەی کۆمەڵی ئازادی و ئەندامانی و لقەکانی، ڕۆبەرت ئولسون لەلاپەڕە (٤٢)ی کتێبەکەیدا ئاماژەی بۆ دوکیومێنتی ژمارە (Air.٢٣-٤١١) ڕۆژی ١٩٢٤/١١/٨ کردووە کە لەو دوکیومێنتەدا وتراوە، کۆمەڵی ئازادی لەسەرەتادا لەساڵی ١٩٢١دا لەلایەن (خالید بەگ جبران)ەوە لەئەرزڕوم دروستبووبوو، لەشوێنی تریشدا ئەو کۆمەڵە گەلێك لقی هەبووە کە لێپرسراوی هەرلقێك ناوەکەی نهێنی بووە و بەپێی قسەی ئەو ئەفسەرانەی لەڕووداوەکەی (بیت الشباب)دا دژی حکومەت

یاخیبووبوون باسی گەلێك لقی كۆمەڵی ئازادیان كردووە لەشوێنەكانی (دیاربەكر، سعرت، ئەستەمبوڵ، دەرسیم، بدلیس، قارس، هینس، موش، ئەرزنجان، ملازگرد، خەرپوت، وان) لەوانە لەناوچەی سعرت پێنج لق و لەبدلیس دوو لق و لەوان حەوت لق و لە(بیت الشباب) لقێك و لەهەموو ناوچەكاندا ژمارەی لقەكان گەیشتبوونە (٢٣) لق.

دەربارەی ئەندامانی كۆمەڵی ئازادی سەرچاوەكان هەریەكەیان بەشێوەیەك باسی هەندێ لەئەندامانی ئەو كۆمەڵەیان كردووە، بەڵام وادیارە ئینگلیزەكان زۆر مەبەستیان بووە زانیاریەكی تەواو كۆبكەنەوە بۆئەوەی بزانن ئەندامە چالاك و لێپرسراوەكانی كێ بوون و ژمارەی هەموو ئەندامەكان چەند بووە. دەربارەی ئەمە رۆبەرت ئولسون لەلاپەرە (٤٢)ی كتێبەكەیدا سەرچاوە/٨٤ ئاماژەی بۆ دوكیومێنتی ژمارە (Air.٢٣-٤١١) كردووە كە بەرلەمە باسمانكردوە لەوەدا دەردەكەوێ ئینگلیزەكان زۆر مەبەستیان بووە بزانن هۆی دامەزراندنی كۆمەڵی ئازادی چی بووە (كە لامواییە دوورنی‌یە ئینگلیزەكان حسابی ئەوەیان كردبێت كە رەنگە هەندێ لەئەندامانی ئەو كۆمەڵە بیریان لەوە كردبێتەوە پەیوەندی بەئینگلیزەوە بكەن، بۆیە هەروەكو رۆبەرت ئولسون لەلاپەرە (٤٥)ی كتێبەكەیدا باسیكردوە دەركەوتووە مەبەست لەپێكهاتنی ئەو كۆمەڵە و پرۆگرامەكانی هەروەكو هەندێ لەئەفسەرانی كورد باسیانكردوە بریتی بووە لە:

١-رزگاركردنی كورد لەجەور و ستەمی تورك.

٢-كورد ببێت بەدەسەڵاتێكی ئەوتۆ بتوانێت وڵاتەكەی خۆی و هاوڵاتیەكانی بەرەو پێشەوەببات.

٣-هەوڵدان بۆ دەستگیربوونی یارمەتی یەكێك لەدەوڵەتەكان چونكە بۆ كورد دەركەوتبوو بەبێ دەستگیربونی یارمەتی لایەك ناتوانیت بەرگەی حكومەت بگریت. هەرچەند هەندێ لەكوردەكان لایانوابووە سۆڤیەت هەوڵی ئەوەی دابوو یارمەتی كورد بدات بەڵام كوردەكان ئەوەیان پەسەندنەكرد و دەستگیربوونی یارمەتی بەریتانیایان لاباشتربوو وەك لەهی سۆڤیەت.

دەربارەی ئەوەی رۆبەرت ئولسون باسیكردووە لامواییە پێویستی بەروونكردنەوە هەیە چونكە:

یەكەم: ئەگەر كوردی وا هەبووبێ كە لای وابووبێت سۆڤیەت ئامادەبوو یارمەتی كورد بدات و كورد خۆی ئەوەی پەسەند نەكردووە لەگەڵ راستیەكاندا

یەکناگرێتــەوە چــونکە هــیچ بەڵگــە و دوکیــومێنتێکی وا بەدەســتەوە نی‌یــە کــە سۆڤیەت ئامادەبووبێت یارمەتی کورد بدات و بەپێچەوانەوە لەو ڕۆژانەدا هێشتا ماوەیــەکی زۆر بەســەر ئــەو پەیمانــەدا تێپــەڕی نــەکردبوو کــە لــەنێوان تــورك و سۆڤیەتدا مۆرکرابوو کە لەشوێنی خۆیدا بەدووروودرێژ باسی ئەو پەیمانەمان کردووە کە چەند زیانی بەمافی کورد و بەدواڕۆژی کورد گەیاندبوو.

دوهەم: ئەگەرچی سۆڤیەت لەهیچ کاتێکدا دەستی کوردی نەبڕیبوو بەوەی ئامادە دەبێت یارمەتی کورد بدات و لەبەڵێنەکەشی پاشگەزبێتەوە، بەڵام هەمیشە سیاسەتی حکومەتی بەریتانیا بریتی بووە لەسیاسەتێکی دوڕوویی و لەهیچ کاتێکدا مەبەستی نەبووە لەو ڕۆژانەدا کورد هیچ جموجوڵێك بکات و نیازیشی نەبووە ئەگەر کورد شۆڕش بکات هیچ جۆرە یارمەتیەکی بدات وەکو لەباسی شۆڕشی پیراندا ئەو ڕاستیەی هەڵوێستی بەریتانیا بەدووروودرێژی باسدەکەین.

لەکۆتایی باسی کۆمەڵی ئازادیدا وەکو بەرلەمە باسمانکردووە، سەرچاوەکان بەپچڕپچــڕی نــاوی هەنــدێ لەئەنــدامانی کۆمــەڵی ئازادیــان هێنــاوە، بــەڵام ئینگلیزەکان توانیویانە پوختەی ناوەکان کۆبکنەوە کە ناوەکانیان لەدوکیومێنتی ژمارە (Air.٥-٥٦٦)دا بڵاوکراوەتەوە و ڕۆبەرت ئولسون لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٨٤ ناوی ئەندامانی کۆمەڵی ئازادی وەکو چۆن لەو دوکیومێنتەدا باسکراوە ئەویش وەکو پاشکۆیەك لەلاپەڕەکانی (١٦٩-١٧١)دا ئەو ناوانەی بڵاوکردۆتەوە، ئێمەش دەقی ئەو لاپەڕانەی کتێبەکەی ڕۆبەرت ئولسون بەفۆتۆکۆپی بڵاودەکەینەوە:

| | |
|---|---|
| **MARDIN.** | |
| Haji Khidr Effendi. | |
| Qaimmaqam Khidr Beg of Dersım. | (Sent there from Dersim.) Was OC 6th Regiment. |
| **ERZING[J]AN.** | |
| **KHARPUT.** | |
| **DERSIM.** | |
| Kangor Zadah Ali Haidar. | (Head of Branch.) |
| | (Tribes whom Azadi counted on to give them support.) |
| **BITLIS AREA.** | |
| Haji Musa Beg and his sons. | |
| Jamil Chatto. | Pachinar tribe. |
| Shaikh Salahuddin. | |
| Mustapha Agha. | Gharzan tribes. |
| Ali Agha s/o Mustapha Agha. | |
| **VAN AREA.** | |
| Karawilli Dezgin Agha. | Artushi tribes. |
| Abu Bakr (brother of Lezgin). | |
| Ismail Agha. | Gevdan tribe. |
| Umar Agha. | Mamkhuran tribe. |
| Ismail Agha Simko. | Shikak tribe. |
| Shaikh Abdul Rahman Effendi. | Berwardı tribe. |
| Shahin Agha. | |
| Yahya Agha. | Jirikan tribe. |
| Yaqub Agha. | Aruh tribes. |
| **SHERNAKH AREA.** | |
| Ali Khan Agha. | |
| Mustapha ibn Abdul Rahman Agha. | Haji Bairam tribes. |
| Shahin ibn Sulaiman Agha. | |
| 'Agid Agha. | |
| Umar Timur Agha. | Chief of Batwan tribes. |
| Shaikh Tahir. | Batman tribes. |
| **MARDIN AREA.** | |
| Rammo Agha of Zangard. | |
| Aiyub Beg. | Milan tribes. |
| Isa Agha. | |
| Ibrahim Agha. | Dakourı tribes. |
| Farıs Agha. | |
| Mahmud Beg ibn Ibrahim Pasha. | Millı tribes. |

**لاپەڕە (١٦٩)ی کتێبەکەی ڕۆبەرت ئولسون**

| | |
|---|---|
| **MUSH.** | |
| **BITLIS.** | |
| Yusuf Zia Beg, Ex-Deputy. | (Head of Branch.) |
| Binbashi Haji Hassan Beg. | Bitlis. |
| Abdul Rahman Agha. } | Shernakh (now in prison in Sairt). |
| Haji Darsum Aghi. } | Of Mush. |
| **VAN.** | |
| Mullah Abdul Majid Effendi. | Brother of Mullah Sa'id Kurdi. (Head of Branch.) |
| Sa'adun Beg, Kara Hisar. | Chief of Hassaran Tribes. |
| Binbashi Arif Beg, Shamsaki. | Chief of Shamsaki Tribes. |
| Ali Beg. | Brother of Arif. |

(Note. In early September informant heard that the well known Mullah Sa'id Kurdi had left Constantinople for Van via Bitlis.)

| | |
|---|---|
| **SAIRT.** | |
| Yuzbashi Ihsan Beg. | (Head of Branch.) |
| Haji Abdullah Effendi, Merchant. | Sairt. |
| Darwish Beg, Inspector of Customs. | Sairt. |
| Qaimmaqam Razzak Beg. | Now Qaimmaqam of Belajik. (Sent by Governor of Anatolia.) |
| Miralai Wais Beg. | Retired. |
| **SHERNAKH.** | |
| Sulaiman Agha. | (Head of Branch.) Haji Bairam Tribes. |
| **JAZIREH.** | |
| Haji Dursun Effendi. | |
| Abdul Wahab Effendi. | |
| Abdul Muttalib Effendi. | Mudir of Sloopi Nahiyah. |
| **DIARBEKIR.** | |
| Jamil Pasha Zadah Akram Beg. | (Head of Branch.) |
| Doctor Fu'ad Beg. | |
| Abdul Ghani Beg. | |
| Doctor Nasim Beg. | |
| Binbashi Mustpha Beg. | |
| Qaimmaqam Adhan Beg. | 1st Cavalry Division. Native of Diarbekir where he is known as an enthusiastic nationalist. |

**لاپەڕە (١٧٠)ی کتێبەکەی ڕۆبەرت ئولسون**

# *Appendix III:* Azadi Membership as of September 1924

(Air 5/566; Kurdish names appear as written in the British documents.)

| | |
|---|---|
| **ERZERUM.** | |
| Miralai Khalid Beg. | (Head of the Society; previously Commander of Erzerum Garrison, now a merchant in Kars.) |
| Qaimmaqam Salim Beg. | |
| Qaimmaqam Kuckuk Kazim Beg. | |
| Miralai Kuchuk Raghib Beg. | |
| Haji Maulud Effendi. or Haji Dorsum Effendi. | Notable of Erzerum. |
| Qaimmaqam Arif Beg. | Now Civil Qaimmaqam of Khinis. |
| Abdul Huda Jafar Beg. } Arslan Beg. | Brothers. |
| **CONSTANTINOPLE.** | |
| Saiyid Abdul Kadir Effendi. | (Head of Branch.) |
| Abdul Rahim, Lawyer. | |
| **KARS.** | |
| Yuzbashi Tawfiq Effendi. | (Head of Branch.) |
| **BAYAZID.** | |
| Shaikh Ibrahim. | |
| **MELASHGIRD.** | |
| **MENASGIRD.** | |
| Kur Hussain Pasha of Haidaranli tribe. | (Head of Branch.) |
| **VARTAVA** | (NEAR MELASHGIRD) |
| Khalid Beg. | (Head of Branch; distinct from President of Society.) Chief of the Hasserahli Kurds and Colonel of a Tribal Regiment. |
| **KHINIS.** | |
| Rushti Effendi. | (Head of Branch.) |
| Yuzbashi Rashid Effendi | |

لاپەرە ( ١٧١ )ی کتێبەکەی ڕۆبەرت نولسون

## باسی چوارەمی بەشی دەهەم

### سەرەتای ڕوویەڕووبونەوە لە( بیت الشباب )

زۆربەی سەرچاوەکان لەسەرئەوەن کە کۆمەڵی ئازادی بەسەرکردایەتی (خالید بەگی جبران) پێکهاتبوو، لەسەرەتادا شێخ سەعید ئەندامی ئەو کۆمەڵە نەبووە و تەنها بەهۆی خالید بەگەوە پەیوەندی بەو کۆمەڵەوە هەبووە ئەمیش وەکو خالید جبران و (یوسف ضیاء بەگ) و هاوڕێکانیان لەنیازی تورکەکان گەیشتبوو کە چ نەخشەیەکیان بەدەستەوە بووە بۆ لەناوبردنی کورد، بۆیە پڕ بەدڵ ئامادەبووە هاوکاری لەگەڵ کۆمەڵدا بکات و دوایئەوەی ڕووداوەکەی (بیت الشباب) لەلایەن تورکەکانەوە کرا بەبیانوو و دەستیانکرد بەزەبروزەنگ نواندن دژی کورد و خالید جبران و (یوسف ضیاء) گیران و دران بەدادگا و لەسێدارەدران وەکو لەدواییدا باسیدەکەین.

ئیتر شێخ سەعید ڕێبەرایەتی ئەو کۆمەڵە و بزوتنەوەی کوردی گرتەئەستۆی خۆی و تورکەکان دەستیانکرد بەپڕوپاگەندەکردن دژی شێخ سەعید و بەوە تاوانباریان دەکرد پیاوێکی کەللەڕەق و وشك و نەزانە و لەژێر پەردەی ئاینی ئیسلامدا هەوڵی گەڕانەوەی خەلافەتی ئیسلامی دەدا و دەشیەوێ حکومەتێکی کوردی دامەزرێنرێت و ئیتر تورکەکان سڵیان لەهیچ شتێك نەدەکردەوە و بەئاشکرا دوژمنایەتی خۆیان دەردەبڕی و شێخ سەعیدیش وەنەبووبێ بێدەنگ بووبێت بەرامبەر بەو هەڵوێستەی کەمالیەکان و ئەویش کەوتەخۆی و پەیوەندی بەزۆر کەسەوە کرد بۆ خۆئامادەکردن بۆ ڕوبەڕوبونەوەی حکومەت بۆ پوچەڵکردنی ئەو نەخشەیەی دەربارەی کورد ئامادەیان کردبوو.

ئیسماعیل حەقی شاوەیس کە وەختی خۆی ئەفسەر بووە لەسوپای عوسمانیدا و یەکێك بووە لەئەندامە چالاکەکانی کۆمەڵی ئازادی وەکو بەرلەمە باسیکردوە، پاش شکانی شۆڕشەکەی پیران کە گەڕایەوە بۆ سلێمانی هەر لەچالاکی خۆی نەکەوتبوو، بەڵکو لێپرسراوی لقی (ژ. ك) بووە لەسلێمانی و دەربارەی ڕووداوەکانی شۆڕشی پیران وەکو بیرەوەریەکی خۆی لەڕۆژنامە و گۆڤارەکانی سلێمانیدا زۆرجار شتی نوسیوە کە یەکێك لەوانە بریتیە لەبلاوکردنەوەی بەیانێکی شێخ سەعیدی پیران لەمانگی مارتی ١٩٢٤ کە وەکو

ئیسماعیل شاوەیس وتویەتی ئەو بەیانەی شێخ سەعید بەشێوە زمانی کرمانجی ژووروو و بەزمانی تورکی لەناوچەکانی (ئەرزڕوم، وان، بدلیس، دیاربەکر، خەرپوت، مەلاتیە) ئەو بەیانەی بڵاوکردۆتەوە و ئیسماعیل شاوەیسیش لەلاپەڕە (٣٦)ی گۆڤاری (ڕۆژی نوێ)، ژمارە (٧)ی مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٦٠ کە لەسلێمانی دەرچووە بڵاویکردۆتەوە کە ئەمە دەقی ئەو بەیانەیە هەروەکو خۆی چۆنی بڵاوکردۆتەوە لێرەدا ئێمەش پێشکەشی دەکەین (کە دیارە کردویەتی بەکرمانجی خواروو): ((تورکەکان.. عوسمانیەکان.. داخەکەم بەناوی دین و خەلافەتی ئیسلامیەوە ئەمە ماوەی چوارسەد ساڵە بەرە بەرە ئێمەیان دیل و ژێردەست کردووە و بەرەو تاریکی و نەزانینیان بردووین و ڕێگەی نەهاتیان هێناوەتە بەرمان، خۆیان مردووی بەشی زیندوخۆرن و ئێمەش لەگەڵ خۆیاندا بەکێشدەکەن بۆ ملکەچی بۆ زۆرداران.

ئەم تورکانە لەمێژە بەکۆچەرێتی هاتونەتە ناومان و بەفرۆفێڵ خۆیان دامەزراندوە و وڵاتی ئێمەیان داگیرکردوە و وێرانیان کردووە، کوردستان هەرگیز وەکو ئیمڕۆ کاول نەبووە و ئاوا شوێنی گورگانی بۆ زقوردانی تۆرانیەکان نەبووە، وڵاتمان وا بێبەش و هەژار نەبووە، حاڵی ئیمڕۆمان سەرگەردانی و ماڵوێرانیە و هیچ کوردێك و هیچ دیندارێك ئەمە قبوڵ پەسەند ناکات و پێویستە لەسەرمان هەموومان لەم ژیانە تاڵ و بێبەختیە خۆمان ڕزگارکەین و ئەبێ لەڕێگەی ڕاست و هەقپەرستی لانەدەین، لەمردن نەترسین، لەڕێی هەق سەندندا نەبەزێین، بۆ هەستی ناوبانگی باپیران و گەل و وڵاتمان خۆمان و گیانمان فیدابکەین.

بەرامبەر بەسەربازانی تورك بەرامبەر بەئەفسەران و سەرۆك قوماندانەکانی تورك کە دەربارەی ژن و کچ و منداڵانمان زۆر بێبەزەییانە دەبزوتن و بەپێچەوانەی دین کوشتار دەکەن پێویستە بوەستێن و تۆڵەی ئەو بەسزمان و بێدەسەلات و بێچەکانە بسێنینەوە و خوێنیان وننەکەین، بەڵام بەرامبەر بەدیل و زامداران پێویستە نەرمونیان بین و بەرامبەر بەو سەربازە تورکانەش کە شەڕ ناکەن و خۆیان بەدەستەوە ئەدەن پێویستە نەرمونیان بین و هەروەکو برای خۆمان ڕەفتاریان لەگەڵدا بکەین.

لەشەڕدا دەستتان نەلەرزێ، لەمردن مەترسن چونکە ژیانێکی هیچوپوچی دوور لەجیهان، ژیانی بێبەشی و بێدەسەلاتی، ژیانی پڕخەم و سزا و ناسۆر و خەفەت و کەساسی بۆ هەموومان شەرمەزاریە، مردنێکی ئازایانە گەلێك لەو ژینی

دیلێتیـه خۆشـتره. ئاشـكرایه تـورك بێپـەیمانن و بەرامبـەر كـورد زۆردارانـه و نامەردانه ئەجوڵێنـەوە، ئێمـەی كوردیش دەبـێ دەرسێكی ئەوتۆ بەتوركان بدەین هـەرگیز لـەبیریان نەچێتەوە و ڕووڕەشـی و ڕەفتـاری گورگانـەی تـورك بـۆ هـەموو جیهان دەرخەین كه چۆن بێكەڵك و وێرانەپەرست و گورگ و ڕنده و خوێنخۆرن، لـەباتی لـەناو ئـەم زۆردارانـەدا بێكـەڵك بـژین، بەكۆمـەڵ مـردن و لەڕێگـەی هـەق و ڕزگاریدا شەهیدبوون گەلێك خۆشتره.

تا مردن ئێمەمانان بۆ ئەو برا كوردانه، بۆ ئەو منداڵه نازدارانـەی لـەدوای ئێمـه دەژین ئەبێ مەشق و دەرسێك لەگیانبازی ئێمەوە وەربگرن و بۆ دواڕۆژی ژیانیان گەوهـەرێكیان پێببەخشـین تـا لـەڕێی هەقپەرسـتی و ڕزگـاری لانـەدەن و بـەرەو ڕوناكی ژیـان بـڕۆن و بیـانجوڵێنین. هەوڵبـدەن بـا بەڕوویـەكی سـوورەوە بـژین، بـا هـەموومان لـەڕێی ئازادی و سـەرفرازیدا بەكۆمـەڵ بمرین و ناونیشـانێكی بـەرز بـۆ نەتەوەكەمان پەیدابكەین و یەكێتی و برایـەتی و بەكۆمـەڵ كۆششـكردن و ڕاپـەڕین زۆر سەربەرزیه، دەبێ بـەجیهان ڕابگەیـەنین ئێمـه بەرامبەر زۆرداری و نـاڕەوایی و بێدادی ڕاپـەڕیوین و بـەرەنگاری بووینـەوە، دەبـێ هەوڵبـدەین لەهـەردوو دنیـادا برایەتیمان ڕابگرین و هەق پەرستیمان پەروەردەبكەین هـەتا بەرامبـەر خـوا و هـەق شەرمەزار نەبین و لەهەردوو دنیاش بێبەش نەبین.

ئـەی گـەلی كـورد، چاكه و خراپه بەدەسـت خۆمانـه، بەبیر و كـردەوەی خۆمـان نەبێت هەرگیز ڕزگار نابین و لەتاریكیەوە ناگەینه ڕوونـاكی، دەبـێ كۆشش بكـەین ئەوسا هەردوو دنیامان دەستدەكەوێت، لـەژێر زۆردارێتی توركانـدا زۆر ماوینـەوە و ئەگەر چاوەنواڕی ئەوان بین بێدەست و بێگیان بۆگەن دەكەین و دەڕزێین. ئەمه چوار چەرخه هەتا ئیمڕۆ توركان مەشقی كینه و دوژمنایەتی و تەمبەڵی و بێكاری و یەكتركوشـتن و تـاڵانكردن و ماڵوێرانكردنمـان دائـەدەن، هـەرگیز نەزاكـەت و نەرمونیانی و یـەكتر خۆشویسـتن و لێبوردن و زانست و هونـەریان فێرنەكردوین، هەمیشـه ڕێوشوێنی كۆچەرێتیان نیشـانداوین، هەتاكەی وا سسـت و بێكـەڵك و دوژمـن بەیـەكترین، لەسـەر مەشـق و ڕێگـای توركـان ڕۆیشـتن بـا بەسـبێت، هاوكاریكردن لەگەڵ كەمالیەكانـدا بـۆ كـوردان چ بـۆ دنیـا و چ بـۆ ئاخیرەت نەهاتی دەبەخشێت. ئیتر بەرەو ڕووناكی و ئازادی و بەرەو برایەتی و ئادەمیزادپەروەری.

كوردان: هـەر لەچـەرخی مەموزینـەوە هـەتا ئیمـڕۆ ژیانمـان سازنەكرد!! گیانی پـاكی شـەهیدانمان، هـی باوباپیرانمـان شـادنەكرد!! ئـاواتی ئەحمـەدی خانیمان

نەهێنایەدی، بۆیە وا پەرێشان و سەرگەردان دەژین و دوژمنانمان بەخۆشادکرد. ئیتر گیانی ئەحمەدی خانی، دەنگی شیرینی ئازاری مەموزین بلندبکەنەوە، ئاواتی باوباپیرانمان بژێننەوە با ئامانجیان بێتەدی.

ئەی گەلی کورد.. زۆر باش دەزانن لەڕۆژی ڕەش و نەهاتیدا تورک هاواری بۆ کورد هێناوە، بەلام لەڕۆژی خۆشیدا کوردیان نەناسیوە و کورد بێبەشکراوە لەدەستکەوتەکان و تورک نەک تەنها هەر بێپەیمانی نواندوە بەلکو پەیمانیشی شکاندوە و ئەگەر بۆشیەهەلکەوتبێت نێزە و سونگیەکەشی دەرهێناوە و ئاڕاستەی سنگی کوردی کردووە، بەم ڕەنگە نامەردانە بەخیانەت پاداشی کوردی داوەتەوە:

فاعتبروا یا أولی الالباب

ئیمزا

شێخ سەعیدی نەقشی-پیران

گۆڤاری ڕۆژی نوێ دوای ئەو بلاوکراوەیە سوپاسی ئیسماعیل شاوەیسی کردووە و وتویەتی: ((کۆنەپەرستە دڕندە تورکەکان هەتا سالی ١٩٢٢ نزیکی بیستودوو هەزار پەیکەریان بۆ ئەتاتورک لەسەر شەقامەکان دروستکردوە، بەلام هەر ئەتاتورکیش بوو لەماوەی سالانی (١٩٢٤-١٩٢٥)دا بیستودوو هەزار کوردیان کوشت و خنکاند و زیندەبەچالیانکردن. ڕاستە.. پەیکەر بۆ (ئەدیسۆن)یش دروست دەکرێت کە بەکارەبا دنیای تاریکی ڕووناک کردەوە و بۆ ئەتاتورکیش دروست دەکرێت کە تاریکی بەسەر میللەتی کورد و کوردستاندا دەهێنێت)).

وێنەیەکی شێخ سەعید

## هۆی ڕوودانی (بیت الشباب)

(بیت الشباب) هەروەکو لەلاپەڕە (٢٣)ی سەرچاوە/١٠٩ باسکراوە، ئەو شوێنە بووە کە یەکەم ڕووبەڕووبونەوەی کورد و جەندرمەکانی تیادا ڕوودابوو کە (بیت الشباب) شوێنێکە لەناوچەی (ماردین) دەربارەی چۆنیەتی دەستپێکردنی ئەو ڕووبەڕووبونەوەیە چەند سەرچاوەیەك باسیانکردوە کە ئەو ڕووبەڕووبونەوەیە بەر لەوکاتەی لەلایەن سەرکردایەتی شۆڕشەوە بۆ دەستپێکردنی شۆڕش دەستنیشانکرابوو کە بریتی بوو لە ١٩٢٥/٣/٢١ هەڵەیەکی زۆر زل کرا لەلایەن کوردەوە کە بوو بەهۆی ئەوەی بەرلەوەی بەتەواوەتی خۆی ئامادەبکات شۆڕشەکە دەستپێکردبوو لێرەدا هەوڵئەدەین کورتەباسێکی ئەو سەرچاوانەی لەو ڕووداوە دواون بیانخەینە پێشچاو.

زنار سلوپی (قەدری جەمیل پاشای دیاربەکری) لەلاپەڕە (١٠٣)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٥٧ و لاپەڕە (٢٣)ی گۆڤاری (ئالآی ئیسلام) سەرچاوە/١٠٩ هەردووکیان وتویانە: (یوسف ضیاء بەگ) کە ئەندامی سەرکردایەتی لیژنەی ناوەندی کۆمەڵی ئازادی بوو تەلگرافێکی ناردبوو بۆ ڕەزای برای کە ملازمی یەکەم بووە لە(بیت الشباب-لەناوچەی ماردین) و ناوەڕۆکی تەلگرافەکە لەلایەن براکەی (یوسف ضیاء بەگ)ەوە بەهەڵە لێکدرابووەوە (بەداخەوە سەرچاوەکان باسی ناوەڕۆکی ئەو تەلگرافەیان نەکردووە) و وای بۆچووبوون مانای دەستکردن بەشەڕ و ڕووبەڕووبونەوە بووە لەگەڵ حکومەتدا (زنار سلوپی وتویەتی لەو ڕۆژانەدا ئەو هێزەی لەبیت الشباب بوو خەریکی دامرکانەوەی بزوتنەوەی ئاسوریەکان بوو).

لەسەر ئەو تەلگرافە هەموو ئەندامەکانی ئازادی کە لەو فیرقەیەی (بیت الشباب)دا بوون ڕوویانکردە چیاکان بەئیحسان نوریشەوە کە سەرکردەی هێزی ناوچەکە بوو. ڕۆبەرت ئولسون لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٨٤ ژمارەی ئەو کوردانەی لە(بیت الشباب)دا لەحکومەت یاخیبوون بریتی بوون لە(٥٠٠) ئەفسەر و سەرباز کە هەندێ چەکیشیان لەگەڵ خۆیاندا بردبوو، ڕۆبەرت ئولسون لەکتێبەکەیدا دەربارەی ئەو یاخیبوونە وتویەتی ساتێك ئەو ئەفسەرانەی (بیت الشباب) لەحکومەت یاخیبوون ئینتلجسی بەریتانیایان لەوە ئاگادارکردبوو.

زنار سلوپی ناوی هەندێ لەو ئەفسەرانەی لەکتێبەکەیدا باسکردووە کە بریتی بوون لە: بێجگە لەئیحسان نوری، ڕاسم، خورشید، تۆفیق (بێگومان دەبێ ڕەزای برای یوسف ضیاء بەگیشیان لەگەڵدا بووبێت کە تەلگرافەکەی بۆ نێردرابوو).

دیاره ئەوانەی ئەو تەلگرافە کاری تێکردبوون تازە دەستیان کەوتبوەڕوو، کار لەکار ترازابوو بۆیە هەموویان ڕوویانکردبوە شاخەکانی ناوچەکە و لەوێوە ڕوویانکردە سوریا و لەوێ بوون بەپەناهەندە و لەوێشەوە خۆیان گەیاندبووە چیاکانی باشوری کوردستان کە لەو ڕۆژانەدا لەژێر دەسەلاتی ئینگلیزەکاندا بوو.

هەروەکو هەموو ئەو سەرچاوانەی باسی ڕووداوەکەی (بیت الشباب) و شۆڕشی پیرانیان کردووە حکومەتی تورك بۆی دەرکەوتبوو ئەو ڕووداوە بەهۆی (یوسف ضیاء بەگ)ەوە بووە بۆیە گیرا و درا بەدادگا و تورکەکان ماوەیەك بوو بۆ بەڵگە و بیانویەك دەگەڕان بۆئەوەی لەکورد بدەن و سەرکردەکانی کۆمەڵی ئازادی لەناوببەن و ڕێکخراوەکەیان هەڵوەشێننەوە.

هەروەکو زنار سلوپی باسیکردوە (کە خۆی لەو ڕۆژانەدا لەناوچەکەدا چالاك بووە وەکو لەباسی کۆمەڵی ئازادیدا باسیکراوە وتویەتی: ساتێك تورکەکان یوسف ضیاء بەگیان گرت لەگەڵ (حاجی موسی بەگ) بیست کەسی تریشیان لەئەندامانی کۆمەڵی ئازادی گرت و داواشیان لەشێخ سەعید کرد بەناوی شایەتیەوە بچێت بۆ (بەدلیس)، بەلام شێخ سەعید لەفرۆفێڵی تورکەکان گەیشتبوو بۆیە ڕوویکردە (غینج) و (چاپاکچور) و (داراهین) و لەوێ هەوڵیشیدا چارەسەری کێشەی نێوان هەندێ لەعەشیرەتەکانی ئەو ناوچانە بکات.

ڕۆبەرت ئولسون دەربارەی گرتنی یوسف ضیاء بەگ، لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٨٤ وتویەتی: ((ساتێك یوسف ضیاء بەگ گیرا دادگا شەرعیەکان لەو ڕۆژانەدا هەڵوەشێنرابونەوە لەبەرئەوە درا بەدادگای (National Law Court) (Organization Regulation) وە لەکاتی دادگاکردندا یوسف ضیاء بەگ دانی بەهەموو شتێکدا نابوو، ناوی خالید بەگ جبران و حسنانلی خالید و شێخ سەعید و حاجی موسی بەگی سەرۆکی عەشیرەتی موتکی هێنابوو، حاجی موسی بەگ گیرا بەلام لەلایەن (کازم دیریك)ەوە کە تازە کرابوو بەوالی بەردرا و بەردانەکەی بۆ مەبەستێکی تایبەتی بوو بۆئەوەی ببێتە هۆی ناکۆکی و تێکچونی ئەندامانی کۆمەڵی ئازادی و ئەفسەرەکان بۆئەوەی ئەو بەردانەی حاجی موسی بەگ وا لێکبدرێتەوە کە لەژێرەوە حکومەتی ئاگاداریکردبوو لەبزوتنەوەکە و لەدوای بەردانی حاجی موسی بەگ (نوح بەگ)ی برای (٧٠) باری ولاخ شتومەك و خواردەمەنی ناردبوو بۆ (کازم دیریك). بەلام خالید بەگ جبران لە١٩٢٤/١٢/٢٠دا گیرا و لەزیندانی (بدلیس)دا لەگەڵ یوسف ضیاء بەگ هەردووکیان گیران (وەکو

لەدواییدا باسی دەکەین، ڕۆبەرت ئۆلسون وتویەتی هەردووکیان لەدوایدا لەسێدارەدران).

ڕۆبەرت ئۆلسون لەباسەکەیدا لەسەرینەڕوا و دەڵێت: کازم دیریك هەوڵێکی زۆریدا (حسنانلی خالید) و شێخ سەعید بگیرێن بەتایبەتی لەوکاتەدا کە (حسنانلی خالید) هەوڵیدابوو یوسف ضیاء بەگ و خالید بەگ جبران لەزیندانی بدلیس ڕزگاربکات کە تەقەلاکەی بێسوود بوو، تورکەکان هەردووکیان لەسێدارەدران و هەوڵەکەی حسنانلی خالید سەرینەگرت.

ساتێك داواش لەشێخ سەعید کرا بچێتە بەردەمی دادگای بدلیس بۆ شایەتی، وەڵامی حکومەتی دایەوە لەبەر نەخۆشی ناتوانێت بگاتە بدلیس، بەڵام ئامادەیە بچێتە (Hinis–هینس)، قایمقامی هینس کە (Maksun–کە ڕەنگە مقصود بێ) لەبارەی ئاینەوە سەر بەشێخ سەعید بوو، نامەیەکی ناردبوو بۆ حکومەت کەوا شێخ سەعید نەخۆشە و تەمەنی پەنجا ساڵە بۆیە ناتوانێت بگاتە بدلیس (لەباسی ژیانی شێخ سەعید وتمان لەساڵی ١٩٢٥دا تەمەنی شەست ساڵ بووە نەك پەنجا ساڵ وەکو ئەو قایمقامە باسیکردوە).

ڕۆبەرت ئۆلسون لەباسەکەیدا ئەڵێت: خالید بەگ جبران بەرلەوەی بگیرێت نامەیەکی ناردبوو بۆ شێخ سەعید بۆئەوەی دەمودەست شۆڕش دەستپێبکات. شێخ سەعید لە٢٧ی دیسەمبەردا ڕوویکردۆتە چاپکچورد لەوێوە بۆ (پالو) و بۆ ناوچەی (Licehani) بۆئەوەی لەناو عەشیرەتەکانی زازادا کە زۆر دڵسۆزی بوون لەوێوە دەست بەشۆڕش بکات.

وێنەیەکی خالید بەگ جبران

# باسی پێنجەمی بەشی دەهەم

## هەڵوێستی تورك و ڕووداوەكەی پیران

هەروەكو ڕۆبەرت ئولسون لەكتێبەكەیدا سەرچاوە/٨٤ باسیكردوە: دوایئەوەی خالید بەگ جبران و یوسف ضیاء بەگ گیران و شێخ سەعید ڕێبەرایەتی كۆمەڵی ئازادی و شۆڕشی گرتەدەست، ڕۆژی ١٩٢٥/١/٤ لەگوندی (Kirikan) لەگەڵ چەند سەرۆكێكی كورددا كۆبووەوە وەكو (سلیم زركانی) و لەوێ چاوەڕوانی گەڕانەوەی عەلی ڕەزای كوردی دەكرد كە ناردبووی بۆ حەلەب بۆ فرۆشتنی ئەو مەڕومالاّتەی بڕیاریدابوو پارەكەی تەرخانبكات بۆ شۆڕش، ساتێك عەلی ڕەزا دوای گەڕانەوەی حەلەب چووبووە ئەستەمبوڵ و چاوی بەشێخ عەبدولقادر كەوتبوو لەگەڵ چەند كەسێكی تردا و كە گەیشتەوە لای باوكی باسی ئەوەی بۆ كردبوو ئەوانەی ئەو دیبوونی هەموویان لەكردەوە و ڕەفتاری حكومەتی ئەنقەرە بێزارن و لایان واباشە شۆڕشەكە لەنزیك ەیاربەكرەوە دەستپێبكات.

شێخ سەعید لە١٩٢٥/١/٥دا چەند نامەیەكی ناردبوو بۆ عەشایری (هورمیك) و (لولان) كە عەلەوی بوون و لەنامەكانیدا داوای لێكردبوون هاوكاری بكەن لەو شۆڕشەی كورد بەدەستیەوەیە لەگەڵ توركدا بیكات، بەلاّم داخوازیەكانی قبوڵنەكرا و بەپێچەوانەوە ساتێك لەدواییدا شەڕ دەستپێكرد ئەوان بوون بەلایەنگری حكومەت لەگەڵ ئەوەشدا ئەمانە كاتی خۆی لەشۆڕشی كوجگیریدا دژی حكومەت شەڕیانكردبوو.

ڕۆبەرت ئولسون دەڵێت: عەلەویەكان نەیانویستبوو كورد حكومەتی سەربەخۆی هەبێت بەسەركردایەتی كەسێكی سونی مەزهەب، بەتایبەتی زۆربەی سەركردەكانی هێزەكەی شێخ سەعید لەوانە بوون كاتی خۆی لەسوارەی حەمیدیەدا بوون، یەكێك لەوانە خالید جبران بوو كە دوژمنایەتیەكی تەواو هەبووە لەبەینی ئەو و هەندێ لەعەلەویەكاندا پاشئەوەی كاتی خۆی (زینل)ی كوڕی (ئیبراهیم تالو)ی كوشتبوو كە سەرۆكێكی ناسراوی عەشیرەتی (هورمیك) بوو، بەو جۆرە عەلەویەكان ژێردەستێتی توركیان لاباشتربوو وەك لەوەی لەژێر سەركردایەتی كوردێكی نەقشبەندیدا بن (كە مەبەست شێخ سەعیدی نەقشبەندیە).

دەربارەی هاوکارینەکردنی عەلەویەکان لەو شۆڕشەی پیراندا پرۆفیسۆر حەسرەتیان ئاماژەی بۆ دوو کتێب کردووە، یەکەمیان کتێبی (Firat dogul Leve Varto) لاپەڕە/١٢٦ و دوهەمیان (Aydemir Tekadom Kemel) چاپی ئەستەمبوڵ ساڵی (١٩٦٦) کە هەردووکیان وتویانە شێخ سەعید لەگەڵ ئەوەشدا تەقەلایەکی زۆری دابوو لەگەڵ عەلەویەکاندا کە بە(قزلباش) ناودەبرێن لەناوچەکانی (وارتو-لەویلایەتی موش) و (خینیس-لەویلایەتی ئەرزڕوم) بەڵام هەمووی بێسوود بوو. لەگەڵ ئەوەشدا وەکو ڕۆبەرت ئولسون باسیکردوە شێخ سەعید لەکانونی دوهەمی ١٩٢٥ بەدواوە خۆی ئامادەکرد بۆ بەرپاکردنی شۆڕش دژی حکومەت.

ڕۆبەرت ئولسون لەسەرچاوە/٨٤دا باسی کۆبونەوەیەکی شێخ سەعیدی کردووە ڕۆژی ١٩٢٥/١/٦ لەگوندی (کانی ڕەش) لەناوچەی (Karliova)، بۆئەوەی بزانێت چ هێزێك هەڵبژێرێت بۆ بەرەنگاربونەوەی ئەو لایەنانەی بەئاشکرا دژی شۆڕشی کورد دەوەستان و لەهەمان ڕۆژدا لە(مالکان) کۆبونەوەیەکی تر کرا بۆئەوەی دەستنیشانی ڕۆژی دەستکردن بەشۆڕش دیاریبکرێت و بەپێی چەند سەرچاوەیەك بڕیاریاندا شۆڕشەکە لە١٩٢٥/٣/٢١دا دەستپێبکات و پێنج شوێن دانرا کە شۆڕشی لێوە دەستپێبکرێت کە لای باکور و ڕۆژهەڵاتی باکور لەژێر سەرکردایەتی (شێخ عەبدوڵای ملکان)دا بێت و بۆ جەبهەکانی تر شێخەکانی (Can) و عەشایری (Hasanan-هەسانان) مەحمود ئاغا، خلیل کیتی، عەلی ڕەزای کوڕی شێخ سەعید دانران، شێخ شەریف کرا بەسەرکردەی خەرپوت و جەبهەی (Ergani-ئیرغانی) لەژێر سەرکردایەتی شێخ عەبدولڕەحیمی برای شێخ سەعید و (ئەمیر فاروق-Amiri Faruk) و جەبهەی (Forkin) لەژێر سەرکردایەتی (شێخ صمدالدین)دا و شێخ سەعید خۆشی سەرکردایەتی شۆڕشەکەی گرتەدەست و جەبهەی دیاربەکر خرایە ژێردەستی (حاکی بەگ) بەڵام لەسەرچاوە/١٠٩ ئەو حاکی بەگەی ڕۆبەرت ئولسون باسیکردوە بەشێخ حەقی ناویهێناوە کە هەردوکیان هەریەکن و لەسەرچاوە/١٠٩دا باسی (شیخ شمس الدین)یش کردووە کە وتویەتی کراوە بەسەرکردەی قوڵی (سلڤان).

بەپێی بۆچونی ڕۆبەرت ئولسون لە ١٩٢٥/١/١٥دا نازناوی (امیر المؤمنین) دراوە بەشێخ سەعید کە مانای سەرکردەی پیرۆزی شۆڕشی گرتۆتەوە (وەکو لەباسی ژیانی شێخ سەعیددا باسکراوە نازناوێکی تریشی هەبووە کە بریتی بووە لەبدیع الزمان). شێخ سەعید لە ١٩٢٥/١/٢١دا لە(لیج)دا و لەڕۆژی ١٩٢٥/١/٢٥دا

لە(هانی) دەستیکرد بەراویـژکردن لەگەڵ شێخ شەریفدا کە سەرکردەی قۆڵی خەرپوت بوو، لەوێ بریاری ئەوە درا شێخ شەریف هێرش بکاتەسەر (Elazig) و لە٥/٢/١٩٢٥دا خۆشی بە(١٠٠) چەکدارەوە گەیشتە (پیران) و لەوێوە دەستیکرد بەشۆڕش (دیارە هەر لەبەرئەوەشە شۆڕشەکە ناوینراوە شۆڕشی پیران و شێخ سەعیدیش بووە بەشێخ سەعیدی پیران).

وادیارە تورکەکان بۆ کات بردنەسەر و بۆ بەنجکردنی مێشکی ئەو کوردانەی هێشتا باوەڕیان بەبەڵێنەکانی مستەفا کەمال مابوو، هەروەکو چۆن لەباسی شۆڕشی کوچگیریدا باسی ئەو لائیحەیە کرا کە تورکە کەمالیەکان بۆ دەستبڕینی کورد لەئەنجومەنەکەیاندا لیژنەیەکی تایبەتیان دانا و لەو مادانەیان کۆڵیەوە لەڕەشنوسی ئەو لائیحەیەدا لەلایەن ئەو لیژنە تایبەتیەوە دانرابوو، کە دەربارەی ئەمە لەڕاپۆرتێکی (مستەر هندرسن)دا ڕوندەبێتەوە کە لەدوکیومێنتی ژمارە (Air.٥-٥٥٦) لەلاپەڕە (١٢)دا باسیکراوە کە ڕۆبەرت ئولسونیش لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٨٤ دەقی ئەو ڕاپۆرتەی باسکردوە کە مستەر هندرسنی باڵیۆزی بەریتانیا لەتورکیاوە ناردویەتی بۆ وەزیری دەرەوەی بەریتانیا بەم شێوەیەی خوارەوە: تورکەکان خۆیان وا پیشاندەدەن دەیانەوێ شەش داخوازی کورد بەجێبێنن کە بریتین لە:

١-ئیدارەیەکی تایبەتی لەناوچە کوردنشینەکاندا پێکبهێنرێت.

٢-تورکیا ئامادەیە پارە بەقەرز بدات بەکوردەکان بۆ چارەسەرکردنی باری ژیانی خۆیان (نەیوتوە قەرزەکە چۆن دەدرێ و چۆن دەسێنرێتەوە).

٣-لێخۆشبونێکی گشتی دەردەچێت بۆ بەردانی ئەوانەی لەزیندانەکانی ناوچەکاندا ماون.

٤-بۆ ماوەی پێنج ساڵ گرتنی سەربازی ئیجباری لەکوردستاندا دوادەخرێت.

٥-حکومەت دادگاکانی (Sheriyet-شەریعەت) دەکاتەوە و حکومەت هەرچی چەکی ناوچەکانیان هەیە هەمووی کۆدەکاتەوە.

٦-ئەو تورکانەی لەناو هێزەکانی حکومەتدان لەناوچە کوردنشینەکاندا، ئەوانەیان کە خەڵك بێزارن لێیان هەموویان دوردەخەینەوە. بەرامبەر بەمانە پێویستە کوردیش لایەنگری داخوازیەکانی حکومەت بێت بۆ داواکردن و گێڕانەوەی ویلایەتی موسڵ.

ڕۆبەرت ئولسون بەرامبەر بەو پێشنیازانەی حکومەتی تورک وتویەتی: لەکۆنگرەی دیاربەکردا بۆ کوردەکان دەرکەوتبوو ئەو بەڵێنانەی حکومەت هیچی لێسەوزنابێت بۆ میللەتی کورد، بۆیە هەر دەمودەست لەهەندێ ناوچەی دەرسیمدا هەندێ بزوتنەوەی کورد دژی حکومەت دەستیپێکرد و بەرامبەر بەوە (جەواد پاشا)ی موفەتیشی گشتی هەموو هێزەکانی تورکیا لەسێواس دەسەڵاتێکی تەواوی پێدرا بۆ دامرکانەوەی هەر بزوتنەوەیەکی کورد لەناوچەکەدا ڕووبدات و ئەمە نیشانەی ئەوەبوو کە حکومەت هەر لەبنەڕەتەوە نیازی نەبووە چارەسەری هیچ کێشەیەکی کورد بکات و کوردیش لەو جموجوڵانەیدا مەبەستیان ئەوەبوو ئینگلیزەکان والێبکەن ئەو هێزەی لەعێراقدا هەیانبوو بەناوی (لیڤی)یەوە کە بریتی بوون لەئاسووری یارمەتی کورد بدەن دژی هەرپەلامارێکی هێزی تورک بۆ سەریان.

**نەخشەی ناوچەکانی شۆڕشی پیران**
**لەویلایەتەکانی ڕۆژهەلاّتدا**

بەرامبەر بەو جموجوڵەی کورد وەنەبێ تورکەکان بێدەنگ بوون، بەڵکو لەمێژبوو خۆیان ئامادەکردبوو بۆ لێدانی کورد بەپێی ئەو نەخشەیەی کێشابوویان، ڕۆبەرت ئولسون لەکتێبەکەیدا ئاماژەی بۆ دوکیومێنتێکی بەریتانی کردووە، ژمارە (Air.٢٣-٤٤) ئاماژەی بۆ ئەو نەخشەیەی حکومەت کردووە کە بریتی بووە لە:

١-بەرلەوەی بەفر ببارێت و ڕێگاکان بگیرێت شوێنەکانی خۆیان قایمکرد.

٢-چەك و جبەخانەیەکی زۆریان لەعەمارەکانیاندا کۆکردبووەوە.

٣-دەستیانکردبوو بەچاکردنی ڕێگاوبان بۆ ئاسانکردنی هاتوچۆی هێزەکانیان.

٤-شێخ مەحمود لەو ڕۆژانەدا لەگەڵ حکومەتی بەریتانیادا تێکچووبوو (لەو ڕۆژانەدا ئینگلیزەکان شاری سلێمانیان بۆردومان کردبوو، شێخ مەحمود ناچار ڕوویکردبووە ئەشکەوتی جاسەنە و یوزدمیری تورك کە لەناوچەی ڕەواندز بنکەیەکی دروستکردبوو هەندێ لەعەشایرەکانی کوردی کردبوو بەدوژمنی ئینگلیز هەروەکو لەبەرگی دوهەمی سەرچاوە/٨٠دا بەدووروودرێژ باسیکراوە)، تورکەکان هەوڵیاندابوو پەیوەندی بەو عەشایرانەوە بکەن و لەڕێگەی ئەوانەوە لەبەرزاییەکانی دەوری موسڵەوە بتوانن دەست بەسەر دەشتاییەکاندا بگرن (لەڕاستیدا عەلی شەفیق-یوزدمیر) هێزێکی وای لەگەڵ نەبوو هێشتا شێخ مەحمود لەئەشکەوتی جاسەنەدا بوو و ئینگلیزەکان توانیبوویان یوزدمیر و ئەو چەند سەرباز و جەندرمە پەڕاگەندەیەی لەگەڵیدا بوو دەریانکردن و گەڕانەوە بۆ تورکیا.

٥-لەدوای تەواوکردنی نەخشەکەیان ئەگەر لەوەی برگە/٤دا سەرکەوتن ئەوسا تورکەکان پەلاماری سلێمانی و کەرکوك ئەدەن و بەوە دەسەلاتیان لەویلایەتی موسڵدا دوبارە بەهێزدەکەنەوە.

٦-تورکەکان تەقەلای ئەوە ئەدەن ئەگەر بتوانن هەندێ لەعەشایرەکانی کوردی باکور بکەن بەگژ ئینگلیزەکاندا و ڕێگەبدەن بەو عەشیرەتانە پەلاماری گوندەکانی کریستیانەکان بدەن و تالانیان بکەن و لەهەموولایەکەوە ئیعلانی غەزا دژی ئینگلیز بلاوبکەنەوە.

٧-پاشئەوەی دەسەلاتیان لەسلێمانی و کەرکوك بەهێزدەکەن، داوا لەکۆمەڵی گەلان (عصبە الامم) دەکەن بڕیارێك دەربکات دەربارەی کێشەی موسڵ کە سوودی

خۆیانی تیادا بێت و کارێکی واشبکرێت ڕێگە لەکورد بگرن بەهیچ جۆرێك بیر لەسەربەخۆیی نەکەنەوە.

هەروەکو بەرلەمە باسی ئەوەکرا کە سەرکردایەتی شۆڕش بڕیاریدابوو شۆڕشی گشتی لەو جەبهانەی باسکراون لە ١٩٢٥/٣/٢١دا دەستپێبکرێت، لەمەشدا وەکو چۆن ئەو هەڵە زلەی (بیت الشباب) کرا، هەڵەیەکی خراپتریش لەپیراندا کرا کە بوو بەهۆی ئەوەی شۆڕشی پێشوەخت دەستپێبکات، دەربارەی چۆنیەتی ڕوودانی ئەوەی پیران گەلێك سەرچاوە لێیدواون و هەوڵئەدەین پوختەی ئەو سەرچاوانە بخەینە پێشچاو:

پرۆفیسۆر حەسرەتیان لەکتێبەکەیدا ئاماژەی بۆ کتێبەکەی نوری دەرسیمی کردووە کە باسی ڕووداوەکەی بەم شێوەیە کردووە: لە ١٩٢٥/٢/٥دا شێخ سەعید (خانی) بەجێهێشت و بەسەد سوارەوە ڕوویکردە پیران و لەوێ بوو بەمیوانی شێخ عەبدولڕەحیمی برای و پاشئەوە (حەسەن ئەفەندی) ملازمی یەکەم گەیشتە پیران کە ملازم (مستەفا عاسم) و (١٥) جەندرمەشیان لەگەڵدا بوو، حەسەن ئەفەندی دوای لەشێخ سەعید کرد (١٠) کەس لەو کوردانەی لەگەڵیدا هاتبوونە پیران کە لەماڵی (بەحری)دا بوون بەتاوانی پیاوکوشتن تاوانبارن و دەبێ بگیرێن و بدرێن بەدادگا.

شێخ سەعید لەوەڵامدا پێیدەڵێت: ئەوانە لەگەڵ ئێمەدا هاتوون میوانی ئێمەن و هیواداریین هەتا ئێمە لێرەین دەستدرێژی مەکەنە سەریان و دوایئەوەی ئێمە دەڕۆین خۆتان چی بەباش ئەزانن دەربارەیان بکەن، بەلام ئەفسەرەکە بەشێوەیەکی زۆر ناشیرین وەلامی شێخ سەعید ئەداتەوە و پێیدەڵێت من گوێنادەمە کەس و هیچ کەسیش بەشت نازانم چونکە بەپێی یاسای کۆماری ڕەفتار دەکەم و پێویستە ئەو تاوانبارانە بدرێنەدەست، بەو شێوەیە لەنێوان چەکدارەکانی شێخ سەعید و ئەو جەندرمانەدا بوو بەهەرا و تەقە و هەندێك لەو جەندرمانە کوژران و ئەوانیتر گیران کە ئەمە بوو بەسەرەتای دەستپێکردنی ئاڵۆزیەکی تەواو و بوو بەهۆی دەستپێکردنی شەڕێکی پێشوەخت کە کوردەکان حسابیان بۆ نەکردبوو بەڵکو بڕیار وابوو لە١٩٢٥/٣/٢١دا دەستبکرێت بەشۆڕش وەکو بەرلەمەش باسکراوە.

حەسرەتیان لەباسەکەیدا وتویەتی: شێخ سەعید دەیزانی کاتی ئەوە نەهاتووە ڕووبەڕووی هێزی تورك ببێتەوە بۆیە پیرانی بەجێهێشت و ڕوویکردە (غنج)

بۆئەوەی ڕووداوەکەی پیران تەشەنە نەکات، بەڵام سەید تاهیری برای شێخ سەعید کە بەم ڕووداوە دەزانێت بەخۆی و (١٠٠) چەکدارەوە دەگەنە لای شێخ سەعید و بەرلەوە ساتێك پۆستەخانەی (لجیّ)ی داگیرکردبوو، لەنامە و تەلگرافەکان گەلێك زانیاری دەربارەی هەڵوێست و زانیاری حکومەت دەستکەوتبوو هەمووی درا بەشێخ سەعید و کە شێخ سەعید چاوی بەمانە کەوت وتبووی وادیارە ئەمەمان لەچارە نوسراوە-کە مەبەستی ئەوە بووە تازە چارنەما و ئەبێ شۆرش دەستپێبکات.

دەربارەی هەمان ئەو ڕووداوەی پرۆفیسۆر حەسرەتیان باسیکردوە، مامۆستا (مالمیسانج) لەباسێکدا کە بەشێوەی کرمانجی ژوورو و بەپیتی لاتینی بڵاویکردۆتەوە، مامۆستا حەسەنی قازی کردویەتی بەشێوەی کرمانجی خواروو بەسوپاسەوە بۆی ناردووم کە بەپێی ئەو وەرگێڕانە ڕووداوەکە بەم شێوەیەی خوارەوە بووە کە ئەو باسەی لەیاداشتێکی ساڵح بەگی هێنەیی وەرگرتووە کە یەکێك بووە لەکوردە ئازاکانی زازا و لەشۆڕشی پیراندا بەشداریکردوە و سەرۆکی یەکەمی موجاهیدین بووە (مجاهدین رئیس اولی) و لەدواییدا پاش شکانی شۆڕش کە لەسێدارەدراوە لەبەردەمی قەنارەکەیدا شیعرێکی بەتورکی دەربارەی کورد وتوە کە (مالمیسانج) ئەو شیعرەی وەرگێڕاوە بۆ شێوەی کرمانجی و لەیاداشتەکەیدا وتویەتی: ((لەگەڵ شێخ سەعیددا چووینە پیران و لەو چوونەماندا چەند قاچاخچیەکیش هاتبوون (دوورنییە ئەوانە قاچاخچی چەك بوون بۆیە حکومەت زۆر مەبەستی بووە بیانگرێت) و لەپیران (ئیبرەمی حاجی عەلی) کە قەڵبینەی جەندرمەری بوو، پاسگایەکی تورکی ئاگادارکردبوو لەوەی شێخ سەعید لەهاتنەکەیدا چەند قاچاخچیەکیشی لەگەڵدایە و لەئەنجامی ئەمەدا چەند جەندرمەیەك هەڵدەکوتنە سەر ئەو خانوەی شێخ سەعیدی لێدابەزیبوو، ئەفسەرێك داوا لەشێخ سەعید دەکات ئەو قاچاخچیانە لەوێ نەمێنن و لەم کەین وبەینەدا چەکدارەکان هێرش دەبەنەسەر پاسگەکەی تورك و (حسێن حوسنی-کە حەسرەتیان بەحەسەن ئەفەندی ناویبردووە) و ئیسماعیل ئەفەندی مودیری پیران دەگرن و ئیتر تەقە دەستپێیکرد، هەرچەند شێخ سەعید هەوڵێکی زۆریدا تەقەکردن ڕابگیرێت، بەڵام تازە کار لەکار ترازابوو، شەڕ دەستپێکرد و گەرم بوو، ئێمەش (معدن)مان گرت و بەرلەوەی ئێمە بگەینە (معدن)، حکومەت

(٥٠٠) کەسی لەدانیشتوانی (ئاویامان) هێنابوو بۆ معدن بۆئەوەی ئێمە داگیرینەکەین.

لەدوای داگیرکردنی معدن هێرش برایەسەر (ئەرقەنی) و داگیرمانکرد و لەوێوە هەواڵ نێردرا بۆ (ڕەشید ئاغای تێرکان) و بۆ (ڕەشید ئاغای گەوران) و بۆ چەند کەسێکی تر بۆئەوەی خۆیان ئامادەبکەن بۆ هێرشبردن بۆ سەر دیاربەکر (لەدواییدا لەباسێکی ڕۆبەرت ئولسوندا کە بەدوورودرێژی باسی شەڕەکەی کردووە، باسی ئەو ساڵح بەگە دەکرێت کە ڕۆبەرت ئولسون بە(ساڵح بەگی هانلی) ناویبردووە.

ڕۆبەرت ئولسون لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٨٤ باسی ئەوانەی کردووە کە لەو شۆڕشەدا بەشداربوون، وەکو کوردەکانی زازا (ڕۆبەرت دەڵێت: زازاکان بەشێوە زمانی خۆیان دەڵێن دومڵی)، ئەوانەی ناوچە شاخاویەکانی (Liege) و (Hani–هانی) و باسی ئەوانەشی کردووە کە بەشداریان نەکردبوو وەکو (Milan), (Hasanan), (Purukan), (Heyderan), (Domsi), (Epodi)، جلالی، (Dakuri–داکوری)، (Zirkan–زرکان)، شادیلی، (Ademen) لەگەڵ ئەوەشدا لەناو عەشیرەتی (Hasanan–هەسانان)دا هی واش هەبووە لایەنگری شۆڕش بووە و شێخەکانی هەسانان لەسەرکردایەتی شۆڕشدا و بەرەی ڕۆژهەلاتی باکوردا بەشداربوون.

ڕۆبەرت ئولسون لەباسەکەیدا لەسەریئەڕوا و ئەڵێت: لەگەڵ ئەوەشدا ساتێك شەڕ دەستپێکرد و گەرم بوو هەندێ لەو عەشیرەتانەی بەڵێنی یارمەتیدان و بەشداربوونیان دابوو وەکو (Penchi Maran) و (Raman) و (Pesh Kotan) لەشۆڕش هەڵگەڕانەوە و بوون بەلایەنگری حکومەت و هەندێ عەشیرەتی تریش وەکو (شرناخ) و (Godan–گۆدان) و (Bezdima) و ئالان و (Kurgance) و (Karalisan) هەتا ١٩٢٥/٤/٥ بەشداریان نەکردبوو لەشۆڕشدا.

ڕۆبەرت ئولسون هۆی بەشدارنەبوونی ئەو عەشیرەتانەی بەم جۆرە باسکردوە:

١-ژمارەیەك لەسەرکردەکانی ئەو عەشیرەتانە لەلایەن حکومەتەوە بەرتیل و دیاریان پێدرابوو.

٢-ناوچەی (شرناخ) بەپێچەوانەی ناوچەی دەرسیم شوێنێکی دەوڵەمەند و زەویوزارێکی باش و بەپیتی هەبوو لەگەڵ مەڕومالاتێکی زۆر، لەبەرئەوە حەزیان لەئاشتی دەکرد و خۆیان لەشۆڕش دووردەختەوە.

٣-بێجگە لەوە سەرکردەکانی (شرناخ) بەتەمای ئەوەبوون پارمەتیان لەئینگلیزەوە دەستگیرببێت، لەڕاستیدا بەشدارنەبوونی شرناخیەکان کە ناوچەکەیان نزیکی سنووری عێراق بوو کە لەژێر دەستی حکومەتی بەریتانیادا بوو، تای تەرازووی شۆڕشەکەی نەویکرد، چونکە بەشداربوونی ئەوانە دەبووە هۆی بەشداربوونی عەشیرەتەکانی تری نزیک بەوان.

ڕۆبەرت ئولسون دەڵێت: بەو جۆرە بەشدارنەبوونی ئەمانە و بەشدارنەبوونی دەرسیمیەکان کە لەکاتی خۆیدا لەڕاپەڕینی دەرسیم و کوجگیریدا شارەزاییەکی تەواویان پەیداکردبوو بەتایبەتی ئەوانەی (هرموك) و (لولان) کارێکی وایکرد تورکەکان بەئاسانی بەناوچەکانی ئەمانەدا بەئارەزووی خۆی هاتوچۆ بکات و بوو بەهۆی ئەوەی تورکەکان توانیبوویان سنووری دەسەڵاتی شۆڕشگێڕەکان تەسك بکەنەوە.

ڕۆبەرت ئولسون دەڵێت: بێجگە لەوانەی باسمانکردون، ئەوانەی دەورووبەری دیاربەکریش نەبوون بەهاوکاری شۆڕشگێڕەکان و شێخ سەعید خۆشی بیری لەوە نەکردبووەوە بچێتە ناوجەرگەی جەماوەر و نەیتوانیبوو جگە لەسەرۆك عەشیرەتەکان جوتیارەکان والێبکات ببن بەهاوکاری شۆڕشگێڕەکان بۆیە کە شۆڕش دەستیپێکرد هەموو شتێك هەر بەدەست سەرۆك عەشیرەتەکانەوە بوو.

بۆ زۆرتر ڕوونکردنەوەی بارودۆخی ناوچەکانی شۆڕش، ڕۆبەرت ئولسون لەباسی دیاربەکردا وتویەتی: لەدیاربەکر کەسێکی ناسراو و دەسەڵاتدار بەلای شۆڕشەکەدا نەچوو، بگرە هی وایان هەبوو لایەنگری کەمالیەکان بوون، بۆ نمونە بنەماڵەی (قاسم بەگ) کە لەبنەماڵە ناسراوەکان بوون لەمانگی شوباتی ١٩٢٥دا بەرلەوەی شۆڕش دەستپێبکات شارەکەیان بەجێهێشت و بەوجۆرە هێزەکانی تورك لەو ناوچانەدا توشی کێشەیەکی ئەوتۆ نەبوون.

ئەوەی سەرنجڕاکێشەرە لەو باسەی ڕۆبەرت ئولسوندا ئەوەیە وادیارە ئەو لقەی کۆمەڵی ئازادی لەدیاربەکردا پێکیهێنابوو هەروەکو لەباسی کۆمەڵی ئازادیدا باسی کتێبەکەی قەدری بەگی جەمیل پاشای دیاربەکریمان کردووە کە بەحسابی ئەو دەبوایە دیاربەکر لەهەموو شوێنێك زۆرتر سەرگەرمی شۆڕش بوونایە و ئەو قاسم بەگەی ئەو باسیکردوە کە یەکێك بووە لەدامەزرێنەرانی کۆمەڵی ئازادی هەروەکو لەدواییدا باسیدەکرێت دەرکەوتوە چ خیانەتێکی گەورەی بەرامبەر بەکورد و ئەو شۆڕشە کردووە.

پرۆفیسۆر حەسرەتیان لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٤٩ وتویەتی حکومەتی تورك بۆئەوەی جوتیارەکانی ناوچەکە لەهاورێکردنی شۆڕش دووربخەنەوە، یاسای ژمارە ٥٥٦ی دەرکرد لەرۆژی ١٩٢٥/٢/٢٥دا بەپێی ئەو یاسایە ئەو باجی دە یەکەی لەجوتیاران دەسێنرا بۆ ماوەیەکی کاتی وەستانی و بەرامبەر بەمە سەرکردایەتی شۆڕشیش بۆ سوککردنی باری ئەو جوتیارانە ئەو باجەی لەجوتیارەکانی ناوچەکانی ژێر دەسەلاتیان دەسێنرا وەستانی و تەنها داوای لەدانیشتوان و جوتیارەکان کرد خواردەمەنی پێویست بۆ شۆڕشگێڕەکان دابینبکەن، کە سەرچاوەی حەسرەتیان بۆ ئەمە بریتیە لەکتێبی (هەڵوێستی کەمەنتەوەکان لەتورکیا) نوسینی (س. س. ئەتاناسیف)، چاپی یەریڤان ساڵی ١٩٦٣ لاپەڕە (٥٤).

پرۆفیسۆر حەسرەتیان لەکتێبەکەیدا دەربارەی بارودۆخی ناوچەکە و هەڵوێستی حکومەتی تورك لەدوای ڕووداوەکەی پیران وتویەتی: حکومەتی تورك لای وانەبوو ئەنجامی ئەو شۆڕشەی دوای ڕووداوەکەی پیران بەرپابوو بەوە دەگات کە شۆڕشەکەی کورد بگاتە ئەو ڕادەیەی بەو جۆرە پەرەبسێنێت و لایوابوو و لەرۆژنامەکانیشدا بڵاویدەکردەوە کە ئەو یاخیبوونە شتێکی ئەوتۆ نییە هیچ بایەخێکی پێبدرێت و بڵاویدەکردەوە لەبزوتنەوەیەکی چەتەگەری ڕاوڕوتکردن بەولاوە شتێکی تر نییە و زۆر شتی ڕاستی هەبوو لەبڵاوکراوەکانیدا دەیشاردەوە، بۆ نمونە لە ١٩٢٥/٢/١٨دا لەکۆبونەوەیەکی ئەنجومەنی میللیدا لەوەڵامی پرسیاری ئەندامێکدا وەزیری ناوخۆ وتبووی: لە(غنج) تاقمێك چەتە و ڕێگر بەسەرکردایەتی شێخ سەعید دەستیانکردوە بەچەتەیی و تاڵانکردنی دانیشتوان و ڕاوڕوتکردنی هاتوچۆکەران، بەڵام حکومەت بەزوترین کات لەناویاندەبات (کە سەرچاوەی حەسرەتیان بۆ ئەمە بریتیە لەلاپەڕە (٣٩)ی کتێبی (B. Gemel Seykh Sait isyan).

لەمۆسکۆش جێگری باڵیۆزی تورك کە (ئەنیس بەگ) بوو بڵاویکردەوە ئەو بزوتنەوەیە بایەخێکی ئەوتۆی نیە و هیچ مەترسیەکی بۆ حکومەت نییە و ئاسایشی وڵاتی پێ‌تێکناچێت و شێخ سەعید لەگەڵ کۆنەپەرستەکانی هاوبیریان لەژێر پەردەی ئاینەوە دەستیانکردوە بەو گێرەشێوێنیە، بەڵام جەماوەری خەڵك زۆر دوورن لەوەی هاوکاریان لەگەڵدا بکەن و بەم زووانە ئەو بزوتنەوەیە لەناودەبرێت، هەروەکو چۆن بزوتنەوەکەی عەشیرەتی (ئابور) ساڵی پار لەناوبرا

(لەهیچ سەرچاوەیەکدا باسی ئەم بزوتنەوەیەی نەکردووە) و زۆری پێناچێت ئەمەی شێخ سەعیدیش توشی شکستێکی خراپ دەبێت. سەرچاوەی حەسرەتیان بۆ ئەمە بریتیە لە(فجر الشرق) لەڕوسیەوە وەرگێڕاوە، کە لەڕۆژی ١٩٢٥/٣/١دا بلأوکراوەتەوە.

حەسرەتیان دوای ئەمە ئاماژەی بۆ ڕۆژنامەی (حاکمیتی میللی) کردووە کە لەڕۆژی ١٩٢٥/٢/٢٤دا دەرچووە، لەوەدا باسی کۆبونەوەیەکی ئەنجومەنی میللی تورکی کردووە کە لەو کۆبونەوەیەدا سەرۆك کۆمار کە مستەفا کەمال بووە و سەرۆکی وەزیران فەتحی بەگ و وەزیری ناوخۆ هەریەکەیان وتارێکی خوێندەوە، باسی ڕووداوەکانی (غنج) کرا، ئەمجارە ڕاپەڕینەکەیان بەهی تاقمێك چەتە و ڕێگر ناونەبرد بەڵکو بەبزوتنەوەی تاقمێکی کۆنەپەرست ناوبران و فەوزی پاشای چقماقچیش لەکۆبونەوەکەدا ئامادەبوو، لەکۆبونەوەکەدا بڕیاری (اعلانی طواریء) بۆ ماوەی مانگێك و (اعلانی عرفی) لەویلایەتەکانی (ئەرغان-بەرلەمە مالمیسان بەئەرقن ناویهێناوە) و دەرسیم و دیاربەکر و ماردین و ئورفە و سیورك و سعرت و بدلیس و وان و هەکاری و ناوچەکانی کیفی و خنس لەویلایەتی ئەرزڕۆم ئیعلانکرا و قسەکەرەکانی ئەو کۆبونەوەیە شێخ سەعیدیان بەوە تاوانبارکرد هەوڵی ئەوەیدابوو دەیەوێ حکومەت بگێڕێتەوە بۆ سەر ڕێبازی شەریعەتی ئیسلامی و دەیەوێ حکومەتێکی کوردی بۆ ئەو مەبەستە پێکبێت و هەوڵی گەڕانەوەی خەلافەتی ئیسلامی دەدات و حکومەتی کۆماری بەکافر لەقەڵەم دەدات.

حەسرەتیان لەباسی کۆبونەوەی ڕۆژی ٢/٢٤دا باسی (مەحمود ئەسعەد بەگ)ی وەزیری عەدلیەی کردووە کە پڕۆژەیەکی ئامادەکراوی پێشکەشکرد دەربارەی بارودۆخی ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵات کە بریتیبوو لە:

١-پێویستە هەر هەوڵدانێك بۆ بەکارهێنانی هەستی ئایینی لەناو خەڵکدا بۆ سەرگرتنی مەبەستێکی سیاسی بەتاوانی دژ بەحکومەت دابنرێت.

٢-ئەو کەسەی بەدەم یان بەنوسین هەوڵی پێکهێنانی کۆمەڵێك یان ڕێکخراوێك بدات کە بۆئەوە کاربکات دین بۆ مەبەستێکی سیاسی بەکاربێنێت ئەو هەوڵدانە بەخیانەتی گەورە بژمێرێت، لەکۆبونەوەکەدا زۆربەی ئەندامانی حیزبی (شعبی جمهوری) لەسەرئەوە ڕێکەوتن کە ئەوانە ببن بەیاسا و بۆ ئەو مەبەستە ڕۆژی ١٩٢٥/٢/٢٥ (مجلس عمومی-پارلەمان) مادەی یەکەمی یاسای سزای گۆڕی

دەربارەی خیانەتکردن لەنیشتمان کە کاتی خۆی لە ١٩٢٣/٤/١٥دا دەرچووبوو، ئەو مادەیە بەم شێوەیەی لێکرا: ((قەدەغەکردنی دروستکردنی هەر ڕێکخراوێکی سیاسی کە لەسەر بناغەی دین دابڕێژرێت بۆ گەیشتن بەئامانجی سیاسی لەژێر پەردەی دیندا و هەرکەسێك لەوجۆرە ڕێکخراوەدا بەشداریبکات بەخائینی وڵات دەژمێردرێت. سەرچاوەی حەسرەتیان بۆ ئەم گۆڕانکاریە بریتیە لەلاپەڕە (١٠٧)ی کتێبی ژمارە ٦٠٥، (Dustur).

حەسرەتیان دەڵێت لەو ڕۆژانەدا یەکێتی و لەیەکچون نەبوو لەنێوان بۆچونی کاربەدەستانی حکومەتدا دەربارەی سیاسەتی ناوخۆ و چۆنیەتی کوژاندنەوەی بزوتنەوەکەی کورد، کە ئەو ناڕێکیە زۆر ئاشکرا بووە لەنێوان ئەندامانی (حزبی شعبی جمهوری–مەبەست حیزبەکەی مستەفا کەماله) و (حزبی جمهوری تقدمی– کە لەزۆر سەرچاوەدا وتراوە سەرکردەکەی کازم قەرەبەکر بووە)، بێجگە لەمە حیزبی جمهوریش ئەندامەکانی لەناو خۆیاندا لەسەر یەك بۆچوون نەبوون و لەئەنجامی ئەمەدا سێ تاقم پەیدابوو:

١–مامناوەندیەکان (معتدلون).

٢–نەتەوەییە ڕەگەزپەرستەکان.

٣–چەپڕەوەکان کە بە(ڕادیکالی) ناودەبران.

تاقمی دوهەم کە زۆر ڕەگەزپەرست بوون، لەناو سەرکردایەتی حیزبەکەیاندا زۆرینە بوون (مەبەستی سەرکردایەتی حزبی شعبی جمهوریە) و بەهەلیان زانی و توانیبوویان مامناوەندەکان دووربخەنەوە لەبەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەتدا و پەلاماری پێشکەوتنخوازەکانیاندا و سوودیان لەڕاپەڕینەکەی شێخ سەعید دەستگیربوو کە بیکەن بەبیانوو بۆ سەرگرتنی مەبەستەکانیان. هێرش برایە سەر (فەتحی بەگ) کە سەرۆك وەزیران بوو، ڕەخنەی ئەوەی لێگیرا نەیتوانیبوو بەباشی لەکاتی خۆیدا قەوارەی بزوتنەوەکەی شێخ سەعید هەڵسەنگێنێت و شتەکانی بەڕاستی نەخستبووە پێشچاو، بەپێچەوانەی ئەمەش هەندێ لەئەندامانی (حزبی شعبی جمهوری) کێش و قەوارەی ڕاپەڕینەکەیان زۆر زل کردبوو.

ڕادیکاڵیەکانیش وەنەبێ لەبۆچونیاندا لەڕێبازی حکومەت لایاندابێت، بەڵکو لایەنگری هەموو ئەو هەنگاوانە بوون کە فەتحی بەگی سەرۆك وەزیران نابووی بۆ لێدانی شۆڕشەکەی کورد و ڕۆژنامەکانیان بەئاشکرا هەموو لایەنگری حکومەت بوون و دژی ڕاپەڕین و ڕاپەڕیوەکان شتیان دەنوسی و بڵاویاندەکردەوە و کازم

قەرەبەكری سەركردەیان بەئاشكرا داوای ئەوەی دەكرد پێویستە خائینەكانی ولآت دەستنیشان بكرێن لەوانەی كە دین و ئاین بۆ مەبەستە سیاسیەكانی خۆیان بەكاردێنن (كە مەبەستیان شێخ سەعید و شۆڕشگێڕەكانی هاوكاری بووە) و لیژنەی ناوەندی حزبی شعبی جمهوری تەلگرافیان نارد بۆ لقەكانی خۆیان لەویلایەتەكان و داوایان لەهەموو ئەندامانی ئەو لقانە كرد بزوتنەوەكەی شێخ سەعید بەبزوتنەوەیەكی كۆنەپەرستی لەقەڵەم بدەن و بەهەموو شێوەیەك دژی ئەو بزوتنەوەیە كۆشش بكەن. كە سەرچاوەی حەسرەتیان بۆ ئەمە بریتیە لەلاپەڕە (٤٧)ی كتێبی (Sekh Sait isyani–عسیانی شێخ سەعید).

ڕۆژنامەكانی سەر بەحكومەت لەڕەخنەكانیاندا بەرامبەر (حزبی جمهوری تقدمی) بەوە تاوانباریان دەكرد كە گوایە ئەو حیزبە ئەو شتانەی كە دەیوت و بڵاویدەكردەوە تەنها شتێكی تەكتیكی بووە و بەرامبەر بەمەی ئەوان (حزبی تقدمی)یش عیسمەت ئینونۆیان بەوە تاوانبار دەكرد كە دەیویست سوود لەڕووداوەكانی ویلایەتەكانی ڕۆژهەلآت وەربگرێت بۆئەوەی لەژێر پەردەی ئەوەدا بەسەر هەموو دژەكاندا زاڵبێت لەوانەی ڕەخنەیان لەخۆی دەگرت.

حەسرەتیان لەپەراوێزی لاپەڕە (٩٢)ی كتێبەكەیدا باسی ئەوەی كردووە پاڵێوراوەكانی (حزبی شعبی جمهوری) لەهەڵبژاردنی دەزگاكانی بەڕێوەبردنی شارەكانی (حمسون، ئەسكیشهر، سیڤاس، مەرسین)دا سەرنەكەوتبوون بەڵكو پاڵێوراوەكانی (حزبی جمهوری تقدمی) دەرچووبوون، دیارە لەئەنجامی ئەمەدا هەروەكو حەسرەتیان باسیكردوە، فەتحی بەگی سەرۆك وەزیر بەپێی ڕاسپاردەی مستەفا كەمال داوای لە(حزبی جمهوری تقدمی) كردبوو حیزبەكەیان هەڵوەشێننەوە بەتاوانی ئەوەی هانی كوردەكان ئەدەن لەگەڵ ئەوەشدا ئەو حیزبە هیچ پەیوەندی و چالاكیەكی نەبووە لەو ناوچانەی ڕاپەڕینەكانی تیادا كرابوو، بەئاشكرا فەتحی بەگی سەرۆك وەزیران، كازم قەرەبەكر و عەلی فوئادی سكرتێری و ڕەوف بەگی لەوە ئاگاداركردبوو ئەگەر حیزبەكەیان هەڵنەوەشێننەوە ئەوا توشی كێشەیەكی گەورە دەبن كە دەبێتە هۆی خوێنڕشتنێكی زۆر و فەتحی بەگ ڕووبەڕوو پێیان دەڵێت بەداخەوە ناچارم ئەمەتان پێڕابگەیەنم چونكە ئەگەر ئەوە نەكەن دەبن بەكەمایەتیەكی بێهێز و مستەفا كەمال و تاقمەكەشی بڕیاری دیكتاتۆریەتی تاكە حیزبی ئەدەن، بەلآم لەگەڵ ئەوەشدا سەركردەكانی (حزبی جمهوری) پارتەكەی خۆیان هەڵنەوەشانەوە و كازم قەرەبەكر بەفەتحی بەگی وت:

هەڵوەشانەوەی حیزب بەدەست ئێمە نیە بەڵکو بەدەست کۆنگرەیە و لەگەڵ ئەوەشدا پارتەکەمان بەهەموو توانای خۆیەوە بەلایەنگریەتی حکومەت دەمێنێتەوە بۆ لەناوبردنی ڕاپەڕینی کوردەکان.

حەسرەتیان لەباسەکەیدا دەچێتە سەر باسی کۆبونەوەیەکی (حزبی شعبی جمهوری-پارتەکەی مستەفا کەمال) لەڕۆژی ١٩٢٥/٣/٢دا لەو کۆبونەوەیەدا (ڕەجەب بەگ) ڕەخنە لەسیاسەتی فەتحی بەگی سەرۆك وەزیران دەگرێ کە قسەکانی ماوەی سێ سەعات دەخایەنێ و زۆر بەتوندوتیژیەوە فەتحی بەگ بەوە تاوانبار دەکات کە نەیتوانیبوو بەزووترین کات ئەو ڕاپەڕینە دامرکێنێتەوە و لەناوییبات و فەتحی بەگیش بەرامبەر بەوە خۆی پێناگیرێت و دەڵێت: ئەوەی ڕەخنە لەمن بەمجۆرە دەگرێت، بەداخەوە دەڵێم ئەو کەسەی بۆتە هۆی کێشەی کورد هەر ئەوانەن کە ڕەخنە لەمن دەگرن و ئیتر من لەمە زۆرتر دەستی خۆم خوێناوی ناکەم بەسزادان و کوشتن و بڕین کە هیچ پێویستیش بەوانە ناکات (سەرچاوەی حەسرەتیان بۆ ئەمە بریتیە لەکتێبی مستەفا کەمال، لاپەڕە (٢٢١) نوسینی S.S.Aydemir Adam).

حەسرەتیان دەڵێ لە ١٩٢٥/٣/٨دا فەتحی بەگی سەرۆك وەزیران وازی لەکارهێنا و لەجیاتی ئەو (عیسمەت پاشا-مەبەست عیسمەت ئینونۆ) بوو بەسەرۆك وەزیران و کابینەیەکی تازەی دانا. عیسمەت پاشا لەیەکەم کۆبونەوەی ئەنجومەنی وەزیرانی تازەدا پرۆگرامی وەزارەتەکەی خوێندەوە و بەڵێنی ئەوەی دا بەر لەهەموو شتێك ئەو ڕاپەڕین و ڕووداوانە لەناودەبەن و وڵات لەدەسیسەی بێگانە ڕزگاردەکەن. لەڕاستیدا هەروەکو ڕۆژنامەی (حاکمیتی میللی) لەژمارەی ڕۆژی ١٩٢٥/٣/٦دا بڵاویکردبوەوە گۆڕینی وەزارەت شتێکی تەکتیکی بوو چونکە عیسمەت ئینونۆ دانی بەوەدا نابوو پرۆگرامی وەزارەتی پێشووە.

لەڕۆژی ١٩٢٥/٣/٤دا یاسای ژمارە/٨ دەرچوو دەسەڵاتێکی زۆردرا بەحکومەت و بەپێی مادەی یەکەمی ئەو یاسایە حکومەت دەسەڵاتی ئەوەی پێدرا دژی هەر کۆمەڵ و ڕێکخراوێك بوەستێت بۆنی کۆنەپەرستی لێبێت و هەرکەسێك لەو بڕیارە لابدات بدرێت بەدادگای (استقلال) و ئەو یاسایە بۆ ماوەی دوو مانگ بەکاربهێنرێت و ئەو دادگایەی دەسەڵاتی دادگاکردنی پێدرا بریتی بوو لەدوو دادگا، یەکەمیان لەئەنقەرە و ئەویتریان بۆ ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵات (کە کوردنشین بوون) و هەروەکو ڕۆژنامەی (Vakit-وەقت) لەژمارەی ڕۆژی ١٩٢٥/٣/٦دا

بلاٚویکردبوەوە دەسەلاٚتی ئەو دادگایانەی بۆ ویلایەتەکانی ڕۆژهەلاٚت دانرابوو تەواو بێسنور بووە (دادگای ویلایەتە ڕۆژهەلاٚتەکان لەدیاربەکر بووە).

بەپێی ئەو یاسا تازەیە ڕۆژنامەکانی ئۆپۆزسیۆن داخران کە بریتی بوون لەڕۆژنامەی (توحید ئەفکار) و گۆڤاری (سبیل الرشاد) و ڕۆژنامەی (استقلال) کە هی ئیتحادیەکان بوو لەگەلٚ ڕۆژنامەی (سوین تەلگراف) لەتەرابزون و ڕۆژنامەی (التقدمیە) و (استقبال) هەروەها لەئەدەنەش ڕۆژنامەی (حمیە) داخرا لەگەلٚ دوو ڕۆژنامەی چەپڕەوەکان کە بریتی بوون لە(ئیدنیلیك) و (ئوراك جكیج). سەرچاوەی حەسرەتیان بۆ داخستنی ئەم ڕۆژنامە و گۆڤارانە بریتیە لەلاپەڕە (٨٢)ی کتێبی (M.Toker Seh Sait Ve isyani) وە لەلاپەڕە (٧٦)ی هەمان کتێبدا وتراوە مستەفا کەمال بانگەوازێکی بلاٚوکردەوە لەوەدا ڕاپەڕیوەکانی بەوە تاوانبارکرد کە دەیانەوێ شۆڕشێك دەربارەی تورکیا بەرپابکەن و داوای لەهەموو هاولاٚتیەك کرد یارمەتی حکومەت بدات بۆ لەناوبردنیان.

لە١٩٢٥/٣/١٢دا دادگای ئەنقەرە هەڕەشەی لەوانە کرد کە خەلٚك هاندەدەن لەسوپا ڕابکەن و بەشداری نەکەن دژی یاخیبووەکان هەروەکو لەڕۆژنامەی (وقت)ی ڕۆژی ٣/١٢دا بلاٚوکرابوەوە. لەکۆتایی مانگی ئازاردا حکومەت هێزەکانی بەسەرکردایەتی جەنرالٚ (کمال الدین سامی پاشا) ئامادەکرد بۆ ڕووبەڕووبونەوەی ڕاپەڕیوەکان و بلاٚویکردەوە حکومەت سێ شتی لەبەردەستدایە:

١-لەناوبردنی ڕاپەڕینەکەی کورد و بەکارهێنانی نەوپەڕی توندوتیژی بێبەزەییانە و لەسەرەتای مانگی نیساندا یەکە سەربازیەکانی ژمارە (٧، ٨، ٩) لەگەلٚ سێ فەیلەقی تر خۆیان ئامادەکرد و ڕووبەڕووی ڕاپەڕیوەکان بوونەوە.

٢-سەندنی چەك لەهەموو کوردێك بەشدار بووبێت لەڕاپەڕیندا یان بەشدار نەبووبێت.

٣-پەرەوازەکردنی کورد و دورخستنەوەیان لەیەك و دابەشکردنیان بەسەر ناوچە دوورەکاندا.

حەسرەتیان لەباسەکەیدا لەسەری ڕۆیشتوە و وتویەتی: شانبەشانی ئەمە ئیمپریالیزمیش (مەبەستی حکومەتی فەرەنسیە) یارمەتیەکی زۆری تورکیدا بەوەی ڕێگای بەهێزەکانی تورکدا بەناو خاکی سوریادا تێپەڕێت و لەپشتەوە

لەشۆڕشگێڕانی کورد بدەن. لەنیوەی دوهەمی مانگی مارتدا سەرکردایەتی هێزەکانی تورك بانگەوازێکی بۆ دانیشتوانی (ئەرزڕوم، ئەرزنجان، دەرسیم، العزیز، مەلاتیە، ئورفە، وان، سیرت، موش، غنج) بلاوکردەوە و داوای لێکردن پێویستە دڵسۆزی خۆیان بۆ حکومەت دەربڕن و ئەبێ دەمودەست ڕووبکەنە بنکەکانی سوپای حکومەت و ناوی خۆیان تۆماربکەن بۆ ئامادەبوون بۆ بەشداریکردن دژی یاخیبووەکان. سەرچاوەی حەسرەتیان بۆ ئەمە بریتیە لە (Jourald Orient) ڕۆژی ١٩٢٥/٣/٢٤.

سەرکردایەتی سوپا لەسەرەتای مانگی نیساندا بلاویکردەوە هەرکەسێك شێخ سەعید بەزیندویی بگرێت هەزار لیرەی ئاڵتونی دەدرێتێ و ئەوانەش کە لەگەڵیان ئەگەر وازبێنن پاداشتیان دەدرێتێ و حکومەت لێیان خۆشدەبێت و حکومەت بلاویکردەوە پێویستە چەك تەسلیمی حکومەت بکرێت و هەرکەس بەچەکەوە بگیرێت بەتوندی سزادەدرێت کە دەقی ئەو بلاوکراوەیە لەڕۆژنامەی (Aksam- ئەقشام)ی ڕۆژی ١٩٢٥/٤/١٣دا بلاوکرابوەوە.

لەناوەڕاستی مانگی نیساندا شۆڕشگێڕان لەدۆڵەکانی (غنج)دا دەورەدران و بەهۆی خیانەتی (قاسم بەگ)ەوە شێخ سەعید و سەرکردەکانی تر لەسەر پردی سەر ڕوباری (مراد) گیران کە بریتی بوون جگە لەشێخ سەعید: شێخ عەبدوڵلا، شێخ عەلی، شێخ غالب، ڕەشید ئاغا، محەمەد ئاغا و (٢٦) شۆڕشگێڕی تری کورد (لەدواییدا بەدووروودرێژی باسی ئەو گرتنە دەکرێت)، نوسەر لەلاپەڕە (١٠٣)دا باسی ئەوەی کردووە لە١٩٢٥/٤/٢٠دا ئەنجومەنی میللی تورکی ئەحکامی عورفی بۆ حەوت مانگی تر درێژەپێدا و دادگاکانی (استقلال)یش لەئەنقەرە و دیاربەکردا بۆ شەش مانگی تر دەسەلاتیان تازەکرایەوە. کە سەرچاوەی حەسرەتیان بۆ ئەمە بریتیە لە (Dustur Cilt.٥٦٦, ٥٦٨, ٥٦٩).

هەروەکو حەسرەتیان باسیکردوە ئەنجومەنی میللی یاسای ژمارە/٦٣٥ی دەرکرد، بەپێی ئەم یاسایە هەرکەسێك هەوڵی گۆڕینی دەستوور بدات دەبێ حوکمی لەسێدارەدانی بۆ دەربچێت، بێجگە لەمانە حکومەت (١٢) فڕۆکە و (٢٠٠) هەزار سەربازی بەکارهێنا بەرامبەر بەشۆڕشگێڕانی کورد کە ژمارەیان نزیکی (٤٠) هەزار دەبوو.

## باسی شەشەمی بەشی دەهەم

### دەستپێکردنی شۆڕش هەتا کاتی شکاندنی

دەربـــارەی دەســـتپێکردنی شـــۆڕش (Patrick Kinross) لەلاپـــەڕە (٣٩٧)ی کتێبەکەیـــدا سەرچـاوە/٨٥ وتویـــەتی ســـاتێك شـێخ ســـەعید بەتـــەواوەتی لـــە ١٩٢٥/٢/١٣دا بانگەشـەی شۆڕشـی کـرد، ئالآی سـەوزی ئیسـلامی هـەڵکرد و ئالآ گیرا بەدەستەوە و خۆی و هێزەکەی پەلاماری دەزگاکانی حکومەتیاندا لەئیلازیك و دەستیان بەسەر بانقدا گرت و بەرزاییەکانیان خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە.

سـەیر ئەوەیـە ئـەم کتێبـە باسـی شـتێکی کـردووە کـە لـەهیچ سەرچاوەیەکدا باسینەکراوە و تۆزێکیش دوورە لەڕاستیەوە کە بریتیە لەوەی ساتێك لەو ڕۆژانەدا شـــۆڕش دەســـتپێکرد لەئاسمانـــەوە بەفرۆکـــە بەیاننامەیـــەك دژی حکومـــەت بلآوکرایـەوە و لـەو بەیاننامەیـەدا وترابـوو ولآت بـەبێ خەلیفـە نـاژی و داواکـرا ژنانیش بەشدارییکەن لەکۆڕی شۆڕشدا و بەئاسانی ئیلازیکیان گرت بەڵام زۆری پێنەچوو حکومەت ناچاریکردن بکشێنە دواوە پاشنەوەی حکومەت یارمەتی بۆ هاتبوو (مەبەستی ئەو هێزەی حکومەتە کە بۆ پاراستنی دیاربەکر نێرابوو وەکو لەدواییدا بەدووروودرێژ باسیدەکرێت).

لەڕاســتیدا بلآوکردنــەوەی ئــەو بەیاننامــە بەفرۆکــە لــەو ڕۆژانــەدا شــتێکی نـەگونجاو بـووە لەبـەر هەنـدێ هـۆ، وە لـەو ڕۆژەدا حکومـەتی ئەسـتەمبوڵ هـیچ فرۆکەیـــەکی بەدەســـتەوە نـەبووە کـــە بتوانێـــت دژی کەمالیـــەکان بەیاننامـــەی پیێبلآوبکاتـــەوە و ئینگلیـــزیش هـــیچ ســـودێکی لەبلآوکردنـــەوەی وادا نـــەبووە و هەروەکو لەدواییدا لەشوێنی خۆیـدا و لەباسی هەڵوێستی حکومەتی بەریتانیادا بەرامبـەر بـەم شۆڕشـەی کـورد ڕووندەبێتـەوە. بـەڵام دوورنیـە ئـەو بەیانـەی لـەم سەرچاوەیەدا باسکراوە بریتی بێت لەو بەیانەی شێخ سەعید لەمارتی ١٩٢٤دا بلآویکردبـوەوە بـەناوی (شـێخ سـەعیدی نەقشـی پـیران کـە لەلایـەن ئیسـماعیل شاوەیســەوە کـراوە بەشـێوەی کرمـانجی خـوارووی کـە لەباسـی چـوارەمی بەشـی دەهەمدا بلآومانکردۆتەوە.

دەربارەی ڕووبەڕووبونەوەی شۆڕشگێڕانی کورد لەگەڵ حکومەتدا هەتا کاتی شکاندنی شۆڕش و دەستگیرکردنی شێخ سەعید و هاوڕێکانی و لەسێدارەدانی گەلێك سەرچاوە بەدووروردرێژی باسی هەموو ڕووداوەکانیان کردووە و لێرەدا ئێمەش هەوڵئەدەن کورتەی ئەو سەرچاوانە پێشکەش بکەین کە هەریەکەیان بەشێوەیەك لێی‌دواون و لەکۆتاییدا ئاماژە بۆ ئەو کەم‌وکوڕیانە و ئەو ڕەخنانەی لەشۆڕشەکە گیراوە بەپێی ئەو سەرچاوانە پێشکەشیان دەکەین.

پرۆفیسۆر حەسرەتیان بێجگە لەو باسەی لەپێشوودا لێی‌دواوین لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٤٩ دوبارە چوەتەوە سەر باسی شۆڕشی پیران و ئاماژەی بۆ لاپەڕە (٢٠٤)ی کتێبەکەی (ئەرمسترونغ) کردووە کە باسی هەڵوێست و ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژانەی ناوچەکە و شۆڕشەکەی پیرانی بەم شێوەیە کردووە: ((لەمانگی شوباتی (١٩٢٥)دا دوایئەوەی شێخ سەعید سەرکردایەتی شۆڕشی گرتبووەدەست لەگەڵ تاقمە چەکدارەکەی (حاجی حەسەن) و (عومەر فاروق) و هێزی عەشیرەتی (مستان) و (بۆتان) کە لەخوارووی (چاپاکچور)دا بوو لەڕۆژی ١٩٢٥/٢/٢دا دەستیگرت بەسەر (لجی) و (خانی) و لەوێوە هێزەکەی (سالح بەگ)ی خەڵکی خانی چوەپاڵ هێزەکەی شێخ سەعید و لەوێوە بەسەر دۆڵی خانیدا ڕوویکردە دیاربەکر (ئەم سالح بەگەی حەسرەتیان باسیکردوە بریتیە لەسالح بەگی هێنەیی کە (مالمیسانج) یاداشتەکەی کردووە بەکرمانجی ژووروو کە بەرلەمە باسمانکردوە).

لە ١٩٢٥/٢/٢٨دا هێزێکی گەورەی شێخ شەمسەدین چووەپاڵی و لە ٢/٢٩دا شێخ عەبدولڕەحمان برای شێخ سەعید (ڕاستیەکەی شێخ عەبدولڕەحیمە) لەناحیەی (مادن-معدن) لەویلایەتی (العزین) دەستی بەڕاپەڕین کرد و (شێخ ئەیوب) بەخۆی و (٥٠٠) چەکدارەوە چووەپاڵ هێزەکەی شێخ عەبدولڕەحیم لە(چرمیك) لەویلایەتی دیاربەکر و لەوێوە هەردوولایان ڕوویانکردە (ئەرغانی) و شاری (پالو) کرا بەبنکەی سەرکردایەتی شۆڕش کە ژمارەی هێزەکانی شێخ سەعید لەوکاتەدا گەیشتبووە بیست هەزار چەکدار (ئەوەی شایانی باسە وەکو بەرلەمە لەباسێکی حەسرەتیاندا وتراوە ژمارەی شۆڕشگێڕانی کورد بریتی بووە لەچل هەزار بەرامبەر بە (٢٠٠) هەزار چەکداری حکومەت و (١٢) فڕۆکە، کە دوورنیە ئەم بیست هەزارەی لەدواییدا باسیکردوە تەنها بریتی بووبێت لەچەکدارەکانی ئەو ناوچەیەی هێزەکانی شێخ شەمسەدین و شێخ ئەیوب و شێخ

عەبدولڕەحیم یەکیانگرتبوو) وە لەوێوە هەواڵی هێزەکانی تری کوردیان پێگەیشت لەناوچەکانی ماردین و ئەرغانی و (معدن–مادن) و هەتا دەهات ژمارەی شۆڕشگێڕان لەپەرەسەندندا بوو هەر شوێنێکیان داگیربکردایە دەزگایەکی تایبەتیان لێدروستدەکرد.

هەروەکو حەسرەتیان باسیکردوە شێخ سەعید لەوە گەیشتبوو هێزەکانی بەشی ئەوەناکەن بەسەر سوپای تورکدا سەربکەوێت بۆیە لەوێوە هەوڵیدا وتوێژ لەگەڵ حکومەتدا بکرێت لەمەدا شێخ سەعید مەبەستێکی تری هەبوو دەیویست لەوکاتەدا لەمەبەست و نیاز و هەڵوێستی دانیشتوانی دیاربەکر تێبگات و هەوڵی ئەوە بدات چۆن بیانکات بەلایەنگری شۆڕش. بەرامبەر بەو تەقەلایەی شێخ سەعید حکومەت لەنیاز و مەبەستی شۆڕشگێڕان گەیشتبوو، بۆیە خۆی ئامادەکردبوو بۆ بەرەنگاربونەوەیان و (عەلی جەمال پیرداخی) کە موتەسەڕیف بوو لەگەڵ (کازم پاشای ئوربای) کە سەرکردەی هێزەکان بوو، وە (مرسل بەگ)ی سەرکردەی فیرقە کۆبوبونەوە و چاوەڕوانی گەیشتنی هێزی یارمەتی بوون بۆ دیاربەکر و هەتا گەیشتنی ئەو هێزە بڕیاریاندا چەك بدەن بەدانیشتوانی دیاربەکر و هاوکاری لەگەڵ حکومەتدا بکەن بۆ پاراستنی شارەکە.

چەکدارەکانی شۆڕش بەشێك لەچەکەکانیان بریتی بوو لەچەکی کۆن و تفەنگی ساچمەزەنگ کە لەڕاودا بەکاردەهێنرا و لەشەوی ١٩٢٥/٣/١١دا هەندێ چەکدار هەڵبژێردرا بۆئەوەی هێرشبکەنە سەر شارەکە (مەبەست دیاربەکر)ە و ساتێك گەیشتنە دەروازەی ماردین (یەکێك بووە لەدەروازەکانی شاری دیاربەکر) ئەوانەی لەناو شاری دیاربەکردا لایەنگری شۆڕش بوون چوونە پاڵ هێزەکەی شۆڕشگێڕان و بەهەموویان پەلاماری هێزەکەی تورکیاندا و هاوار و بانگەوازی (بژی کوردستان) بەرزبووەوە و هێزەکەی حکومەت پرچەك بوو، لەیەکەم ڕووبەڕووبونەوەدا (١٥٠) کورد شەهید بوون و ئەوانیتر کە ڕزگاریان بووبوو لەژێر باڵی تاریکایی شەودا گەڕانەوە بنکەکانی خۆیان و ئەوانەی ناو شاریش بەدەنگ شۆڕشگێڕەکانەوە چووبوون، ئەوی ڕزگاری بووبوو خۆی گەیاندبووەوە ماڵی خۆی.

لەدوای ئەو شکاندنە شێخ فەرمانی کشانەوەی ئەو هێزەی دەرکرد و حکومەت یارمەتی تازەی پێگەیشت و لەباکورەوە (٤٠) هەزار سەربازی تورك ئابلۆقەی شۆڕشگێڕانیاندا و (٣٠) هەزاری تریش پەلاماری چەکدارەکانی شۆڕشیاندا.

حەسرەتیان لەکتێبەکەیدا ئاماژەی بۆ ڕۆژنامەی (ئەقشام)ی تورکی کردووە کە لەڕۆژی ١٩٢٥/٤/٢٧دا دەرچووە باسی نامەیەکی شێخ سەعیدی تیادا بڵاوکراوەتەوە کە لەو نامە گیراوەدا دەرکەوتوە شێخ سەعید داوای یارمەتی کردووە لەهاوکارەکانی.

حەسرەتیان دەڵێ لەو هەڵوێستەدا شێخ سەعید چەند نامەیەکی ناردبوو بۆ شێخ عەبدولڕەحیمی برای (کە لەهەندێ شوێندا بەهەڵە بەشێخ عەبدولڕەحمان ناوبراوە، لەباسی بنەماڵەی شێخانی پیراندا بەرلەمە وتراوە ناوی شێخ عەبدولڕەحیم بووە هەروەکو ڕۆبەرت ئولسون باسیکردوە) و بۆ شێخ ئیسماعیل و بەپێی ئەوەی لەڕۆژنامەی ئەقشامدا بڵاوکراوەتەوە نامەکەی شێخ سەعید بەم شێوەیە بووە: سەعات چواری ڕۆژی جومعە هەردوو نامەکەتانم پێگەیشت کە لەڕۆژی ٩ی شەعبانی بەرامبەر (١٩٢٥/٣/١٥) نوسرابوو کە نامەیەکی (شێخ ڕەشید)یشی لەگەڵدا بوو، ئێوە لەنامەکەتاندا وتوتانە (بوزان ئاغا) و (شێخ ئەیوب) هاتون بۆ (کارا) لە(بغنج)ەوە داوا دەکەن منیش بچمە ئەوێ، حەزم دەکرد بتانبینم بەلآم نەختێك لەمەوبەر (ڕەشید کانی)م لەگەڵ سەد سواردا نارد بۆ بەرەی ڕۆژهەلآت و ئیمڕۆ بەئومێدی خودا چاوەڕوانی ئەوەم عەشیرەتی (ئیرغیان) بگەنە لای ئێمە و کە گەیشتن دەیاننێرم بۆ جەبهە، هەروەها (شێخ تاهیر) و (شێخ سراج)م نارد بۆ ناوچەکە بۆ بەرزکردنەوەی وورەی شۆڕشگێڕەکان و هێشتا نەهاتوونەوە و هەرکاتێك گەیشتنەوە لێرە هەندێ کاروبار هەیە ڕێکیاندەخەم و ئەوسا خۆشم دێم بۆ لای ئێوە بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ (بوزان ئاغا) و (شێخ ئەیوب) و داواتان لێدەکەم بەئارام و خۆڕاگرین و داوا لەچەکدارەکانمان دەکەم بەپێی شەریعەتی ئاین هەڵسوکەوت بکەن و ڕێگە نەدرێت دەستدرێژی بکرێتەسەر ماڵ و موڵکی موسڵمانان و هەروەکو بەرلەمەش ئاگادارمکردون دەتوانن شت لەکۆگاکان وەربگرن بەمەرجێك بەرامبەر هەرشتێکی وەرگیراو پسوله بدرێت بەخاوەنەکەی بۆئەوەی لەدواییدا ئەو شتانە یاخود نرخەکانیان بدرێتەوە بەخاوەنەکانیان.

ئیمزا

خادم المحاربين-محمد سعيد نقشبندى

ئەوەی شایانی باسە دەربارەی ئەو نامەیەی شێخ سەعید، دوورنیە ئەو نامەیەی لەڕۆژنامەی (ئەقشام)دا بڵاوکراوەتەوە بریتی نەبووبێت لەهەموو نامەکەی شێخ سەعید یان حەسرەتیان هەرئەوەندەی لێبڵاوکردۆتەوە کە لەکتێبەکەیدا (وەرگێرانە عەرەبیەکەی لەڕوسیەوە) بڵاوکراوەتەوە، چونکە ڕۆژنامەی (Vakit–وقت)ی تورکیش هەمان نامەی بەشێوەیەکی تر بڵاوکردۆتەوە کە (مالمیسانج) لەتورکیەوە کردویەتی بەکرمانجی ژووروو و بەپیتی لاتینی و مامۆستا حەسەنی قازی بەسوپاسەوە کردویەتی بەکرمانجی خواروو و بۆی ناردوم کە (مالمیسانج) وتویەتی کاتی خۆی ئەو نامەیە دەست سەربازەکانی تورك کەوتوە و لەڕۆژنامەی (وقت)دا بڵاوکراوەتەوە کە ئەمەی خوارەوەی لەسەر نوسراوە (لەلایەن تورکەوە: Tarih Numrosi Gevrah-Adad-Jenderma Kumandanlig).

بێجگە لەوەرگێرانەکەی مالمیسانج لەلاپەڕە (٦٠)ی سەرچاوە/٥٠دا گۆڤاری کوردنامە فۆتۆکۆپیەکی دوو لاپەڕەیی ئەو نامەیەی کە بەزمانی تورکی نوسراوە بڵاویکردۆتەوە کە مۆری (خادم المجاهدین–سعید)ی لەسەرە کە لەڕۆژی جومعە ڕێکەوتی ١٩ی شەعبانی ١٣٤٣ی کۆچیدا نوسراوە بەڵام بەداخەوە نوسراوە کە لێڵە و هەروەکو (مالمیسانج)یش بڵاویکردۆتەوە دیارە نامەکە خوێنداوی بووە (لەوەی مالمیسانجدا وتراوە نامەکە لەڕۆژی ٩ی شەعباندا نوسراوە بەڵام لەفۆتۆکۆپی نامەکەدا کە بەتورکی گۆڤاری کوردنامە بڵاویکردۆتەوە لەڕۆژی ١٩ی شەعباندا بووە).

بەپێی وەرگێرانەکەی (مالمیسانج) لەڕۆژنامەی (وقت)ەوە کە بەشێوەی کرمانجی خواروو بەم شێوەیە بووە (کە لەلایەن حەسەنی قازیەوە لەکرمانجی ژوورووەوە کراوە بەکرمانجی خواروو): بۆ برای خۆم شێخ عەبدولڕەحیم و خۆشەویستی من سمایل ئەفەندی (کە بەرلەمە بەشێخ ئیسماعیل ناوی هاتوە) نامەی ڕۆژی ١٩ی شەعبانی ١٣٤٣ (مارتی ١٩٢٥)ی ڕۆژی جومعە سەعات چوار بەدەستم گەیشت (کە ئەمە ساغیدەکاتەوە نامەکەی کە نێرابوو بۆ شێخ سەعید لە١٩ی شەعباندا لەهەمان ڕۆژدا وەڵامی دراوەتەوە) کە نامەی شێخ محەمەد ڕەشید ئەفەندیشی لەگەڵدابوو، ئێوە سەبارەت بەهاتنی (بوزان ئاغا) و شێخ ئەیوب ئەفەندی بۆ (قەرەباخچە–گوندێکی سیورگیە) کە لەوەی حەسرەتیاندا بە(کارا) ناویهێناوە لەنامەکەتاندا نوسیوتانە: کە ئەوان چاوەڕوانی بینینی ئێمە

دەکەن، بەسەروچاوان ئەمن بۆ خۆم دەهاتم بۆ زیارەتیان، بەلام ئەمن دوێنێ رەشید ئاغام لەگەلێ (١٠٠) پیاودا ناردە بەرەی رۆژهەلات بۆ گوندی (سماق- گوندێکی دیاریەکرە)، ئیمرۆش خودا یاربێ عەشیرەتی تیرکان-کە لەژووروی دیاربەکردایە (حەسرەتیان بەعەشیرەتی نیرغیان ناویهێناوە، کە ئەمە کێشەیەکی گشتیە لەنێوان ناوەکاندا بەهۆی وەرگێرانی باسەکان لەزمانێکەوە بۆ زمانێکی تر، کە ئەوەی حەسرەتیان لەرووسیەوە کراوە بەعەرەبی) دەیاننێرم بۆ جەبهە و شێخ تاهیر و شێخ سراجیشم ناردووە بۆ کۆکردنەوەی چەکداران و هێشتا نەگەراوەتەوە، شێخ منیریشم ناردووە بۆ زوخبریم (لەسەرچاوە/٥٠دا وتراوە زوخبرین و لەوەی مالمیسانجدا لەپەراوێزدا وتراوە گوندێکی هەرزۆیە) بەلام حکومەت ناوەکەی گۆریوە بە(کرماتاش) و بۆ (محەمەدیان کە گوندێکی دیاربەکریە و حکومەت ناوی ئەمەشی گۆریوە بەئارکباشی) و بۆلای رۆژهەلات بەلام هێشتا نەهاتۆتەوە، هەروەها سالح بەگ و (مەمدی ئەفەندی)م ناردووە بۆ (لجێ) و هێشتا نەهاتۆتەوە و خوا یاربێ هەرکە هاتنەوە لەدوای رێکخستنی کاروباری ئێرە ئەوسا دێم بۆلاتان و (بوزان ئاغا) و (شێخ ئەیوب) دەبینم.

ئامۆژگاری من بۆ هەموو چەکدارەکانمان ئەوەیە بەسەبر و لەسەرخۆبن و بەگوێرەی شەریعەتی پاك بجولێنەوە، چەکدارانی ئێمە نابێ مالێ و دەولەتی موسلمان و ئەفەندییان بەزۆر لەوان بسێنن یان تالانیان بکەن، بەلام بۆ زەخیرە من لەنامەی پێشوودا بۆم نوسیبوون ئەگەر پێویستی زۆر هەبێت دەکرێ بەدەستی کەسێکی ئەمین و حسابزان بەپێی پسولە ئەرزاق لەئەنبارێك بهێننەدەر و بەشیبکەن و پاشان ئەگەر خوای تەعالا بەنسیبمان بکات ئێمە هەمان شت یان نرخەکانیان دەدەینەوە بەخاوەنەکانیان، دوعا و سەلام دەنێرم بۆ (میر سادق بەگ) و (میر حامید بەگ) و میرەکانی (گیلی) و ئیسلامی (ئەمانە لەوەی حەسرەتیاندا ناویان نەهاتوە).

وەسیەت و ئامۆژگاریم بۆ هەمووان ئەوەیە لەشەریعەتی محەمەدی لانەدەن، هەروەکو ئێمە بیستومانە ئەو ئاغایانەی بەیەکەوە لە(چیرمۆگی) راهاتون داخۆ ئەمە راستە یان نا؟ ئەمەمان بۆ روونبکەنەوە خودای تەعالا یاریدەدەری (محەمەد ئەمین مەحمود ئەفەندی ئوداباشی) بدات و هەناوی (دلی) بەئیمان و جوامێری دینی پربکاتەوە، ئەگەر لەئیرادەی ئەزەلی وێدا قبولکردنی رێی راست چارەنوسی ئەو نەبێ خودای تەعالا دەستبەجێ لەقەبری راکا و پەرێشانی بکا و ئیسلام

لەخراپەی ئەو بپارێزێت. ئەگەر هەڵدەسوڕێت لەدوای ڕاوێژ و ڕێکەوتن بەشەو لە(عەلی بارداق-کە گوندێکی دیاربەکرە) بێهەراوهەروژان بەسەر عەسکەری تورکدا بدەن و ئەگەر ئەوەش هەڵنەسوڕا ئەوا درەنگخستنی ئەو کارە شتێکی بەجێیە، با چەکدارانی ئێمە گەمارۆی (سیوەرگ) بدەن.

ڕۆژی جومعە ١٩ای شەعبانی

١٣٤٣گورە-١٩٢٥ز

خادم المجاهدين/ سعيد النقشبندي

دەربارەی ئەو (محەمەد ئەفەندیەی ئودای ژوور-باشی) کە لەنامەکەی شێخ سەعیدا ناویهێناوە، (مالمیسانج) لەپەراوێزی وەرگێڕانەکەیدا وتویەتی: ئەو محەمەد ئەفەندیە سەرۆکی شارەوانی (سیوەرگ) بووە و فەرماندەی هێزی میللی مەبەستی ئەوانە بووە کە بووبوون بەهاوکاری تورکەکان لەکاتی شۆڕشدا و بەپێی ڕۆژنامەی (وقت)ی ڕۆژی ١٩٢٥/٤/٢٤ ئەم کابرایە خەبەری لەشێخ محەمەد ئەیوب دابوو، هەواڵەکانیشی گەیاندبوو بەدەوڵەت.

پرۆفیسۆر حەسرەتیان بەرلەوەی بچێتە سەر باسی چۆنیەتی شکانی شۆڕش و سەرکەوتنی تورک لەلاپەڕە (١١٥)دا باسی بەشداربوونی ئاسوری و چەرکەسیەکانی کردوە شانبەشانی کورد دژی تورکەکان کە ئەمە دەریخستبوو تورک تەنها نەك هەر دوژمنی کورد بوون بەڵکو دژی هەموو کەسێك بوون کە بەڕەگەز تورك نەبووایە و دەربارەی ئەو بەشداربوونە ڕۆژنامەی (حاکمیتی میللی تورك) کە لەڕۆژی ١٩٢٥/٣/٢دا دەرچووە نوسیویەتی: تەنها هەر ئاشوریەکان لەگەڵ کوردا بەشداریان نەکردبوو بەڵکو ئەرمەنیەکانیش چوونەتەپاڵ یاخیبووەکان کە ئەمانیش بۆ ئەرمینیایەکی سەربەخۆ تێدەکۆشن، کە لاموایە تورکەکان ئەوەیان بۆیە بڵاوکردبووەوە بۆئەوەی ئیسلام بگەیەنن ئەوانە بەهاندانی ئینگلیزەکان ئەو کارەیانکردبوو، چونکە لەڕاستیدا لەهیچ سەرچاوەیەکی تردا باسی هاوکاریکردنی ئەوانە نەکراوە بەشێوەی چەکداری.

حەسرەتیان لەلاپەڕە (١١٥)ی کتێبەکەیدا ئاماژەی بۆ ڕۆژنامەی (Gazet)ی ڕۆژی ١٩٢٥/٣/٥ کردووە کە وتویەتی: تورکەکان بۆ تێکدانی نێوان کورد و ئەرمەنی و ئاسوری، لەلایەن فەیلەقی سوپای تورکەوە بەیانێکی بڵاوکردبوەوە تیایدا وترابوو شێخ سەعید کە ئەم ڕاپەڕینەی لەناوچەی (غینج)دا سازکردووە

لەبزوتنەوەی ئاشوریەکانیشدا هەر دەستی هەبووە بۆیە لەبەرئەو خیانەتەی کە کردبووی لەلایەن دادگای سوپاوە لەبدلیس بەتاوانبار دەژمێردرێت کە هەمووی بەڵگەیە بۆئەوەی شێخ سەعید لەگەڵ ئەرمەنی و ئاشوریەکاندا هاوکاری کردبوو بەنیازی دروستکردنی حکومەتێکی سەربەخۆی کورد، ئەرمەنیەکانیش کە دژی ئێمەن دەیانەوێ دەرفەت و سود لەهەموو هەلێك وەربگرن بۆئەوەی دژی غەیری ئەرمەنی کاربکەن بەو کوردانەشەوە کە یارمەتیەکی زۆری ئەرمەنیەکانیان دابوو، بۆیە سەرکەوتن بەسەر یاخیبووەکاندا بەسەرکەوتنێکی گەورە دەژمێردرێت.

تاقە سەرچاوەیەك کە باسی پەیوەندی کورد و کریستیانەکانی کردبێت لەشۆڕشی پیراندا جگە لەدرۆودەلەسەکانی تورك بریتیە لەو باسەی ڕۆبەرت ئولسون لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٨٤ لەلاپەڕە (٩٧)دا ئاماژەی بۆئەوە کردووە کە ئەو بەڵێنەی کریستیانەکانی حەلەب و ئەرزڕوم و ئەرمەنیەکان بەشێخ سەعیدیان دابوو بەوە تێکچوو ساتێك ئەو زەلامەی کریستیانەکان لە(حەلەب)ەوە نامەیەکیان پیادا ناردبوو بۆ شێخ سەعید لەڕێگا لەلایەن تورکەکانەوە گیرا و هەڵواسرا و ئەگەر لەڕاستیدا ئینگلیزەکانیش یارمەتی شێخیان بدایە (کە ئەیاندابوو) ئەو یارمەتیدانە تەنها شتێکی بێ‌نرخ و بێبایەخ دەبوو.

حەسرەتیان ئاماژەی بۆ کتێبی (S.S.Aydemir Ter adam Mustafa Kemal) کردووە کە لەلاپەڕە (٢٢٦)دا وتویەتی: هێزی تورك لەڕۆژی ١٩٢٥/٣/٢٦دا پەلاماری (دیاربەکر، ڤارتو، العزین)یاندا، هێزی فەیلەقی تورك چووە ناو شاری (ڤارتو) و هەوڵیدا هەر چوارلای شۆڕشگێڕەکان ئابلۆقە بدات بۆئەوەی ڕێگەی ڕاکردن و دەربازبوونیان نەمێنێت کە ڕووبکەنە عێراق یان سوریا.

حەسرەتیان لەباسەکەیدا دەچێتەسەر باسی ئەو عەشیرەتانەی لەو ڕۆژە ناسکەدا خیانەتیان لەشۆڕشەکەی کورد کردبوو کە بریتی بوون لەنەجیب ئاغای سەرۆکی (العزین) و عەشایرەکانی ڕۆژهەڵاتی دەرسیم کە بریتی بوون لە(کنێران، لۆلان، ئەپور، سۆران) کە زەعیم و سەرۆکی ڕۆحیان (دومان دیو ئوغلو حسنی) بوو، ئەمانە بوون بەهاوکاری تورکەکان و لەپشتەوە لەهێزەکەی شێخ سەعیدیاندا و لەئەنجامی ئەم خیانەتەدا شۆڕشگێڕەکان ناچاربوون لەیەکەم ڕۆژی نیسانی ١٩٢٥دا کشانە دواوە بۆ (پالو) کە لەوکاتەدا سوپای تورك بەسەرکردایەتی (کازم پاشا) لە(پالو) نزیك بووەوە و هێزەکەی کورد کە نزیکی (٥٠٠٠) چەکدار دەبوو کشایە دواوە بۆ دۆڵی (مێنلاو) لەوێدا کورد شەڕێکی قارەمانانەی کرد بەڵام

لەگەڵ ئەوەشدا بەرامبەر بەسوپا گەورەکەی تورك خۆی پێنەگیرا و کشایەدواوە بۆناو دارستانەکان و خۆیانیان تیادا حەشاردا.

شێخ شەریف و چەکدارەکانی ڕوویانکردە (چپاقچور) بۆئەوەی بگەنە لای شێخ سەعید و لە ١٩٢٥/٤/٦دا هێزی حکومەت (چپاقچور)ی گرت و شێخ سەعید و ئەو (٣٠٠) چەکدارەی لەگەڵیدابوو خۆیان گەیاندە (صلخان) و لەوکاتەدا عەشیرەتی (خورمیك) و سەرۆکی عەشیرەتی (کوچوك) کە محەمەد خولیوس ئەفەندی بوو، بەخۆی و (٣٠٠) چەکداریەوە چوونەپاڵ هێزەکەی حکومەت و (عەلی کەمال)ی برای محەمەد خولیوس و ئەمیش بەخۆی و سەد چەکدارەوە بوون بەلایەنگری حکومەت و بەهەموویان پەلاماری چەکدارەکانی (جبران)یاندا لەدەشتەکانی (خارلیونا) و هەردوو سەرۆك عەشیرەتی (بوبو) و (ختۆ) بەخۆیان و پەنجا سوارەوە کشانە دواوە بۆ ناوچەی (سون) و لەناوچەی (عشق میدان)دا گەیشتنە لای شێخ سەعید لەئەنجامی ئەو سەرکەوتنانەی تورکدا حکومەت پیرۆزبایی لەو عەشیرەتانە کرد کە بووبوون بەهاوکاری و سەرۆك عەشیرەتی (خورمیك) و دانیشتوانی (کیغی) تەلگرافیان نارد بۆ مستەفا کەمال و بۆ موتەسەریفی ئەرزڕوم و بۆ کازم پاشای سەرۆکی سێهەم و بۆ عوسمان نوری سەرکردەی لیوای یازدەهەم. سەرچاوەی حەسرەتیان بۆ ئەم ڕووداوانە بریتیە لە(M.S.Firat illeri Ve Varto) لاپەڕەکانی (١٣٧-١٣٨).

حەسرەتیان دەربارەی ناچاربوونی پەنابردنی هەندێ لەشۆڕشگێڕەکانی کورد لەدوای شکاندن، ئاماژەی بۆ کتێبەکەی نوری دەرسیمی کردووە (Kurdistan Tarihi) کە وتویەتی: لەکۆتایی مانگی ئازاری ١٩٢٥دا (خالد حسنان) و عەلی ڕەزا و (خالید جبری-کە ئەمە خالید بەگی جبران نەبووە کە بەرلەمە لەسێدارەدرا) و چەند سەرکردەیەکی تری کورد بەخۆیان و هەزار سوارەوە ناچاربوون بەرەو ڕۆژهەلأت کشانەدواوە پاشنەوەی لەشەڕی (خینس)دا شکان و هێزی تورك کە لە(قرفوش)دا بوو بەهاوکاریکردنی عەشیرەتی (میدران) ئەوانەیان ناچارکرد بکشێنەدواوە و (خالد حسنان) لەسنوری ئێران پەڕیەوە و لەناو ئێرانیشدا هێزی ئێرانیەکان بەڕەنگاری بوونەوە و لەو شەڕەدا (شمس الدین کوڕی خالد حسنان) و عەباسی کوڕی شێخ سەعید و کەریمی سەرۆکی عەشیرەتی (زرکان) و چەند شۆڕشگێڕێکی تر شەهیدبوون ئەوانەی مابوون وەکو (خالد حسنان) و عەلی ڕەزا خۆیان گەیاندە لای سمکۆ.

تا ئێرە بریتی بوو لەکورتەی ئەو باسەی پرۆفیسۆر حەسرەتیان دەربارەی چۆنیەتی دەستپێکردنی شۆڕش هەتا شکاندنی لەکتێبەکەیدا باسکردووە و دوای ئەم باسەی ئەو دوو سەرچاوەیەی تریش کە بریتین لەسەرچاوە/١٠٥ و کتێبەکەی ڕۆبەرت ئولسون سەرچاوە/٨٤، کورتەی هەردووکیان دەخەینە پێشچاو.

مارتن ڤان برونسون و (Gerard Benecke) دەربارەی دەستپێکردنی شۆڕش وتویانە: لەبەرئەوەی زۆر لەڕێبەرە گرنگەکانی ئازادی لەگرتووخانەدا بوون (مەبەستیان یوسف ضیاء بەگ و خالد جبران) یاخود خۆیان شاردبووەوە (وەکو ئیحسان نوری و هەندێکی تر کە خۆیان نەدابوو بەدەستەوە)، لەبەرئەوە دەبوایە نەخشەی شۆڕشەکە بگۆڕێت، لەبەرئەوە لەکانونی دوەمی ١٩٢٥دا کۆبونەوەیەکی ئەندامانی کۆمەڵی ئازادی کرا و شێخەکان و سەرۆکی عەشیرەتەکان کە زۆربەیان لەزازاکان بوون لەو کۆبونەوەیەدا بڕیاریاندا شۆڕشەکە لەمانگی مارتدا دەستپێبکات (وەکو بەرلەمە باسکراوە هەندێ سەرچاوە وتویانە خرابووە ڕۆژی نەورۆز).

شێخ سەعید بۆ ئەو مەبەستە بەمەڵبەندی زازاکاندا گەڕانێکی کرد بۆئەوەی باسی ئەو گێرەوکێشانە بکات کە دوورنەبوو لەکاتی ڕاپەڕیندا ڕوو‌بدات بۆئەوەی پێشوەخت چارەسەریان بکرێت و لەو گەڕانەدا وتارە ئاگراویەکانی شێخ سەعید بەتەواوەتی هەستی دانیشتوانی ناوچەکەی وروژاندبوو دژی ڕەفتارەکانی حکومەتی تورك. دوای ئەمە هەردوو نوسەرەکە باسی ڕووداوەکەی (پیران)یان کردووە دەربارەی ئەوانەی تورکەکان هاتبوون بۆ گرتنی چەند کەسێك کە لەگەڵ شێخ سەعیدا بوون لەپیران و شێخ سەعید لەئەنجامیدا ڕوویکردە (داراهین)، هەروەکو لەو باسەی پرۆفیسۆر حەسرەتیاندا باسیکردوە و لەوەرگێرانەکەی (مالمیسانج)دا وتراوە ئەمە بوو بەهۆی ئەوەی شۆڕشەکە پێشوەخت دەستپێبکات.

سەرچاوە/١٠٥ دەڵێ: کە شێخ سەعید گەیشتە (داراهین) کە جەندرمەکانی ناوشار زۆربەیان کورد بوون، هەموو بەخۆشیەوە بوون بەلایەنگری شێخ سەعید و شارەکە کرا بەپایتەختی ئوستانی ڕاپەڕیوەکان و شێخ سەعید فەرمانداریك و موفتیەکی بۆ شارەکە دانا لەگەڵ سەرکردەیەك بۆ جەندرمەکان و کاربەدەستانی پلەی خوار ئەوان هەروەکو جاران لەشوێنەکانی خۆیاندا هێڵرانەوە (زنار سلوپی

لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٥٧ باسی حەسەنی سەرۆکی عەشیرەتی (مودان)ی کردووە کە لەلایەن سەرکردایەتی شۆڕشەوە کرابوو بەوالی (داراهین).

شێخ سەعید دەستیکرد بەناردنی چەکدارەکانی بۆ کۆنترۆڵکردنی پەیوەندی بەڕێوەبەرایەتیەکانی هەرێم و سەرکردەکانی هێزەکان دانران کە بریتی بوون لەشێخەکان (بەرلەمە باسی ئەو سەرکردانەی هێزەکان کران کە سەرچاوە (٨٤ و ١٠٥) ئاماژەیان بۆ ناوەکانیان کردبوو). شێخەکانی (جان) چوون (کاپاکچور)یان داگیرکرد و بەرەو (کیگی) چوون، شێخ عەبدولای خەڵکی مەڵبەندی (سولحان) نێردرا بۆ (ڤارتو) و ناوچەی باکور (موش) و (شێخ شەریف)ی فەرماندەی میلیشیا لەداگیرکردنی (کاپاکچور)دا بەشداربوو. زنار سلوپی لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٥٧ وتویەتی شێخ شەریف خەڵکی (گوگدە) بووە و لەوێوە ڕوویکردە (پالو) ئەویشی گرت و بەرەو شاری گرنگی (ئیلازیك) کەوتەڕێ و لەڕێگایدا ژمارەیەکی زۆری چەکدار چوونەپاڵ هێزەکەی، شێخ سەعید خۆشی لەگەڵ هەندێ لەچەکدارەکانی لە(داراهین)ەوە ڕوویکردە باشور.

لەکاتی ئەو جموجولانەی کورددا، هێزێکی پیادە و هێزێکی سوارەی حکومەت لەدیاربەکرەوە نێردران، بۆ بەرەنگاربونەوەی ڕاپەڕیوەکان و لەڕێگەیاندا هێزی پیادەی حکومەت لەلایەن جوتیارەکانی ناوچەکەوە بەسەرکردایەتی (شێخ محەمەد مەهدی-خەڵکی سەردی) لەگوندێکی نزیك بە(خانی) لەهێزەکەی حکومەت درا و دوای چەند ڕۆژێك هێزەکەی شێخ سەعیدیش گەیشتە ئەوێ و ڕێگە بەهێزەکانی حکومەت گیرا و تۆپەکانی ئەو هێزە و چەند قۆرخانەیەکی بەکەڵك گیران و ڕۆژی دوایش هێزێك نێرایە سەر هێزی سوارەی حکومەت و ڕۆژی ١٩٢٥/٢/٢٨ ئەو هێزە خۆیدا بەدەستەوە و لەو ڕۆژەدا تەواوی ناوچەکانی زازا هەر لە(ئەرگانی-ئەرغانی)یەوە هەتا (قولپ) دژی حکومەت ڕاپەڕیبوون و شارەکانی (ئەرغانی، خانی، لجێ) لەلایەن دانیشتوانی گوندەکانی دەوروبەریانەوە دەستیان بەسەرداگیرا ئەگەرچی هەندێ لەدانیشتوانی شارنشین دەستیان لێکردبونەوە.

شێخ سەعید خۆی ئامادەکردبوو بۆ داگیرکردنی (دیاربەکر) و لەولاشەوە شێخ عەبدولڕەحیمی برای لەگەڵ بەشێك لەهێزەکانی زازا بەرەو ڕۆژئاوا چوون و (معدن) و (چەرمیك) و (سیڤەرکی)یان داگیرکرد و شێخ سەعید بەمەڵبەندەکانی دەوروبەری (ئەگیل)دا گەڕا بۆ وەدەستهێنانی لایەنگران بۆ شۆڕشەکەی کورد. ئەو

نوێنەرانـەی شـێخ سـەعید نـاردبوونی بـۆ بەشـەکانی تـری کوردسـتان بـۆلای عەشـیرەتی بـەتوانای (مـیلان) لەدەوروبـەری (وێـران شـهر) و بـۆ عەشـیرەتەکانی دەوروبـەری (بـدلیس) کـە ئەمانـە لەنەخشـەی بنـاوانی (کۆمـەڵی ئـازادی)دا بەشداربوون، بەڵام هیچ لایەکیان وەڵامیان نەهاتەوە بۆ شێخ سەعید.

لەئەنجامدا لەبەرایی مانگی مارتی ١٩٢٥دا دەهەزار چەکداری کورد گەمارۆی دیاربەکریانـدا کـە شـێخ سـەعید خـۆی لەگونـدێکی نزیـك دیاربەکر سەرپەرشـتی شۆڕشەکەی دەکرد. زنـار سلوپی لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٥٧ لەلاپەڕە (١٠٨)دا وتویـەتی ئـەو هێـزەی کـورد کـە نێـردرا بـۆ گەمارۆدانی دیاربـەکر بەسـەرکردایەتی شێخ مستەفا بـوو کـە لەشـێخەکانی (جـان) بـوو، بـەڵام چـەکدارەکانی عەشـیرەتی (هورمیك) و (لۆلان) پـەلاماری هێزەکـەی شـێخ مستەفایان دا و پـاش ئـەوەش کـە هێزەکـەی شۆڕشـگێڕان لەدەوروبـەری دیاربـەکر کشـانەوە ئـەو هێـزە چـووەپاڵ هێزەکـەی شـێخ عەبـدوڵای ملکـان کـە لەوکاتـەدا هێزێکـی گـەورەی تـورك بەسەرکردایەتی (ناجی پاشا) تازە بەشەمەندەفەر لە(ئەدەنە)وە هـاتبووە (مـاردین) و هێزەکـەی تـورك زیـانێکی گـەورەی بـەکورد گەیانـد وەکـو لەشـوێنی خـۆیـدا باسمـــانکردوە فەرەنســـیەکان ڕێگەیانـــدابوو بەشـــەمەندەفەر بەناوچـەکانی دەسەڵاتیاندا بگەنە پشت شۆڕشگێڕانی کورد و لەپشتەوە لێیاندان.

سەرچـاوە/١٠٥ لەباسـەکەدا لەسـەرینەڕوا و دەڵـێ: دیاربـەکر بەسـەربازخانە گەورەکەیـەوە لـەو ڕۆژانـەدا لـەژێر فەرمانـدەی(مرسـل پاشـا)ی لێهـاتوودا بـوو، سـەربازخانەکە بـەدیوارە قایمەکانیـەوە زۆر سـەخت بـوو، لەشـکاندن نـەدەهات و بەئاسـانی نـەدەگیرا و بەرلـەمـە (مرسـل پاشـا) چـەکی بەسـەر دانیشـتواندا دابەشکردبوو، قەدەغەی هاتوچۆی نـاو شـاری بڵاوکردبـوەوە بۆیـە ترسـی ئـەوەی نەبوو دانیشتوانی دیاربەکر ببن بەهاوکاری شۆڕشگێڕەکان.

سـاتێك هێزێکـی بچـوکی ڕاپـەڕیوەکان بەشـەو چـوونە نـاو شـارەوە بـەهیوای ئەوەی زازاکانی ناو شار پشتیوانیان لێبکەن، بەڵام زوو بەوە زانرا و تەنها (٧-٨) کـەس لەوانـەی چـووبوونە ژوورەوە توانیبوویـان خۆیـان ڕزگاربکـەن ئـەوانیتر کوژرابوون، (زنـار سلوپی لەسەرچاوە/٥٧ وتویـەتی ژمـارەی ئەوانەی چووبوونە ژوورەوە تـەنها شەسـت کـەس بـوون) بـەڵام لەجەبهـەکانی تـردا شـێخ شـەریف (ئیلازیك)ی گـرت و بڵاوە بەسەربازخانەکە کـرا، لـەباکوری ڕۆژهەڵاتیشـدا (قـارتو) گـیرا و چــەند جارێــك هێـرش برایەسـەر (هیــنس) لەلایــەن جبرانیــەکان و

حسەنیانەکانەوە بەڵام لەلایەن عەلەویەکانی نەیارمانەوە وەکو (هورمیك) و (لولان) بەتوندوتیــژی ڕووبــەڕوویان بوونــەوە و بــۆ داگیرکردنــی (مــوش) و (بــدلیس) لەبەرئــەوەی دانیشــتوەکانیان لایــەنگری شــۆڕش نــەبوون بۆیــە هێرشــەکەیان سەرینەگرت.

دەربارەی ئەمە زنار سلوپی لەلاپەڕە (١٠٨)ی کتێبەکەیدا وتویەتی: هێزەکانی حسنانلی خالید و هاوکارەکانی کە بریتی بوون لە(خلیل محمود) و (خطو کریم بەگ) و (قۆلئاغاسی زیرەك باب بەگ) و (سادق بەگ) و سەبری ئیسماعیل ئاغا لەسـەرەتادا فیرقـەی نۆهـەم و هێـزی (٦٢)ی تورکیـان شـکان و زیـانێکی زۆریـان بەحکومـەت گەیانـد، بـەڵام زۆری پێنەچـوو هێزێکـی زۆر گـەورەی یارمەتیـدەری حکومـەت گەیشتە ناوچەکە و بەهاوکاری چەکدارەکانی (موتکی) و (خورمیك) و (لـولان) کـە لایـەنگری حکومـەت بـوون هێـزی شۆڕشـگێڕەکانیان شـکاند و ناچاریانکردن ڕووبکەنـە نـاو خـاکی ئێرانـەوە، خالیـد حسـنانلی بـۆ ماوەیـەك چووەلای سمکـۆ و لەدواییـدا گەڕایـەوە بـۆ گونـدی (شـیروان شـێخ) و لـەوێ هێرشبرایە سەری و گیرا و درا بەدادگای ئیستقلال و لەسێدارەدرا.

سەرچاوە/١٠٥ مـارتن ڤـان برونسـون و هاوڕێکـەی باسـی هەڵوێسـتی هەنـدێ لەشۆڕشـگێڕانیان کـردووە کـە کردەوەکانیـان لەگـەڵ ڕاسـپاردە و داخوازیـەکانی شێخ سەعیدا یەکینەدەگرتەوە کە پێی وتبوون نابێ دەستدرێژی بکەنە سەر هیچ لایەك، بەڵام بەپێچەوانەی ئەمە ساتێك شۆڕشگێڕەکان (دارامین) و (چاپاکچور)یان گرتبوو، هەواڵ گەیشتبووە (ئیلازیك) کە چەند سەد جوتیارێکی کورد بەناو بۆ هاوکـاریکردنی شۆڕشـگێڕان بـەخۆیان و ئـاڵای سـەوز و بەدەسـتێکی تریـان قورئانیان پێگرتبوو، لەڕێگا لەخەڵك دەپاڕانەوە کە بۆ خاتری خودا خۆیان بدەن بەدەستەوە و چوونە ناو شاری (پالو) لەوێوە بەرەو ئیلازیك ملیان نا و یەکەم تاقم کە (٣٠٠) کەسێك دەبوون بەوپەڕی سەربزێویەوە گەیشتنە بەردەمی سوپای تورك و سـەربازەکان کـە چاویان بەدیمـەنی ئەوانـە کـەوت وا قورئانیـان نـابووە سـەر نێزەکانیان، ئیتر ئەو سەربازانە هەڵاتن و شارەکە بەخۆشیەوە پێشوازیان لێکردن و کە چوونە نـاو شـارەوە پۆسـتی جەندرمـە و خـانوی دادگـا تـاڵانکرا و پـەلاماری زیندانەکانیانـدا و هــەموو گیراوەکـان بـەردران و فایـل و دۆسـیەکانی دەزگـای زیندانەکانیان سوتاند و خانوی ئەفسەران و دەوڵەمەندەکانیان پیشاندرا بۆئەوەی بیـانگرن و ماڵـەکانیان تاڵانبکـەن و لەولاشـەوە بارەبـەر و دارشـکێنەکانی کـورد

بەخۆشیەوە دوایانکەوتن و بۆ ئێوارە شێخ شەریف گەیشتە ناو شار و بەڵێنیدا ئاسایش و هێمنی بەرپابکات و بڕیاریدا هەموو تالانچیەکان بگیرێن و سزابدرێن و ئەوەی خراپەی کردووە لەسێدارە بدرێت، بەڵام هەڕەشەکانی شێخ شەریف بێهودە بوو چونکە ڕۆژی دوایی تالان‌وبڕین بۆ سەر عەمارەکانی سوپا و فەرمانگەی توتن دوبارە دەستپێکردەوە، دانیشتوانیش بەرەنگاری ئەوە نەبوونەوە چونکە سەربزێوەکانیان بەسوپای ئیسلام لەقەڵەمئەدا و بەسەدان لەجوتیاری گوندەکانی دەوروبەر هاتنە ناو شار بۆ پیرۆزباییکردن لەسەربزێوەکان و هەندێکیان لەگەڵیاندا بەرەو مەلاتیە بەڕێکەوتن.

بەوجۆرە شێخ شەریف نەیتوانیبوو چارەسەری ئەو بارودۆخە بکات و لەجیاتی ئەو پیاوماقوڵانی ناو شارەکە لەناو خۆیاندا دەستەیەکی خۆراگرییان پێکهێنا بۆ دەرکردنی ڕاپەڕیوەکان بۆئەوەی ئاسایش لەشارەکەیاندا بەرپابێتەوە و دوای ئەو ڕووداوە ئیتر ئەو تاقمی ڕاپەڕیوە هیچ سەرکەوتنێکی تریان بەدەستنەهێنا.

لەکۆتایی باسی ڕووبەڕووبونەوەی شۆڕشگێڕانی کورد و هێزەکانی حکومەت لەڕووداوەکەی پیران بەولاوە باسێکی دووروودرێژی ڕۆبەرت ئولسون پێشکەش دەکەین کە بەوردی چۆتە بنج‌وبناوانی شۆڕشی پیران و بۆ ئەو مەبەستە بەڵگەکانی ناو ئەرشیفی حکومەتی بەریتانیای پشکنیوە و تا کۆتایی شۆڕشەکە و دامرکانەوەی باسکردوە، هەرچەند هەندێ لەو باس و ڕووداوانەی ئەو لێیان دواوە لەهەندێ سەرچاوەی تردا بەشێوەیەکی نزیك لەو باسکراوە، بەڵام لەزۆر شتیش دواوە کە لەوانەی ئەو سەرچاوانە ناچێت یان ئەوان هەر باسیشیان نەکردووە بۆیە بەپێویستم زانی کورتەیەکی کتێبەکەی ڕۆبەرت ئولسون دەربارەی شۆڕشی پیران بخەمە پێشچاو.

لەباسی پێنجەمی بەشی دەهەمدا-چۆنیەتی ڕووداوەکەی پیران-کورتە باسێکی ڕۆبەرت ئولسونمان خستە پێشچاو دەربارەی بارودۆخی ناوچەکە لەدوای ڕووداوەکەی (بیت الشباب) و چۆنیەتی لەیەکدانی هەندێ لەشۆڕشگێڕانی کورد لەگەڵ چەند جەندرمەیەکی تردا لەپیران کە ئەم ڕووداوەی پیران بوو بەهۆی ئەوەی شۆڕشەکە پێشوەخت دەستپێبکات و ڕۆبەرت ئولسون وتویەتی: لە ١٩٢٥/٢/١٧دا (چاپاکچور) گیرا و شێخ (حەسەن-Hasan) کرا بەوالی شارەکە و شێخی (can) دووهەزار چەکداری ئامادەکرد بۆ پەلاماردانی (Kigi) و

لە١٩٢٥/٢/٢٠دا ئەو هێرشە سەرنەکەوت چونکە هێزی تورکەکان زۆربوون و چەکدارێکی زۆری بەکرێگیراویان لەگەڵدا بوو کە (٣٠٠) چەکدار لەوانە لەچەکدارەکانی عەلەویەکانی (Hormek) و ناوچەی (Karir) بوون بەسەرکردایەتی (محەمەد هولاسی ئەفەندی–M. Holasi. Efendi) و لە ٢/٢٧دا شۆڕشگێڕەکان (١٥) کوژراو و پێنج برینداریان هەبوو، شێخی (کان) پاشەکشەی کرد بۆ چاپاکچور بەبێئەوەی هیچ دەسکەوتێکی دەستگیربێت و ئەو یارمەتیدانەی بەتەمای بوو ئەرزنجان و ئەرزڕومی پێ‌داگیربکات نەگەیشت.

ڕۆبەرت ئولسون لەباسەکەیدا چۆتە سەر باسی جەبهەیەکی تر دوای شەڕە سەرنەکەوتوەکەی دیاربەکر و وتویەتی: هێزەکەی کورد هەوڵیدا (Varto) داگیربکات بەلاّم سوپای هەشتەمی تورك ڕێگەی لێگرت کە لەوکاتەدا چەکدارەکانی (هورکیك) و (لۆلان) کە دژی شۆڕشگێڕەکان بوون گەیشتبوونە لای سوپاکەی تورك و هورمیکەکان و لولانیەکان ڕێگەی ئەوەیان نەدا بەکورد ڕووبکەنە ئەرزڕوم.

جەبهەیەکی تری گرنگی شۆڕش بریتی بوو لەجەبهەی باکوری ڕۆژهەلاّت بەسەرکردایەتی شێخ عەبدولاّی خەڵکی (Melkan) لەگەڵ عەلی ڕەزای کوڕی شێخ سەعیدا و بەهاوکاریکردنی حسنانلی خالید و سەرۆکی عەشیرەتی جبران کە نەخشەی بزوتنەوەی ئەم جەبهەیە عەلی ڕەزا کێشابووی بۆ داگیرکردنی (Kigi) و دەبوایە سەرۆکی جبران (Solhan)ی داگیربکردایە لەگەڵ ناوچەکانی (گوینوك، فرتو، ملازگرد، حوش) و شێخ عەبدولاّش پەلاماری ئەرزڕومی بدایە و پاش ئەوەش حسنانلی خالید و عەلی ڕەزا (Agri) داگیربکەن لەبدلیس. گرتنی بدلیس کارێکی سەرەکی بوو بۆ شۆڕش بۆئەوەی بتوانرێت خالید بەگ جبران لەبەندیخانە ڕزگاربکرایە لەگەڵ یوسف ضیاء بەگدا کە هەردووکیان سەرکردەی کۆمەڵی ئازادی بوون، چونکە حسابی ئەوە کرابوو ئەگەر بتوانرایە ئەو دوو کەسە ئازادبکرێن ژمارەیەکی زۆر لەعەشیرەتەکانی کورد بەشداردەبوون لەشۆڕشدا بەو کوردانەشەوە کە لەسەر سنووری عێراقدا بوون.

لە ١٩٢٥/٢/١٩دا شێخ عەبدولاّ و محەمەد عەلی سەرۆکی عەشیرەتی (Solhan) و (Girvaslo)، حاکی سەلیم سەرکردایەتی (Omerman) و عەشایری (مینشکورت)ی وەرگرت و توانی شاخەکانی (شرافدین) ببڕێت و گەیشتە ناوچەی (Karaliova) کە لەوناوەدا عەشایری جبران هەندێ شوێنیان گرتبووە دەست. کە گەیشتە ئەو

ناوچەیە شێخ عەبدولاّ فەرمانی دەرکرد بۆ (کامل بابا) کە سەرۆکی عەشیرەتی جبران بوون ڕووبکەنە (Varto) بۆئەوەی لەعەشیرەتی (Hormek) بدەن کە لەسەر ڕێگایاندا بوو کە ئەم لێدانە توشی کارەساتێکی گەورەی کردن.

لە ١٩٢٥/٢/١٧دا عەشیرەتی (هورمیک) ئاگای لەوەبوو کە شۆڕشگێڕەکان بەرەو پێشەوە دەچوون بۆیە بڕیاریاندا لەگوندی (Urtukram)دا بەرەنگاریان ببنەوە، عەشیرەتە شیعەکان (مەبەستی عەلەویەکانە) چوون بۆ پاراستنی (Varto) و لە ١٩٢٥/٢/٢٢دا تاقمی جبرانیەکان ڕووبەڕووی هورمیکەکان و لولانیەکان بوونەوە لەگوندی (Kasman) کە لەباشوری ڤارتودا بوو، لێرەدا ڕووداوێکی زۆر گرنگ هاتەپێشەوە کە سەرنەکەوتن مانای دۆڕاندنی شۆڕشەکەی کوردی دەگرتەوە، هەرچەند لێرەدا شەڕەکە تەنها نیوسەعاتی خایاند بەلاّم ڕێگە لەشێخ عەبدولاّ گیرا کە (ڤارتو) داگیربکات و ڕووبکاتە ئەرزڕوم.

لەشەڕێکی تردا کە لە ١٩٢٥/٢/٢٢ هەتا ١٩٢٥/٢/٢٧ درێژەی کێشا لە(معدن) تورکەکان شکان و کوردەکان لەو شەڕەدا چوار تۆپی شاخیان دەستگیربوو بەگوللەکانیانەوە لەگەلّ چەند ڕەشاشێك و ژمارەیەکی زۆری سەربازەکان کە ڕەنگە زۆربەیان کورد بووبن بەدیلگیران و چەکەکانیان لێسەندن و ڕێگەیان پێدان هەریەکەیان بچێتەوە بۆ مالّی خۆی و لەو شەڕەدا دوو ئەفسەر کوژران و (٢٦)یش بەدیلگیران، لیفتنانت کولونیل (کازم) کە سەرکردەی فەوجی (١٤) بوو بریندارکرا و سەرکردەی فەوجی (١١) نەگەڕایەوە و پێنج ئەفسەر کە ڕزگاریان بووبوو ڕایانکرد و لەدیاربەکر زیندانکران.

لەکۆتایی مانگی شوباتدا شێخ سەعید داوای لەعەشایری ناوچەکە کرد بەشداربیکەن لەشۆڕشدا بەلاّم عەشایری (Sasuna) و (Tatukan) کە لەنێوانی دیاربەکر و گێنجەدا بوون بەدەنگیەوە نەچوون و شێخ سەعید بەرامبەر بەمە هەروەکو ئینگلیزەکان لەڕاپۆرتەکانیاندا باسیانکردوە، (٤٠٠٠) چەکداری ناردە سەر ئەو دوو عەشیرەتە کە (حاجی موسا بەگ) سەرۆکی هەردوو عەشیرەتەکە بوو لەگەلّ (٤٠٠) چەکداریدا کوژران کە ئەم کوشتارە وای لەو دوو عەشیرەتە کرد بچنە پالّ شۆڕشەکە.

لەدوای شەڕی (دربندهانی) هێزەکەی شێخ سەعید ڕوویکردە دیاربەکر کە ژمارەی هێزەکە نزیکی (٧٠٠٠) چەکدار بوو، لە ١٩٢٥/٢/٢٨دا لەباکوری دیاربەکردا شێخ سەعید بارەگای هێزەکەی دامەزراند و لەوێوە پەیوەندی

بەهێزەکانی ترەوە کرد لەناوچەکانی تردا و داوای لە(مەحمود بەگی ئیبراهیم بەگ) کرد لەباشورەوە پەلاماری دیاربەکر بدات بەڵام پێنج ڕۆژ بەسەر ئەو داواکردنەدا تێپەڕیکرد مەحمود بەگ هیچ وەڵامێکی نەدایەوە لەبەرئەوە شێخ سەعید خۆی لەمانگی مارتدا هێرشیکردە سەر دیاربەکر و چەکدارەکانی بەهاواری (الله اکبر)ەوە داوایان لەهێزەکەی حکومەت دەکرد خۆی بدات بەدەستەوە، بەڵام تورکەکان گوێیان نەدایە ئەو بانگەوازە و شەوی ٨\١٧ی مانگی مارت شەڕێکی قورس ڕوویدا لەئەنجامیدا شێخ سەعید ناچارکرا بکشێتەدواوە و جارێکی تر خۆی ئامادەکرد بۆ هێرشبردن بۆ سەر دیاربەکر و لەهەرچوارلاوە هێزی ئامادەکرد بۆ ئەو مەبەستە.

لەولاشەوە شێخ عەبدولڕەحیمی برای شێخ سەعید دوای داگیرکردنی (Maden–معدن) پەلاماری (Cermik)یدا و داگیرکرا، (٥٠٠) چەکداری شێخ ئەیوب لەناوچەی (سیڤریك)دا بوون بەهاوکاری شێخ عەبدولڕەحیم و بەهەردوکیان (ئەرغانی)یان داگیرکرد. بەرەی ڕۆژئاوا (خەرپوت–ئەلزیك) لەلایەن شێخ شەریفەوە سەرکردایەتی دەکرا بەهاوکاری (Saki Yado) و ئەو عەشیرەتانەی کەوتبوونە خۆرئاوای چاپاکچور و (Bingol) ڕوویانکردە (Elazig) و لەڕۆژی ٥ی مارتدا شێخ شەریف بەبێ شەڕ چووە ناو شارەکەوە و لەدانیشتوانی گەیاندبوو شێخ سەعید هەوڵئەدات خەلافەت بگەڕێنێتەوە بۆ وڵات و (محەمەد ئەفەندی) کرا بەوالی شارەکە.

لەلاپەڕە (١١٠)دا ڕۆبەرت ئولسون لەکتێبەکەیدا باسی هەڵوێستی دوای ئەوەی کردووە و وتویەتی: ڕۆژی ١٩٢٥/٣/٦ لەگوندی (Husenik) کە شێخ شەریفی لێبوو لەعەماری تەقەمەنیەکاندا تەقینەوەیەکی گەورە ترسی خستە دڵی هەموو دانیشتوانەوە و لەئەنجامیدا شێخ شەریف و شێخ یادۆ نەیانتوانیبوو دەست بەسەر هەڵوێستدا بگرن و زۆری پێنەچوو (کازم بەگ) بەخۆی و هێزێکی حکومەتەوە ڕوویانکردە ناوچەکە و شۆڕشگێڕەکانیان ناچارکرد بەرەو ڕووباری (مرادسۆ) بکشێنەدواوە و لەشاخەکانی دەرسیمدا عەلەویەکان لەجیاتی ئەوەی یارمەتی شۆڕشگێڕان بدەن پەلاماریاندان و لەگەڵ هێزەکانی حکومەتدا ناچاریانکردن ڕووبکەنە دەشتەکانی (پالو).

لە٤ی نیسانی ١٩٢٥دا لەدەربەندی (Mendo)دا چەند هەزار شۆڕشگێڕێك لەناو داروبەردی چیاکاندا خۆیان حەشاردابوو بۆ لێدانی هێزەکانی تورك

بەسەرکردایەتی کازم بەگ، بەڵام هێزەکەی تورك توانیبووی پاش شەڕێکی (٢٤) سەعاتی هێزەکەی کورد پەرش‌وبڵاو بکەن و لەئەنجامی ئەمەدا شێخ شەریف و تاقمێك لەسەرکردەکانی تر ڕایانکرد بۆ (چاپاکچور) بۆئەوەی خۆیان بگەیەننە هێزەکەی شێخ سەعید بەڵام کازم بەگ توانیبووی دەست بەسەر ئەویشدا بگرێت.
کازم بەگ دوای ئەمە چووە ئیلازیك و لەوێ دەستیکرد بەدادگاکردنی ئەوانەی یارمەتی شۆڕشگێڕانیان دابوو، هەندێکی گرتن و هەندێکی لەسێدارەدان و ژمارەیەك لەدانیشتوانی شارەکە ناچاربوون ڕوویانکردبووە ڕۆژئاوای تورکیا.
ڕۆبەرت ئولسون لەلاپەڕە (١١١)ی کتێبەکەیدا لەباسی داگیرکردنی (ئیلازیك)دا ئاماژەی بۆ قسەی ئەو ئەوروپاییانە کردووە کە لەوکاتەدا لەشارەکەدا بوون، بەپێی ئەو ڕاپۆرتانەی دەربارەی ئەو ڕووداوانە تۆمارکراون، کە وتویانە: لێپرسراوانی بانقی عوسمانی لەژێر سایەی (٢٥) جەندرمەدا لە ١٩٢٥/٣/٢٤دا پارەی بانقەکە دەربازبکات بیگەیەنێتە خەرپوت، بۆیە کاتی خۆی کە شۆڕشگێڕەکان چووبوونە ناو شارەوە تەنها دەرگای بەندیخانەکانیان کردبووەوە و ماڵی ئەفسەرەکان و ئەو دەوڵەمەندانەی لایەنگری حکومەت بوون تاڵانکرد و لەڕۆژی ٣/٢٥دا کۆگاکانی توتن کە بایی (٤٠٠٠) لیرە توتنی تیادابوو دەستی بەسەرداگیرا. شێخ شەریف و محەمەد ئەفەندی موفتی لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵیاندابوو کاروباری ناو شارەکە ئاسایی بکەنەوە تەقەلاکەیان بێسوود بوو (بەرلەمە لەباسێکی سەرچاوە/١٠٥دا باسی ئەوەکرا دوای سەرنەگرتنی تەقەلاکەی شێخ شەریف دانیشتوانی شارەکە خۆیان ئەنجومەنێکیان سازکرد بۆ ئاسایکردنەوەی بارودۆخ تا ئەوکاتەی هێزی حکومەت دەستی بەسەرداگرتەوە).
ڕۆبەرت ئولسونیش هەمان بۆچونی سەرچاوە/١٠٥ی دوبارەکردۆتەوە و ئاماژەی بۆ باسەکەی مارتن ڤان برونسون کردووە کە وتویەتی: ڕاسم بەگ کە ئەفسەرێکی تورك بوو پەلاماری شۆڕشگێڕەکانیدا و لەو پەلاماردانەدا شۆڕشگێڕەکان نزیکەی (٥٠) کوژراویان بەجێهێشتبوو پاشئەوەی ئەوانیتر پاشەکشەیان کردبوو. ڕۆبەرت ئولسون لەباسەکەیدا لەسەریئەڕوا و دەڵێت: لەدوای چوار ڕۆژ بەڕێوەبەری بانق گەڕایەوە و پۆستەخانە کرایەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شارەکە هەر نائارام بوو چونکە چەکدارەکانی شێخ سەعید هێشتا لەدەوروبەری شاردا مابوون و لەدواییدا (نورالدین پاشا) گەیشتە شارەکە و دەستی بەسەر هەڵوێستدا گرت.

شێخ عەبدولاّ پرسی بە(جبران ئیسماعیل)ی مامی خالید جبران و (مێجەر قاسم جبران) کرد، کە لەسوپا خانەنشین کرابوو، بووبوو بەڕاوێژکاری شێخ سەعید و پرسی ئەوەی پێکردن ئایا بەباشی دەزانن هێرش ببرێتە سەر (ڤارتو) و بۆ ئەو مەبەستە ئایا بەلای گوندی (هرمك)دا بڕۆن یان بەناویدا تێپەڕن و لەئەنجامدا بڕیاردرا دووهەزار چەکدار پەلاماری (ڤارتو) بدات و بەر لەبەرەبەیانی ڕۆژی ١٩٢٥/٣/١١دا بەسێ سەعات شێخ عەبدولاّ دڵنیابوو لەوەی بتوانێت سەرکەوێت بەیارمەتیدانی ئیسماعیل و قاسم و ئەو (١٢٠) جەندرمانەی کورد کە لەسوپاکەی تورکدا بوون لە(ڤارتو) کە زۆربەیان زازا بوون و لەموریدەکانی شێخ سەعید بوون لەگەڵ خەڵکی ناوچەکانی دیاربەکر و (Hazzo)، لەو پێکدادانەی لەگەڵ هێزەکانی حکومەتدا کردیان محەمەدی مامی شێخ عەبدولاّ کوژرا و هرمکەکان شێخ عەبدولاّیان ناچارکرد واز لەداگیرکردنی (ڤارتۆ) بێنێت دوای شەڕێکی سەخت کە پێنج ڕۆژ درێژەیکێشا.

لە ٣/١٧دا شێخ عەبدولاّ هێرشیکردە سەر (Arpa pass–ئەرپاپاس) کە لەنێوان (ڤارتو) و (هینس)دا بووە بەخۆی و دووهەزار چەکدارەوە، لەشەڕێکی قورسدا کە تا نیوەشەو درێژەیکێشا، شێخ عەبدولاّ ناچاربوو پاشەکشە بکات و گەڕایەوە بۆ گوندی (Kirs) و ئەو چەکدارانەی لەژێر سەرکردایەتی عەلی ڕەزادا بوون کە بریتی بوون لەدووسەد چەکدار، لەگەڵ ئەوانەی لەگەڵ (سەلیم)ی برای خالید بەگ جبراندا بوون، هەموو هێزەکە لە ١٩٢٥/٣/١٩دا کە لەدەوروبەری (ڤارتو)دا بوون چوونە ملازگرد بۆلای هێزەکەی خالید حسنانلی.

دوای ئەمە شێخ عەبدولاّ بڕیاریدا بەخۆی و (٥٠٠) چەکدارەوە پەلاماری موش بدات لەوەشدا هەر شکا و هێزەکەی گەڕایەوە بەرەو (ڤارتو). ڕۆبەرت ئولسون لەلاپەڕە (١٤٤)ی کتێبەکەیدا باسی شکانێکی تری شۆڕشگێڕانی کردووە لەڕۆژی ١٩–١٩٢٥/٣/٢٠دا لەسەر (Murat Bridge–پردی مراد) کە لەم شەڕەدا شۆڕش زیانێکی زۆر گەورەی لێکەوت و ئەم زیانە و لەسێدارەدانی خالید بەگ جبران و یوسف ضیاء بەگ بەرلەمە بوون بەهۆی ئەوەی هێزەکانی تورك بەسەرکردایەتی تەلعەت بەگ کە لە(ساروقامیش)ەوە هاتبوون دەستبەسەر گەلێ شوێندا بگرن و لەشەڕی پردی مرادا چل شۆڕشگێڕی ئازا شەهیدکرابوون و هێزی تورك بەرەو پێشەوە ملینا بۆ هینس، شێخ عەبدولاّ شکا و ڕوویکردە شاخەکانی (شرافدین) و لەدەربەندی (Gomo gorgo) کوشتارێکی زۆر لەهێزەکەی کرا و لەو شەڕەدا

خاڵێکی خالید جبران کوژرا و ئەوانەی لەدەست هورمیکەکان ڕزگاریان بووبوو تورکەکان لەناویانبردن و کوشتنیان.

عوسمان پاشا خۆی لە(ڤارتو) دامەزراند و لە ٣/٢٧دا حسنانلی خالید و عەلی ڕەزا لەگەڵ ئەحمەد و سەلیم کە جوتە برای خالید جبران بوون بەهەزار چەکدارەوە پەلاماری تورکەکانیاندا و لەو شەڕەدا (٢٧) شۆڕشگێڕ کوژران و شۆڕشگێڕەکان ناچارکران ڕوویکەنە (ملازگرد) و لەوێدا ئابلۆقە دران و لە١٩٢٥/٤/٣دا فەوجی چوارەمی تورك بەسەرکردایەتی میرئالاَی (تەلعەت بەگ)، حسنانلی خالید و عەلی ڕەزایان ناچارکرد خۆیان و (١٥٠) چەکدار کە لەگەڵیاندا بوو خۆیان گەیاندە ناوخاکی ئێرانەوە.

هەروەکو ڕۆبەرت ئولسون باسیکردوە حسنانلی خالید داوای پەنامەندەیی لەئێرانیەکان کرد و چەکەکانی دا بەحکومەتی ئێران و عەلی ڕەزاش هەمان شتی کرد، بەلاَم (کەریم) کە سەرۆکی عەشیرەتی (Zirgan) خۆی نەدایە دەست ئێرانیەکان و لەگەڵیاندا ڕووبەڕووبوەوە و لەمەدا (٧٥) شۆڕشگێڕ و چەند سەربازێکی ئێرانی کوژران کە لەناو ئەوانەدا کەریم و حسنانلی خالید و سلێمان و ئەحمەد و عەبدولباقی و کوڕێکی شێخ سەعیدیش کوژران و عەلی ڕەزا و حسنانلی خالید لای سمکۆ بوون بەپەنابەر بەوجۆرە سەرنەکەوتنی شۆڕش لەمینس ڕێگەی لەشێخ سەعید گرت لە(مینس)ەوە کە تەکیەکەی خۆی لێبوو بتوانێت شۆڕشەکە بگەیەنێتە ئەرزڕوم و دەوروبەری.

شێخ سەعید و ئەو سەرکردانەی لەگەڵیدا بوون بڕیان دەرکەوت شۆڕشەکەیان لەدۆڕاندندایە بۆ ئەمە لەگوندی (Kirvas) کە لەناوچەی (Solhan)دا بوو ڕۆژی ١٩٢٥/٤/٣ کۆبونەوە بۆئەوەی نەخشەی دەربازبونی خۆیان بکێشن بۆ عێراق یان ئێران، لەوکاتەدا هێزەکەی تورك کە بەسەرکردایەتی (غالب بەگ) بوو کە تاقمێك چەکداری (هورمیك) و (لولان)ی لەگەڵدابوو لەشێخ سەعید نزیکبووبوەوە وە لە ١٩٢٥/٤/٦دا میرلیوای سەرکردەی سوپای (١٢) ئابلۆقەی تاقمەکەی شێخ سەعیدیان دابوو، لە ٤/١٤دا شێخ سەعید و هاوکارەکانی بڕیاریاندا لەڕوباری (مرادسو) بپەڕێنەوە کە لەباکوری (موش)دا بوو، لەوێ هێزەکەی تەلعەت بەگ بەرەنگاری بووەوە و شێخ ناچاربوو بەرەو (ڤارتو) بکشێتەدواوە بەهیوای ئەوەی لەڕێگەی (Bulanik)ەوە خۆی دەربازبکات بۆ ناو خاکی ئێران، لە ١٩٢٥/٤/١٥دا

لەپردی (Corik) بەتالیۆنێکی حکومەت لەگەڵ هەندێ لەهورمیکەکانی (Chelcuklu) بۆسەیان بۆ نابووەوە کە شێخ پەنجا چەکداری لەگەڵدابوو ئابلۆقەی شێخیاندا.

مارتن ڤان برونسون وتویەتی قاسم بەگ لەمەدا فێڵی لەشێخ سەعید کردبوو و خیانەتی لێکردبوو لەچۆنیەتی گرتنیدا و بەڵگەی مارتن ڤان برونسون بۆ ئەمەش ئەوەیە لەسەرەتادا قاسم و باوکی و براکانی لەسزای لەسێدارەدان ڕزگاریان بووبوو، بەوجۆرە وەکو ڕۆبەرت ئۆلسون باسیکردوە شێخ سەعید و تاقمەکەی لە ١٦/٤/١٩٢٥دا گیرا و نێردران بۆ دیاربەکر کە (Sayim bey) قایمقام بوو دران بەدادگای ئیستقلال و خۆی و ژمارەیەکی زۆر لەهاوڕێکانی لەسێدارەدران.

دەربارەی ئەو بەدیلگرتنەی شێخ سەعید و خیانەتکردنی قاسم بەگ، زنار سلوپی لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٥٧ باسی خیانەتی قاسم بەگی کردووە کە زانیاریەکی تەواوی دەربارەی شێخ سەعید دابوو کە بووبوو بەهۆی نانەوەی بۆسە لەسەر پردی (مرادسو). حەسەن عەرەفە لەکتێبەکەیدا وەرگێڕانی بۆ فارسی لەلایەن حامید گەوهەریەوە ئەو پردەی بە(مرادچای) ناوبردوە لەکاتێکدا لەوەرگێڕانی کتێبەکەی زنار سلوپی بۆ عەرەبی بەهەڵە بە(مرادجی) ناویبردوە کە مەبەست (مرادچای)ە، لەکتێبەکەی پرۆفیسۆر حەسرەتیانیشدا سەرچاوە/٤٩ بەپردی (مورجای) ناویهاتوە وەکو لەوەرگێڕانە ڕوسیەکەوە بۆ عەرەبیدا دەردەکەوێت (هەروەکو لەهەندێ شوێنی تردا دوبارەمانکردۆتەوە چ لەناوی شوێن و عەشیرەت و کەسایەتیەکاندا زۆرجار جیاوازیەکی ئاشکرا لەنێوان سەرچاوەکاندا دەبینرێت کە هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ چۆنیەتی وەرگێڕانی باسەکە لەسەرچاوەیەکەوە بۆ سەرچاوەیەکی تر.

بەو پێیە بەدیلگرتنی شێخ سەعید و هەندێ لەهاوکارەکانی و پەنابردنی ژمارەیەکی زۆر لەشۆڕشگێڕان بۆ ئێران کۆتایی بەو شۆڕشەی کوردیش هێنرا ئەگەرچی هەندێ سەرچاوە باسی هەندێ جموجوڵی تریان کردووە لەناوچەکەدا وەکو ئەوەی زنار سلوپی دەربارەی شێخ شەمسەدینی خەڵکی (خویدانا)ی کردووە کە لە(قامشلی) بەرەنگاری هێزی تورك بووبووەوە بەسەرکردایەتی (جمیل جاهد) کە ئەو هێزەی کورد ژمارەیەك لەچەکدارانی عەشایرەکانی (بکران) و (رشکوتان) و فەوجێکی تورکیان پەرێشان کردبوو لەدەوروبەری پردی (باتمان) و زۆری نەمابوو فەوجەکە بەدیلبگیرێت بەڵام تەوژمی باران و ڕەشەبا ڕێگەی هەموو

شتێکی لەشۆڕشگێڕەکان گرت و ڕۆژی دوایی هێزێکی زۆری تورك پەلاماری شێخ شەمسەدینی دا و شێخ شەمسەدین بەدیلگیرا و نێردرا بۆ دیاربەکر بۆ دادگاکردن.

بەوجۆرە شۆڕشەکەی پیران لەهەمولایەکەوە خامۆشکرا و حکومەتی تورك بەوپەڕی دڕندەیەتیەوە دەستیکرد بەدادگاکردنی شۆڕشگێڕان و شەهیدکردنیان و بەربووە دانیشتوانی کورد و بەوپەڕی دڕندەیەتیەوە دەستیکرد بەکوشتن و سزادان و ئاوارەکردن و ڕاگویزانی بەکۆمەڵ وەکو لەباسی داهاتوودا بەدوورودرێژی باسیدەکەین.

## باسی حەوتەمی بەشی دەهەم
### دادگاکردن و ئاوارەکردن و ڕاگوێزانی بەکۆمەڵ

لەدوای سەرنەکەوتنی شۆڕش، ئیتر کاربەدەستانی تورک بەئاشکرا بەربوونە گیانی کورد و ئەوانەش کە خیانەتیان لەمیللەتەکەی خۆیانکردبوو، بووبوون بەوابەستەی تورک لەو قین و ڕقەی فاشستەکان ڕزگاریان نەبوو، لەهەموولایەکەوە دەستکرا بەدادگاکردن و لەسێدارەدانی سەدان کورد و ئەو نەخشەیەی دەمێك بوو تۆرانیەکان بۆ لەناوبردنی کورد ئامادەیان کردبوو هەنگاو بەهەنگاو هەموویان بەجێهێنا، هەوڵئەدەین کورتەباسێکی ئەو سەرچاوانە بخەینە پێشچاو کە دەربارەی لەسێدارەدان و ڕاگوێزانی کورد دواون:

#### یەکەم-دادگاکردن و لەسێدارەدان

لاپەڕەکانی مێژووی تورك لەسەرەتای هاتنیانەوە بۆ ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی ئاسیا بریتیە لەزنجیرەیەکی لێکنەپچڕاوی خوێنڕێژی و کاولکردنی شارستانیەتی و لەناوبردنی ئەو میللەتانەی دەستیان بەسەر وڵاتەکانیاندا گرتوە کە میللەتی کورد لەدێرزەمانەوە هەتا ئیمڕۆش لەڕەفتاری ئەو دڕندانە ڕزگارینەبووە و لەم باسەدا هەوڵئەدەین کورتەباسێکی ئەو سەرچاوانە بخەینە پێشچاو کە سەرچاوە شارەزاکان بەپشت بەستن بەبەڵگە و دوکیومێنتەکان دەربارەی دادگاکردنی کورد و هەڵواسین و کوشتن و زیندانیکردن لەلایەن کاربەدەستانی تورکەوە تۆماریانکردوە لەئەنجامی شۆڕشی پیراندا.
هەروەکو سەرچاوەکان ڕوونیانکردۆتەوە ئەو خوێنمژانە تەنها بەکوشتن و لەسێدارەدانی ئەوانە وازیان نەهێنابوو لەشۆڕشەکەدا بەشداریانکردبوو بەڵکو شۆڕشەکەیان کرد بەبیانوو، هەرچی بۆنی ئەوەی لێهاتبێت هەستی نەتەوایەتی کوردی تیادابووبێت بیانوی بۆ دۆزیونەتەوە و ئەوانەشی داوە بەدادگا و لەسێدارەیداون، کە ئەم ڕەفتارەی تورك هەر مەگەر لەفاشستەکانی ئیتاڵیا و نازیەکانی ئەڵمانیا ڕوویاندابێت.

پرۆفیسۆر حەسرەتیان لەلاپەرە (١١٤)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٤٩ دەربارەی ژمارەی ئەوانەی درابوون بەدادگا وتویەتی: بەپێی ئەو هەواڵەی لەرۆژنامەی (Gaset–کە رۆژنامەیەکی فەرەنسی بووە) لەرۆژی ١٩٢٥/٩/٢٥دا بلاویکردبووەوە وتویەتی بەپێی رۆژنامەکانی تورك کە لەکۆتایی مانگی ئەیلولی ١٩٢٥دا بلاوکرابونەوە، دادگاکانی (استقلال) لەدانیشتوانی ویلایەتەکانی رۆژهەلات تەماشای (٣٩٧) دۆسێیان کردووە کە بۆ دادگاکردنی (١٨٥٥) کەس تەرخانکرابوو، لە(١٣٨)یاندا کە بۆ (٦٩٠) کەس تەرخانکرابوو (١٢٠) کەسیان بریاری لەسێدارەدانیان درا کە لەمانە (٢١) کەسیان لەدادگاکردنیاندا ئامادەنەبووبوون و (١١٦) کەسیشیان هەریەکەیان بۆ چەند ساڵێك بریاری زیندانیکردنیان درا و ئەوانیتر دران بەدادگاکانی تر، بەلام بەپێی ئەو زانیاریانەی (م. ن. دەرسیمی–کە مەبەستی نوری دەرسیمیە) کۆیکردونەتەوە و لەلاپەرە (١٨١)ی بەرگی پێنجەمی کتێبەکەیدا (Kurdistan Tarihinde Dersim) باسیکردوە (٤٠٠) کەس لەکوردەکانی (پالو) و (چپاقچور) لەسێدارەدرابوون.

دەربارەی ئەو ژمارانەی پرۆفیسۆر حەسرەتیان ئاماژەی بۆ کردون، رۆبەرت ئولسون لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٨٤ وتویەتی: لەکۆتایی مانگی ئابدا (کە مەبەست ئابی ١٩٢٥)ە بەپێی راپۆرتەکانی ئینتلجسی بەریتانیا (٣٢٧) کورد لەلایەن دادگای ئیستقلالی دیاربەکرەوە لەسێدارەدران و هەروەکو حکومەتی تورك خۆشی بلاویکردۆتەوە لەرۆژی ١٩٢٥/٢/١٥ بەدواوە (مەبەست رووداوەکەی پیرانە کە بوو بەهۆی پێشخستنی کاتی دەستپێکردنی شۆرش) لەماوەی دوو مانگونیودا هەزار کەس گیران و (٩٠٠) کەسیان دران بەدادگا و (٧٨) کەسیان لێهەلواسرا، (٨٠٠) کەسی تریش بەناوی چەتەگەری و رێگریەوە گیران و بەهەمووی (٧٤٤٠) کەس تەنها لەلایەن دادگای دیاربەکرەوە گیران و (٦٦٠) کەسیان هەلواسران.

هەروەکو رۆبەرت ئولسون باسیکردوە، حکومەتی تورك تەنها هەر بەدادگاکردنی کورد وازینەهێنا، بەلکو ئەو شۆرشەی بەهەل زانی و نەیارەکانی خۆشی کە لەناو توركدا هی وایان هەبوو لەرەفتار و هەلوێستی کاربەدەستان قایلنەبوون ئەوانیشی بەوە تاوانبارکرد کە بێدەنگ بوون بەرامبەر بەیاخیبووەکان و مستەفا کەمال گەلێك رەخنەی توندوتیژی لەهەندێ رۆژنامە گرت کە لەبۆچوونی ناو باس و بلاوکراوەکانیاندا وایان پیشاندابوو لایەنگری حکومەت

نەبوون و عیسمەت ئینونۆ بەئاشکرا دژی (حسێن جاهد یالچین)ی سەرنوسەری ڕۆژنامەی (Tanin–طنین) و (ولید ئبوزیا)ی سەرنوسەری ڕۆژنامەی (توحید افکار) و (ئەحمەد ئەمین یالمان)ی سەرنوسەری ڕۆژنامەی (وەتەن) و (شەریف ئەدیب)ی نوسەری ڕۆژنامەی (Sebilurresol) کە ئەمەی دوایی سەر بەپیاوە ئاینیەکان بوو دژی هەموویان وەستا.

بێگومان باسی ئەوانەی لەلایەن دادگاکانەوە بڕیاری لەسێدارەدان و گرتنیان دەرچووبوو باسێکی دووروودرێژە و پێویستی بەلێژنەیەك هەیە لەدواڕۆژدا فایلەکانی ناو دادگاکان بپشکنن بۆ تۆمارکردنی هەموویان و لێرەدا ئێمە ئەوی لەهەندێ سەرچاوەدا ئاماژەیان بۆ کردووە دەیانخەینە پێشچاو:

### أ-دادگاکردنی شێخ سەعیدی پیران و هەندێ لەهاوکارەکانی

لەدوای ئەو خیانەتە گەورەیەی (قاسم بەگ) لەشێخ سەعیدی کردبوو کە بووبوو بەهۆی گرتنی، شێخ سەعید درا بەدادگای ئیستقلال لەدیاربەکر و گەلێك سەرچاوە باسی چۆنیەتی دادگاکردنیان کردووە. مارتن ڤان برونسون و هاوڕێکەی لەسەرچاوە/١٠٥دا وتویانە شێخ سەعید لەپاش دادگاکردنێکی کورت، خۆی و (٤٧) کەس لەوانەی لەشۆڕشەکەدا لەگەڵیانبوون و گیرابوون لە ١٩٢٥/٩/٤دا لەسێدارەدران و حکومەت یاسایەکی دەرکرد بەپێی ئەو یاسایە هەرچی قوتابخانە ئاینیەکان بوو لەگەڵ شوێنە پیرۆزەکان هەموویان داخران.

دکتۆر عەزیز شەمزینی لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٤٢ وتویەتی لە ١٩٢٥/٧/٢٧دا ژمارەیەك بڕیاری لەسێدارەدانیان درا کە بریتی بوون لە: شێخ سەعید، شێخ عەبدوڵا، شێخ ئیسماعیل، شێخ عەبدولەتیف، قاسم بەگ، حاجی خالید، چەرکەس ڕەشید، مەلائەمین، شێخ عەلی یوزباشی فەخری، ملازم شەهری، حاجی سادق و هەندێکی تر.

دکتۆر شەمزینی ئاماژەی بۆ قسەکانی شێخ سەعید کردوە کە لەکاتی لەسێدارەدانیدا وتبووی: ((سەربەرزی بۆ ئێمەیە کەوا لەئەنجامی خەباتماندا بۆ ڕزگارکردنی وڵاتەکەمان لەجەور و ستەمی ئێوە پەتی سێدارە بکرێتە ملمان، خەبات ئەرکێکی نیشتمانی بوو، ئێمەش بەسەربەرزیەوە بەجێمانهێنا و پێویستە هەموو کوردێکی سەربڵند بۆ ڕزگارکردنی کوردستانی ژێردەستە تێبکۆشێت)). شەمزینی لەکتێبەکەیدا ئاماژەی بۆ کتێبەکەی عەبدولعەزیز یامولکی کردووە

(کوردستان و کورد اختلاللری) چاپی تاران بەتورکی، ساڵی ١٩٤٦ لاپەڕەکانی (٨٣-٨٤) کە لەوەدا وتویەتی: (ڕۆژی ١٩٢٥/٦/٢٨ دادگای دیاربەکر بڕیاری خنکاندنی (٩٣) تێکۆشەری کوردیدا).

وێنەیەکی شێخ سەعید لەبەردەمی دادگای ئیستقلالدا لەدیاربەکر

بەلاّم (ولید حمدی) لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٢٣ ئاماژەی بۆ ڕاپۆرتێکی (Harrare) کردوە کە لەڕۆژی ١٩٢٥/٧/١دا ناردویەتی بۆ (مستەر ئوستن چمبرلن) وتویەتی لە١٩٢٥/٤/٢٨دا بڕیاری هەڵواسینی شێخ سەعید و چل کەسی تر لەهاوکارەکانی درا کە سەرۆکی دادگا لەکاتی دادگاکردنی شێخ سەعیدا بەشێخ سەعیدی وتوە: ((هەندێکتان بۆ سودی خۆتان ئەم کارەتان کردوە و هەندێکی ترتان بەهاندانی بێگانە بووە (لەباسێکی دواییدا بەدووروودرێژی ئەمە بەدوورئەخەمەوە کە شۆڕشی پیران بەهاندانی بێگانە بووە) و ئەو کارەتان بەنیازی سەرگرتنی مەبەستێکی سیاسی بووە کە ئێوەی والێکردبوو ئاگریەربدەنە ناوچەکە، بەلاّم بەهەوڵ و کۆششی حکومەت توانرا ئەو ئاژاوە کۆنەپەرستانەتان خامۆش بکرێت و هەمووتان بەکێشبکرێن بۆ بەردادگا و پێویستە هەموو کەس

لەوەبگات حکومەتە ساواکەمان بەهیچ گێرەشێوێن و کۆنەپەرستێك کۆڵنادات و بەوپەڕی دەستوبردیەوە ڕێگە لەهەموو ڕەفتارێکی خراپ دەگرێت بۆئەوەی دانیشتوانی ئەو ناوچانەی کەوتبوونە ژێر فشار و زۆرداریێتی ئاغا و بەگزادەکان ڕزگاریان ببێت و پێویستە سزای ئێوەش بەهەڵواسین بدرێتەوە کە بریتیە لەعەدالەتی یاسای جمهوریەتەکەمان)).

دەربارەی دادگاکردنی شێخ سەعید، (Patrick Kinross) لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٨٥ لەباسی دادگاکردنی شێخ سەعیدا وتویەتی شێخ سەعید لەکاتی دادگاکردنیدا زۆر بەئارام و لەسەرخۆبوو، بەهیچ شێوەیەك خۆی تێکنەدا، بەڵکو جاروبار لەگەڵ حاکمەکانیشدا جاروبار قسەی خۆشی دەکرد و لەکۆتای دادگاکردنیدا ڕوویکردە حاکمەکە و پێی‌وت: ((من بۆیە شۆڕشمکرد چونکە ئاینی ئیسلام بەتەواوەتی پشتگوێخراوە و ئەگەر سەریکەوتینایە بڕیار وابوو بەپێی یاسای پیرۆزی ئیسلام ڕەفتارمان بکردایە و زمانی پیاوی درۆزن و دەستی پیاوی دز و خراپکار بڕایە و کوردستانمان والێدەکرد هەروەکو ڕۆژانی پێغەمبەر داد و ئاسایشی تیادا بەرپابکرێت بۆیە ئەوەی لەو ڕێگەیە لایدابێت بەتاوانباری دەزانین)).

سەرچاوەکە دەڵێ: لەئەنجامی دادگاکردندا شێخ سەعید و چل کەسی تر کە نۆ کەسیان لەشێخەکان بوون بڕیاری خنکاندنیاندرا و شێخ سەعید بەسەرۆکی دادگاکەی وت: حسابی دواییمان لەبەردەمی دادگایەکی تردا دەکرێت و کە شێخ سەعید برایە بەرسێدارە زۆر لەسەرخۆ و بێ‌پەشۆکاوی دانیشت و قوماشێك کرا بەسەر و دەموچاویدا و هەڵیانواسی. نوسەر لەلاپەڕە (٤٠٢)ی کتێبەکەیدا باسی عیسمەت ئینونۆی کردوە کە بە(عەلی فوئاد)ی وتبوو پاشئەوەی شێخ سەعید لەسێدارەدرا ئیتر لەمەودوا ناوی ئۆپۆزسیۆن نەماوە و بەهیچ جۆرێکیش نابێ بمێنێت و بە(ئەدمیرال بریستول)ی نوێنەری ئەمریکای لەتورکیا وتبوو: ئیتر لەمەودوا بوونی هەموو جۆرە ئۆپۆزسیۆنێك بەیاخیبوون دەژمێردرێت.

دوای ئەمە نوسەری سەرچاوە/٨٥ دەچێتە سەر باسی ئەوەی چۆن حکومەت شکاندن و لەناوبردنی ئەو شۆڕشەی بەهەل زانی و دەستیکرد بەداخستنی پێنج ڕۆژنامەی تورکی لەوانەی لایەنگری بۆچونەکانی حکومەت نەبوون و تەنها ڕێگە بەپێنج شەش ڕۆژنامە درا دەربچێت کە مەرجێکی سەرەکیش بۆ ئەوان دانرابوو کە دەبوایە بەپێی ئارەزوو و خواستی حکومەت بڵاوبکرێتەوە و یەکێکی وەکو

(حسێن جاهد یالچین)ی خاوەنی ڕۆژنامەی (طنین–Tanin) زۆر بەترسەوە شتی بلاودەکردەوە و پاشئەوەی (حزبی تقدم) داخرا (لەشوێنی تردا باسمانکردوە کە کازم قەرەبەکر سەرۆکی ئەو حیزبە بووە) ئیتر نۆرەش هاتەسەر (حسێن جاهد یالچین) و بەتاوانی بەکارهێنانی چەند وشەیەك کە حکومەت بەئاواتی زانیبوو خۆی و سێ کەسی نوسەر و بەڕێوەبەری ڕۆژنامەکە دران بەدادگا لەئەنقەرە و بڕیاری دورخستنەوەی درا بۆ (Chorum) و لەوێ بۆ ماوەی چەند ساڵێك مایەوە.

نوسەری سەرچاوە/٨٥ لەلاپەڕە (٤٠٣)ی کتێبەکەیدا باسی چۆنیەتی دادگاکردن و هەڵواسینی تاقمێکی بەم شێوەیە کردوە: شەوێك وەزیری دەوڵەتی بولغاریا کە ناوی (Simon Radev) بوو لەئوتێلێکدا دەبێ، بەدەم قیژەوڕی سەرجادەوە خەبەریدەبێتەوە و لەپەنجەرەی ژوورەکەیەوە سەیری دەرەوە دەکات دەبینێت لەساحەکەی بەرامبەر بەژوورەکەی چەند کەسێك بەسێدارەدا هەڵواسراون و هاواریان دەکرد: ئێمە هیچمان تاوانبارنین، بەلام ئەفسەرەکان هاواریان ئەکردە سەربازەکان و پێیانئەوتن درەنگە پەلە لەکارەکەتاندا بکەن، بەیانی کە ڕۆژبووەوە میستەر (Hawland Shaw) کە سکرتێری باڵیۆزخانەی ئەمریکی بوو کە ئەویش چاوی بەم دیمەنە کەوتبوو هەستی خۆی بەرامبەر بەو دیمەنە بەمجۆرەی خوارەوە دەربڕیوە و تۆماریکردوە: ((ئەوانەی کرابوون بەسێدارەدا سەروچاویان بەپەڕۆیەك داپۆشرابوو، ناوەکانیان لەسەر سنگیان نوسرابوو، لەولاشەوە منداڵی ورد یاری و گەمەیان دەکرد و خەڵکێکی زۆریش هاواریان دەکرد و لەگەڵ هاواری هەڵواسراوەکان تێکەڵ بەیەك دەبوون و دەتووت هەرهیچ ڕووینەدابووبێ وابوو)).

پرۆفیسۆر حەسرەتیان لەلاپەڕە (١٠٧)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٤٩ ئاماژەی بۆ کتێبێك کردوە وەرگێڕاوەکەی بۆ عەرەبی لەڕوسیەوە بۆ کوردیەکی بریتیە لە: کورتە زانیاریەك دەربارەی سیاسەتی تورك بەرامبەر بەکورد لەساڵانی (١٩٢٤–١٩٣٩)دا، چاپی ساڵی ١٩٦١ کە لەمەدا لەلاپەڕە (١٢٥)دا باسێکی تایبەتی تەرخانکردوە بۆ دادگاکردنی شێخ سەعید و شۆڕشگێڕە هاوکارەکانی کە وتویەتی: لەکۆتایی مانگی ئایاری ١٩٢٥دا دادگاکردنی شێخ سەعید و چەند کەسێکی تر دەستپێکرد کە دادگاکردنەکە نزیکەی مانگێکی خایاند.

لەو دادگاکردنەدا شێخ سەعید، شێخ عەبدوڵای ملکان، ڕائیدی موتەقاعد قاسم خەڵکی ڤارتو (کە مەبەستی قاسم بەگە کە خیانەتی لەشێخ سەعید کردبوو،

لەدواییدا باسی دادگاکردنی ئەمیش دەکەین))، حاجی خالید عەبدولحەمید، ڕەشید چەرکس، ڕائیدی موتەقاعد ئیسماعیل، ئیمام مەلا عەلی، شێخ عەلی، شێخ ئیسماعیل خەڵکی جزیرە، شێخ عەبدولەتیف، کامل، بابك ڕەشید تەیمور، محەمەد، سلێمان، ڕائیدی موتەقاعد بەحری ئەمین، شەوکەت، مقصود، حەمید، عەبدولمەجید، شێخ شەریف، سلێمان خەڵکی چپاقچور، نیعمەت، ماهر، ملازمی جەندرمە محەمەد موکری، نیازی (موەزەفی مەحمی))، حاجی سادق و چەند کەسێکی تر.

لە ۲۹ی ئایاردا دادگای ئیستقلالی دیاربەکر بڕیاری لەسێدارەدانی (٤٧) کەسی دەرکرد، لەژوور هەموویانەوە شێخ سەعید بوو، هەمووشیان هەڵواسران و لەکاتی لەسێدارەدانی شێخ سەعیدا لەبەر قەنارەکە شێخ سەعید وتویەتی: ((من ژیانی ئاسایی خۆمم بردۆتەسەر و تەواومکردووە پەشیمان نیم لەوەی کردوومە لەپێناوی نیشتمان و میللەتەکەمدا و ئەمە ئەوپەڕی شانازیە و سەربەرزیە بۆ نەوەکانی دواڕۆژمان و بەو هەستەوە سەیری دوژمنە شەرمەزارەکانمان بکەین)).

جەلادەت بەدرخان لەلاپەڕە (١٠٠)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٦٠ ئاماژەی بۆ بڵاوکردنەوەیەکی ناو ڕۆژنامەی (وقت)ی تورکی کردوە کە لەڕۆژی ١٩٢٥/٦/٣دا بڵاوکراوەتەوە وتراوە: ڕۆژی ۳ی حوزەیران ئەوەی لەدادگاکردنەکەی شێخ سەعیدا دەردەکەوێ ئەوەیە لەویلایەتەکانی ڕۆژهەڵاتماندا کۆمەڵێکی نهێنی پێکهاتبوو بەنیازی دروستکردنی حکومەتێکی سەربەخۆی کوردستان کە بەتەقەلای یوسف ضیاء بەگ پێکهاتبوو کە ئەو ضیاء بەگە بەرلەمە لەسێدارەدراوە، وە دوایئەوەی توانرا بنەماڵەی شێخ سەعیدیش بکرێن بەهاوکاری ئەو کۆمەڵە کە مەبەستی ئەو کۆمەڵە بریتی بووە لەبەرپاکردنی شۆڕشێك لەژێر پەردەی ئایندا بۆئەوەی لەپشتی ئەو پەردەیەوە بگەن بەمەبەستی خۆیان کە بریتی بووە لەدروستکردنی حکومەتێکی سەربەخۆ لەناو ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵاتدا، بەڵام حکومەت بەر لەدەستپێکردنی شۆڕشەکەوە ئاگای لەهەموو شتێك هەبوو بۆیە کە دەستپێکرا توانرا زوو لەناوببرێت.

سەرنجدانێك دەربارەی کاتی دادگاکردن و لەسێدارەدانی شێخ سەعید و شۆڕشگێڕەکانی تر دوو شتمان دەخاتە پێشچاو:

یەکەم: ئەو قسانەی شێخ سەعید و شۆڕشگێڕەکانی تر لەسەرچاوەکاندا باسیانکردوە چ لەبەر دادگادا و چ لەبەر داری قەنارەکانیاندا ئەگەرچی هەندێ

جیاوازی هەست پێدەکرێت لەو قسانەی وتویانە و دەماودەم و سەرچاوە بۆ سەرچاوە وەرگێڕاوە و بیستراوە و تۆمارکراوە، هەموویان ئەوە دەگەیەنن زۆربەیان بەوپەڕی قارەمانێتیەوە ڕووبەڕووی دادگاکان و سێدارەکان بوونەتەوە و هەروەکو لەدوایشدا ڕووندەبێتەوە زۆربەیان هەست و بیروباوەڕیان وەکویەك وابووە.

دوهەم: دەربارەی ئەو جیاوازیەی لەمێژووی دادگاکردن و لەسێدارەدانی شۆڕشگێڕەکاندا لەسەرچاوەکاندا دەبینرێت کە بەپێویستم زانی بەراوردی جیاوازیەکانی ئەو سەرچاوانە باسبکەم.

وەکو بەرلەمە باسمانکردوە، ڕۆبەرت ئولسون وتویەتی شێخ سەعید لە ١٩٢٥/٤/١٦دا گیرا و نێردرا بۆ دادگای ئیستقلال لەدیاربەکر، دەربارەی بڕیاری لەسێدارەدانی شێخ سەعید: ولید حمدی وتویەتی بەپێی ئەو ڕاپۆرتەی ئاماژەی بۆ کردوە شێخ سەعید و چل شۆڕشگێڕی تر لە ١٩٢٥/٤/٢٨دا بڕیاری لەسێدارەدانی شێخ سەعید و هاوکارەکانی درا و پرۆفیسۆر حەسرەتیان وتویەتی لەکۆتایی مانگی نیساندا دادگاکردنی شێخ سەعید و هاوکارەکانی دەستپێکرد و نزیکی مانگێکی خایاند کە بەپێی ئەمە دەبێ لەسێدارەدانی شێخ سەعید نزیکی کۆتایی مانگی مایس بووبێت.

ڕۆژنامەی (وقت)ی تورکی ١٩٢٥/٦/٣ کە جەلادەت بەدرخان ئاماژەی بۆ کردوە وتویەتی دادگاکردنی شێخ سەعید لە ٦/٣دا بووە، دکتۆر عەزیز شەمزینی ڕۆژی ١٩٢٥/٦/٢٨ بڕیاری خنکاندنی (٩٣) تێکۆشەری دەرکرد کە ئەمە لەگەڵ ئەوەی عەبدولعەزیز یامولکیدا یەکدەگرێتەوە کە خۆی ئەفسەر بووە لەتورکیا و شارەزای شۆڕشەکە بووە وەکو لەیاداشتەکانیدا باسیکردوە، بەلام مارتن ڤان برونسون وتویەتی شێخ سەعید و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون لە ١٩٢٥/٩/٤دا لەسێدارەدران کە ئەمە لەگەڵ هیچ سەرچاوەیەکی تردا یەکناگرێتەوە و بەپێی بەراوردکردنی سەرچاوەکان دەردەکەوێ شێخ سەعید کە لە ١٩٢٥/٤/١٦دا گیرابوو نزیکی پاش دوو مانگ و نیو بەسەر گیرانەکەیدا کە لەو ماوەیەدا دادگاکەی درێژەی کێشابوو، لەئەنجامدا لە ١٩٢٥/٦/٢٨دا لەکاروانی پێشەوەی شەهیداندا لەسێدارەدراوە.

بەلام پیرەمێردی شاعیری مەزنی کورد هەروەکو لاپەڕە (١٠٣)ی کتێبەکەی پیرەمێردی نەمردا، چاپی بەغدا، ساڵی ١٩٧٠ بلاومکردۆتەوە، کردبووی بەپیشە

هەموو ساڵێك یادی شەهیدانی ئەو شۆڕشە مەزنەی کردوە و هەروەکو خۆی وتویەتی لە ٢٤ی ئایاری ١٩٢٥دا یادی ئەو شەهیدانەی بەشیعرێك کردووە کە ئەمەی خوارەوە سێ دێڕی دوایی ئەو شیعرەیە کە لەدوا دێڕیدا ئاماژەی بۆ ڕۆژی ١٩٢٥/٥/٢٤ کردوە کە یادی شەهیدبوونی شێخ سەعید و هاوڕێکانی بووە کە وتویەتی:

**سەرداری ئێمە کە لەسەر دار بەپێکەنین**
**بانگیدەکرد: بەکوشتنی من میللەتم ئەژین**
**ئەم خوێنی کوردە کە وەکو سیاوەخشە**
**خوێنی نەسێنرێ هەڵدەقوڵێ دائیما گەشە**
**بۆ ئێمە لازمە هەموو ساڵێک هەتا دەژین**
**ئەم ڕۆژی ٢٤ی ئایارە بکەین بەشین**

پیرەمێرد بەناوی (من و ئەستێرەکان) و شیعرێکی تریَ بەرزی وتوە بۆ شەهیدانی شۆڕشی پیران کە فەرمویەتی:

ئەستێرە بەرزەکان ئەدرەوشێنەوە بەشەو
وەك من بەداخەوەن نە سرەوتنیان هەیە نە خەو
چەند ساڵە ئاشنای شەوی بێداری یەکترین
وەك سەرسەرین شەوێ سەرناکەنە سەرسەرین
من خواروژوور لەدەسچوەکەی بێولەت خۆم ئەوان
وەك خێڵی خواروژوورکەری کورد وێڵی ئاسمان
شەو شەونمی ئەوانە چەمەن ئاونەخواتەوە
ڕۆژ هەڵمی چاوی منە سەریەخاتەوە
دوێشەو بەری بەیان بوو ئەگریان بەسەر منا
منیان کەساس ئەبینی لەناو دۆست و دوژمنا
دڵسۆزی وام نەدیبوو کە بۆم بگری وەك خەشیم
فرمێسکەکەی ئەوان بوو بەئاونگی تێگەییم
بام ڕاسپارد کە خەفەت بۆچ ئەخۆن ئەوان
وەك ئێمە نین نزیکتری لای بارەگای خوان
جوابیان نوسیبوو بەشەونم لەسەر گیا

تــا ئاسمـــان پریشـــکی بـــەدی نێـــوە هەڵپـــژا
ئـــاهونزای کوردەکـــانی شمـــال گەییـــە ئاسمـــان
بـــەو دوکـــەڵی هەناســـەیە ئـــاو دێ لەدیـــدەمان

**ب-دادگاکردنی شێخ عەبدولقادری شەمزینی و هەندێ شۆڕشگێڕی تر**

هەروەکو لەسەرچاوەکاندا ڕووندەبێتەوە، شێخ عەبدولقادر ئەگەرچی بەکردەوە لەشۆڕشـــەکەی پیرانـــدا نـــەبووە و لەناوچـــەکەدا نـــەبووە، بـــەڵام وەکـــو کـــوردێکی شۆڕشگێڕ و دڵسۆز بەدڵ و بەگیان لەگەڵ شۆڕشگێڕەکاندا بووە.

دەربـــارەی چـــۆنیەتی پەیوەنـــدیکردنی شـــێخ عەبـــدولقادر بەشۆڕشـــگێڕانەوە، بەرلەمە لەباسی ڕاپەڕینەکەی (بیت الشباب)دا باسی ئەوەکرا عەلی ڕەزای کوڕی شێخ سەعید لەدوای گەڕانەوەی لەحەلەب کە باوکی ناردبووی (۲۰) ڕانەمەڕ لـەوێ بفرۆشێت بۆئەوەی پارەکەی بـۆ شـۆڕش تـەرخانبکرێت، لەگەڕانەوەیـدا چووبووە لای شێخ عەبدولقادر بۆئەوەی ببێت بەلایەنگری شۆڕش و هاوکاری شۆڕشگێڕان، تورکەکان لەمێژبوو شێخ عەبدولقادریان ناسیبوو دەیانزانی لـەجموجۆڵی کۆمەڵی ئـازادی و شۆڕشـگێڕانی کـورددا ئەگـەر بـەکردەوەی نـاو شۆڕشـیش بەشـداری نەکات، بەڵام بەشێوەیەك لەشێوەکان بێدەنگ دانانیشێت بۆیـە هەمیشە ئاگاداری هەنگاوەکانی بوون و بۆ هەل و دەرفەتێك دەگـەڕان بەڵگە و بیانوویـەك بدۆزنـەوە بۆ تاوانبارکردن و لەناوبردنی.

دەربـارەی تەقـەلادانی تـورك بـۆ تاوانبـارکردنی شـێخ عەبـدولقادر هـەروەکو حەسرەتیان لەلاپەڕە (۱۰۷)ی کتێبەکەیدا، سەرچاوە/٤۹ باسـی پیلانێکـی کـردوە کە تورکەکان وەکو داوێك بۆ شێخ عەبدولقادریان نـابووەوە، کرێگرتەیـەکی خۆیـان نـــاردبوو بـــۆلای شـــێخ عەبـــدولقادر و ئـــەو کرێگرتەیـــە خـــۆی وا پیشـــاندابوو فەرمانبەرێکی وەزارەتـی دەرەوەی بەریتانیایـە و پێـی وتبـوو حکومـەتی بەریتانیا (۸۰) ملیۆن لیرەی تەرخانکردوە بۆ یارمەتیدانی شۆڕشێکی کورد دژی حکومـەتی تورکیا، بەڵام شێخ عەبدولقادر ئەمەی ئەو کابرایەی قبوڵ نەکردبوو.

هـــەروەکو حەســـرەتیان ئامـــاژەی بـــۆ کـــردوە، لەسەرچـــاوەیەکدا کـــە باســـی دوکیـــومێنتێکی تیـــادا کـــراوە (۱۹۲٥-٥-۷ istanbul) لـــەوەدا وتـــراوە تورکـــەکان بەسـەرنەگرتنی ئـەو پیلانـە وازیـان لەشـێخ عەبدولقادر نـەهێنا و بـەپێی بڕیـارێکی وەزیری ناوخۆی تورکیا لەڕۆژی ۱۹۲٥/۳/۱۳دا فەرمانی گرتنـی شـێخ عەبـدولقادر

و سەید محەمەدی کوڕی و (نافز) کە خەڵکی سلیمانی بوو لەگەڵ (کور عەبدوڵای سعادی) و سەرۆکەکانی عەشیرەتی (هوشنان-کە لامواپە هسنان)ە گیران.

وێنەی شێخ عەبدولقادری شەمزینی

حەسرەتیان لەلاپەڕە (١٠٨-١٠٩)ی کتێبەکەیدا باسی چۆنیەتی دادگاکردنی شێخ عەبدولقادر کردوە کە بەهیچ جۆرێك لەو دادگاکردنەیدا دانی بەوەدا نەنابوو پەیوەندی بەشۆڕشەوە بووە و ئەگەر بیزانیایە حکومەتی ئاگاداردەکرد (کە دوورنیە ئەمەی دوایی تورکەکان خۆیان لێیان زیادکردوە). حەسرەتیان دەڵێت بەڵام (کور عەبدوڵا سعادی) ڕەفتارێکی زۆر ناشیرینی نواند بەوەی ناوی چەند کەسێکی هێنابوو کە بووبوو بەهۆی گرتنیان و بەوپەڕی ساویلکەیەتیەوە لەبەردەمی دادگاکەدا وتبووی: بەڵێ ماوەی چەند ساڵێکە ئەوانە خەریکی دروستکردنی کوردستانێکی سەربەخۆن بەڵام ئەوە خۆی بەر لەشەڕی جیهانی نێردرابوو بۆ (طایف) بۆئەوەی لەوێ خەریکی کاروباری پێکهێنانی چەند ڕێکخراوێکی کوردی بێت (دیارە ئەو کوردانەی ئەو ویستویەتی ئەو کۆمەڵانەیان لێپێکبێنێت دەبوو لەو کوردانە بوونایە کە بۆ حەجکردن دەچوون بۆ تایف، ئەگینا کورد کەی لەتایف هەبووە)، کە بێجگە لەکورد هەندێ لەڕزگاریخوازانی

نیشتمانیش بەشداربووبوون (دیارە لەمەشدا مەبەست ئەو تورکانە بووە کە دژی کەمالیەکان بوون وەکو تاقمەکەی حیزبی تقدم بەسەرۆکایەتی قەرەبەکر پاشا) بەڵام ئەو دژی ئەو هێزە نیشتمانیانە بووە کە دژی حکومەت بوون.

هەمان (کور عەبدوڵا) لەبەرچاوی سەرۆکی دادگا پەنجەی بۆ شێخ عەبدولقادر ڕاکێشا و وتی: هەموو بزوتنەوەکانی کوردستان بەسەرکردایەتی ئەو کراوە چونکە بێپرسی ئەو گەڵایەك لەکوردستاندا ناڵەرێتەوە. کە سەرچاوەی حەسرەتیان بۆ ئەم قسانەی کور عەبدوڵا سعادی بریتیە لە( M. Toker Seyh Sait ve isani–لاپەڕە ١١٥–١١٧).

حەسرەتیان ئاماژەی بۆ ڕۆژنامەی (Aksham–ئەقشام)ی تورکی ڕۆژی ١٩٢٥/٥/١٢ کردوە کە وتویەتی: لەناوەڕاستی مانگی ئایاری ١٩٢٥دا دادگای ئیستقلال لەدیاربەکر باسی تاوانبارکردنی (کەمال فەوزی)ی کە خەڵکی (بدلیس) بوو سەیرکرد و کەمال فەوزی بەدادگای ڕاگەیاند کە لەکاتی شۆڕشی پیراندا لەئەستەمبوڵ بووە و لەوێ ئەندامی دوو کۆمەڵی کوردی بووە، یەکەمیان کۆمەڵی بوژانەوەی کوردستان، دوهەمیان کۆمەڵی ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵات کە بریتی بووە لەکۆمەڵی سەربەخۆیی کوردستان و بۆ ماوەی دوو مانگ سکرتێری ئەو کۆمەڵە بووە، بەڵام دوای دوو مانگ وازیهێنا و خەریکی دەرکردنی ڕۆژنامەی (ژین) بووە.

لەکۆتایی دادگاکردنی شێخ سەعید و تاقمەکەیدا دادگای ئیستقلال لەدیاربەکر بڕیاری هەڵواسینی شێخ عەبدولقادر و سەید محەمەدی کوڕی و محامی حاجی ئاختی و کورسعاد و کەمال فەوزی و خوجە عەسکەری دەرکرد، حەسرەتیان ئاماژەی بۆ لاپەڕە (١١٨)ی کتێبی (M. Toker Sheh Sait ve isani) کردوە کە وتویەتی لەدوای چوار ڕۆژ تەواوکردنی دادگاکردن لە ١٩٢٥/٥/٢٧دا لەدیاربەکر شێخ عەبدولقادر و کەمال فەوزی و کور عەبدوڵا سعادی و حاجی ئاختی و خوجە عەسکەری هەڵواسران و حاجی ئاختی لەکاتی لەسێدارەدانیدا وتی: بژی خەبات و تێکۆشان لەپێناوی کوردستاندا و بژی کورد و کوردستان. بەڵام شێخ عەبدولقادر لەکاتی لەسێدارەدانیدا لەخوا پاڕایەوە هەڵواسینەکەی ببێتەهۆی بەهێزکردنی تێکۆشانی کورد لەپێناوی ڕزگاربوونی نەتەوەکەیدا.

دکتۆر عەزیز شەمزینی لەلاپەڕە (٨٥)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٤٢ دەربارەی چۆنیەتی لەسێدارەدانی شێخ عەبدولقادردا وتویەتی ساتێك شێخ عەبدولقادر برایە بەرسێدارە هاواریکرد: ((جەلادەکان، سەربەرزیە بۆ ئێمە کە لەپێناوی

ڕزگاربوونی نیشتمانەکەماندا پەتی سێدارەمان بکرێتە مل، بەهەڵواسینی ئێمە جگە لەتوڕەبوونی میللەتی کورد بەولاوە هیچ شتێکی ترتان دەستگیر نابێت، بەم کردەوانەتان ئەوەندەی تر کورد هاننەدەن خەبات بۆ سەربەخۆیی کورد بکات)).

پیرەمێردی شاعیری مەزن و دۆستی دێرینی شێخ عەبدولقادر لەشیعرەکانیدا چەند جارێك باس و یادی شەهیدبوونی شێخ سەعیدی دوبارەکردۆتەوە و لەڕۆژنامەکەیدا کە لەشاری سلێمانی دەریدەکرد لەژمارەی ڕۆژی ١٩٤٨/٧/٢٤دا بۆ یادی ئەو شەهیدانە و لەژوور هەموویانەوە شێخ عەبدولقادری کردووە کە ئەمە سێ دێڕی ئەو شیعرە بەرزەیەتی:

| | |
|---|---|
| لەدیاربەکر گەورەکانی کورد | لەتەناف دران ناڵەیان نەکرد |
| شێخ قادر نەوەی شێخ عوبەیدوڵا | ئیرپی (جد)ی بوو زوڵمی لێکرا |
| لەسەر دار بانگینەکردن مەگرین | با من بکوژرێم هۆزەکەم بژین |

## ج-دادگاکردنی دکتۆر فوئاد

دکتۆر فوئاد یەکێك بووە لەو تێکۆشەرە نەبەردانەی کورد لەشۆڕشی پیراندا تا لەسێدارەدانی کۆڵینەدابوو، زنار سلوپی لەلاپەڕە (١١٩)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٥٧ لەباسی دکتۆر فوئادا وتویەتی: دکتۆر فوئاد کوڕی حاجی ئیبراهیم ئەفەندی بووە کە لەبنەماڵەیەکی ناسراوی دیاربەکر بووە، دوایئەوەی خوێندنی لەدیاربەکر تەواوکردوە چووەتە ئەستەمبوڵ و لەوێوە بۆ پاریس و کۆلێجی پزیشکی تەواوکردوە و لەدواییدا بوو بەو قارەمانەی لەلاپەڕەکانی مێژووی کورددا بەوپەڕی سەربەرزی و ڕێزەوە ناویهێنراوە.

دەربارەی دادگاکردنی دکتۆر فوئاد لەڕاستیدا دادگای تورك هیچ بەڵگەیەکی ئەوتۆی بەدەستەوە نەبووە بۆ تاوانبارکردنی دکتۆر فوئاد، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا دادگا بڕیاری دادگاکردنی دەرکرد و تەنها لەبەرئەوەی لەکاتی دادگاکردنیدا وتبووی مـن (زازا)م تاوانبارکرا و بڕیاری هەڵواسینی درا. ساتێك بڕیاری هەڵواسینی لەلایەن سەرۆکی دادگاوە خوێنرایەوە، دکتۆر فوئاد هیچ خۆی نەشڵەژاند و بۆ ماوەی سێ ڕۆژ لەژێر دارکاری و سزاداندا هێشتیانەوە بۆئەوەی بیشکێنن و سەری پێشۆڕبکەن و ناچاربێت لەقسەکانی خۆی پەشیمانبێتەوە و داوای لێبوردن و لێخۆشبوون بکات، بەڵام هەروەکو عەزیز ئەفەندی بەڕێوەبەری زیندانەکەی کە خەڵکی بدلیس بوو باسیکردبوو، دکتۆر فوئاد بەهیچ جۆرێك

پەشیمان نەبووەوە و سەری دانەنەواند و ساتێك برایە بەرسێدارە لەبەردەمی قەنارەکەیدا شیعرێکی خوێندەوە کە هەمووی نیشانەی قارەمانێتی و کۆڵنەدانی بوو.

دەربارەی ئەو شیعرەی زنار سلوپی (قەدری جەمیل بەگی دیاربەکری) باسیکردوە، دکتۆر جەمال نەبەز لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٩٤ وتویەتی دکتۆر فوئاد ئەو شیعرەی بەتورکی وتووە:

کیمدر بزی منع ئیلەجك باخی جناندن     میراثی پدر درگیر ز خانە بزمدر

(واتە: کێ بێ بتوانێت ڕێی ئەم باخی بەهەشتە لەئێمە بگرێت کە میراتی باوکمانە و بۆمان بەجێماوە.. ماڵ ماڵی خۆمانە و دەچینە ناوی).

پیرەمێردی شاعیری مەزنی کوردیش دەربارەی ئەو شیعرەی دکتۆر فوئاد لەڕۆژنامەکەیدا کە لەسلێمانی دەریدەکرد لەژمارەی ڕۆژی ١٩٤٨/٧/٢٤دا لەو شیعرەیدا کە بۆ شەهیدانی شۆڕشی پیرانی وتوە، لەدێڕێکدا دەربارەی دکتۆر فوئاد وتویەتی:

دکتۆر فوئادیش وتی: وا ئەمرم     میراتی باوکمە من وەریدەگرم

دەربارەی دادگاکردنی دکتۆر فوئاد، پرۆفیسۆر حەسرەتیان لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٤٥ ئاماژەی بۆ ڕۆژنامەی (istanbul-استمبول)ی ڕۆژی ١٩٢٥/٤/١٩ کردوە کە لەو ڕۆژنامەیەدا وتراوە: دکتۆر فوئاد ئەندامێکی چالاکی ڕێکخراوی (ئازادی) بوو، لەکاتی دادگاکردنیدا ئەو نامانەی کاتی خۆی ناردبووی بۆ (فەرید پاشا)ی وەزیری حەربیەی سوڵتانی عوسمانی بووە خوێنرایەوە، لەو نامانەی دکتۆر فوئادا بەئاشکرا لایەنگرێتی خۆی دەربڕیبوو بۆ بزوتنەوەی کورد و داخوازیەکانی (کە ئەمە لەگەڵ ئەو بۆچونەی زنار سلوپیدا یەکناگرێتەوە کە وتویەتی دادگای تورك بەڵگەیەکی وای دژی دکتۆر فوئاد بەدەستەوە نەبووە، کە لەڕاستیدا تورك ئەو کۆنە بەڵگەیەیان کردبوو بەبیانوو).

حەسرەتیان لەهەمان سەرچاوەدا وتویەتی: لەنیسانی ١٩٢٥دا دادگای ئیستقلال بڕیاری خنکاندنی دکتۆر فوئادی دەرکرد بەتاوانی ئەوەی چالاکی نواندبوو لەتێکۆشانی کورددا بۆ سەربەخۆیی کوردستان و لەکاتی دادگاکردنیدا سەرۆکی دادگاکە (مظهر مفید) بووە، ڕوویکردۆتە دکتۆر فوئاد و پێیوتوە: (تۆ بەوە تاوانباریت کە بەشداریت کردوە لەڕاپەڕینێکی خوێناویدا لەبەرئەوە پێویستە لەسەرت بەوپەڕی جوامێریەوە قبوڵی سەرەنجامی کارەکەت بکەیت).

دکتۆر فوئادیش بەتوڕەییەوە وەڵامی سەرۆکی دادگا دەداتەوە و پێی دەڵێت: (بەڵێ من هەمیشە ئاواتەخوازی ئەوەبووم گیانم لەپێناوی نیشتمانەکەمدا بەختبکەم و هیچ گومانیشم لەوەدا نیە ئاڵای سەربەخۆیی کورد لەم شوێنەدا بەرزدەکرێتەوە کەوا ئێستە بڕیاری هەڵواسینی ئێمەی تیادا دەدرێت).

وێنەی دکتۆر فوئاد

پرۆفیسۆر حەسرەتیان لەشوێنێکی تری کتێبەکەیدا چووەتەوە سەر باسی دادگاکردنەکەی دکتۆر فوئاد کە سەرۆکی دادگا لەکاتی دادگاکردندا لەدکتۆر فوئادی پرسیوە: تۆ لەبەرچی داوای سەربەخۆیی کوردستان ئەکەیت لەکاتێکدا تۆ لەتورکیادا خوێندنت تەواوکردوە و بەزمانی تورکی قسەدەکەی؟ لەوەڵامی ئەو پرسیارەدا دکتۆر فوئاد ئەڵێت: چونکە کوردم و دەمەوێ وڵاتەکەم بەسەربەخۆیی و سەربەستی ببینم.. هەتا نوکی سونگی و شیری تورک ئاڕاستەی سنگی کورد بکرێت ئەوا کێشەی کورد و خەباتی کورد زۆرتر پەرەدەسێنێت و ئەو ڕێگایەی ئێوەش گرتوتانەتەبەر ئەو کێشەیەی پێ چارەسەر ناکرێت. بەرامبەر بەم وەڵامەی دکتۆر فوئاد دوبارە سەرۆکی دادگا ڕوودەکاتە دکتۆر فوئاد و پێی دەڵێت:

بەرلەوەی بگەیت بەئامانجی ئەو مەبەستە سیاسیەت کە گیانی خۆتت بۆ تەرخانکردوە پێویستە پەتی قەنارە لەملت بئالێنرێت.

حەسرەتیان لەباسەکەیدا دەڵێت: بەوجۆرە داننانی دادگاکەی تورك بەو ڕاستیەدا کە شۆڕشەکەی کورد لەسەر بناغەیەکی نەتەوایەتی کورد پێکهاتبوو، بەرزکردنەوەی دروشمە ئاینیەکانیش لەشۆڕشەکەدا هەر بەمەبەستی ڕزگارکردنی میللەتی کورد بووە. بێگومان مەبەستی حەسرەتیان ئەوەیە بەرپەرچی ئەو درۆودەلەسانە بداتەوە کە پڕوپاگەندەیان دژی شۆڕشەکەی پیران و شۆڕشگێڕان دەکرد و بلاَویاندەکردەوە کە بریتی بووە لەیاخیبوونێکی کۆنەپەرستانە.

دکتۆر عەزیز شەمزینی لەلاپەڕە (٨٥)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٨٥ لەباسی چۆنیەتی لەسێدارەدانی دکتۆر فوئادا وتویەتی: ساتێك دکتۆر فوئاد برایەبەر پەتی قەنارە هاواریکرد ((خوێنرێژەکان هەرگیز وا تێمەگەن کە بەسەرەنێزەی تورك دەتوانرێت میللەتی کورد لەناوببرێت، بەڵکو بەپێچەوانەوە بەرقێکی ئەستورترەوە تێدەکۆشێت و ئازادی و سەربەخۆیی خۆی وەدەستدێنێت و ئێوەی خوێنرێژیش لەمێژوودا تەنها لاپەڕەی ڕەشتان بۆ دەمێنێتەوە)).

### د-دادگاکردنی محەمەد ئەفەندی (باڤی تۆژو) کە بەحاجی ئاختی بەناوبانگ بووە

زنار سلوپی لەلاپەڕە (٥٧)ی کتێبەکەیدا دەربارەی چۆنیەتی دادگاکردنی حاجی ئاختی وتویەتی: ساتێك ئەو مەردە ئازایە لەدوای شکانی شۆڕشەکەی پیران گیرا و درا بەدادگا بەوپەڕی ئازایەتیەوە لەبەردەمی دادگاکەدا بەهیچ جۆرێك قایل نەبوو بەزمانی کوردی نەبێت بەهیچ زمانێکی تر وەڵامی پرسیارەکانی سەرۆکی دادگا بداتەوە، لەبەرئەوە چارنەبوو وەرگێڕێکیان بۆ هێنا بۆئەوەی پرسیارەکانی سەرۆکی دادگا بکات بەکوردی و وەڵامەکانی ئەویش لەکوردیەوە بکات بەتورکی.

حاجی ئاختی لەگەڵ ئەوەشدا بەر لەدادگاکردنەکەی لەزینداندا دارکاریەکی زۆریان کردبوو، هەموو لەشیان تێکشکاندبوو، بەڵام لەبەردەمی سەرۆکی دادگادا کە چەند سەربازێکی تورك بەخۆیان ڕمەکانیانەوە دەورەیاندابوو، ئەو هیچ نەشڵەژا و خۆی تێکنەدا و خۆی ئاسایی لەبەردەمی سێدارەکەیدا شێرانە هاواریکرد: بژی کوردستان.

## ٥-دادگاکردنی حسێن خەیری کە لەهەندێ سەرچاوەدا بەحەسەن خەیریش ناویهاتوە

بەرلەوەی بچینە سەر باسی چۆنیەتی دادگاکردنەکەی دەگەڕێینەوە سەر هەڵوێستی (حسێن خەیری) بەرلەوەی بدرێت بەدادگا. حسێن خەیری یەکێك بووە لەو کوردانەی کاتی خۆی مستەفا کەمال بەوە هەڵیخەڵەتاندبوو لەدوای ڕزگارکردنی وڵات لەداگیرکەران ئەوسا کوردیش مافی خۆی دەدرێتێ بۆیە بووبوو بەئەندامی ئەنجومەنی میللی تورکیا کە مستەفا کەمال و تاقمەکەی پێکیانهێنابوو، لەباسی پەیمانی لۆزانیشدا باسی ئەوەکرا کە حسێن خەیری یەکێك بووە لەو کوردانەی لەئەنجومەنەکەی مستەفا کەمالدا لەگەڵ حسێن عەونیدا تەلگرافیان ناردبوو بۆ لۆزان بەناوی نوێنەرانی کوردەوە لەئەنجومەنەکەدا کەوا کورد و تورك بران و نایانەوێ لەیەکتر جیاببنەوە، کە شۆڕشیش دەستییێکرد و شۆڕشگێڕانی شۆڕشی پیران بۆ دەستگیربوونی مافی کورد ناچاربوون دەستیاندایە چەك، هەروەکو پرۆفیسۆر حەسرەتیان باسیکردوە حسین خەیری نامەیەکی ناردبوو بۆ دەرسیمی (کە مەبەست شۆڕشگێڕ و نوسەری کورد نوری دەرسیمیە) لەڕێگەی ئەوەوە داوایکردبوو بێدەنگ و بەئارام بن، کەچی کە شۆڕش تەواوبوو تورکەکان ئەمانەیان هیچی بۆ حساب نەکرد و بەفەرمانێکی مستەفا کەمال خۆی و جەلال محەمەدی برازای گیران و دران بەدادگا و لەکاتی دادگاکردنیدا شتێك لەوانەی پێی تاوانبارکرابوو ئەوە بووە کە سەرۆکی دادگا ڕوویتێکردبوو پێیوتبوو: تۆ لەکاتی دادگاکردنەکانی دادگای ئەنقەرەدا بەجلی کوردیەوە دەچوویتە ژوورەوە بەمە پروپاگەندەت بۆ کورد دەکرد.

پرۆفیسۆر حەسرەتیان دەربارەی ئەو جلی کوردیە لەبەرکردنەی حسین خەیری ئاماژەی بۆ لاپەڕە (١٨٦)ی کتێبەکەی دەرسیمی کردوە (Kurdistan Tarihinde Dersim) وتویەتی: سەیر ئەوەبووە ئەو چوونەی بەجلی کوردیەوە لەسەر داخوازی مستەفا کەمال خۆی بووە. لەڕاستیدا تورکەکان بۆ بیانوو گەڕاون و هیچی تریان دەستگیرنەبووە پێی تاوانباربکەن لەو شتە پڕ لەپێکەنینە بەولاوە.

حەسرەتیان دەڵێت: حسین خەیری بەر لەدادگاکردن و لەسێدارەدانی هەموو شتێکی بۆ ڕوونبووبوەوە و لەسیاسەتی دوژمانەی کەمالیەکان گەیشتبوو لەبەرئەوە زۆر ڕێزی لەو کەسانە دەگرت کە خۆیان بەختدەکرد لەپێناوی

میللەتەکەیاندا. ئەو حسین خەیریە هەر لەو فرۆفێڵەی لەلۆزانەوە لەکورد کرابوو، بۆی دەرکەوتبوو کە چ هەڵەیەکی تاوانبارانەی زۆر زل کردبوو، بۆیە وەسیەتی کردبوو لەدوای مردن هەرکەس بەلای گۆڕەکەیدا بڕوات تفێکی لێبکات.. بەلاّم لەپاش چی؟! کورد وتەنی: لەپاش باران کەپنەك؟!

هەروەکو نوری دەرسیمی لەکتێبەکەیدا بەرگی پێنجەم باسیکردوە، ساتێك بڕیاری دادگا دەردەچێت بەلەسێدارەدانی بانگئەکات و ئەڵێت: (ئەی ئەو کەسانەی بەدەستی تاوانباری دوژمن کوژراون، ئەوا یەکێکی تریش هاتە ڕیزتان کە حسین خەیریە). پرۆفیسۆر حەسرەتیان لەباسی دادگاکردنی ئەو ڕۆژەدا ئاماژەی بۆ ڕۆژنامەی (istanbul)ی ڕۆژی ١٩٢٥/٩/٢٨ کردوە، کە باسی دادگاکردنی (بوغوس)ی ئاسنگەری ئەرمەنی کردوە کە لەدانیشتوانی (چمشکزك) بووە بەتاوانی ئەوەی لەڕاپەڕینەکەی کورددا جاسوسی بۆ شۆڕشگێڕەکان کردبوو لەخەرپوت.

وێنەی لەسێدارەدانی هەندێ شۆڕشگێڕان

( ڕیزە سێدارەی شەهیدانی پیران )

## و-دادگاکردنی قاسم بەگ
## (کە زۆربەی سەرچاوەکان بەخائینیان ناوبردوە)

بەپێی سەرچاوە/١٠٩ قاسم بەگ وەختی خۆی لەسوپای تورکدا (رائد) بووە و خزمی شێخ سەعیدیش بووە و لەشۆڕشەکەدا لەشێخ سەعید و شۆڕشگێڕانی ترەوە زۆر نزیك بووە و یارمەتیدەری شێخ سەعید بووە (لەچۆنیەتی گرتنی شێخ سەعیدا باسی ئەوە کرا چۆن خیانەتی لەشۆڕش و لەشێخ سەعیدیش کردبوو بەوەی زانیاریەکی زۆری دابوو بەتورکەکان کە بووبوو بەهۆی گرتنی شێخ سەعید و هاوڕێکانی لەسەر پردی مرادچای).

بەپێی سەرچاوە/١٠٩ لەکاتی دادگاکردنی قاسم بەگدا (عونی دوغان)ی جێگری داواکاری گشتی لەدادگای ئیستقلالی دیاربەکردا وتویەتی قاسم بەگ پەیوەندی هەبووە لەژێرەوە بەئەندامانی دادگا و هەروەکو ڕۆژنامەی (وقت) باسیکردوە کە لەژمارەی ڕۆژی ١٩٢٥/٦/٩دا بڵاوکراوەتەوە، قاسم بەگ بەدەمی خۆی لەدادگادا وتویەتی: (شێخ عەبدولقادر و بەدرخانیەکانی ئەستەمبوڵ پڕوپاگەندەیەکی زۆریان کردبوو بۆ هاندانی خەڵك بۆئەوەی بەشداری بکەن لەشۆڕشدا).

نوسەری سەرچاوە/١٠٩ لەسەر باسەکە ڕۆیشتوە و وتویەتی: عیسمەت ئینونۆ بەشفرە ئەندامانی دادگای دیاربەکری ئاگاداردەکرد و هانیئەدان دەبێ کارێکی وابکەن ئەوانەی بانگدەکرێن بۆ دادگاکەیان بۆ شایەتی ناچاریانبکەن لەشایەتیدانەکانیاندا کوردەکانی ئەنقەرە و ئەستەمبوڵیش تێوەبگلێنن و ناویان بهێنرێت و بەوانەیان لەقەڵەم بدەن کە بەشداریان کردبوو لەشۆڕشەکەدا کەوا دیارە قاسم بەگیش یەکێك بووە لەوانەی تورکەکان لەتەقەلاکانیاندا لەگەڵیدا سەرکەوتبوون بۆ بەجێهێنانی داخوازیەکەی عیسمەت ئینونۆ.

هەمان سەرچاوە/١٠٩ ئاماژەی بۆ کتێبی نوسەرێکی تر کردوە (بایراك) کە لەباسی قاسم بەگدا وتویەتی: ساتێك سەرۆکی دادگا لەقاسم بەگی پرسی: وادیارە سێ شت هانی شێخ سەعیدیان دابوو کە ئەو یاخیبوونە بکات کە بریتی بوون لەدین، ڕۆژنامەکان، ئۆپۆزسیۆن. لەوەڵامی ئەو پرسیارەدا قاسم بەگ

دەڵێت: بەڵێ ئەوانە هەمووی ڕاستە و هەمووشیان بۆ سەربەخۆیی کورد بووە کە کۆمەڵی ئازادی ڕۆڵێکی زۆر گەورەی بینیوە لەمەدا.
بێگومان تورکەکان هەر بەپڕوپاگەندەی ڕۆژنامەکان خۆیان دژی شۆڕش و شۆڕشگێڕانی پیران وازیان نەهێناوە، بەڵکو لەهەرشوێنێك دەرفەتیان هەبووبێت بۆ پینەکردنی تاوانەکانی خۆیان هەوڵیانداوە ناوی شۆڕشەکە و شۆڕشگێڕان لەکەداربکەن و ناویان بزڕێنن، بۆ نمونە لەڕۆژنامەی (لغازیتیە)ی فەرەنسی کە ڕۆژی ١٩/٤/١٩٢٥ دەرچوە وتراوە ئەو بەڵگە و دوکیومێنتانەی لەقاسم بەگدا گیرا کە یەکێك بووە لەسەرکردەکانی شۆڕش دەریخستوە ئینگلیزەکان پەیوەندیەکی بەهێزیان هەبووە لەگەڵ شۆڕشگێڕەکاندا و بەڵگەی تری واش هەیە کە شێخ سەعید خۆشی پەیوەندی بەئینگلیزەکانەوە هەبووە (لەباسێکی تایبەتیدا لەدواییدا کە بۆ هەڵوێستی دەوڵەتانم تەرخانکردوە بەدووروودرێژی ئەم درۆودەلەسانە ڕووندەبێتەوە و ئاشکرا دەبێت کە بەپێچەوانەوە ئینگلیز زۆر مەبەستی بووە کە شۆڕشەکەی کورد سەرنەکەوێت).
بلەچ شێرکۆ لەلاپەڕە (٩٧)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٦٠ دەربارەی قاسم بەگ باسێکی دووروودرێژی بڵاوکردۆتەوە کە هەندێ شتی گرنگی دەربارەی قاسم بەگ ڕوونکردۆتەوە کە بلەچ شێرکۆ وتویەتی: ئەگەر بەوردی سەیری فایل و تۆمارگەی دادگاکردنەکانی ئیستقلال بکرێت لەساڵی ١٩٢٥دا ڕووندەبێتەوە شۆڕشی پیران لەئەنجامی جەور و ستەمێکی ئێجگار زۆری تورك بەرامبەر بەکورد هەڵگیرسابوو، هیچ بێگانەیەکیش دەستی نەبووە لەو شۆڕشەدا کە نمونەی ئەمە بۆ بەڵگە لەڕۆژنامەی (وقت)ی تورکی ڕۆژی ٩ی یۆنیۆی ساڵی ١٩٢٥دا دەردەکەوێ کە لەژێر ناوی مەحزەری دادگاکردنی شێخ سەعید و هاوڕێکانیدا بڵاوکراوەتەوە کەوا قاسم بەگی بگباشی لەبەردەمی دادگادا وتویەتی: من بەشدارنەبووم لەچالاکیەکانی کۆمەڵە (مەبەستی کۆمەڵی ئازادیە) لەبەرئەوە شارەزای نهێنیەکانی ئەو کۆمەڵە نیم، بەڵام ئەوەی بەدەم لەدەرەوە دەوترا و دەمبیستەوە ئەوەیە ساڵی پار (دیارە مەبەستی ساڵی ١٩٢٤ بووە) لەئەرزڕوم سێ ئەفسەر هەبوون کە بریتی بوون لە (توفیق السلیمانی) و ساڵح و ئیسماعیل حەقی (بێگومان مەبەستی ئیسماعیل حەقی شاوەیس بووە) کە ئەمەی دوایی ساڵی پار مۆڵەتی وەرگرت و هاتە دیاربەکر و لەوێوە چووە ئەرزڕوم و پاشماوەیەك چووە حەلەب و لەوێوە نامەیەکی ناردبوو بۆ کۆمەڵی ئازادی (دەربارەی ئەوەی قاسم

بەگ لێرەدا باسی ئیسماعیل شاوەیسی کردوە، بەرلەمە لەباسی چۆنیەتی پێکهاتنی کۆمەڵی ئازادیدا باسی ئەوە کراوە کە قەدری جەمیل بەگ لەکتێبەکەیدا وتویەتی ئەرکی کردنەوەی چەند لقێکی ئازادی لەشارەکاندا سپێردرا بەئیسماعیل شاوەیس).

جەلادەت بەدرخان (بلەچ شێرکۆ) لەباسەکەیدا لەسەرینەڕوا و دەڵێت: قاسم بەگ لەبەردەمی دادگادا وتویەتی: لەبەدلیسدا گەلێك کۆمەڵ و ڕێکخراو هەبوو کە بەهۆی (یوسف ضیاء بەگ)ەوە پێکهاتبوو کە مەبەستی هەمووشیان بریتی بوو لەسەربەخۆیی و هەندێکیان لەڕێبازی ئاینەوە بۆی دەچوون و هەندێکیشیان نەخشەیەکی سیاسی تایبەتیان هەبوو بەلآم هی هەموویان هەریەك شتی دەگرتەوە.

جەلادەت بەدرخان ئاماژەی بۆ باسێکی تر کردوە کە لەڕۆژنامەی (میلیت)دا بلأوکراوەتەوە لەژێر ناوی (اعترافاتی بگباشی قاسم) کە قاسم بەگ باسی چۆنیەتی پێکهاتنی (جمعیتی تعالی کورد)ی کردبوو لەلایەن شێخ عەبدولقادر و بەدرخانیەکانەوە لەئەستەمبوڵ و لەهەندێ شوێنی تریشدا لقی ئەو جەمعیەتە هەبوو، ئەو تاقمە لەدوای شەڕی جیهانی لاوازی حکومەت و میللەتی تورکیان بەهەل زانی و کەوتنە چالاکی و جموجوڵ بەهیوای گەیشتن بەسەربەخۆیی کوردستان. ساتێك لەدواییدا ئەنجومەنی بالأی میللی لەئەنقەرە کرایەوە، من (قاسم بەگ) تەلگرافی پیرۆزباییم بۆ ئەنجومەنەکە نارد و بەرامبەر بەمە تاقمی (جمعیتی تعالی کورد) لێم تورەبوون و پێیانوتم: تۆ چۆن کوردێکی وا پیرۆزبایی لەتورك دەکەیت؟!.

بلەچ شێرکۆ لەلاپەڕە (٩٩)ی کتێبەکەیدا ئاماژەی بۆ باسێکی تر کردوە کە لەڕۆژنامەی (وقت)ی ڕۆژی ١٨ی یۆنیۆی ١٩٢٥دا بلأوکرابووەوە لەژێر ناوی (جێگری گشتی دادگا) داوای سزادانی (٥٣) کەسی تاوانبار دەکات، لەوانەی بەشداریان کردوە لەو ڕووداوانەی لەویلایەتەکانی ڕۆژهەلأتدا قەوماون کە بەشێکن لەخاکی نیشتمانی هەمیشەیی تورك کە ماکی ئەو بزوتنەوەیە بریتیە لەو هەست و بیرە ناپاك و پیسەی لەناو هەندێکدا لەمێشکیاندا جێگیربووە وەکو ئەو هەستە پیس و ناپاکەی بەرلەمەش لە(بۆسنە و هەرسك) ڕوویدابوو کە بەهۆی دەوڵەتە بێگانەکانەوە لەسێ لاوە ئەو شوێنانە ئابلۆقەدرابوون و ئەوەی ئیمڕۆی کوردیش بریتیە لەهەمان هەستی ناپاك کە کوردی هانداوە دژی تورك و ئەوانەی

بەو کارە هەستابوون بریتی بوون لەو خائینانەی لەناوەوە و لەدەرەوەی ولات دەستیانپێکردبوو بەیارمەتیدانی بێگانە.

جەلادەت لەلاپەڕە (١٠٠)ی کتێبەکەیدا باسی دوا وتاری سەرۆکی دادگای کردوە بۆ ئەوانەی لەبەردەمیدا بوون و پێیوتبون: (هەندێکتان بەنیازێکی ناپاک خەڵکتان هاندابوو بۆ سەرگرتنی نەخشەی بێگانە و هەمووشتان لەسەرئەوە یەکتاندەگرتەوە کە بریتی بوو لەهەوڵدان بۆ پێکهێنانی کوردستانێکی سەربەخۆ ئەوا ئێستە لەتۆڵەی ئەو هەموو خوێنەی ئێوە بوون بەهۆی ڕشتنی و بەرامبەر بەو وێرانکاریەی بەهۆی کردەوە و ڕەفتارەکانی ئێوەوە پەیدابووە و بۆئەوەی عەدالەت لەناو ولاتدا ڕێگەی ڕاستی خۆی بگرێتەبەر، پێویستە هەمووتان سزابدرێن و هەڵواسرێن).

ئەوەی لەم باسی دادگاکردنەدا لەسەرچاوەکانەوە وەرمانگرتوە بریتیە لەکورتە باسێکی ئەو کارەساتە خوێناویەی بەسەر باکوری کوردستاندا هاتوە و بەرامبەر بەم هەموو تاوانانەی لەوساوە هەتا ئیمڕۆش دەکرێت هێشتا گوێچکەی کارگوزارانی دەوڵەتە زلهێزەکان بەرامبەر بەکارەساتەکانی کوردستان کەڕە و خۆشمان هەتا بڵێی کەمتەرخەمین و بەداخەوە هەتا ئێستە لەسنورێکی زۆر تەسک بەولاوە نەمانتوانیوە ڕاستی ڕووداوەکان بکەین بەزمانی بێگانە و بتوانین ئەو تەمومژەی پڕوپاگەندەی تۆرانیەکان ساڵەهای ساڵە ئاسمانی کوردستانیان پێداپۆشیوە بیڕەوێنینەوە و بەتیشکی ڕاستی تاوانی دوژمنانی تاوانبار لەمیللەتان بگەیەنین.

## دوهەم-پاشماوەی باسی حەوتەمی بەشی دەهەم

### سزادان و ڕاگویزان و ئاوارەکردن

لـەدوای دامرکاندنـەوەی شۆڕشـی پـیران و سـزادان و لەسـێدارەدانی سـەدان شۆڕشـگێڕ و ڕۆشـنبیری کـورد بەوانەشـەوە کـە بوویـوون بەلایـەنگری خۆیـان و خیانەتیان لەنەتەوەکەی خۆیانکردبوو، ئیتر وەنەبێ بەو لەسـێدارەدان و گرتنانـەی کـورد وازیـان هێنابێـت بـەڵکو دەسـتیانکرد بەبـەجێهێنانی ئـەو نەخشـەیەی بـۆ لەناوبردنی کورد و توانەوەی کورد لەبۆتەی تورکدا ئامادەیان کردبوو.

گەلێك سەرچاوە باسی دڕندەیەتی تورکیان کردوە و ئاماژەیان بۆ ئەو بەڵگە و دوکیومێنتانە کردوە کە باسی چۆنیەتی ڕەفتاری تورکیـان کردوە بەرامبـەر کورد کە زۆر لەخراپەی نازیەکان چووە و هیـوادارم ڕۆژێك بێـت کـە کـورد بتوانێـت ئـەو دڕندەیەتیەی تورك بکـات بەئینسـکلۆپیدیایەك بۆنـەوەی نـەوەی ئیمـڕۆ و دواڕۆژی کورد بتوانێت بیکـات بـەئامێرێك بـۆ ڕیسـواکردنی ئـەو ڕژێمـەی ئیمڕۆشـی هیچـی لەجاران کەمتر نیە لەڕەفتاریدا بەرامبەر بەمیللەتی کورد.

هەوڵئەدەین ئەم باسە بکەین بەدوو بەشەوە:

یەکەم: دڕندەیەتی تورك بەرامبەر بەکورد و ئەو کوشتارانەی لەکوردیان کردوە.

دووەم: ئـاوارەکردن و ڕاگـوێزانی بەکۆمـەڵی کـورد بـەنیازی تواندنـەوەی لەبۆتـەی تورکدا.

## یەکەم: دڕندەیەتی تورک بەرامبەر بەکورد

لەم بەشەدا هەوڵئەدەین کورتەیەکی ئەو سەرچاوانە باسبکەین کە لەو بابەتە دواون بەپێی ئەو بەڵگانەی لەو سەرچاوانەدا ئاماژەیان بۆ کراوە.

قەدری جەمیل بەگ لەلاپەڕە (١١٣)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٥٧ باسی ئەو هێزی تورکەی کردوە کە بەشەمەندەفەر لە(ئەدرنە)وە نێرابوون بۆ ناوچەکە کە فەرەنسیەکان یارمەتی تورکیان دابوو، ڕێگەیان پێدابوون بەناوچەکانی ژێر دەسەڵاتیاندا تورکەکان بەئارەزوی خۆیان هێزەکانیان بگوێزنەوە و بەشەمەندەفەر هێز و چەکەکانیان گواستبوەوە بۆ پشتی شۆڕشگێران و لەپشتەوە لەشۆڕشگێڕانیان دابوو، ئەو هێزە ساتێك کەیشتبووە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی شۆڕش پەلاماری دانیشتوانی بێچەکیان دابوو لەگوندەکانی (سردی، جومیلان، ئەمهنر، (دیرکان) لەقەزای (ئەلیجی) و لەو گوندانەدا بێجگە لەتاڵانکردن (١٥٠) کەسی بێچەکی بێتاوانیان گرتبوو، بەستبوویاننەوە بەیەکەوە و هەموویان گوللەباران کردبوو، لەگوندی (سێلمو) کە لەعەشیرەتی (بکرا) بوون حەفتا کەسی بێتاوانیان گرت و خستیاننە ناو کایەنێکی پڕ لەپووش و کا و ئاگریان تێبەردا و هەموویان لەو کایەنەدا سوتێنران.

لەدوایئەوەی (قاسم ئاغا)ی سەرۆکی عەشیرەتی (سیوان) بەبریندراری بەدیل گیرا لەلایەن ئەو هێزەی تورك کە (عەلی حەیدەر) سەرکردەی بوو لەناوچەی (مزیبانی) لەدۆڵی (خازێ) کە لەباکوری ناوچەی (خانی)دا بوو، عەلی حەیدەر بەدەستی خۆی پشکۆی ئاگر و شتی سوورەوەکراوی دەنا بەسنگی قاسم ئاغا و بەوەش وازی لێنەدەهێنا بەڵکو گاڵتەی پێدەکرد و پێیدەوت: ها.. ها قاسۆ ئەوە چیت بەسەرداهات؟! بەڵام قاسم ئاغای ئازا و نەبەردیش بەو هەموو ئازارەیەوە وەڵامی ئەدایەوە و پێیدەوت: بەڵێ ئەمە ئەوەیە کە بەسەر هەموو مرۆڤێکی ڕاستدا دێت، چیشت لەدەستدێ لەمندا تاقیبکەرەوە. ئەم وەڵامەی قاسم ئاغا ئەوەندەی تر عەلی حەیدەری هارتر دەکرد و پیاوەکانی ڕادەسپارد بەردبارانی بکەن هەتا لەئەنجامدا لەژێر سزاداندا شەهیدبوو.

قەدری جەمیل بەگ (زنار سلوپی) لەلاپەڕە (١١٥)ی کتێبەکەیدا نمونەیەکی تری لەدڕندەیەتی تورك باسکردوە کە چۆن تاهیر بەگی ئامری ئەو فەوجەی ناوی لێنرابوو فەوجی تەمێکردن، موختاری گوندی (تورن) لەناحیەی (ملکان)ی گرت

کە ناوی (جاجان) بوو، خۆی و کوڕەکەی هەردووکیان مەنجەڵە ئاوی گەرمی لەکوڵی دەکرد بەلەشیاندا.

مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد لەلاپەڕە (١٤)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٩٢ ئاماژەی بۆ کتێبی (ئەتاتورك) کردوە کە وەرگێڕاوە بۆ عەرەبی، لەلاپەڕە (١٤٤)ی ئەم کتێبەدا وتراوە: (ئەریٚ وەڵلاٚ.. وا کوردەکان شکێنران و لەناوبران، فڕۆکەکانمان لەئاسمانەوە بۆمبای وێرانکاری بەسەر کوردەکاندا فڕێدەدەنە خوارەوە، لولەی تۆپەکان ئاگربارانیان دەکەن، گوللەی تفەنگ و نوکی شیر و سونگیەکانیش ئاڕاستەی گیان و کەللەسەر و سنگیان کرا).

پرۆفیسۆر حەسرەتیان لەلاپەڕە (٩٨)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٤٩ ئاماژەی بۆ کتێبەکەی (ئەرمسترونگ) کردوە کە باسی دڕندەیەتی و ڕەفتاری تورکی کردوە بەرامبەر کورد بەم شێوەیەی خوارەوە: (تورکەکان بەئاگر و ئاسن کوردستانیان کاولکرد و سزای خەڵکیان ئەدا و دەیانکوشتن و دێهاتەکانیان دەسوتاندن و باخ‌وباخات و کێڵگەکانیان تێکدەدا و وێرانیان دەکرد، ژن و منداڵیان قەلاچۆدەکرد و قەسابخانەیەکیان بۆ لەناوبردنی کورد دانابوو، کە بەڕاستی دەریانخست تورکەکانی ئیمڕۆش هیچیان کەمتر نیە لەباوباپیرانیان کە لەزەمانی سوڵتانەکانیاندا چی‌یان بەیۆنانیەکان و ئەرمەن و بولغارەکانیان دەکرد و چۆن سەریاندەبڕین).

حەسرەتیان لەباسەکەیدا ئاماژەی بۆ ئەو نامانە کردوە کە لەلایەن کۆمەڵی ئاسوریەکانەوە لەمانگی ئابی ١٩٢٥دا ناردبوویان بۆ کۆمەڵی گەلان (عصبة الامم) دەربارەی دڕندەیەتی و خوێنڕێژی تورك کە لەنامەی ڕۆژی ١٩٢٥/٨/٦یاندا وتراوە: (کوردەکان و ئاسوریەکان ڕێگەی ئەوەیان لێگیراوە بتوانن لەگوندەکانی خۆیان بچنە دەرەوە، هەرچی موڵك و مەڕومالاٚت و سامانیان هەیە هەمووی لەلایەن تورکەکانەوە تالاٚنکراوە، دەستدرێژی کراوەتەسەر ژنەکانیان و وادیارە کۆمەڵی گەلان و دەوڵەتە گەورەکان گوێنادەنە مافی نەتەوەکانی تر لەتورکیادا بۆیە ئەو کارەساتانە هەمووی فەرامۆشکراوە).

لەنامەیەکی تردا لەڕۆژی ١٩٢٥/٨/١٠دا نوسراوە کۆمەڵی ئاسوری بێزاری و نارەزایی خۆی دەردەبڕێت بەرامبەر بێدەنگبوونی کۆمەڵی گەلان و دەوڵەتە گەورەکان دەربارەی تاوانەکانی تورك لەکوردستاندا کە بێ‌وچان خەریکی تالاٚنکردنی مەڕومالاٚتیانن و گوندەکانیان کاولدەکەن و ئەوی لەمردنیش ڕزگاری

بووبێت و هیچی بۆ نەمابێتەوە لەگوندەکەی خۆی دەریدەکەن و پەرەوازەی دەکەن و ئاوارەکردنی دانیشتوانی دەرسیم و جزیرە و شارەکانی تر بەرەو (کیلیکیا) و (سامسون) و (سینوب) و جیاکردنەوەی ژن و پیاوی خێزانێك لەیەکتری و لەکاتی ئاوارەکردنیشیاندا دەدرێنە بەرگوللە و ژن و منداڵە بێکەسەکانیان لەبازاڕەکانی ئەنادۆڵدا دەفرۆشرێن کە ئەمە نەخشەیەکە تورکەکان لەمێژە ئامادەیانکردوە و ئەمە ماوەی شەش مانگە دادگاکانی ئیستقلال یەك لەدوای یەك بڕیاری هەڵواسینی کورد دەدات کە لەنێوان ساڵانی (١٩٢٥-١٩٢٦)دا نزیکەی (٢٠٦) گوندیان وێرانکردوە و (٨٧٥٨) خانوو سوتێنراوە و پتر لە (١٥٠٠٠) ژن و منداڵ و پیری بێتاوان کوژراون جگە لەو هەزارانەی لەژێر کرێوە و باران و سەرماوسۆڵەی کاتی گواستنەوەیاندا لەڕێگاکاندا ڕەقدەبنەوە و دەمرن. سەرچاوەی حەسرەتیان بۆ ئەمە بریتیە لە (L.Rambout Les Kurdsetl droit) لاپەرە ٢٨.

حەسرەتیان لەباسەکەیدا ئاماژەی بۆ ئینسکلۆپیدیایەکی تورکی کردوە کە لەو ئینسکلۆپیدیایەدا بەوپەڕی بێشەرمیەوە وتراوە: (هەندێ لەسیاسیە خائینەکان کە کرێگرتەی بێگانەن، ئەوانەی ئاگری قینی ڕەگەزپەرستی و نەتەوایەتیان هەڵگیرساند، ئەوانە لەوجۆرە کەسەن کە دوورن لەبارودۆخی فێربوونی ژیانی شارستانیەتی، وایان لێهاتوە کوێرانە پەلاماری شارەکان بدەن و تالآنیبکەن).

حەسرەتیان دەربارەی ئەو بۆچونەی ئەم ئینسکلۆپیدیایە دەڵێ: ئەوەی لەم ئینسکلۆپیدیا تورکیەدا نوسراوە بەتەواوەتی شتێکە زۆر دوورە لەڕاستی و با بۆ ئەم ڕاستیە سەیری ئەو هەواڵەی لەلایەن (حاشد حقی) پەیامنێری ڕۆژنامەی (وقت) کە بەنامەیەك ناردویەتی بۆ ڕۆژنامەکەی و تیایدا وتویەتی هۆی ڕوودانی ئەم شۆڕشەی دوایی (مەبەست شۆڕشەکەی پیرانە) هیچ جیاوازیەکی نیە لەگەڵ ئەو هۆیانەی بووبوونە ڕووداوەکانی پێشوو کە لەبۆسنە و هەرسکدا ڕوویدابوو لەگەڵ ئەو هۆیانەی بووبوونە هۆی شۆڕشەکانی سوریا و فەلەستین دژی تورك (لەڕاستیدا حەسرەتیان دەبوایە بیوتایە ئەوەی لەو ئینسکلۆپیدیا تورکیەدا تۆمارکراوە پڕ بەپڕ تورکەکان خۆیان دەگرێتەوە کە هەستی ڕەگەزپەرستی کوێرانە وای لەتورکەکان کردبوو وەکو دڕندەیەك لەهەموو ڕێبازێکی شارستانیەتی دووربکەونەوە).

حەسرەتیان لەکتێبەکەیدا ئاماژەی بۆ ڕۆژنامەی (Gazet)ی فەرەنسی ڕۆژی ١٩٢٥/٦/٢٩ کردوە کە نامەی کوردێکی ناسراوی بڵاوکردۆتەوە کە ناوی (احمد علي حاجي صبري) بووە کە لەڕۆژی ١٩٢٩/٦/٢٥دا ناردبووی بۆ ڕۆژنامەکە کە بریتی بووە لەوێنەی ئەو نامەیەی ناردبووی بۆ کۆمەڵی گەلان (عصبة الامم) کە لەو نامەیەدا وتویەتی: (ئەوا دوو مانگ تێپەڕی بەسەر شۆڕشەکەی کورددا بەڵام هێشتا لافاوی خوێن لەوڵاتەکەماندا نەنیشتۆتەوە، میللەتی کورد لەژێر جەور و ستەمی دڕندەکاندا دەناڵێنێت، بۆیە ئیتر کورد لەمە زیاتر ناتوانێت خۆی بگرێت و ناچاردەبێت جارێکی تر دەستبداتەوە چەك بۆئەوەی لەم کارەساتە ڕزگاری ببێت و بتوانێت کاروباری خۆی بباتبەڕێوە.

ئەم شۆڕشە شۆڕشی میللەتێکە کە بەرەگەز لە(ئاری)یەکانە و هیچ پەیوەندیەکی بەڕەگەزی تورکەوە نیە و زمانەکەی لەزمانی ئەوان جیاوازە، بەهیچ جۆرێك واز لەداواکردنی مافی خۆی و لەڕەوشت و عەنعەناتی باوباپیری خۆی لانادات، بەڵام بەداخەوە بێدەنگبوونی دەوڵەتەکانی ئەوروپا لەو تاوانانەی لەکورد دەکرێت ئەوەندەی تر تورك هانئەدات لەسیاسەتی توانەوەی کورد وازنەهێنێت کە دەیەوێ کورد لەبۆتەی خۆیدا بەزۆرەملێ بتوێنێتەوە کە ئەم سیاسەتەی تورك بریتیە لەهەمان ئەو سیاسەتەی تورك بەرامبەر ئەرمەنیەکان بەکاریانهێناوە. ڕاپەڕینەکەی ئێمە بۆ دەستگیربوونی مافی ڕەوای ئاشکرایە و داوا لەکۆمەڵی گەلان و لەمیللەتە پێشکەوتوەکانی جیهان دەکات یارمەتی کورد بدەن کە ئەم یارمەتیدانە نەك تەنها هەرکارێکی مرۆڤانەیە بەڵکو کارێکی سیاسیشە چونکە دابینکردنی ئاسایش لەناوچە کوردیەکاندا بریتیە لەکلیلی دابینکردنی ئارام و ئاسایش لەناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا.

حەسرەتیان دوای بڵاوکردنەوەی ئەو نامەیە دەڵێت: بەڵام کۆمەڵی گەلان بەهیچ جۆرێك گوێی‌نەدایە ئەو نامانەی لەو ڕووەوە بۆی دەنێرا و بەپێچەوانەوە لەمانگی تەموزی ١٩٢٥دا بڕیارێکی دەرکرد بەرامبەر بەو نامانەی کورد کە لەهەموویدا بێزاری کوردی تیادا باسکرابوو، بڕیارەکەی کۆمەڵی گەلان بریتی بوو لەوەی ئەو هەموو نامانە پشتگوێ بخرێت کە تا ئەوکاتە پێی‌گەیشتبوو.

حەسرەتیان لەلاپەڕە (١١٩)ی کتێبەکەیدا وتویەتی: بەرامبەر بەتاوانەکانی تورك کوردەکان لەبەغدا لەڕۆژی ١٩٢٥/٧/٢٦دا لەنزیك پەیکەری مۆد (ئەو پەیکەرەی ئینگلیزەکان لەبەغدا دوای داگیرکردنی بەغدا پاش شەڕی جیهانی

دروستیانکردبوو، لەشۆڕشی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨دا ئەو پەیکەرە شکێنرا و لابرا) خۆپیشاندانێکیان کرد و داوا لەهەموو کورد کرا بێزاری خۆیان دەربڕن بەرامبەر بەتاوانەکانی تورك و داوا لەکۆمەڵی گەلان کرا فریای کورد بکەوێت. سەرچاوەی حەسرەتیان بۆ ئەم خۆپیشاندانەی لای پەیکەری مۆد بریتیە لەو بڵاوکراوەیەی لەرۆژنامـــەی (ژیـــن)ی ڕۆژی ١٩٦١/٥/٢٢دا بڵاوکراوەتـــەوە کـــە حەســـرەتیان لەکتێبەکەی دکتۆر کەمال مەزهەر (الحركة التحررية الوطنية في كردستان العراق) ئەمەی ژینی وەرگرتوە.

بلەچ شێرکۆ لەلاپەڕە (١٠٢)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٦٠ بەدووورودرێژی باسی درندەیەتی توركی كردوە لەكاتی شۆڕشی پیران و لەدوای دامرکانەوەشی کە وتویەتی: (لەدوای لەناوبردنی شۆڕشی پیران و پاش ماوەیەك كە سەرماوسۆڵەی زستان هاتەپێشەوە، بەو کوشتارەی لەشەڕەکەدا کرابوو تورك وازینەهێنا و بەربووە گیانی ئەوانەی هەر بەناو مابوون. لەلاپەڕە (١٠٣)دا باسی درندەیەتی مستەفا بەگی سەرکردەی فیرقەی (٤١)ی سوپای توركی كردوە چۆن هێزەکەی ئابلۆقەی (داراهین)ی دا و دانیشتوانەکانی تۆپبارانکرد و نەیهێشت کەسی بەزیندوویی لێدەرچێت، بەوجۆرە نزیکی (٤٣٠) گوندی ناوچەکەیان وێرانکرد.

بێجگە لەو تاوانە، (حەیدەر بەگی بگباش)یش بەخۆی و هێزی سوارەوە پەلاماری پیاوە ناسراوەکانی شاری (ئەرغنی–معدن)ی دا، بەبیانوی ئەوەی چالاکی نیشتمانی تیادا هەستپێکرابوو، کە بریتی بوون لە: یوسف ئەفەندی، عەبدولڕەحمان ئەفەندی، مستەفا ئەفەندی ئەمانە هەموویان گیران و پێش خۆیانیاندان و ناچاریانکردن بۆ ماوەی مانگێك بەشەو و ڕۆژ بەپێ بڕۆن و خستیاننە بەردەمی سوارەکانی خۆیان و لەڕێگا بەشەق و شەپازلە لەو خەڵکەی پێشخۆدرابوو لێیاننەدان و دارکاری دەکران و خۆراکێکی زۆر کەمیان ئەدانێ و لەڕێگادا زۆریـــان لێئـەكوژرا و ئەوی لەمردن ڕزگاری بوو پەڕەوازەکران و دوورخرانەوە لەوڵاتی خۆیان. بلەچ شێرکۆ لەپاشکۆی کتێبەکەیدا باسی کوژراوەکانی هەندێ ناوچەی کردوە لەگەڵ لیستی ناوی ئەو گوندانەی کاولکرابوون و سوتێنرابوون لەگەڵ ژمارەی خانوی سوتاو و کاولکراو و ژمارەی ئەوانەی لەو ناوچانەدا کوژرابوون کە وەکو خوارەوە بووە:

| ژمارەی خانوی سوتێنراو | ژمارەی کوژراو | ئەو گوند و ناوچانەی تاوانەکانی تورکیان تیاداکراوە |
|---|---|---|
| ١٢٩٤ | ٦٤١٩ | گوندەکانی ناوچەی لیسجە |
| ٢٢٠٧ | ١٣٢٦ | گوندەکانی ناوچەی داراهین |
| ١٢٥ | ٢٩٥ | گوندەکانی ئەردوشین |
| ٥٧١ | ٣٥٠ | گوندەکانی چپاقچور |
| ٤٤٠ | ٣٧٤ | گوندەکانی نصیبین |
| ٨٧٠ | ٩٠٢ | گوندەکانی حباب |
| ٧٩٠ | ١٦٧١ | گوندەکانی ئەلیان |
| ٤٥٠ | ٦١٣ | گوندەکانی مدیات |
| ٥٥٣ | ١٠١٥ | گوندەکانیباجەرین |
| ٧٢ | ١٧٢ | گوندەکانی کربوران |
| ٣٧ | ٧١ | گوندەکانی حصن کیف |
| ١٣٨ | ١٧٦ | گوندەکانی دیاربەکر |
| ٦٤٣ | ١٠٩٠ | گوندەکانی کنج |
| ٥٩٠ | ٨٠٩ | گوندەکانی ئیفتوت |
| ٨٧٨٠ | ١٥٣٨٣ | |

ئەوەی شایانی باسە سریا بەدرخانیش لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٧٩ باسی هەمان ئەو ژمارانەی کردوە کە جەلادەت بەدرخان باسیکردوە کە وادیارە سەرچاوەی هەردوکیان هەریەك سەرچاوە بووە، بەلاّم سادق شەرەفکەندی لەلاپەڕە (١٤٦)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٧٢ باسی کاولکردنی (٢٣٠) گوند و (١٥٠٠٠) کوژراوی ژن و منداڵ و پیری بێچەکی کردوە لەوانەی بەشدارنەبوون لەشۆڕشدا و لەگۆڤاری (The Kurd)دا نوسینی (David Macdwell) ژمارەی هەموو کوژراوەکانی شۆڕشی پیرانی بەچل هەزار کوژراو ناوبردوە، بەلاّم دکتۆر عەبدولڕەحمان قاسملو لەلاپەڕە (٦٧)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/١٦ ئاماژەی بۆ کتێبی نوسەرێکی تورك کردوە کە ناوی (س. ئوستونفل) بووە وتویەتی ژمارەی کوژراوانی کورد بەهۆی شۆڕشەوە لەگەڵ ئەوانەی بەهۆی ئاوارەکردن و ڕاگوێزان و کوشتنی دوای شۆڕش لەوانەی بێچەك بوون هەمووی نزیکی سەدهەزار کوژراو بوون.

لەباسی دڕندەیەتی تورکەکان بەرامبەر بەکورد نمونەیەکی هێناوەتەوە کە بەچاوی خۆی دیویێتی و وتویەتی: (دڕندەیەتی کاربەدەستانی تورك ئێجگار لەڕادەبەدەربوو، من و چەند کەسێکی تر کە کۆمۆنیست بووین و لەدڕندەیەتی کاربەدەستان بێزاربووین گیرابووین و خرابووینە زیندانی ناو یەکێك لەو قەلاَ سەختانەی لەلایەن پشکنەری گشتیەوە سەرپەرشتی دەکرا، لەزینداندا بەچاوی خۆمان جەندرمەکانمان دەبینی چۆن یەکەیەکە کوردەکانیان لەزیندان ئەبردە دەرەوە و بەرگوللەیان دەدان و لەپاش کوشتنیان جەندرمەکان دەچوونە ئەو ژوورەی ئەو کوژراوەی تیادا زیندانکرابوو کەلوپەل و پشتێنە ئاوریشمیەکەیان بۆ خۆیان دەبرد و دەیانفرۆشت).

لەڕاستیدا تاوانکردنی تورك و دڕندەیەتی کەمالیەکان لەگەلْ کورد بەکتێب و دوو کتێب تەواونابێت و لەکۆتایی ئەم باسەدا بەپێویستم زانی ئاماژە بۆ کتێبەکەی (جەواهیر لال نەهرۆ) بکەین کە عەرەبیەکەی بەناوی (لمحات من تأريخ العالم) چاپی بەیروت، سالْی ١٩٥٧، لەوەدا لەو نامەیەیدا کە لە ١٩٣٣/٥/٨دا لەزیندانەوە بۆ کچەکەی ناردوە لەو نامەیەیدا باسی تاوانی تورکە کەمالیەکانی کردوە بەرامبەر بەکورد کە ئەمە وەرگێڕانی ئەو نامەیەی جەواهیر لال نەهرۆیە کە بۆ کچەکەی ناردوە کە وتویەتی: بەرلەمە ئاگادارم کردیت کە لەتورکیادا دەولْەتێکی یەکگرتوو پەیدابووە کە کەمترە لەوەی جاران (مەبەستی زەمانی عوسمانیە)، بەلاَم لەڕۆژهەلاَتی تورکیادا میللەتێکی تر هەیە کە بریتیە لەکورد کە یەکێکە لەو میللەتە کۆنانەی بەیەکێك لەشێوەکانی ئێران قسەدەکەن و ولاَتەکەیان دابەشکراوە کە ئیمڕۆ نیوەیان لەناو ولاَتی تورکیادا دەژین.

ئەم کوردانە لەسالْی ١٩٠٨دا لەدوای ڕاپەڕینی ئەو سالْە (مەبەست ئیسلاحاتی دەستوریە کە لەبەرگی یەکەمدا بەدوورودرێژ باسمانکردوە)، کوردیش بزوتنەوەیەکی دەستپێکرد و لەدواییدا لەکۆنگرەی ئاشتیدا لە(فرسای) داوای سەربەخۆیی خۆیان کرد. لەسالْی ١٩٢٥دا شۆڕشێکی گەورە لەکوردستانی تورکیادا بەرپابوو (مەبەستی شۆڕشی پیرانە) کە لەو ڕۆژانەدا کێشەی نێوان ئینگلیز و تورك هەبووە لەسەر ویلایەتی موسلْ کە ناوچە کوردیەکان بەشێکە لەو ویلایەتە و تورکەکان وایان بۆ دەرکەوت ئینگلیزەکان دەستیان لەو ڕاپەڕینەدا هەبوو کە بەناوی توندڕەوی ئاینیەوە دژی مستەفا کەمال ڕاپەڕیبوون. لەگەلْ ئەوەشدا شتێکی زۆر گرانە ئەو ڕاپەڕینە بدرێتەپالْ هاندانی ئینگلیز بەلاَم

بێگومـان ئینگلیزەکـان ڕاپەڕینەکـەی کوردیـان بـەدڵ بـووە دژی تورکیـا، هـەروەها نەردەکـەوێ هەسـتی ئـاینیش ڕۆڵـی خـۆی هـەبووە لـەو ڕاپەڕینـەدا شانبەشـانی هەستی نەتەوایەتی کە ئەمەی دواییان هۆی سەرەکی شۆڕشەکە بووە.

مستەفا کـەمال بڵاویکـردەوە کە ئینگلیزەکـان هـانی کوردیـان داوە، بەرامبـەر بەمە وای لەئەنجومـەنی میللـی تـورك کـرد یاسایەك دەربکات کە هەرکەسێك ئاین بەکاربێنێت بۆ هاندانی هەستی خـەڵك چ بەقسە بێت یان بەنوسینی بڵاوکراوە، ئـەو کەسـە بـەخائین دەژمێردرێـت و بەوپـەڕی توندوتیژیـەوە ڕەفتـاری لەگەڵـدا دەکرێـت و لەئەنجامـدا خوێنـدنی ئـاینی لەمزگەوتەکانـدا قەدەغـەکرا چـونکە ئەوانەی بەدوژمنی جمهوریەت دادەنا و مستەفا کەمال پاشا بەوپەڕی بێبەزەییانـە و دڵڕەقیـەوە کوردەکانی لـەناوبرد و دادگـای ئیستقلالی دانا بۆئـەوەی هـەزارانیان دادگابکات و لەئەنجامی ئەمـەدا شێخ سـەعید و دکتـۆر فوئـادی یـاوەری و چـەند کەسێکی تریان لەسێدارەدا کە ئەوانە هیـوا و ئاواتیان بۆ گەیشتن بەسەربەخۆیی شتێك بوو هەمیشە لەسەر زمانیان بوو لێیان جیانەدەبووەوە.

بـەوجۆرە ئـەو تورکانـەی بـۆ سەربەسـتی خۆیـان شۆڕشـیان کـرد، میللـەتی کوردیان داپڵۆسـی و لێیانـدا و شۆڕشـەکەیان لەناوبرد بەتاوانی ئەمـەی ئـەوانیش داوای مـافی خۆیـانکردبوو. لەسـاڵی ١٩٢٩دا کـورد جـارێکی تـریش ڕاپـەڕی (مەبەستی شۆڕشی ئاگریداغە) بەڵام دوبارە ئەم شۆڕشـەیان لەناوبرد، بەڵام ئەمـە هەتاسەر هەروا نابێت چونکە چۆن و کەی لەتوانادایە شۆڕشی میللەتێك خامۆش بکرێت و لەناوببرێت کە هەمیشە ئامادەبێت خوێنی خۆی لەپێناوی سەربەستیدا پێشکەشبکات.

**دووەم: ئاوارەکردن و ڕاگوێزانی بەکۆمەڵ**

لەدوای لەسێدارەدانی سەدان تێکۆشەر و ڕۆشنبیری کورد پاش خامۆشکردنی شۆڕشی پیران و کاولکردنی سەدان گوند و هەزاران خانو، لەدوای کوشتنی دەیان هەزاری بێتاوان وەکو بەرلەمە باسمانکردوە ئیتر نۆرە هاتەسـەر تـەواوکردنی ئـەو نەخشـەیەی بـۆ لـەناوبردنی کـورد ئامـادەکرابوو کـە بریتـی بـوو لـەئاوارەکردن و ڕاگوێزانی کورد بەکۆمـەڵ و دەسـتگرتن بەسـەر مـاڵ و سامانیاندا و دابەشـکردنی زەویوزارەکانیـان بەسـەر تورکـدا و بەسـەر ئـەو تورکانـەی لەشـەڕی (کۆسـۆڤۆ)دا دەرکرابوون کـە نیـاز و مەبەسـتی سـەرەکی کەمالیـەکان بریتـی بـووە لـەوەی ئـەو

کـورده ئاوارەکراوانـه بگوێزرێنـەوە بـۆ ناوچـە دوورەکـان کـە تورکنشـین بـوون، بۆئـەوەی لـەخاکی وڵاتـی خۆیـان دووربخرێنـەوە و هەسـتی نەتەوایـەتی لەمێشـکی هـیچ کوردێکدا نـەمێنێت و لەماوەیـەکی کەمـدا زمانەکـەی خۆیـان لەبیربچێتەوە و لەبۆتـەی ڕەگـەزی تورکـدا بتوێنرێنـەوە و ئـیتر شـتێك نـەمێنێت نـاوی کـورد و کوردستان بێت و ناوی ناوچەکانیان بگۆڕدرێت بۆ ناوی تورکی.

ئـەو ڕاگوێزانـەی لـەدوای شـکانی شۆڕشـی پیرانـەوە دەسـتپێکرد زنجـیرەی نەپچڕاو تـەمی نەڕەوییەوە و درێژەیکێشا و ساتێك میللـەتی کورد دوو جاری تر لەشۆڕشـی ئـارارات و دەرسـیمی دوھەمـدا ناچـاربوو دوبـارە دەسـتبداتە چـەك و ڕووبەڕووی نەوەی مەغۆل و تەتەر ببێتەوە و پاش ئەو دوو شۆڕشە ئەوی لەدوای شۆڕشـی پـیران بەتورکـەکان نـەکرابوو یـان دوایانخسـتبوو، لـەدوای هـەردوو شۆڕشـەکە دەسـتیانپێکردەوە و لێرەدا باسـی ئـەو ڕاگوێزانـە دەکـەین کـە لـەدوای شۆڕشـی پیرانـەوە دەسـتپێکردبوو هـەتا پـێش شـەڕی ئـارارات و باسـی ڕاگوێزانەکانی دوای ئارارات و دەرسیم دەهێڵینەوە بۆ بەرگی سێهەم. دەربارەی ڕاگوێزانی دوای شۆڕشی پیران چەند سەرچاوەیەك باسیانکردوە و هەوڵئەدەین کورتەی هەندێکیان بخەینە پێشچاو:

پرۆفیسـۆر حەسـرەتیان لـەدوو کتێبیـدا یەکـەمیان سەرچـاوە/٤٥ لەلاپـەڕە (١٠١)دا و دووەمیـان سەرچاوە/٤٩ لەلاپـەڕە (١٤٣)دا وتویەتی: لە ١٩٢٥/٦/١٩دا ئەنجومەنی باڵای میللی تورك یاسای ژمارە (١٠٩٧)ی دەرکرد بـەپێی ئـەو یاسایە بڕیاردرا کورد لەویلایەتـەکانی ڕۆژهەڵاتـەوە بگوێزرێنـەوە بـۆ ڕۆژئاوای تورکیا و دەسـەڵات درا بەکاربەدەسـتانی حکومـەت (١٤٠٠) خێزان بگوێزرێنـەوە بێجگـە لـە (٨٠) خێزانـی تـر لەوانـەی دژی حکومـەت بـوون لەویلایەتـەکانی ڕۆژهـەڵات و لەئورفە و بایەزیدەوە بگوێزرێنەوە بۆ ڕۆژئاوای تورکیا و بیانوی گواستنەوەشیان تاوانبارکردنیان بووە لەڕووداوەکەی شۆڕشی پیراندا.

بەپێی مادەی دووهەمی ئەو یاسایە دەبوایە گواستنەوەیان هەتا کۆتایی ساڵی ١٩٢٧ تەواوبکرایـە و لەپێشـدا کۆچـەرییەکان (ڕەوەنـدەکان) ئـاوارەکران و دوای ئەوان دەستکرا بەڕاگوێزانی خاوەن زەویوزارەکان. بەپێی مادەی/٧ی هەمان یاسا دەبوایـە لـەماوەی دوو سـاڵدا خـاوەن زەویوزارەکـان کاروبـاری ئـەو زەویوزارانـەی پێیـان بەجێدەهێڵرا تـەواویان بکردایـە و ئەگـەر لـەو ماوەیـەدا تـەواویان نەکردایە

حکومـەت دەسـتی بەسـەردادەگرت (مەبەسـت ئـەوەبووە کـورد ناچـاربکریّ بەهەرنرخێك بێت زەویوزارەکانی هەڕاجبکات و بەنرخێکی هەرزان بیفرۆشێت).
بەپێی مادەی نۆهـەمی ئەو یاسایە بڕیار لەسەرئەوە درابوو بۆ هەر قەزایەك لیژنەیەکی سیّ کەسی دابنرێت بۆئەوەی نرخ بۆ زەویوزارەکان دابنێت. لەبەرئەوە هەموو ئەندامانی ئەو لیژنانە هەر لەتورکەکان دادەنران، بۆیە نرخی زەویوزارەکان زۆر بەکەمی دادەنرا. بەوجۆرە بەپێی مادەکانی ئەو یاسایە بەهەزاران کورد ماڵ و موڵکیان لەکیسچوو یان زەوتکرا یاخود بەنرخێکی هەرزان لەدەستیان دەرهێنرا و نێردران بۆ ناوچە تورکنشینەکان و بەپەڕەوازەیی نیشتەجێکران.
حەسرەتیان دەڵێ: لەو ماوەی دوو ساڵەدا لەترسی ئاوارەبوون ژمارەیەکی زۆری کورد لەناو چیاکاندا خۆیان شاردەوە، ئەوانەش کە بەزۆرەملێ نێردرابوون بۆ بەهەشتی تازە، لەیەکەم دەرفەتدا ئەگەر بۆیان بڕەخسایە ڕایاندەکرد، بەڵام ئەگەر بگیرانایە بەوپەڕی دڵڕەقیەوە سەخترین سزایان دەچێشت. حەسرەتیان ئاماژەی بۆ مادە/٢ی یاسایەکی تر کردوە، ژمارە (١١٧٨) بەپێی ئەم یاسایە هەرکەسێك لەشوێنە تازەکانی خۆیان ڕاییکردایە دەبوایە لەماوەی سیّ مانگدا خۆی بدایە بەدەستەوە، هەرچەند ئەو ماوەیە بۆ شەش مانگی تر تازەکرایەوە بەڵام کەس خۆینەدا بەدەستەوە.
لەساڵی ١٩٢٧دا وەزیری ناوخۆی تورکیا (شوکری قایا) لەکۆبونەوەیەکی ئەنجومەنی میللیدا وتبووی ئێستە شێوەی بەڕێوەبردنی کاروبار لەویلایەتەکانی ڕۆژهەڵاتدا گۆڕاوە و ویلایەتەکانی (العزیز، ئورفە، بدلیس، هەکاری، دیاربەکر، سعرت، ماردین) هەمووی کراوە بەیەك ناوچە لەژێر سەرکردایەتی و ڕێبەرایەتی پشکنەرێکی گشتیدا. لەهەمان ساڵدا حکومەت ڕوونکردنەوەیەکی بڵاوکردەوە بۆ سەرپەرشتیکردنی ئەو ناوچانە و لەدواییدا لەحوزەیرانی ١٩٢٩دا یاسای ژمارە (١٥٠٥)ی دەرکرد دەربارەی ئەو زەویوزارانەی کە لەویلایەتەکانی ڕۆژهەڵاتدا دەستیان بەسەرداگیرابوو لەگەڵ چۆنیەتی دابەشکردنیان لەمادە/١ی ئەو یاسایەدا وتراوە: ئەو زەویوزار و موڵکانەی بەپێی مادە/٥٩ی یاسای ژمارە (١٠٩٦)ی ڕۆژی ١٩٢٧/٦/١٩ دەرچووبوو، پێویستە هەمووی بدرێت بەخەزێنە بۆئەوەی دابەشبکرێت بەسەر عەشیرەتە کۆچەریەکاندا.
مادە/٢: دەسەڵات ئەدرێت بەکاربەدەستانی حکومەت ئەو زەویوزارانەی لەمادە/١ی پێشوودا بەپێی یاسای ژمارە (١٠٩٧) بدرێت بەجوتیارەکان.

ماده/٣: نرخی ئەو زەویوزارانەی بەپێی مادەی پێشوو دەدرێن بەجوتیارەکان نابێ لەهەشت قات زۆرتر دابنرێت وەکو لەوەی تەخمینکراوە (لێرەدا ئەو زوڵموزۆرەی حکومەت دەردەکەوێت کە چۆن بەهەزاران زەویوزار و موڵك داگیرکراوە و لەچنگی خاوەنی پێشوویان دەرهێنراوە کە ماوەی ئەوە هەبووە هەتا نرخی هەشت قات زیاتر لەوەی پێشووی بدرێت بەجوتیارە تازەکان).

حەسرەتیان دەڵێت: بەپێی یاسای ژمارە (١٥٠٥) و بەپێی بڕیاری عیسمەت ئینونۆی سەرۆك وەزیران حەفتا هەزار دۆنم دابەشکرا و دران بەعەشایرە کۆچەرییەکان پاشئەوەی باجێکی زۆر قورسیان لەسەر دانان و لەڕاستیشدا حکومەت ئەو یاسایەی بۆئەوە دەرکرد ئەو کوردە کۆچەرییانەی لەو زەویوزارانەیان بەردەکەوت بکرێن بەلایەنگری حکومەت و لەکوردەکانی تریش دابڕێن. لەگەڵ ئەوەشدا لەناو کوردە کۆچەرییەکاندا تەنها دەوڵەمەندەکانیان توانای کرینیان هەبوو، هەژار و دەستەپاچەکانی کورد لەناویاندا توانا و دەسەڵاتی ئەوەی نەبوو ئەو زەویوزارانە بکڕێ و بیهێنێتە بەرهەم و باجێکی قورسیشی بۆ بدات، بەوجۆرە حکومەت ویستی ئەو هەژارانەی کورد وەکو جۆرە نۆکەر و دەسنگەخۆریان لێبێت لەژێر سایەی حکومەتدا.

ڕۆبەرت ئولسون لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٨٤ باسی ئەوەی کردوە لەڕۆژی ١٩٢٦/٧/٥دا دەنگ بڵاوبوو حکومەتی تورك نەخشەی ئەوەی کێشاوە ئەوانەی لەکۆسۆڤۆی ئەلبانیادا بوون هەموویان دەهێنرێن و لەشوێنی کوردە ئاوارەکانی ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵات نیشتەجێدەکرێن و بێجگە لەمە دەنگوباس هەبوو کە حکومەت (٤٠-٥٠) هەزار چەرکەس لەناوچە کوردیەکاندا نیشتەجێدەکات.

ڕۆبەرت ئولسون ئاماژەی بۆ ئەو هەواڵە کردوە کە لەماوەی ساڵی ١٩٢٧دا باڵیۆزی بەریتانیا لەتورکیا (جۆرج کلیرك) لەئینتلجسی هەواییەوە هەواڵی پێگەیشتوە، ئاوارەکردنی کورد هەر درێژەیکێشاوە و ڕاپۆرتەکانی حکومەتی بەریتانیا وایان پێگەیشتبوو ئەگەرچی ناوچە کوردنشینەکان هێمن بووبووەوە بەڵام لە٩٠٪ی چەکەکان شاردرابونەوە لەبەرئەوە ئەنجومەنی باڵای میللی ملیۆنێك لیرەی تەرخانکردبوو بۆ زۆرکردنی ژمارەی جەندرمەی ناوچەکانی ڕۆژهەڵات و (ئیبراهیم تالی بەگ) کرا بەپشکنەری گشتی هەموو ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵات، (دکتۆر قاسملۆ لەلاپەڕە (٦٧)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٤٦ باسی دانانی هەمان پشکنەری گشتی کردوە بەڵام وتویەتی ناوی ئیبراهیم تالق بووە).

بلەچ شێركۆ لەلاپەڕە (١٠٢)ی كتێبەكەیدا سەرچاوە/٦٠ لەباسی ڕاگوێزانی كورد بۆ ناوچە توركنشینەكان وتویەتی حكومەت لەهەرشوێنێكدا نیشتەجێی بكردنایە نەدەبوو ژمارەی كورد لەو شوێنەدا لە١٠٪ی دانیشتوان تێپەڕی بكردایە و ئەوانەش كە لەدەست ئاوارەكردن خۆیان بشاردایەتەوە سزادەدران و نمونەی بۆ ئەمە هێناوەتەوە كە چۆن (٢٥) كەس لەژوور دەریاچەی وانەوە لەترسی ڕاگوێزان خۆیان شاردبووەوە و پەنایان بردبووەبەر چیاكان، هێزی تورك دەورەیاندان و هەموویان بەخاووخێزانەوە سەربڕین و كەللەسەرەكانیان لەسەر جادەكانی (ئەرجیش) و (عادنجوان) و شارەكانی تردا هەڵواسین بۆ ترساندنی خەڵك. بەپێی بۆچوونی بلەچ شێركۆ وەكو لەلاپەڕە (١٠٣)ی كتێبەكەیدا باسیكردوە، ژمارەی ئەو كوردانەی ئاوارەكرابوون بریتی بووە لەملیۆنێك كەس بێجگە لەوانەی لەڕێگای گواستنەوەیاندا بەهۆی برسێتی و سەرماوسۆڵە و نەخۆشیەوە مردبوون.

بەكورتی دەربارەی ئەو زیانانەی بەحكومەت و بەشۆڕشگێڕانی كورد كەوتبوو، ڕۆبەرت ئولسون لەكتێبەكەیدا سەرچاوە/٨٤ وتویەتی: لە ١٩٢٥/٦/٢٩دا ژمارەی كوژراوەكانی حكومەت نزیكەی پێنج هەزار كوژراو بووە هەرچەندە ڕەنگە لەمەش كەمتربووبێت ئەگەرچی زۆر سەرچاوە زیادەڕەویانكردوە و ژمارەی كوژراوەكانی حكومەتیان گەیاندۆتە پەنجاهەزار بەڵام نەزانراوە حكومەت زیانیماڵی چەند لێكەوتوە لەو شەڕەدا.

بەڵام عەبدولڕەحمان قاسملۆ لەكتێبەكەیدا سەرچاوە/١٦ زیانی حكومەتی توركی لەو شۆڕشەدا بە(٦٠) ملیۆن لیرە داناوە (كە لامولیە ئەگەر ئەو پارەیە لەئاوەدانكردنەوە و برایەتی كورد و توركدا خەرج بكرایە نە ئەو شۆڕشە و نە ئەو كوشتارەش لەهەردوولادا دەكرا)، وە ژمارەی كوژراوەكانی كوردی بەپانزە هەزار داناوە و زیانی ماڵی كورد لەئەنجامی سوتاندنی گوند و كاولكردنی باخ و كێڵگەكانی كورد ئەوەندە زۆربووە نەتوانراوە نرخەكانیان دەستنیشان بكرێت.

## باسی هەشتەمی بەشی دەهەم

### هەڵوێستی دەوڵەتان بەرامبەر شۆڕشی پیران

لاموایە سەرکردایەتی شۆڕشی پیران بەر لەدەستپێکردنی شۆڕشەکەیان حسابێکی زۆر هەڵەیان کردبێت دەربارەی هەڵوێستی حکومەتی بەریتانیا بەرامبەریان کە بەداخەوە کورد نەك تەنها هەر لەم شۆڕشەدا، بەڵکو لەزۆر ڕووداوی تری وادا بەهەڵەداچوون بەزۆری سیاسەتمەدارانی کورد ئێجگار کۆڵبوون لەدەستنیشانکردنی دۆست و دوژمندا و بەقوڵایی نەچوونەتە سەر بنج وبناوانی زۆر هەڵوێست و بەڵێنی درۆ و بەقسەی پڕ لەڕواڵەت هەڵخەڵەتاون و کاتێك بەخۆیان زانیوە بۆچوونەکانیان هەمووی بێبناغە بووە و زیانێکی زۆریان بەخۆیان و بەمیللەتی کورد گەیاندوە. لەم باسەدا هەوڵئەدەین هەڵوێستی هەندێ لەو دەوڵەتانەی لەکاتی شۆڕشی پیراندا دەستڕۆیشتوو بوون بڕیار و هەڵوێستیان کاریگەر بووە بەرامبەر بەم شۆڕشە بیانخەینە بەرچاو:

### ١-هەڵوێستی حکومەتی سۆڤیەت

لەباسەکانی پێشوودا بەدووروودرێژی باسی دۆستایەتی نێوان کەمالیەکان و سۆڤیەت و ئەو پەیمانەمان کردوە کە لەنێوان هەردوولایاندا مۆرکرابوو، سۆڤیەتەکان لەسەرەتادا و هەتا ماوەی چەند ساڵێکیش کە هێشتا تا ئەوسا ڕەگەزپەرستێتی تورکیان بۆ ئاشکرا نەبووبوو، یان ئاگاداریبوون بەڵام هێشتا هەر بەتاقمێکی ئازادیخوازی دژ بەئیمپریالیزم لەقەڵەمئەدا و لایانوابوو دەتوانن سودیان لێوەربگرن بۆ سەرگرتنی ئەو ستراتیژەی بۆ دواڕۆژی خۆیان کێشابوویان دەربارەی ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

ڕۆبەرت ئولسون هەروەکو خۆی لەلاپەڕە (٢٠٩)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٨٤ ڕوونیکردۆتەوە، هەوڵێکی زۆریدابوو لێکۆڵینەوەیەکی تەواوبکات لەو دوکیومێنت و سەرچاوانەی پەیوەندیان بەهەڵوێستی سۆڤیەتەوە هەبووە بۆئەوەی بزانێت ئایا سۆڤیەت لەو ڕۆژانەدا بەهیچ جۆرێك یارمەتی کوردی داوە یان هەر هیچ نەبێت لایەنگری دەستگیربوونی مافی کورد و سەرکەوتنی شۆڕشێکی کورد بووبێت،

بەلآم بەهیچ جۆرێك شتێكی وای دەستگیر نەبووە كە بۆ ئەو مەبەستە سوودی لێوەربگرێت، بەڵكو بەپێچەوانەی ئەو بۆچونەی لەكتێبی (Rise of Modern Turkey)دا نوسینی (Saaw) كە لەلاپەڕە (٣٨١)دا باسیكردوە (بەداخەوە باسی ناوەڕۆكی لاپەڕەكەی نەكردوە كە زۆر گرنگ بوو باسی بكردایە).

ڕۆبەرت ئولسون لەباسەكەیدا لەهۆی ئەو بایەخنەدانەی سۆڤیەتدا وتویەتی هۆی ئەمەش ئەوەبوو سۆڤیەتەكان هەستیان بەوەكردبوو لەپەیمانی (Locarno)دا (بەداخەوە شتێكم دەربارەی ئەم پەیمانە دەستگیرنەبوو لەسەرچاوەكاندا) لەبەرئەوە دیبلۆماسیەتی ڕوس ڕێگەی نەوەینەدا هیچ جۆرە یارمەتیەكی كورد بدات و لەلایەكی ترەوە زۆر مەبەستی نەبوو ببێت بەئەندام لەكۆمەڵی گەلاندا. سەرچاوەی ڕۆبەرت ئولسون بۆ ئەمە بریتیە لەلاپەڕە (١٣١)ی كتێبەكەی (Tunge tekparty) لەگەڵ لاپەڕەكانی (٣١٢-٣١٤)ی كتێبی (Turk-Ingliz Lishkirlery).

كریس كۆچراش لەكتێبەكەیدا سەرچاوە/٤١ ئاماژەی بۆ ڕاپۆرتێكی سەركردەی هێزی هەوایی بەریتانیا كردوە لەعێراق ژمارە (١٢٢٥٥-٣٧١) لەڕاپۆرتەكەدا وتراوە: خالید بەگ جبران بەر لەدەستپێكردنی شۆڕشەكەی پیران لەگەڵ قونسولی ڕوسیا لە(ورمیە) چاویان بەیەكتر كەوتوە و خالید جبران هەوڵێكی بێسودی دابوو لەگەڵیدا بۆ یارمەتیدانی كورد. كریس كۆچرا دەڵێت: دەوڵەتی سۆڤیەت لەڕۆژنامەی (ئەزڤستیا)دا باسێكی بڵاوكردەوە بەپێی ئەو باسە شۆڕشەكەی شێخ سەعیدی بەشۆڕشێكی فیودالی و كۆنەپەرستانە داناوە و وتویەتی شێخ سەعید خۆشی بووە بەقۆچی قوربانی ولآتانی ڕۆژئاوا. سەرچاوەی كریس كۆچرا بۆ ئەمە بریتیە لە(سێر ویلسون هویل) لەباسێكیدا بەناوی سۆڤیەت و كورد كە لەدانیشگای فرجینیا ساڵی ١٩٦٥ بڵاوكردۆتەوە.

ئەوەی شایانی باسە هەڵوێستی سۆڤیەت بەرامبەر كورد هەر لەسەرەتای تەواوبوونی شەڕی جیهانیەوە ڕوونبووبوەوە، لەباسی سێهەمی بەشی دوهەمی ئەم بەرگەدا (هەڵوێستی دەوڵەتان لەدوای شەڕ) بەدوورودرێژی باسی هەڵوێستی سۆڤیەت كراوە.

## ٢-هەڵوێستی حکومەتی بەریتانیا

کە شۆڕشی پیران دەستیپێکرد، تورکە کەمالیەکان لەلایەکەوە بۆئەوەی تورکە ساویلکەکانی خۆیان والێبکەن ئەوەندەی تر دوژمنایەتیان لەگەڵ کورددا تیژتربکەن و بەگەرمی لایەنگری حکومەتەکەی خۆیان بن بۆ لێدانی کورد و لەلایەکی تریشەوە بۆئەوەی ناوی کورد و شۆڕشگێڕانی کورد بزڕێنن بەتایبەتی لای ئەوانەی دژی حکومەتی بەریتانیا بوون و بۆئەوەی هەرچی ژەهر و قینی ناو دڵ و مێشکیان بوو هەمووی داچۆڕێنن بەسەر کورددا بەبڵاوکراوە و بەڕۆژنامە و بەقسە بڵاویاندەکردەوە ڕاپەڕین و شۆڕشەکەی کورد بەهاندانی ئینگلیز بووە و حکومەتی بەریتانیا دەستێکی باڵای هەبووە لەدەستپێکردنی ئەو شۆڕشەدا، بەڵام بەرامبەر بەو پڕوپاگەندە بێسەروبەرەی ئەوان گەلێك بەڵگە و دوکیومێنت هەیە ئەو هەموو پڕوپاگەندەیەیان بەدرۆخستەوە و بەپێویستم زانی ئەوەی پەیوەندی بەشۆڕشی پیرانەوە هەیە ئاماژە بۆ ئەو بەڵگە و دوکیومێنتانە بکەم کە لەسەرچاوەکاندا ئەو تەقەلایانەی ئینگلیزیان بەدرۆخستەوە کە بەداخەوە سۆفیەتەکان لەبەر هەندێ هۆی تایبەت بەخۆیان زۆر درەنگ دانیان بەم ڕاستیەدانا.

گۆڤاری ئاڵای ئیسلام، سەرچاوە/١٠٩ لەژمارەی حوزەیرانی ١٩٨٨دا ئاماژەی بۆ ڕۆژنامەی (لغازتیە)ی فەرەنسی کردوە لەژمارەی ڕۆژی ١٩٢٥/٤/١٩دا وتویەتی: ئەو بەڵگانەی لەناو ئەو دوکیومێنتانەی لای قاسم بەگ گیرابوون (بەرلەمە لەباسی دادگاکردندا باسی ئەو دادگاکردنەی قاسم بەگ کراوە) دەریانخستوە پەیوەندیەکی بەهێزی هەبووە لەگەڵ ئینگلیزەکاندا و بەڵگەی تریش هەیە کە شێخ سەعید خۆشی پەیوەندی بەئینگلیزەکانەوە هەبووە. بێجگە لەو ڕۆژنامەیە، ڕۆژنامەی (توحید افکار)ی تورکیش لەژمارەی ڕۆژی ١٩٢٥/٢/٥دا هەواڵێکی بڵاوکردۆتەوە کە وتویەتی فڕۆکەکانی بەریتانیا بەسەر ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی شێخ سەعیدا بڵاوکراوەی بڵاوکردەوە، بەداخەوە لەم ڕۆژانەدا کە ئێمە لەشەڕداین لەگەڵ یۆنانیەکاندا کەچی برا کوردەکانمان ئەم کێشەیەمان بۆ دروستدەکەن.

لەزنجیرەی درۆودەلەسە و پروپاگەندەکانی تورکدا تورکەکان چیرۆکی (تامبلون) ناوێکیان هەڵبەستوە گوایا ئەم کابرایە پەیوەندی بەباڵیۆزخانەی بەریتانیاوە هەبووە لەئەستەمبوڵ و لەگەڵ کوردەکانیشدا دۆستایەتی هەبووە و بەپێی ڕۆژنامەی (توحید افکار)ی تورکی، میستەر (R.Lendsay) باڵیۆزی بەریتانیا نامەیەکی ناردوە بۆ (چمبرلن)ی وەزیری دەرەوەی بەریتانیا دەربارەی (تامبلون).

سەیر ئەوەیە حکومەتی بەریتانیا لەدواییدا لەڕێگەی باڵیۆزەکەیەوە لەئەستەمبوڵ ئەوەی بەدرۆخستۆتەوە و داوای ڕوونکردنەوەی ئەو بڵاوکراوەیەی لەحکومەتی تورکیا کردوە و لەوەڵامی ئەوەدا سەرۆکی ئەرکانی تورکیا دانی بەوەداناوە کە حکومەت ئەوەندە بایەخ بەو شتانە نادات کە لەڕۆژنامەکاندا بڵاودەکرێنەوە بێجگە لەو دانپیادانانەی سەرۆکی ئەرکانی تورکیا کە زانیوێتی ڕۆژنامەکانیان شتی پڕ لەدرۆودەلەسە بڵاودەکەنەوە، ڕاستیەکی تریش هەیە کە بۆچونەکەی ڕۆژنامەی (توحید افکار) پوچەڵدەکاتەوە: دەربارەی ئەوەی وتویەتی شۆڕشەکەی پیران لەکاتێکدا بووە کە حکومەتی تورك لەوکاتەدا لەشەڕدا بووە لەگەڵ یۆنانیەکاندا، چونکە هەروەکو بەرلەمە لەباسی شەڕی یۆنان و تورکدا نەك هەرکێشەی بۆ حکومەت پەیدانەکردبوو، بەڵکو بەشداربوونی کورد شانبەشانی حکومەت دژی یۆنانیەکان هۆی سەرەکی سەرکەوتنی تورك بووە و لەدوای تەواوبوونی شەڕ سەرکردەی هێزەکەی تورك کە بەسەر یۆناندا سەرکەوتبوو لەکاتی لابردنی پەردە لەڕووی سەربازی نەناسراودا بەئاشکرا وتبووی بێگومان ئەم سەربازی نەناسراوە کورد بووە.

دەربارەی تەقەلادانی تورك بۆ زڕاندنی ناوی کورد، مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد لەلاپەڕە (١٧)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٩٢ بۆ بەرپەرچدانەوەی درۆودەلەسەکانی تورك ئاماژەی بۆ کتێبەکەی (داجوبروت)ی نوسەری ئەڵمانی کردوە کە وەرگێڕدراوە بۆ عەرەبی لەژێر ناوی (مصطفی کمال المثل الاعلی) لەلاپەڕە (٣٦٥)ی ئەم کتێبەدا وتراوە: تورکەکان وایان بڵاوکردبوەوە کە شۆڕشەکەی شێخ سەعید بەهاندانی (لورنس)ی بەریتانی بووە، کە لەڕاستیدا ئەمەی ئەوان بە(لورنس) ناویانبردوە بریتی بووە لە(دکتۆر وایزل) کە ڕۆژنامەگەرێکی ئەڵمانی بووە کە کۆمپانیایەکی ئەڵمانیا ناردبووی بۆ کوردستان تەنها بۆئەوەی زانیاری و هەواڵی شۆڕشەکەی کورد کۆبکاتەوە و بینێرێت بۆ گۆڤارێکیان کە وەرگێڕانە

عەرەبیەکەی ناوی ئەو گۆڤارە بریتی بووە لە(الدنیا المصور) و لەڕاستیشدا ئەوەی ئەو ئامادەیکردبوو لەژمارە (١٣٩)ی ئەو گۆڤارەدا بڵاویکردبوەوە.

لەدوکیومێنتێکی بەریتانیادا ژمارە (Vol.١.٨١٩. No.٥٧٠) مانگی مارتی ١٩٢٥ کە ڕۆبەرت ئۆلسون لەسەرچاوە/٨٤دا باسیکردوە و سەرچاوە/١٠٩ ئاماژەی بۆ کردوە، لەو دوکیومێنتەدا وتراوە (لیندسای) کە باڵیۆزی حکومەتی بەریتانیا بووە لەتورکیا یاداشتێکی بۆ وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا (کە لەو ڕۆژانەدا چەمبرلن بووە) دەربارەی بزوتنەوە و شۆڕشەکەی کورد وتویەتی: گەلی کورد گەلێکی دواکەوتوە و هێشتا سەرگەرمی مانەوەی خەلافەتە و زۆر ساویلکەیە و بەئاسانی دەخەڵەتێنرێت، بەڵام مستەفا کەمال هەرچۆنێك بێت و هەرچەندێکیش لەگەڵ ئێمەدا ناڕێك بێت بەڵام مرۆڤێکی تازەخوازە و وڵاتەکەی دەبێتە (Lumper– کۆسپ و ڕێگر)ێك لەبەردەمی بڵاوبونەوەی شیوعیەتدا، کەچی بەپێچەوانەوە بزوتنەوەکەی شێخ سەعید دەمانباتەوە بەرەو خەلافەتی عوسمانی.

دکتۆر عوسمان عەلی لەسەرچاوە/١٠٩دا ئاماژەی بۆ کتێبی نوسەرێکی تورك کردوە (عومەر کورکچو ئوغلو) چاپی ١٩٧٨ کە لەم کتێبەدا وتراوە: ئینگلیزەکان دەیانزانی تورکیا دەسەڵاتدارە و کاربەدەستەکانی وڵاتەکەیان بەرەو ڕێبازی وڵاتە ڕۆژئاواییەکانەوە دەبەنبەڕێوە و ئامادەیە بەربەرەکانی هەموو بزوتنەوە و جموجوڵێکی ئیسلامیەکان بکات ئەگەر هات و ئەمانە دژی بەرژەوەندیەکانی حکومەتی بەریتانیا بوەستن.

لەدوکیومێنتی ژمارە (Fo.٣٧١-١٠٨٧٦. No. March) مارتی ١٩٢٥ نامەیەکی تری (لندسای) باڵیۆزی بەریتانیای تیایە لەئەستەمبوڵەوە ناردوە بۆ (چەمبرلن) لەو نامەیەدا بۆی نوسیوە (مستەر ج. هارنیك)ی پاشکۆی سوپایی بەریتانیا لەئەستەمبوڵ چاوی بەسەرکردەی سوپاکانی تورك کەوتوە و ڕایسپاردون و نەسیحەتی کردون پێویستە بەزووترین کات و بەهەرشێوەیەك بێت ڕاپەڕینەکەی کورد دەبێ دامرکێنرێتەوە.

بەڵگەیەکی تریش بۆ بەدرۆخستنەوەی پڕوپاگەندەکانی تورك دەربارەی ئەوەی حکومەتی بەریتانیا هانی کوردی دابوو بۆ دەستپێکردنی شۆڕش بریتیە لەوەی پاشئەوەی شۆڕشەکەی پیران شکا و هەندێ لەشۆڕشگێڕەکان بەناچاری ڕوویانکردە عێراق کە (شێخ مەهدی) برای شێخ سەعید یەکێك بووە لەوانەی لەلایەن ئینگلیزەکانەوە دەستبەسەرکرا و ڕێگەی ئەوەی لێگیرا هیچ پەیوەندیەك

بەکوردەکانی باشوورەوە بکات بۆئەوەی داوایان لێبکات دژی تورکەکان خەباتبکەن.

لەدوکیومێنتی ژمارە (Fo.٣٧١-١٠٨-٣٥E) مانگی نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٢٥ باسی (عەلی ڕەزا)ی کوڕی شێخ سەعیدی تیاداکراوە کە پەنابەردبووەبەر خاکی ئێران و لە ١٩٢٥/٨/٢٣دا قونسوڵی بەریتانیا لەتەورێز نامەیەك دەنێرێت بۆ باڵیۆزەکەیان لەتاران و تیایدا نوسیویەتی: (عەلی ڕەزای کوڕی شێخ سەعید داوای ئەوەی لێکردووین ڕێگەی بدرێتێ بچێت بۆ بەریتانیا بۆئەوەی لەوێ باسی کێشەی کورد بگەیەنێت بەکاربەدەستان و پێیان بڵێت کورد ئامادەیە هاوکاری لەگەڵ حکومەتی بەریتانیادا بکات ئەگەر سەربەخۆیی بۆ کورد مسۆگەر بکرێت).

لەوەڵامدا (Lorain–لۆرین) بەقونسوڵی بەریتانیا لەتەورێز دەڵێت: لەعەلی ڕەزا بگەیەنە حکومەتی خاوەنشکۆ ئاگای لەهەموو ڕووداوێکە و شارەزای بارودۆخی کوردستانە و پێویست بەچوونی ئەو ناکات بۆ لەندەن، بێجگە لەو بۆ سەرکردەکانی تری کوردیشی ڕوونبکەرەوە حکومەتی خاوەنشکۆ بەهیچ شێوەیەك لایەنگری دروستبوونی حکومەتێکی کوردی سەربەخۆ نیە و نایەوێ ئۆتۆنۆمیشی هەبێت.

ڕۆبەرت ئولسون باسی بەڵگەیەکی تری کردوە کە لە١٩٢٦/٤/١٨دا (یەعنی دوای ساڵێك بەسەر دامرکاندنەوەی شۆڕشدا) کە لەو بەڵگەیەدا باسی ئەو پەیمانی دۆستایەتیە کراوە کە لەنێوان بەریتانیا و عێراق و تورکیادا مۆرکرا، لەکاتی مۆرکردنی ئەو پەیمانەدا (لیندسای) بەعیسمەت ئینونۆی سەرۆك وەزیرانی تورك دەڵێت: ئێمە ئەگەر کاتی خۆی بمانویستایە دەمانتوانی پڕیشکی شۆڕشەکەی شێخ سەعید بگەیەننە هەموو ناوچەکانی تورکیا، بەڵام ئێمە لایەنگری ئەوە نەبووین و لەبیرتدێ لە ١٩٢٥/٣/٨دا کاتێك شۆڕشەکەی شێخ سەعید لەگەرمەیدا بوو لەو ڕۆژانەدا پێموتیت: تورکیا ئەو شۆڕشە لەناودەبات و ئێوە سەردەکەون و ژمارەیەك لەشۆڕشگێڕانی کوردیش دەگرن، ئەوسا بۆتان دەردەکەوێت ئێمە بەهیچ جۆرێك دەستمان لەو شۆڕشەدا نەبووە و کوردمان هاننەدابوو، وا ئێستە ئەو ڕاستیەتان بەتەواوەتی بۆ ئاشکرابووە.

بۆ دڵنیابوون لەوەی ئینگلیزەکان بەهیچ شێوەیەك دەستیاننەبووە لەهاندانی کورد بۆ بەرپاکردنی شۆڕشی پیران و هیچ جۆرە یارمەتیەکی کوردیان نەدابوو، ڕۆبەرت ئولسون لەهەموو نوسەرێك زۆرتر بەقوڵایی مەسەلەکەدا چووە و چۆتە

بنج وبناوانی و پاشنەوەی گەلێك لەدوکیومێنتەکانی بەوردی پشکنیوە لەلاپەڕە (١٢٨)ی کتێبەکەیدا بەدووروودرێژی باسی ئەوەی کردوە چۆن بەتەواوەتی لەوە دڵنیابووە کە حکومەتی بەریتانیا هیچ پەیوەندیەکی نەبووە بەشۆڕشەکەی کورد نە لەدوورەوە و نە لەنزیکەوە و ئاماژەی بۆ دوکیومێنتی ژمارە -C.O.٧٣٠-٢٨-٤) (٧ کردوە کە لەم دوکیومێنتەدا ئەو هۆیانە خراوەتە بەرچاو کە ڕێگەی لەحکومەتی بەریتانیا گرتبوو هیچ جۆرە یارمەتیەکی کورد نەدات:

١-یارمەتیدانی کورد زۆر ئەکەوێت لەسەر حکومەت و ئەگەر یارمەتی کورد بدرایە دەبوایە پارەیەکی زۆرتر تەرخانبکرایە وەك لەوەی بۆ ڕا پەڕینی عەرەبەکان تەرخانکرابوو.

٢-ناوچەکانی شۆڕشی کورد هەمووی سەخت بوو بەئاسانی یارمەتی پێنەدەگەیشت.

٣-هەموو جۆرە یارمەتیدانێکی ئێمە بۆ کورد دەبووە هۆی بێزاربوون و نارەزایی وڵاتە ئیسلامیەکان.

٤-لەوانە بوو شۆڕشەکەی کورد توانای ئەوەی نەبێت بۆ ماوەیەکی زۆر و درێژخایەن خۆی پێڕابگیرێت.

٥-ترسی ئەوەش هەبوو ئەگەر حکومەتی بەریتانیا یارمەتی کوردی بدایە و ناچاربکرایە واز لەو یارمەتیدانە بهێنێت ئەوسا تورکەکان کوشتارێکی زۆرتریان لەکورد دەکرد و بەهۆی خۆکێشا نمانەوە ڕەخنەیەکی زۆرمان لێدەگیرا.

ڕۆبەرت ئولسون لەباسەکەیدا لەسەرینەڕوا و ئەڵێت: لەگەڵ ئەو هەموو کێشە و ناڕێکیە زۆرەی لەنێوان حکومەتی بەریتانیا و تورکدا هەبوو، هەر لەنۆڤەمبەری ساڵی ١٩٢١ هەتا کاتی دەستپێکردنی شۆڕشەکەی شێخ سەعید لە ١٩٢٥/٢/٢٨دا هەرچی بەڵگە و دوکیومێنتەکان هەبوو پشکنیم و شتێکی وام نەهاتە بەرچاو کە حکومەتی بەریتانیا سیاسەتی خۆی بەرامبەر یارمەتینەدانی کورد بگۆڕێت و ئەو لێکۆڵینەوانەی (Omer Kurkcoglo–عومەر کورکچو ئوغلو) و (Bilal Shimsir–بیلال شمشێر) هەردووکیان لەناو دوکیومێنتەکانی ناو ئەرشیفی بەریتانیادا کردوویانە ئەوانیش وەکو من بۆیان ڕوونبۆتەوە حکومەتی بەریتانیا هیچ ڕۆڵێکی نەبووە لەشۆڕشی پیراندا کە ئەمانە هەمووی ڕوونیانکردۆتەوە ئەو هەموو پڕوپاگەندانەی تورکەکان لەڕۆژنامەکاندا بڵاویانکردبوەوە هەمووی بێبناغە بووە و بگرە لەئەرشیفەکانی حکومەتی تورکیشدا هیچ بەڵگەیەك نەدۆزراوەتەوە کە حکومەتی بەریتانیای پێتاوانبارکرابێت بەیارمەتیدانی کورد.

هەروەکو ڕۆبەرت ئولسون باسیکردوە لەلاپەڕە (٣٠)ی کتێبەکەی (عومەر کورکچو ئوغلو) و بیلال شمشێردا کە بەناوی (تورک-ئینگلیز لەشکرلەری) وەڵامی ڕۆژنامەی جمهوریەتی ڕۆژی شوباتی داوەتەوە کە بڵاویکردبووەوە شۆڕشەکەی شێخ سەعید بەهاندانی ئینگلیز بووە و هەردووکیان وتویانە ئەو بڵاوکردنەوەیە شتێکی بێبناغە بووە چونکە بۆیان دەرکەوتوە لەبەرژەوەندی بەریتانیادا نەبووە هیچ جۆرە یارمەتیەکی کورد بدەن ئەگەرچی هەندێ لەئەفسەرەکانی بەریتانیا پێیانخۆشبووە تورکەکان لەگەڵ کورددا تووشی کێشەیەکی وا ببن نەیانپەرژێتە سەرئەوەی داوای ویلایەتی موسڵ بکەنەوە.

لەدوکیومێنتێکی تری ئەرشیفی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیادا ژمارە (Fo.٣٧١-E-١٢٢٩-٩١-٤٤) ڕۆژی ١٩٢٥/٤/٧ باسی یاداشتێکی عیسمەت ئینونۆی کردوە کە لەئەنجومەنی باڵای میللیدا ڕۆژی ١٩٢٥/٣/٣ خوێندبویەوە لەوەدا وتبووی (کە دیارە هێشتا ئەو سەرۆك وەزیران نەبووە): سەرۆکی وەزیران (کە فەتحی بەگ بووە وەکو لەپێشدا باسکراوە) نابێ ڕۆژنامەکان بەتاوانبار دابنێت دەربارەی ئەو باسانەی بڵاویدەکەنەوە کە گوایا بێگانەکان بەتایبەتی بەریتانیەکان دەستیان هەبووە لەیاخیبوونەکەی کورددا.

لەدوکیومێنتێکی تردا ژمارە (Fo.٣٧١-١٠٨-٦٧-E-٢١٩٥)ی ڕۆژی ١٩٢٥/٤/٢٢دا باسێکی (سێر ڕونالد لیندسای) کردوە کە نامەیەکی ناردوە بۆ (چمبرلن) و ئاگاداریکردوە کەوا هەندێ پڕوپاگەندە بڵاوکراوەتەوە گوایا حکومەتی بەریتانیا لەعێراقەوە دەستی خستۆتە کاروباری شۆڕشەکەوە کە لەڕاستیدا ئەو پڕوپاگەندانە پەیوەندیان بەساڵانی (١٩١٩-١٩٢٠) هەیە کە ئەوسا بیر لەئۆتۆنۆمی دەکرایەوە بۆ کورد و هیچ پەیوەندیەکی نەبووە بەسەر شۆڕشی پیرانەوە.

ڕۆبەرت ئولسون دەربارەی تەقەلاکانی تورك بۆ تاوانبارکردنی بەریتانیا بەرامبەر هاندانی کورد بۆ بەرپاکردنی شۆڕش وتویەتی: لەڕاستیدا بەپێی دوکیومێنتەکانی ئەرشیفی بەریتانیا لە (Public Record) لەلەندەن، هەندێ لەلێکۆڵەرەوەکانی بەریتانیا بەتایبەتی (جیمس مورگان) لایانوابووە تورکەکان خۆیان بووبوون بەهۆی هەڵگیرسانی شۆڕشەکەی شێخ سەعید و ڕێگەیان بۆ خۆشکردبوو بەپێی ئەم سەرنجانەی خوارەوە:

١-تورکەکان لەساڵی ١٩١٨ بەدواوە هانی کوردیانداوبوو خۆیان ئامادەبکەن بۆئەوەی فریای برا کوردەکانی عێراق بکەون دژی ئینگلیز لەکاتێکدا خۆیان لەشەڕی جیهانیدا شکابوون و لاوازبووبوون و لەوە ترسابوون ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ئەرمینیایان لەکیسبچێت بۆیە لەو قۆناغەدا لایەنگری بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد بوون، بەڵام هەر کە خۆیان بەهێزکرد لەو هەڵوێستە پاشگەزبوونەوە.

٢-سەرکەوتنی بزوتنەوەی تورکەکانی ئەنقەرە بوو بەهۆی ئەوەی کوردی عێراقیش ڕاپەڕێت کە تورکەکان لەمەدا دەستیان هەبوو (مەبەست ناردنی عەلی شەفیقە کە بەیوزدمیر ناسرابوو بۆ ناوچەی ڕەواندز کە لەوێ بنکەیەکی دامەزراندبوو، ژمارەیەکیش لەکوردی باشور کە لەسیاسەت و هەڵوێستی ئینگلیز بێزاربووبوون، بووبوون بەلایەنگری یوزدمیر وەکو هەباسی مەحمود ئاغای پشدەر و کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند و هەندێکی تر) بەئومێدی ئەوەی بتوانن کوردی باکور و باشور لەژێر سایەی دەوڵەتی ئەنقەرەدا بێت.

٣-دوورنیە تورکەکان ویستبێتیان هێزەکانی خۆشیان ئاڕاستەی عێراق بکەن بۆئەوەی ئەمە بکەن بەبیانوو دژی ئەو تورکانەی تر کە سەر بەبزوتنەوەکەی ئەنقەرە نەبوون (مەبەست ئەو تورکانە بووە کە لەئەستەمبوڵدا مابوون و هێشتا سەر بەخەلیفە بوون و لەگەڵ بزوتنەوەی ئەنقەرەدا نەبوون).

٤-حکومەتی تورک هەر بزوتنەوەیەك لەژێر دروشمی ئایندا بەرپابکرایە بەبزوتنەوەیەکی کۆنەپەرستانەیان دادەنا و هەر هەوڵدانێك بۆ مەبەستی سەرگرتنێکی سەر بەئاین بەتەقەلایەکی خائینانەیان دەژمارد.

ڕۆبەرت ئولسون لەباسەکەیدا دەڵێت: لەڕاستیدا تورکەکان دژی هەموو جۆرە بزوتنەوەیەکی کورد بوون لەهەر شێوەیەکدا بووبێت ئەگەر بەنیازی پێکهێنانی حکومەتێکی کوردی بوایە و ئەمە بریتی بوو لەو بیروبۆچوونە تۆرانیەی کاتی خۆی تاقمی (اتحاد و ترقی) چەسپاندبوویانە مێشکیان و ئەوان بەتەمای ئەوەبوون سنوری دەسەڵاتیان بگاتە ناوەڕاستی ئاسیای ئیسلام (پان تۆرانیزم) و هەرکۆسپ و بەرهەڵستیەك بهاتایەتە سەر ڕێگەی ئەو مەبەستەیان هەوڵیانئەدا ئەو کۆسپە بڕوخێنن و لەناویببەن.

ڕۆبەرت ئولسون لەلاپەڕە (١٣٠)ی کتێبەکەیدا دەگەڕێتەوە سەر باسی هەڵوێستی حکومەتی بەریتانیا و وتویەتی: دکتۆر (D.A.Obsorme) کە کارمەند بووە لەوەزارەتی دەرەوەی بەریتانیادا، لایوابووە حکومەتی بەریتانیا پێویست بووە لەسەری بایەخ بەسەرنج و بۆچونەکانی (مورگان) بدات کە داوای

لەحکومـەتی بـەریتانیا کردبـوو ئاگـاداری هەڵوێسـت بێـت و لایوابـوو قـەوارەی بزوتنەوەی کورد زیادەڕۆیی تیادا کرابوو هـەروەکو ئەنتلجسـی فەرەنسـی بۆ ئەمـە چووبوو، مۆرگان وەکو خۆی ڕوونیکردبووەوە لایوابووە کوردەکان لایەنگری ئـەوە نەبوون تورکەکان ویلایەتی موسڵیان دەستگیربێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە شۆڕش دەستپێکرد (مەبەست شۆڕشی پیرانـە) تورکـەکان هەوڵیانـدا ئـەو شۆڕشە بکـەن بەبیانو بـۆ هێنـانی عیسـمەت ئینونـۆ (کەمالیـەکان لەگـەڵ فـەتحی بـەگی سـەرۆك وەزیرانـدا ناڕێکبوون وەکو لەشوێنی خۆیدا باسمانکرد چونکە وەکـو عیسـمەت ئینونۆ توندوتیژ نەبوو دژی کورد بۆیە لەبیانوییەك دەگەڕان لاییبەن) کە لەڕاستیدا عیسمەت ئینونۆیان بۆ شتێکی گرنگ پێویست بوو کە بریتی بوو لەپاکردنـەوەی وڵات لەو تورکانەی دژی ڕێبازی کەمالیەکان بوون.

لـەکۆتایی باسـەکەی ڕۆبـەرت ئولسـوندا ئامـاژەی بـۆ ڕاپـۆرتێکی (لیندسـای) باڵیۆزی بەریتانیا کردوە کە لە١٩٢٥/٦/٢٠دا ناردویـەتی بۆ (چمبرلن)ی وەزیـری دەرەوە لەڕاپۆرتەکەدا وتراوە: (تا ئێستە هیچ کارێکی وەها نـەکراوە کـە لەلایـەن تورکەکانـەوە ببێـت بەبەڵگـە و بیکـەن بـەبیانوی ئـەوەی بڵـێن شۆڕشـەکەی کـورد بەهاندانی حکومەتی بەریتانیا بەرپاکرابوو).

### ٣-هەڵوێستی حکومەتی فەرەنسا

فەرەنسیەکان هـەر لـەدوای مـۆرکردنی پـەیمانی شەڕوەسـتاندن و دەسـتکردن بەسەرگرتنی پـەیمانی (سـایکس پیکۆ)دا بۆ دابەشـکردنی میراتەکـەی عوسـمانی، لـەو فڕوفێڵـەی ئینگلیزەکـان بەرامبـەر دەوڵەتـە هاوپەیمانـەکان گەیشـتبوون و هاندانی ئینگلیز بۆ یۆنانیەکان کە لەشوێنی خۆیدا باسمانکردوە ئەمانە هـەموو کارێکی وایانکرد فەرەنسیەکان بەشێوەی جاران ڕەفتار لەگەڵ تورکەکانـدا نەکـەن و بەدەسـتگیربوونی سـوریا و ناوچـەی (کیلیکیـا) وازیـان هێنـابوو بۆیـە لەگـەڵ ئیتاڵیەکاندا هەریەکەیان بەجیا پەیمانێکی دۆستانەیان لەگەڵ تورکە کەمالیەکاندا مۆرکرد کە تورکەکان بەرهەمی ئەو پەیمان مۆرکردنەیان لەدوو شتدا خۆی نوانـد، یەکـەمیان ئـەو هێـزی تورکـەی بـەر لـەمۆرکردنی ئـەو پەیمانـە بەرامبـەر هێـزی فەرەنسیەکان دایاننابوو وە زۆر کـەوتبوو لەسـەریان، هـەموویان کێشـایەوە و دژی ڕاپەڕینـەکانی کـورد و ئەرمـەنی بـەکاریانهێنان و دەسـتکەوتی دوهـەمی تـورك لـەو

پەیمان مۆرکردنە ئەوەبوو لەکاتی شۆڕشەکەی پیراندا توانی فەرەنسیەکان بەوە قایلبکەن لەڕێگەی ئەو هێڵی شەمەندەفەرەی بەناوچەی دەسەڵاتی فەرەنسیەکاندا دەڕۆیشت ژمارەیەکی زۆر لەو هێزانەی لە(ئەدرنە)دا بوو بیگوێزنەوە بۆ پشتی هێزی شۆڕشگێڕانی کورد لەشۆڕشی پیراندا و لەپشتەوە لەشۆڕشگێڕان درا کە هۆیەکی سەرەکی بوو بۆ سەرکەوتنی تورکەکان.

لەدوای ئەو باسە دوورودرێژەی ڕۆبەرت ئولسون و ئەو دوکیومێنتانەی باسی هەڵوێستی دەوڵەتانیان کردوە بەرامبەر بەکورد چەند بۆچوون و سەرنجێك دێنە پێشچاو کە دەتوانرێت کورتەیەکی باسبکرێت وەکو:

١-شۆڕشەکەی شێخ سەعید ئەگەرچی شۆڕشێکی سەرنەکەوتوو بوو بەڵام زیانێکی زۆری ماڵیشی گەیاندبوو بەتورکەکان و دکتۆر قاسملۆ لەلاپەڕە (٣٦٢)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٦٩ ئاماژەی بۆ نامەیەکی (م. فروغی) کردوە کە ساتی خۆی باڵیۆزی ئێران بووە لەئەنقەرە، لەکاتی خۆیدا نامەیەکی ناردوە بۆ وەزارەتی دەرەوەی ئێران کە دەقی ئەو نامەیە لەگۆڤاری (یەغما)ی ژمارە (٨)ی ساڵی ١٩٥٧دا بڵاوکرابوەوە لەوەدا وتراوە: (شۆڕشی ساڵی ١٩٢٥ زیانێکی ئێجگار زۆری گەیاندبوو بەکورد پاشئەوەی تورکەکان توانیبوویان هەشتا هەزار سەرباز ئاراستەی کوردستان بکەن).

٢-هەرچەند تورکەکان بەهەموو شێوەیەك پروپاگەندەیان دژی شۆڕشی پیران و شۆڕشگێڕان بڵاودەکردەوە و بەوە تاوانباریان دەکردن کە شۆڕشەکەیان بەهاندانی ئینگلیزەکان بووە، بەڵام لەوەش گەیشتبوون کە حکومەتی بەریتانیا لەبەرژەوەندیدا نەبووە خۆی بگلێنێتە ناو ئەو شۆڕشەوە بۆیە هەر لەسەرەتاوە دڵنیابوون لەوەی بەئاسانی ئەو شۆڕشە دادەمرکێننەوە.

ئەو هەموو گڕوکڤە و ئەو هەموو پروپاگەندانەش کە بەڕواڵەت دژی ئینگلیزەکان بڵاویاندەکردەوە بۆ دوو مەبەست بوو:

یەکەم: بۆئەوەی حکومەتی بەریتانیا والێبکەن بیر لەوە نەکاتەوە لەباشوری کوردستاندا هیچ جۆرە دەزگایەکی کوردی دامەزرێنرێت و ئامادەیی خۆیان پیشاندا ئەگەر ئەوان دەستبەرداری دامەزراندنی ئەو دەزگایە ببن ئەمانیش ئامادەن واز لەداواکردنەوەی ویلایەتی موسڵ بهێنن.

دووەم: هەموو داخوازیەکانی تورك لەحکومەتی بەریتانیا ئەوەبوو دان بەسەربەخۆیی حکومەتەکەیاندا بنێت لەئەنقەرە و ڕێگەی ئەوەی لێنەگیرێت ببێت

بەئەندام لەکۆمەڵی گەلاندا کە لەڕاستیدا هەردوو تەقەلاکەیان سەریگرت و تورکیا لە(عصبە الامم)دا قبوڵکرا و پەیمانی نێوان تورکیا و عێراق مۆرکرا کە هەمووی لەسەر حسابی پێشێلکردنی مافی نەتەوەی کورد بوو.

بلەچ شێرکۆ لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٦٠ ئاماژەی بۆ ڕۆژنامەی (میلیت)ی تورکی ژمارە (١٦٢٦)ی ڕۆژی ١٩٣٠/٨/٣ کردوە (واتە پتر لەپێنج ساڵ دوای دامرکاندنەوەی شۆڕشی پیران) کە لەو ڕۆژنامەیەدا باسی ئەوە کراوە ساتێك هێڵی شەمەندەفەری ڕێگەی (سێواس-ئەنقەرە) کرایەوە، عیسمەت ئینونۆ لەو ڕۆژەدا وتبووی: ئەو هەموو بگرەوبەردەی پێنج ساڵ لەمەوبەر لەویلایەتەکانی ڕۆژهەڵاتدا ڕوویدا بەهاندانی بێگانە، هەتا ئێستە نیوەی هێزەکانیان لەناوبراوە (بێگومان مەبەستی لەنیوەکەی تری ئەو هێزانە بووە کە لەشۆڕشی ئارارات و دەرسیمی دوهەمدا بەناچاری دەستیاندایەوە چەك هەروەکو لەبەرگی سێهەمدا باسیاندەکەین).

ڕۆبەرت ئولسون لەکتێبەکەیدا لەلاپەڕە (١٥٠)دا بەدووروودرێژی باسی سەرەنجامی شۆڕشە سەرنەگرتوەکەی پیرانی کردوە کە بەپێویستم زانی کورتەیەکی پێشکەش بکەم:

١-شۆڕشی پیران و سەرەنجامەکەی ڕێگەی خۆشکرد بۆ گفتوگۆکردن لەنێوان تورکیا و بەریتانیا و عێراقدا دەربارەی ویلایەتی موسڵ کە ئینگلیزەکان زۆر مەبەستیان بوو ئەو کێشەیە بێگێچەڵ چارەسەر بکرێت دەتوانرا لە ١٩٢٦/٦/٥ پەیمانێك مۆربکرێت لەنێوانیاندا.

٢-ڕێگە بۆئەوە خۆشکرا دەسەڵاتی کۆمەڵی گەلان (عصبە الامم) لەلایەن حکومەتی بەریتانیا و دەوڵەتە ئەورووپاییەکانەوە بکرێت بەچەکێکی سیاسی کە لەمەدا بەریتانیای ئیمپریالیزم بوو بەکەڵەگای ناوچەکە لەبەجێهێنانی مەبەستەکانیدا.

٣-تورکەکان لەگەڵ ئەوەشدا لەقۆناغێکدا بووبوون بەدۆستی فەرەنسیەکان و ئیتاڵیەکان، بەڵام کە ئینگلیزەکان کێشەکانی خۆیان لەگەڵ ئەو دوولایەدا چارەسەرکرد بەمە تورکیا بەتەواوەتی گۆشەگیرکرا.

٤-بیروبۆچوونی سۆڤیەتەکان لەگەڵ بیروبۆچوونی تورکەکان لەمەدا یەکیانگرتەوە کە هەردوولایان شۆڕشەکەی شێخ سەعیدی پیرانیان بەشۆڕشێکی کۆنەپەرستی دەرەبەگانە لەقەڵەمدەدا.

٥-شۆڕشی پیران بوو بەهۆی ڕێگەخۆشکردن بۆ چارەسەرکردنی کێشەی تورك و بەریتانیا لەسەر ویلایەتی موسڵ کە بەمە دەسەڵاتی شەریفیان (مەبەستی شا فەیسەڵە) لەعێراقدا بەهێز بوو.

٦-شۆڕشی شێخ سەعید هاندەرێك بوو بۆ تورکەکان بۆ خۆنزیککردنەوە لەئێران و توانیان لە ١٩٢٦/٤/٢٢دا پەیمانێك مۆربکەن و لەساڵی (١٩٣٢)شدا پەیمانێکی تریان مۆرکرد بۆ چارەسەرکردنی کێشەی سنووری نێوانیان.

٧-شۆڕشی شێخ سەعید وای لەتورکەکان کرد کە ئیتر کارێکی وانەکات دەستبخاتە ناو کاروباری ناوخۆی وڵاتانەوە.

٨-بەرامبەر بەو بڕیارەی مادە/٨ تورکیا بڕیاریدا ڕێگە بەهیچ دەوڵەتێك نەدات دەستبخاتە کاروباری ناوخۆیەوە.

٩-شۆڕشی شێخ سەعید تورکیای ناچارکرد سیاسەتی بەریتانیا قبوڵبکات بەرامبەر بوونی دەزگایەکی خۆماڵی بۆ کوردەکانی عێراق بەمەرجێك لەگەڵ ناوەڕۆکی پەیمانەکەی ڕۆژی ١٩٢٦/٦/٥دا گونجاو بێت (دەربارەی ئەم سەرنجەی ڕۆبەرت ئولسون لێرەدا باسیکردوە، لەڕاستیدا ئینگلیزەکان هەتاڕادەیەك ئەگەرچی دژی سەربەخۆیی یان ئۆتۆنۆمی بوون بۆ کوردی باشور لەچوارچێوەی حکومەتی عێراقدا، بەڵام ڕێگەشیان لەوە گرتبوو ڕەگەزپەرستەکانی عەرەب لەعێراقدا کارێکی وابکەن بەشێوەی تورکەکان ڕەفتار لەگەڵ کورددا بکرێت، بەڵکو زمانی کوردی قەدەغەنەکرا و ڕێگە لەوە نەگیرا ڕۆژنامە و گۆڤار بەزمانی کوردی دەربچێت و لەقوتابخانە سەرەتاییەکاندا خوێندن بەزمانی کوردی بووە و ژمارەیەکی زۆر لەفەرمانبەرە بەرزەکانی دەوڵەت هەتا پلەی وەزارەت و بگرە سەرۆك وەزیران و ژمارەیەك لەئەندامانی پەرلەمان و ئەنجومەنی پیران لەکوردەکان دادەنران و هەڵدەبژێردران).

١٠-شۆڕشی شێخ سەعید ئەنجامەکەی بەوە گەیشت تورك و بەریتانیا لەیەکتر نزیکببنەوە و تورك لەسۆڤیەت دووربخرێتەوە.

١١-ئەو شۆڕشە بوو بەهۆی ئەوەی ئیتر تورکەکانی لەوە نائومێدکرد بەهیچ جۆرێك هیچ دەستکەوتێکیان لەنەوتی ویلایەتی موسڵ دەستگیرببێت (جگە لەو پارە کەمەی لەکۆتاییدا کۆمپانیای نەوتی ئینگلیز دای بەتورکەکان و بەمە هەموو جۆرە پەیوەندیەکی تورکی بەنەوتی ویلایەتی موسڵەوە نەهێشت، هەروەکو

لەبەرگی دوهەمی کتێبەکەی شێخ مەحموددا سەرچاوە/٨٠ بەدووروودرێژ باسکراوە).

١٢-شۆڕشی شێخ سەعید بیانوی دایە دەستی تورکەکان بۆ چارەسەرکردنی باری ئاڵۆزی ناو وڵاتەکەیان دروشمی (عیلمانی-لادینی) بەرزبکەنەوە (بەڵام سەیر ئەوەیە لەجیاتی عیلمانی بەرەو فاشستێتی ملیاننا).

١٣-سەرنەکەوتنی شۆڕش بوو بەهۆی ئەوەی تورکەکان بەوپەڕی دڕندەیەتی و خوێنڕێژیەوە ڕەفتار لەگەڵ کورددا بکەن و ڕێگەی ئەوەیان لێگرتن دەنگ و هاواریان بگەیەننە میللەتانی تر.

١٤-شۆڕشی شێخ سەعید بیانوی بۆ تورکەکان دۆزیەوە بەناوی عیلمانیەوە دوورەپەرێزبن لەگەڵ دەوڵەتە ئیسلامیەکاندا.

## باسی نۆهەمی بەشی دەهەم

### بارودۆخی ناوچەکانی شۆڕشی پیران لەدوای شکاندنی شۆڕشەکە

لەگەڵ ئەوەشدا بەگرتنی شێخ سەعید و هاوکارەکانی و دادگاکردنیان لەدادگای ئیستقلالی دیاربەکردا لەناوەڕاستی ساڵی ١٩٢٥دا، بەڵام وەکو هەندێ سەرچاوە باسیانکردوە لەدوای خامۆشکردنی شۆڕشەکە و لەسێدارەدانی شۆڕشگێڕەکان هێشتا لەهەندێ ناوچەدا پەلاماردانی چەکدارانی کورد بەسەر سوپای تورك هەر درێژەیکێشابوو.

لەو ڕووەوە ڕۆبەرت ئولسون لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٨٤ لەلاپەڕە (١٢١)دا وتویەتی: تورکەکان لەمانگی حوزەیرانی ١٩٢٥دا نزیکی هەزار هەتا دووهەزار سەربازی تورکیان نارد بۆ داگیرکردنی (Goyan) کە چەکدارەکانی خۆیان نەدابوو بەدەستەوە و لەچیای (تور) هەردوولا بەرەنگاری یەکتربوونەوە و یەك دوو هەزار سەربازی تریشیان نارد بۆ تەواوکردنی کارەکەیان و لە٢٠ی حوزەیراندا هێزەکە گەیشتە (مدیات–Midyat) و دەستیان بەسەر هەموو مەڕوماڵاتی ناوچەی (لیج) و دیاربەکردا گرت و لەمەزادخانەدا نزیکەی (٣٠٠٠٠) مەڕیان فرۆشت و لەهەندێ شوێنی تریشدا دەستیان بەهەمان ڕەفتارکرد.

لەمانگی حوزەیران و تەموزی ١٩٢٥دا ئەو سەرۆکە کوردانەی مابوون بڕیاریاندا بەشەڕی پارتیزانی درێژە بەڕاپەڕینەکە بدەن، لەوانە عەشیرەتی (سیگو–Sigo) و (حەیدەر–Hayter) لەناوچەکانی (موش) و لەناوچەکانی (هیزان–Hizan) و (گارزان–Garzan) و (بشیری–Bishiri) و (سوسان–Sosan کە ڕەنگە زوزان بێت) بەدرێژایی پاشماوەی ساڵی ١٩٢٥ شەڕیانکرد و لەمانە تەنها هەر (نوح بەگ) پەنایبردەبەر شێخ مەحمود.

لەمارتی ١٩٢٧دا ڕاپۆرتەکانی بەریتانیا بەدووروودرێژی باسی بەرەنگاربونەوەی کوردیان کردوە لەگەڵ تورکدا کە گرنگترینیان ئەوەی سەید عەبدوڵای کوڕی شێخ عەبدولقادری شەمزینی بوو (مەبەست سەید عەبدوڵای باوکی دکتۆر عەزیز شەمزینیە) کە شێخ عەبدولقادری باوکی ڕۆژی ١٩٢٥/٥/٢٧ لەدیاربەکر لەسێدارەدرابوو لەگەڵ سەید محەمەدی کوڕی و حاجی ئاختە و

(پالول کورسەعید-Palulu Korsaid) و کەمال فەوزی و سـەید عەبـدوڵای شنەمزینی لەناوچەکانی وان و بدلیس بەرەنگاری هێزی تورك بووەوە کە ڕاپەڕینەکەی چەند مانگێکی خایاند و لەگەڵ ئەوەشدا هیچ عەشیرەتێکی نـاو عێراق ڕێگەی پێنـەدرا یارمەتی سەعید عەبدوڵا بدات و ئەو سەربازە کوردانەی لەتورکیاشەوە کاتی خۆی هاتبوونـە نـاو عێراقـەوە لەلایـەن حکومـەتی عێراقـەوە نێردرانـەوە بۆ تورکیـا. لـەو ڕاپەڕینـەی سـەید عەبـدوڵادا لەناوچـە سـەختەکانی شـەمزینیدا نزیکـەی (٢٠٠) سەربازی تورك کوژران و ئەنتلجسی فەرەنسا ڕایگەیاند خۆڕاگرتنی چەکدارەکانی ئـەم ڕاپەڕینـە زۆر لـەوەی شۆڕشـی پـیران بـەهێزتر بـوو، فەرەنسیەکان لایـانوابوو ئینگلیزەکان دەستیان هەبووە لەم ڕاپەڕینەدا.

ڕۆبەرت ئولسون دەڵێت: لەژێر فشاری هێزێکی گەورەی تورکدا سـەید عەبدوڵا ناچـاربوو ڕۆژی ١٩٢٥/٩/١٦ تـوانی خـۆی ڕزگاربکـات لەدەسـت ئـەو هێـزەی حکومەت کە لەشەمزیناندا بوو، لەوێوە کەوتە گفتوگۆکردن لەگەڵ (هنـری دوبس) مەندوبی سامی بەریتانیا لەبەغدا و داوای پەناهەندەیی بۆ خۆی و (٧٠٠) کەس کـرد کـە لەگەڵیـدا بـوو، (هنـری دوبـس) داخوازیەکـەی پەسـەندکرد بەمـەرجێك لەعێراقـەوە هـیچ جـۆرە هێرشـێك نەکاتـە سـەر خـاکی تورکیـا. ڕۆبـەرت ئولسـون ئەڵێت: ئینگلیزەکان نیازیان وابوو ئەگەر تورکەکان بەبڕیاری (عصبه الامم) قایل نەبن، دوورنەبوو ئەوسا ئینگلیزەکان یارمەتی سەید عەبدوڵایان دەدا.

وێنەی سەید عەبدوڵای شەمزینی

پرۆفیسۆر حەسرەتیان لەلاپەرە (۱۰۱)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٤٥ دەربارەی بزوتنەوەکانی دوای شکانی شۆڕشی پیران وتویەتی: لەدوای شۆڕشی پیران گەلێك ڕاپەڕین و بزوتنەوەی کورد ڕوویدا، هەرچەند دەزگاکانی ڕاگەیاندنی تورك ئەو بزوتنەوانەی هەمووی بەچەتەگەری و ڕاووڕوتکردن باسدەکرد، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا لەساڵی ۱۹۲٦دا کوردە شۆڕشگێڕەکان لەناوچەی (بایەزید)دا توانیبوویان فەوجێکی تەواوی تورك لەناوببەن و لەساڵی ۱۹۲۷دا شۆڕشێکی تر لەشاخەکانی (ساسون کە حەسرەتیان بەقەلاّی شۆڕشگێڕانی هەردوو نەتەوەی کورد و ئەرمەنی ناویهێناوە) بەسەرۆکایەتی (محەمەد عەلی یونس) و لەولاشەوە کوردەکانی (ئەرجیم) لەباکوری کەناری گۆلی (وان)دا شۆڕشێکیان بەرپاکرد و تورکەکان بۆ لەناوبردنی ئەو ڕاپەڕینە ئەوپەڕی دڕندەیەتی و دلّڕەقیان بەکارهێنا و تاوانەکانیان گەیشتبووە ڕادەیەك لاپەڕەکانی مێژوو بەشەرمەزاریەوە ئەو باسانە دەگرنە خۆیان و هەروەکو (د. س. زفریف) لەکتێبەکەیدا (مێژووی ویلایەتەکانی باکوری ڕۆژهەلاّتی تورکیا) بدلیس، چاپی ساڵی ۱۹٤۷ لەلاپەڕە (۱٤۹)ی ئەم کتێبەدا وتراوە: لەشاری (ئەرجیم) کەللەسەری بڕراوی کوردەکان لەدوو شوێندا کەڵەکەکرابوو، کەچی لەگەڵ ئەم هەموو تاوان و کوشتار و دەستدرێژیکردنانەشدا، لەگەڵ ئەو هەموو خوێنڕشتن و دڕندەیەتیەدا هێشتا حکومەت هەستی بەلاوازیی خۆی دەکرد و چەند یاسایەکی دەرکرد بۆ ڕاگوێزانی کورد بۆ ئەو شوێنانەی دەیتوانی دەستبەسەر هەڵوێستدا بگرێت.

دەربارەی ڕەفتاری دڕندانەی تورك بەرامبەر بەدانیشتوانی کورد لەدوای دامرکاندنەوەی شۆڕشەکەی پیران، بۆئەوەی هەواڵی تاوانەکانیان نەگاتە دەرەوە، حکومەتی تورکیا ئەو ناوچە کوردنشینانەی لەژێر جەور و ستەمی تورکەکاندا دەیاننالاّند هەمیشە وەکو ناوچەیەکی داخراوی سەربازی ڕەفتار لەگەڵ دانیشتوانەکانیدا دەکرا. دەربارەی ئەوە لەدوکیومێنتی ژمارە (Fo.۳۷۱-۵۲۳-۹)ی ڕۆژی ۱۹۲٦/٥/۹ لەڕاپۆرتێکدا لەژێر ناوی (Kurds of Turkey Reasearch)دا وتراوە: جمهوریەتی تورکیا لەسەر سیاسەتی داننەنان بەبوونی میللەتی کورددا دەڕوات و ناوچە کوردنشینەکانی بەناوچەیەکی داخراو داناوە و ڕێگە بەهیچ بێگانەیەك نادات بیگاتێ بۆئەوەی ئاگاداری بارودۆخی ئەو ناوچانە نەبێت کە چی تیادا ڕوودەدات، بەلاّم لەگەڵ ئەو هەموو هەڕەشەوگوڕەشانەی کە دەیکات تا ئێستە نەیتوانیوە میللەتی کورد بێدەنگ بکات.

دەربارەی ئەو بزوتنەوە و ڕاپەڕینانەی دوای شۆڕشەکەی پیران ڕوویدابوو، بێجگە لەو بزوتنەوانەی ڕۆبەرت ئولسون و پرۆفیسۆر حەسرەتیان باسیانکردوە لەدوو دوکیومێنتی تردا باسی هەندێ جموجوڵ و بزوتنەوەیەی تری کورد کراوە:

دوکیومێنتی یەکەم ژمارە (Fo.٣٧١-١٤٥-٨٠) کە لەکتێبەکەی دکتۆر (ولید حمدی)دا سەرچاوە/٣٣ لەلاپەڕە (٣٦٩)دا ئاماژەی بۆ ئەو دوکیومێنتە کردوە، بەپێی ئەو دوکیومێنتە (Major Oleary) نامەیەکی ناردوە بۆ (Sir.G. Clerk) لەگەڵ ڕاپۆرتێکی پاشکۆی عەسکەری بەریتانیا لەئەستەمبوڵ و لەو ڕاپۆرتەدا باسی جموجوڵێکی سەلاحەدینی کوڕی شێخ سەعیدی کردوە بەهاوکاری ئیبراهیم بەگ کە سەرۆکی عەشیرەتی جەلالیەکان بووە لەگەڵ (خالس بەگی کوڕی شێخ عەبدولمەجید) و کوڕانی (کورحسێن)ی سەرۆکی عەشیرەتی (حیدوانلی) و بەهەموویان دەستیانکردوە بەچالاکی بۆ دەستپێکردن بەڕاپەڕین و بزوتنەوەیەك دژی تورکەکان کە بەوپەڕی دڕندەیەتیەوە بەربووبوونە گیانی هەموو کوردێك بێجیاوازی و بەپێی ئەو ڕاپۆرتە ژمارەیەك لەکوردە ناسراوەکان پەیوەندیان لەگەڵ یەکتردا هەبووە و بڕیاریاندا نەخشەیەك ئامادەبکەن بۆ دەستپێکردن بەو ڕاپەڕینە ئەگەر هات و حکومەتی تورك ڕەفتاری خۆی نەگۆڕێت بەرامبەر بەکورد.

لەکۆتایی ئەو ڕاپۆرتەدا وتراوە: لەمانگی شوباتی ١٩٣٠دا (عەلی خالس بەگ) و سەلاحەدینی کوڕی شێخ سەعید لەلایەن حکومەتی تورکەوە گیران و هەواڵ بڵاوبووەوە عەشایری جەلالی پەلاماری ئەو هێزەی تورکیان دابوو کە لەناوچەی ئاراراتدا بوو، خالس بەگ توانیبووی خۆی دەربازبکات و بگاتە ناو خاکی ئێرانەوە و لەوێوە دەستیکرد بەهاندانی خەڵك بۆ ڕاپەڕین و شۆڕش دژی حکومەتی تورکیا.

لەدوکیومێنتی دوهەمدا ژمارە (Fo.٣٧١-١٤٥-٧٩) ڕۆژی ١٩٣٠/٣/١٧ ڕاپۆرتێکی مستەر (M. Edmonds-ئەدمۆنس)ی تیایە کە لەئەنقەرەوە ناردویەتی بۆ مستەر هندرسن (کە لەنێوانی ساڵانی ١٩٢٩-١٩٣١)دا وەزیری دەرەوەی بەریتانیا بووە لەو ڕاپۆرتەی ئەدمۆنسدا وتراوە پێکادان لەنێوان هێزەکانی حکومەتی تورك و چەکدارەکانی کورددا ڕوویداوە لەناوچەی (قرافوش)ی سەر بە(بایەزید). بێگومان تورکەکان تەنها بەدامرکانەوەی شۆڕشەکەی پیران دڵیان ئاوی نەخواردبووەوە، بەڵکو بەپێی ئەو نەخشە دووروودرێژەی کێشابوویان نیازیان وابوو لەناو هەموو خاکی تورکیادا هیچ کەسێك نەمێنێت کە دان بەوەدا نەنێت بەڕەگەز تورکە، بۆیە بەئاشکرا بڕیاریاندا چۆن بەرلەمە بەزۆر ئەو یۆنانی و

ئەرمەنیانەی لەتورکیادا بوون یان دان بەوەدا بنێن کە خۆیان بەتورک دەزانن یان دەبوو لەناوببرانایە یان ئاوارەبکرانایە بۆ دەرەوەی وڵات بۆئەوەی تۆوی هیچ نەتەوەیەکی تری غەیری تورک لەتورکیادا نەمێنێت.

بەڵگەش بۆ ئەمە لەدوکیومێنتێکی بەریتانیادا ژمارە (C.O.٧٣٠-٦٩-C. ٢٣٣٧٨) ڕۆژی ١٩٢٦/١٢/٢٠ باسی زیارەتێکی (هنری دوبس)ی مەندوبی سامی بەریتانیای کردوە لەبەغدا کە بەزیارەتی ڕەسمی چووە بۆ ئەنقەرە و لەڕۆژی ١٩٢٦/١٢/٨دا و لەنامەکەیدا وتویەتی: لەگەڵ (سێر جۆرج کلارک) ساتێك لەئەستەمبوڵەوە چووم بۆ ئەنقەرە، لەگفتوگۆکردنماندا لەگەڵ مستەفا کەمالی سەرۆك کۆمار و تۆفیق ڕوشدی بەگی وەزیری دەرەوەی تورکیادا بۆمدەرکەوت هەردووکیان هەڵوێستیان باشە دەربارەی بارودۆخی سەر سنووری عێراق و لێرەدا بەپێویستی دەزانم چەند بۆچوون و سەرنجێکی خۆم دەرببڕم بەرامبەر بەو گفتوگۆیانەی لەگەڵیاندا کردبوومان و بۆم ڕوونبووەوە تورکەکان نیازیان وایە چۆن وەختی خۆی یۆنانیەکان و ئەرمەنیەکانیان لەتورکیا دەرکردبوو، بەوجۆرەش ڕەفتار لەگەڵ کورددا بکەن، کە ژمارەی کورد تەنها لەناوچەی ئەنادۆڵدا هەرچەند تورکەکان بە(٥٠٠) هەزار کەسیان دادەنێن بەڵام ژمارە ڕاستیەکە بریتیە لە(١,٥) ملیۆن، هەرچەند لەوانەیە تۆفیق ڕوشدی بەگ ئەوەی کە دەیوت دەربارەی کورد بەڕاستی نەبووبێت و هەمیشە هەردووکیان ئەوەیان دوبارە دەکردەوە کە ئەو کوردە بێمێشکانە لەو جۆرە نین کە بهێنرێنە ژێربار و بەرەو شارستانیەتی بڕۆن، بەپێی ئەو قسانەی ئەوان لاموایە دەبێ خۆمان ئامادەبکەین بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ تووشی کێشەیەکی گەورە دەبین لەگەڵیاندا لەسەر سنوور، کە دوورنیە بەدەیان هەزاریان والێبکەن ناچاربن ڕووبکەنە ناو خاکی عێراقەوە کە لەناو عێراقدا زەویوزارێکی ئەوتۆ نی‌یە بەشی ئەوانە بکات و خۆ ئەگەر لەسەر سنووریش بمێننەوە ئەوا کوردەکان هەر وازناهێنن و پەلاماری تورکەکان ئەدەن کە ئەمە لەئەنجامدا دەبێتە هۆی تێکچونی نێوان هەردوو حکومەت و لاموایە کارەکە تەنها هەر بەعێراقەوە ناوەستێت بەڵکو لەوانەیە زۆریان ڕووبکەنە سوریا و ئێران، بۆیە بێجگە لەعێراق پێویستە ئەو دەوڵەتانەش ڕێگەی ئەمە نەدەن بەتورکەکان کە کارێکی وابکەن.

ئیمزا

هنری دوبس (H. Dobes)

بۆ تەواوکردنی باسی بارودۆخی ناوچە کوردیەکان لەدوای لەدامرکانەوەی شۆڕشی پیران، لەسەرەتای باسی شۆڕشەکەی شێخ سەعیدا باسی بنەماڵەی شێخانی پیرانمان کرد بەر لەدەستپێکردنی شۆڕشەکە و لەکۆتایی ئەم باسەدا بەپێویستم زانی باسی هەندێ لەئەندامانی ئەو بنەماڵەیە بکەم کە لەکاتی شۆڕشەکەدا و لەدوای شۆڕشەکە لەهەندێ سەرچاوەدا باسیانکراوە، ڕۆبەرت ئولسون لەکتێبەکەیدا باسی چەند کەسێکی لەوانە کردوە وەکو:

١-شێخ تاهیر و شێخ مەهدی کە هەردووکیان برای شێخ سەعید بوون: هەروەکو ڕۆبەرت ئولسون باسیکردوە لەدوای شەهیدبوونی شێخ سەعیدی برایان هەردووکیان خۆیان نەدا بەدەستەوە تا ئەوکاتەی حکومەتی تورک بڕیارێکی لێخۆشبوونی گشتی دەرکرد و بەپێی ئەو لێخۆشبوونە مانەوە هەتا هەردووکیان بەشێوەیەکی ئاسایی کۆتایی بەژیانیان هاتبوو.

٢-شێخ بەهائەدین: برا بچوکی شێخ سەعید بووە، لەماڵەکەی خۆیدا لە(Henis-هنیس) کوژراوە.

٣-شێخ عەبدولڕەحیم: بەپێی باسەکەی ڕۆبەرت ئولسون شێخ عەبدولڕەحیمی برای شێخ سەعید، (ئەمینەخان)ی کچی حەسەن ئاغای مێنابوو کە یەکێك بووە لەدەوڵەمەندەکانی پیران و لەدوای شکانی شۆڕش پەنایبردەبەر سوریا (لەباسی دادگاکردنی شۆڕشگێڕەکاندا لەدادگای ئیستقلال لەدیاربەکر، ناوی شێخ عەبدولڕەحیم نەهاتوە کەوا دیارە خۆی نەداوە بەدەستەوە)، بەڵام لەدوای ماوەیەك گەڕایەوە و خۆیدا بەدەستەوە بەڵام لەساڵی (١٩٣٧)دا تورکەکان هەر وازیان لێنەهێنا و لەسێدارەیاندا، کە هۆی لەسێدارەدانی وەکو ڕۆبەرت ئولسون باسیکردوە، بەوە تاوانبارکرابوو لە ١٩٣٧/٣/١٥ لەگوندی (سردی) نزیك بە(لیجە) دوو پۆلیسی تورکی کوشتبوو، بەرلەگرتنی بۆ ماوەیەك خۆی شاردەوە هەتا لەدواییدا لە ١٩٣٧/٦/١٩دا لەشاری (باتمان) گیرا و هەڵواسرا. ڕۆبەرت ئولسون دەڵێ: (زولکوف)ی کوڕی شێخ عەبدولڕەحیم لەدواییدا بوو بەلایەنگری حکومەت و کرا بەموتەسەڕیفی دیاربەکر.

٤-شێخ سەلاحەدینی کوڕی شێخ سەعید: لەدوای شکانی شۆڕش چووە عێراق و لەوێ نوری سەعیدی سەرەك وەزیر گرتیەخۆی و چووە کۆلێژی عەسکەری بۆئەوەی ببێت بەئەفسەر، لەساڵانی سیەکاندا گەڕایەوە بۆ تورکیا، بەڵام پاش ماوەیەك بەتاوانی ئەوەی پەیوەندی بەحیزبێکەوە هەبووە لەباکوری

کوردستان گیرا و خرایە زیندانەوە و ماوەی دوازدە ساڵ لەزینداندا مایەوە. بەڵام (حەسەن عەرەفە) لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٥٢ وەرگێڕانی بۆ فارسی، وتویەتی: سەلاحەدین لەدوای شۆڕش پەنایبردە بەر عێراق بەیارمەتی ئینگلیزێك کە (ئەرشیبالد هاملتن) بوو (مەبەستی حەسەن عەرەفە نوسەری کتێبی Boads Through Kurdistan) کە لەساڵی ١٩٥٨دا لەلەندەن چاپکراوە و هاملتن ئەندازیارێك بووە رێگەی رەواندزی کردبووەوە کە لەو کتێبەیدا بەدوورودرێژی باسی باری کۆمەلایەتی کوردی کردوە).

بەپێی کتێبەکەی رۆبەرت ئولسون، سەلاحەدین لەباشوری کوردستاندا پەیوەندی بەکۆمەڵەیەکەوە هەبووە بەناوی (کۆمەڵی دۆستانی کورد) کە لەلایەن کوردە ئاوارەبوەکانەوە دامەزرابوو، لقێکی ئەو کۆمەڵەیە لە(حەلەب و دیمەشق) بوو (هیچ سەرچاوەیەك باسی کۆمەڵێکی وای نەکردووە بەو ناوەوە کە دوورنییە مەبەست لەکۆمەڵی خۆیبوون بێت کە لەبەرگی سێهەمدا باسی دروستبوونی دەکەین).

بەپێی کتێبەکەی حەسەن عەرەفە، سەلاحەدین دەستی لەخوێندن هەڵگرت و (بەمەدا دەردەکەوێ قوتابخانە عەسکەرییەکەی تەواو نەکردوە)، هەموو ژیانی خۆی بۆ کاروباری سیاسی تەرخانکرد بۆئەوەی تۆڵەی باوکی بکاتەوە، بۆیە بڕیاریدا بەهەر نرخێك بێت بگەڕێتەوە بۆ باکوری کوردستان (هیچ دوورنییە لەدوای دەرچوونی ئەو لێخۆشبوونە گەڕابێتەوە کە حکومەتی تورك لەماوەیەکدا دەریکردبوو)، وە لەسەرەتادا لە(هینس و لەئەرزڕوم)ەوە پەیوەندی بەکوردە ناسیۆنالیست و کۆمەڵە کوردیەکانی باکوری کوردستانەوە کرد (بەڵام وەکو وتمان رۆبەرت ئولسون وتویەتی بۆ ماوەی دوازدە ساڵ خرایە زیندانەوە).

لەبەرگی سێهەمدا لەباسی شۆڕشی ئاراراتدا ئاماژە بۆ کتێبەکەی کریس کۆچرا دەکەین کە هۆی ئەو گرتنەی سەلاحەدین ئەوە بووە پەیوەندی هەبووە بەشۆڕشی ئاراراتەوە. هەروەها (باسیل نیکیتین)یش لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٤٠ وتویەتی: سەلاحەدین کە لەعێراقەوە لەدوای دەرچوونی بڕیاری لێخۆشبوون گەڕایەوە و چووەپاڵ شۆڕشەکەی دەرسیم کە دیارە بەرلەمەش وەکو وتمان پەیوەندی بەشۆڕشگێڕانی ئاراراتەوە هەبووە.

٥-مەلیك فورات کوڕی شێخ سەباحەدین کوڕی شێخ بەهائەدینی برای شێخ سەعید بووە، شێخ سەباحەدینی باوکی مەلیك فورات لەساڵی (١٩٤٧)دا کۆچی

دوایی کردوه. مەلیك فورات کچێکی عەلی ڕەزای کوڕی شێخ سەعیدی هێناوە و لەدواییدا مەلیك فورات لەنێوان سالآنی (١٩٥٥-١٩٦٠)دا بوو بەئەندامی پارلەمان و لەسالّی ١٩٩١دا بووە بەئەندامێکی چالاك لەحیزبی (الطریق القویم) کە وەکو ڕۆبەرت ئولسون باسیکردوە تانسۆ چیللەر و سلێمان دیمیریل دەیبەن بەڕێوە.

٦-فوئاد فورات کوڕی عەلی ڕەزای کوڕی شێخ سەعید بووە، لەسالّی ١٩٧٣دا ئەندامێکی سەربەخۆ بووە لەپارلەماندا و پاشئەوە بووە بەئەندامێکی چالاك لەحیزبی (الخلاص الوطن) کە لەپاشدا بووە بە(حیزبی رفاه) بەسەرکردایەتی نەجمەدین ئەربەکان.

٧-عەلی ڕەزا سبتی ئوغلو: بچوکترین کوڕەزای شێخ حەسەن بووە کە شێخ حەسەن خالّی شێخ سەعید بووە، عەلی ڕەزا سبتی ئوغلو لەپێشدا لە(حیزبی عەدالەت)دا بووە و لەسالآنی (١٩٧٣-١٩٧٤)دا بووە بە(وزیر الدولە) لەحکومەتەکەی (بلّند ئەجەوید)دا و سالّی ١٩٨٧ لەویلایەتی (ئەلازگ)دا بووە بەئەندامی پارلەمان لەڕیزی حیزبی (الطریق القویم).

## باسی دەهەمی بەشی دەهەم

### هەڵسەنگاندنی شۆڕشەکە و ئەو کەموکوڕی و ڕەخنانەی لێیگیراوە

شۆڕشی پیران شۆڕشێکی جەماوەریی فراوانبووە بۆ ڕزگارکردنی کوردستان لەچنگی ڕژێمێکی دیکتاتۆری فاشست کە نرخی مرۆڤایەتی نەزانیوە و لامواپە ئەگەر کورد شۆڕشیشی دژی ئەو ڕژێمە نەکردایە حکومەتی تورك هەر وازی لەبەجێهێنانی ئەو نەخشەیەی خۆی نەدەهێنا و لەسەرخۆ وردە وردە هەمان تەقەلای ئەدا بۆ لەناوبردنی کورد و تواندنەوەی لەبۆتەی توركدا هەروەکو چۆن لەگەڵ یۆنانییەکان و ئەرمەنیەکاندا کردبووی، ئەرزیروم کە مانای خاکی ڕوم یا یۆنان دەگرێتەوە کە ئەوان بەرلەوەی عوسمانییەکان بگەنە ئەو خاکەی لەدواییدا ناوینرا تورکیا، شاری (قسطنطينيه)یان دروستکردبوو کە لەدواییدا کرا بەئەستەمبوڵ، بەو جۆرەش تەنگیان بەکورد هەڵچنیبوو قۆناغ لەدوای قۆناغ خاکەکەی بەتۆرانییەکان پڕکرایەوە و مایەوە سەرئەوەی چۆن نەتەوەی کورد لەناوببرێت و دەربەدەربکرێت، خاوەن ماڵ لەماڵی خۆی بێبەش بکرێت و داگیرکەر دەستی بەسەرابگرێت، کە ئەمە نەخشەیەك بوو دەمێك بوو تۆرانییەکان ئامادەیان کردبوو.

هەرچۆنێك بووبێت لەشۆڕشەکەی بەدرخان پاشا و شێخ عوبەیدولاّدا هەرچەند هەردوو شۆڕشەکە شکا و زیانێکی زۆر بەکوردی ناوچەکانیان گەیشت، بەلاّم هێشتا بڕیاری ئاوارەکردن و ڕاگوێزان شتێك نەبوو بەبیری خەلیفە و سوڵتانی عوسمانیدا بێت بەرامبەر بەکوردی هاوئاینی خۆیان، بەلاّم لەدوای شەڕی جیهانی ئەو نەخشەیەی تاقمی ژون تورك و (اتحاد و ترقی) بەر لەشەڕ بۆیان بەجێنەهێنرابوو، پاشئەوەی کەمالییەکان بوون بەدەسەلاّتدار و خەلافەت و سەڵتەنەتیان هەڵوەشانەوە کەوتنە سەر هەوای بیرکردنەوە لەدروستکردنەوەی ئیمپراتۆریەتێکی فراوان (پان تورکیزم) کە بەخەیاڵی خۆیان هەروەکو چۆن لەزەمانی سوڵتانە دەستڕۆیشتوەکانیاندا گەیشتبوونە دەروازەکانی ڤیێنا، دوایئەوەی دەرگای ئەو بەهەشتەیان لێداخرا ئیتر بیریان لەوە کردەوە چۆن ئەو نەتەوانەی هەزاران ساڵ بوو لەناو خاکی باپیرانی باپیرانیاندا ژیابوون کە بریتی بووە لەکوردستان و ئەرمینیا هەمووی پێشێل بکەن و دانیشتوەکانیان دەربەدەر

بکـــەن و تۆڵـــەی خۆیـــان لـــەکورد و ئەرمـــەنی بکەنـــەوە لەکاتێکـــدا دەوڵەتـــە هاوپەیمانـــەکانی ئـــەورووپا خۆیـــانی خســـتبووە ســـەر ســـاجی عـــەلی و ئیمپراتۆریەتەکەیانی لەناوبردبوو.

لەدوای شەڕی جیهانی کە هێشتا کەمالیەکان تازە خۆیان گرتبوو توانیبوویان ببن بەجێگری خەلیفەی ئەستەمبوڵ، کورد هێشتا تا ئەوسا نەکەوتبووە ژێر باری جەور و ستەمی کەمالیەکانەوە چونکە ئەمانە هێشتا هەر فریای چارەسەرکردنی کێشەی خۆیان کەوتبوون لەلایەکەوە لەگەڵ دەوڵەتە هاوپەیمانەکان و لەلایەکی ترەوە لەگەڵ تـاقمی سـەر بەخەلیفـەی ئەسـتەمبوڵ کـە لەسـەرەتادا دەوڵەتـە هاوپەیمانەکان بۆ ماوەیەك لایەنگریان بوون، کوردیش لەگێژاوی ئەو بارودۆخەدا لەگەڵ ئەوەشدا لەسـەرەتادا چەند کۆمەڵ و ڕێکخراوێکی هەبووە و ڕۆژنامەی بەزمانی خۆی دەرکردووە و پەیمانی سیڤەر لەئارادابووە بەهیوای دروستکردنی حکومەتێکی کوردی بەڵام بەداخەوە کورد ئەو هەل و دەرفەتە مێژووییەی لەکیس خۆیدا و لەماوەی لاوازێتی و کەم دەسەڵاتی کەمالیەکاندا نەیتوانیبوو دەزگایەکی بەڕێوەبردن بۆ خۆی سازبکات بۆئەوەی بیکات بەبنکەیەکی هەمیشەیی ئەوتۆ دەوڵەتە هاوپەیمانەکان و تورکیش حسابێکی بۆ بکەن و بەپێچەوانەوە دەرد و نەخۆشی خۆخۆیی و ئاغایەتی و کەس بەکەس ڕازینەبوون ئەو هەلە زێڕینەی لەکیس کورد دا و زۆری پێنەچوو تورکەکان دوای لەناوبردنی شۆڕشی ئەرمەنی و سەرکەوتن بەسەر یۆناندا توانیبوویان مەبەستەکانی خۆیان بهێننەدی، سیڤەریان لەلۆزاندا زیندەبەچاڵ کرد لەڕێگەی نزیکبوونەوە لەسۆڤیەت وایان لەئینگلیزەکان کرد دان بەسەربەخۆیی کەمالیەکاندا بنێت و گوێی خۆی کەڕبکات و چاوی بنوقێنێت بەرامبەر بەو هەموو تاوانانەی لەیۆنانیەکانی پاشماوەی ناو خاکی تورکیا لەکورد و لەئەرمەنی دەکرا.

ساتێك کورد بەخۆی زانی ئەوا تورك شمشێرەکانی و نوکەنێزەی سەر چەکەکانیان ئاڕاستەی سنگی کورد کردووە و بەئاشکرا داوا لەکورد دەکات واز لەنەتەوایەتی خۆی بێنێت و خۆی بەتورك لەقەڵەم بدات و زمانی تورکی بەکاربێنێت لەجیاتی زمانی باوباپیرانی، ئیتر کورد چارینەما و دەستیدایە چەك و لەدوو شوێندا دوو تەقەلای سەرنەگرتویدا کە بریتی بوو لەشۆڕشی یەکەمی دەرسیم و شۆڕشی کوچگیری کە هەردووکیان بەئاسانی لەناوبران و کە کۆمەڵی ئازادیش دروستکرا هەندێ لەڕۆشنبیران و ئەفسەران و سەرۆك عەشیرەتەکان

کەوتنە خۆیان و شۆڕشی پیرانیان دەستپێکرد، تازە کار لەکار ترازابوو، تورك خۆی گرتبوو، خۆی پڕچەك کردبوو، سۆڤیەت دۆستی بوو، ترسی دەوڵەتە هاوپەیمانەکانی نەبوو، دوایئەوەی لەگەڵ هەندێکیاندا پەیمانی دۆستایەتی مۆرکردبوو، کورد کە دەستیکرد بەشۆڕش هەموو چەکەکانی بریتی بوو لەچەکی کۆن و ژەنگاوی، هەندێکی بریتی بووە لەتفەنگی ساچمەزەنگ و تفەنگی ڕاو، شۆڕشگێڕەکانی زۆربەیان بریتی بوون لەو جوتیارانەی لەناو زەویوزارەکانی دەرەبەگەکانی کورددا ژیابوون، لەولاشەوە کۆنەقینی نێوان عەلەویەکان بەرامبەر بەسونیەکان و بەو سەرکردانەی کاتی خۆی لەسەرکردەکانی سوارەی حەمیدیە بوون کە عەلەویەکان تووشی گەلێك ناخۆشی و سزابووبوون بەهۆی ئەوانەوە، ئەمانە لەجیاتی ئەوەی ببن بەلایەنگری شۆڕش چوونەپاڵ هێزەکانی حکومەت وەکو لەباسی شۆڕشەکەدا ئەم ڕاستیە ڕوونبۆتەوە.

لەهەمووی جێگەی سەرسوڕمانتر ئەوەیە، لەچاوپیاخشاندنێك بەوانەی لەلایەن تورکەکانەوە دادگاکرابوون و لەسێدارەدرابون یان زیندانکرابوون، لەباسی شۆڕشەکەدا ناوی ئەفسەرێك نایەتە بەرچاو کە بەکردەوە لەشۆڕشەکەدا بەشداری کردبێت بەڵکو شێخ سەعید سەرکردەی هێزەکانی خۆی دەستنیشانکرد وەکو لەشوێنی خۆیدا باسمانکردوە و دەردەکەوێت سەرکردەی ئەو هێزانەی کورد هەمووی بریتی بووە لەشێخ و ئاغا و دەرەبەگ و سەرۆك عەشیرەت و ناوی تاقە ئەفسەرێك لەو شۆڕشەدا نەهاتوە، کە ئەمە بەڵگەی ئەوە بووە شۆڕشێکی بێ‌نەخشە و بێ‌تەکتیك و بێ‌ستراتیژ و شۆڕشێکی بەرەڵلا و بێ‌حساب بووە و هەر تاقمە بەئارەزوی خۆی و بەپێی نەخشەی خۆی و بۆچوونی خۆی ڕوویکردۆتە شۆڕش و هیچیشیان شارەزای لەشکرکێشی نەبوون و ئەگەر شەڕی پارتیزانیشیان کردبێت هەموو شتێکیان بێ‌حساب بووە بۆیە شۆڕشەکە خۆی نەگرت و لەپاش یەك دوو مانگ لەناوبرا.

لەڕاستیدا تورکەکان کە خاوەنی سوپایەکی پڕچەکی مەشقپێکراوبوون وەنەبێ ئاگاداری هەڵسوکەوتی سەرکردەکانی شۆڕشی کورد نەبووبن، بەڵکو حسابی هەموو شتێکیان کردبوو، بەرامبەر بەو عەشیرەتە کوردانەی بووبوون بەهاوکاری کورد ئەوانیش ژمارەیەکی زۆری سەرکردەی ئەو عەشیرەتانەیان ئامادەکردبوو شانبەشانی خۆیان لەشۆڕشگێڕانی کورد بدەن و لەولاشەوە دەزگاکانی ڕاگەیاندنی حکومەت بەڕێکوپێکی دەستیانکردبوو بەبلاوکردنەوەی

پڕوپاگەندە دژی شۆڕشەکە و شۆڕشگێڕان و ڕۆژنامەکانیان بۆ زڕاندنی ناوی شۆڕش و شۆڕشگێڕەکان دەیان درۆودەلەسەیان بڵاودەکردەوە، بۆ نمونەی ئەمە نمونەیەکی بچوك دەهێنینەوە کە کریس کۆچرا لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٤١ ئاماژەی بۆ کردوە، تورکەکان توانیبوویان کاربەدەستێکی فەرەنسی کە لەبانقی عوسمانیدا کاریکردبوو نامیلکەیەکیان پێبڵاوکردبوەوە بەفەرەنسی دەربارەی شۆڕشەکە بەناوی (لەدوای ڕاپەڕین)ەوە بڵاویکردبوەوە، لەو نامیلکەیەدا شێخ سەعیدی سەرکردەی شۆڕشەکەی بەکابرایەکی نەزان و کێوی باسکردوە بەبێئەوەی کوردێك وەڵامی ئەو نامیلکەیە بداتەوە.

گەلێك نوسەر لەوانەی بایەخیان بەشۆڕشی پیران داوە هەریەکەیان بەپێی بۆچونی خۆی ڕەخنەی لەشۆڕشەکە و لەشۆڕشگێڕان گرتوە و لەبەرئەوە ئەو نوسەرانە هیچیان دوژمن و نەیاری کورد نەبوون بۆیە بەپێویستم زانی کورتەباسێکی ڕەخنەی ئەوانە بخەمە پێشچاو.

مارتن ڤان برونسون و هاوڕێکەی لەسەرچاوە/١٠٥دا وتویانە لەشۆڕشەکەدا دوو شێوە دروشم بەرزکرابوەوە و لەکاتی دادگاکردنی شێخ سەعید و شۆڕشگێڕەکاندا حکومەت هەوڵی ئەوەی دابوو دروشمی یەکەمی شۆڕشەکە کە بریتی بووە لەئاین لەلایەن شۆڕشگێڕەکانەوە کرابوو بەدروشمی سەرەکی و دروشمی ناسیۆنالیستی ئەوەندە بایەخی پێنەدرابوو، بەڵام شێوەی دوهەمیان بریتی بووە لەوەی دروشمی ناسیۆنالیستی دروشمێکی سەرەکی بووە لەشۆڕشەکەدا بەڵام لەژێر پەردەی ئایندا بووە.

دەربارەی شێوەی دوهەم (فەهمی بیلال ئەفەندی) کراوە بەنمونە کە کابرایەکی عیلمانی بووە، بەڵام مرۆڤێکی ئازا و بەجەرگ و خۆبەختکەر بووە و ڕێبازی ناسیۆنالیستی بەتاقە ڕێبازێکی ڕاست زانیوە بۆ سەرگرتن و سەرکەوتنی شۆڕشەکە (بەداخەوە نەمزانی ئەم فەهمی بیلالە کێ بووە) بەو جۆرە شێوەی یەکەمیان لەشێخ سەعیدا ڕەنگیدابووەوە کە هەوڵیدابوو لەڕێگەی دروشمی ئاینەوە زۆرترین کورد بەکێشبکات بۆ هاوکاریکردن لەشۆڕشەکەدا و بۆیە هاواریدەکرد و دەیوت: (ئیسلام لەمەترسیدایە و هەڕەشەی لێدەکرێت بۆیە پێویستە بپارێزرێت).

هەردوو نوسەری سەرچاوە/١٠٥ لایانوایە ڕوناکبیرانی کورد ئەوانەی هەوڵیانئەدا شۆڕشەکەیان لەڕێبازی ناسیۆنالیستیەوە سەربکەوێت دەیانزانی

تەنها هەر بەبەرزکردنەوەی ئەو دروشمانە سەرناکەوێت و باش لەوە گەیشتبوون زۆربەی عەشیرەتەکان و جوتیارانی کورد بەدەنگی ئەو هاوارەوە دەچوون کە هەوڵبدرێت ڕێگە نەدرێت بەهەڵوەشانەوەی خەلافەتی ئەستەمبوڵ بۆیە کۆمەڵی ئازادی کە ڕێبەری شۆڕشەکە بوو هەوڵیئەدا لەپشت پەردەوە کاربکەن، بۆیە فەرماندەیەتی شۆڕشەکەی بەسەرۆك عەشیرەت و شێخەکان سپاردبوو (کە ئەگەر ئەمە ڕاستبووبێت لامواية یەکێك بووە لەو هەڵانەی کرابوو، چونکە وەکو لەپێشەکی ئەم باسەدا لێیدواین نەشارەزایی ئەوانە لەکاروباری لەشکرکێشی و نەکردنی ئەو ئەفسەرانەی سەر بەئازادی بەفەرماندەی هێزەکانی شۆڕش هۆی سەرەکی سەرنەکەوتنی شۆڕشەکە بووە).

سەرچاوە/١٠٥ لەسەریئەڕوا و دەڵێت: گوندنشینەکان بەتوندی بەئاینی ئیسلامەوە گرێدرابوون و قسە و کرداری شێخەکان لای ئەوان بڕشت و قورساییەکی تەواوی هەبووە هەر لەبەرئەوەش بووە شێخ سەعید نازناوی (امیر المجاهدین)ی لێنرابوو، هەردوو نوسەرەکە ڕۆڵی شێخەکانیان لەشۆڕشەکەدا بەم شێوەیە هەڵسەنگاندبوو:

١-لەبەرئەوەی بەرێبەری ئاینی دەزانران، بۆیە لەناو خەڵکدا پلە و پایەیەکی تایبەتیان هەبووە و ڕێزیان لێدەگیرا.

٢-شێخەکان لەناو عەشیرەتەکاندا دەسەڵاتدار و قسەرۆیشتوو بوون و هەتا ڕادەیەك توانیبوویان لەهەندێ ڕووداودا کێشەی ناویان و ئەو ناکۆکیەی لەنێوانیاندا ڕوویبدایە چارەسەریان دەکرد.

٣-هەموو شێخەکان سەر بەڕێبازی نەقشبەندی بوون و لەچوارچێوەی ئەو یەکبوونەیاندا بەپیر یەکتریەوە دەچوون.

هەرچۆنێك بووبێت بزوتنەوەی شێخەکانی شۆڕشی پیران تاڕادەیەك لەوەی شێخی سنووسی دەچێت کە لەلیبیا دژی ئیتاڵیەکان کردبووی بەڵام ئەوەی شێخ سەعید بۆیە سەرنەکەوت چونکە شۆڕشەکە نەخشەیەکی ستراتیژی نەبوو کە پەیڕەوی ئەو نەخشەیە بکات بۆیە نەگەیشت بەئامانجی خۆی.

(ولید حمدی) لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٢٣ باسی ڕاپۆرتێکی باڵیۆزی بەریتانیا (لندسای) کردووە کە لەڕۆژی ١٩٢٥/٣/٣دا ناردبووی بۆ (چەمبرلن) کە لەو ڕاپۆرتەدا باسی بڵاوبوونەوەی هەواڵێکی کردووە کە گوایا لەو ڕۆژانەدا کوردەکان هەوڵی ئەوەیاندابوو ئەگەر شۆڕشەکەی کورد سەربگرێت (سەلیم ئەفەندی) کوڕی

سوڵتان عەبدولحەمیدی خەلیفەی لابراو دەکەن بەمەلیکی کوردستان (کە ئەوسا سەلیم ئەفەندی ئاوارە بووە لەبەیروت)، کریس کۆچراش لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٤١ هەروای بۆچووە کە دیارە سەرچاوەی هەردووکیان هەریەکێك بووە.

زنار سلوپی لەلاپەڕە (١١١)دا سەرچاوە/٥٧ ڕەخنەی لەشۆڕشەکە بەم شێوەیە گرتووە کە وتویەتی: لەگەڵ ئەو هەموو قارەمانیەتی و لەخۆبوردنەی شۆڕشگێڕان لەو شۆڕشەدا نواندبوویان، بەڵام بەداخەوە لەبەر نەبوونی نەخشەیەکی ڕێکوپێك و بەرەڵایی لەکاروباری لەشکرکێشیدا و نەبوونی سەرکردایەتیەکی ڕێکوپێکی لێهاتوو بوو بەهۆی ئەوەی ڕەنگدانەوەی عەقلیەت و بۆچوونی عەشیرەتی ببێت بەهۆی ئەوەی هەموو ئەو هەوڵ و کۆششەی کورد دابووی بەفیڕۆچوو، کە بۆ نمونەی ئەم بەرەڵڵاییە وتویەتی کاتێك لەمانگی شوباتی ١٩٢٥دا، ئێمە کە ئەندامی کۆمەڵی ئازادی بووین هەواڵی کوشتنی چەند سەربازێکی تورکمان بیست (مەبەست کوشتنی ئەو سەربازە تورکانەیە کە لەبیت الشباب-دا کوژرابوون و بوو بەهۆی پێشخستنی کاتی شۆڕش وەکو لەشوێنی خۆیدا باسمانکردوە) کەس ئێمەی ئاگادار نەکردبوو، کاتێك بەخۆمانی زانی دەورەدراین و گیراین و لەزیندانی دیاربەکردا بووین کە گوێمان لەتەقە و هەرای شۆڕشگێڕان دەبوو.

دکتۆر جەمال نەبەزیش لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٣١ لەلاپەڕە (٩٤)دا وتویەتی: جەنراڵ خالید بەگ جبران بەنهێنی شۆڕشێکی چەکدارانەی ڕێکخست و بڕیاروابوو لە ١٩٢٧/٣/٢١دا کە ڕۆژی نەورۆز بوو شۆڕش دەستپێبکات بەڵام هێزێکی تورك لە ١٩٢٥/٣/٧دا پەلاماری گوندی (پیران)یدا کە شێخ سەعیدی لێبوو، بەهۆی ئەو شاڵاوەی تورك شۆڕشەکە پێش کاتی خۆی دەستیپێکرد و جەنراڵ حالید جبران و گەلێك کاربەدەستی تری هێزی کورد گیران لەلایەن ڕژێمی تورکەوە و بەبێ دادگاکردن گوللەباران کران.

شێخ سەعیدی سەرکردەی ئەو شۆڕشە هیچ شارەزاییەکی نەبوو دەربارەی ڕێکخستنی شۆڕشی چەکدارانە و سەری لێدەرنەدەچوو، هەرچەند شۆڕشگێڕەکان لەسەرەتادا زۆر شاریان ئازادکرد، بەڵام ئەمەش هەڵەیەکی ستراتیژی بوو چونکە لەشەڕی پارتیزانیدا نابێ ئەو شارانە ئازادبکرێن کە قوربانی و ماندووبوونێکی زۆر دەخوازێت، بەڵکو پێویستە مەڵبەندە ستراتیژیەکان کە پڕ سوودن دەستیان بەسەردابگیرێت چونکە شەڕکردن دژی سوپای تورکی پڕچەك و بەتوانا و

کوردیش بەو چەکە کەمە و بەو ناڕێکیەی کە هەیبوو سەرناکەوێت و زۆر کەوت لەسەر کورد و لەولاشەوە فەرەنسیەکان کە سەرپەرشتی (انتداب)ی سوریایان دەکرد یارمەتی هێزی تورکیاندا و ڕێگەی شەمەندەفەری (حەلەب)یان بۆ هێزەکانی تورك والآکرد کە ئەم هاوکاریکردنەی فەرەنسا بۆ تورکەکان کورد حسابی بۆ نەکردبوو.

دکتۆر جەمال نەبەز لەپەراوێزی لاپەرە (١٠٠)ی کتێبەکەیدا باسی ئەوەی کردووە چۆن ڕۆژنامەی (ئیزفستیا)ی ڕۆژی ١٩٢٥/٢/٢٧ لەباسێکیدا شۆڕشگێرانی کوردی بەهاوکار و سوێندخواری ئینگلیز دانابوو، پڕوپاگەندەی تورکە کەمالیەکان سۆڤێتیشیان لەخشتەبردبوو، بووبوون بەلایەنگری تورك دژی شۆڕشەکەی کورد. دکتۆر جەمال نەبەز لەکتێبەکەیدا ئاماژەی بۆ نامەکەی (جەواهیر لال نەهرۆ) کردووە کە ناردبووی بۆ کچەکەی کە بەرلەمە دەقی ئەو نامەیەمان بلاْوکردۆتەوە. لەدوای باسکردنی ئەو چەند سەرچاوانەی ڕەخنەیان لەشۆڕشی پیران گرتووە، دوو سەرچاوەمان ماوە کە هەردووکیان بەدووروودرێژی باسی ئەم شۆڕشەیان کردووە و نوسەرەکەیان هەریەکەیان بەپێی سەرنج و بۆچوون و ڕەخنەی خۆیان دەستنیشانکردوە.

پرۆفیسۆر حەسرەتیان لەلاپەرە (١٢٠)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٤٩ بەم شێوەیەی خوارەوە شۆڕشەکەی هەڵسەنگاندوە و ڕەخنەی لێگرتوە: شۆڕشەکەی شێخ سەعید وێنەی نەبووە لەشۆڕشەکانی تری کورددا کە بەرلەمە بەرپاکرابوو چ لەڕووی ژمارەی شۆڕشگێرانەوە بووبێت یان لەڕێکوپێکیدا لەچاو شۆڕشەکانی پێشووتردا. دەربارەی هۆی ڕوودانی ئەم شۆڕشە وەکو حەسرەتیان باسیکردوە گەلێك لەنوسەرانی ولاْتانی ڕۆژئاوا و ڕۆژنامەکانی تورکیا لەبۆچونەکانیاندا لەسەر بناغەیەکی زانیاریانە بۆ باسەکە نەچووبوون و هەریەکەیان بەپێی مەبەست و سوودە سیاسیەکانی ولاْتانی خۆیان لەو باسە کۆڵیونەتەوە و هەندێکیان بەچەتەگەری و هەڵپەی ڕاوڕووتکردن باسی شۆڕشگێرەکانیان کردووە، بۆ نمونە ڕۆژنامەی (طنین) لەژمارەی ڕۆژی ١٩٢٥/٢/٢٨دا وتویەتی: هەموو بزوتنەوە و ڕاپەڕینێك بناغەکەی لەسەر بیروباوەڕێك دادەڕێژرێت، بەلاْم ئایا ئەمەی ئەو کێوی و دڕندانە دەیکەن ئاخۆ بناغەی ڕاپەڕینەکەیان دەبێ لەسەر چ بیروباوەڕێك داڕێژرابێت؟ ئەگەر بیروباوەڕ و بنەما ڕێگەی هەبوایە بگاتە ناو مێشکی ئەوانەوە بێگومان بەهیچ جۆرێك خولیای ئەو ڕەفتارە دڕندەیەتیەیان نەدەچووە مێشکەوە،

بەڵام مێشکە خام و ناکامەکانیان لەبەر نەخوێندەواری و نەشارەزایی و خەیاڵ پڵاوی تەسەوف وای لێنەدەکردن ئەم ڕێگەیە بگرنەبەر و هەموو بۆ تاقە مەبەستێك کە بریتیە لەتاڵانی و ڕاوڕوتکردن ئەو کارە دڕندانەیان لێنەدەوەشایەوە.

پرۆفیسۆر حەسرەتیان ئاماژە بۆ سەرچاوەیەکی تر کردووە (Hayat Ansiklopedisi Istanbul) لاپەڕە (٤٣٥٩) بەرگی بیستەم کە لەوەدا وتراوە: هەندێ لەسیاسیە خائینەکان کە نۆکەری بێگانەن، ئاگری هەست و جۆشی ئایینی بزواندنی و بەڵێنیان بەدانیشتوانی ناوچە شاخاویەکان دابوو کە ئەم شەڕە ڕێگەی ئەوەیان بۆ خۆشدەکات بەئارەزووی خۆیان لەناو شارەکاندا ڕاوڕووت و تاڵانی بکەن. حەسرەتیان لەباسەکەیدا دەڵێت: ئەوانەی بیروبۆچوونیان دەربارەی هۆی بەرپاکردنی شۆڕش لەو جۆرەیە کە لەو سەرچاوەیەدا باسکراوە، وای بۆچووبوون شێخەکان جوتیارە دواکەوتوەکانیان هاندابوو دژی جمهوریەت بەنیازی گێڕانەوەی خەلافەت و سەڵتەنەت و بەڵگەی ئەمانە بۆ ئەم بۆچوونەیان بریتی بووە لەوەی گوایا نوێنەری بنەچەی سوڵتانی تورك کە لابرابوو هێشتا هەر لەئارادا مابوو (مەبەست سەلیمی کوڕی دوا سوڵتانی تورکە).

حەسرەتیان لەلاپەڕە (١٢٩)ی کتێبەکەیدا بۆ وەڵامی بۆچوونی ئەوانە وتویەتی: لەڕاستیدا ئەو جۆرە بۆچوونە لەپلەیەکی ئەوەندە نزمدا بووە کە شایانی ڕەخنەگرتن نیە چونکە بەر لەهەموو شتێك چونکە ئەو شۆڕشگێڕانەی نەخشەی ئەو شۆڕشەیان ئامادەکردبوو بریتی نەبوون لەشێخەکان بەڵکو ئەوانە بوون کە کۆمەڵی سەربەخۆیی کوردیان پێکهێنابوو (مەبەست کۆمەڵی ئازادیە کە بەسەرۆکایەتی خالید بەگ جبران و یوسف ضیاء بەگ پێکهاتبوو، لەسەرەتادا شێخ سەعید ئەندامی ئەو کۆمەڵە نەبوو تا ئەوکاتەی ئەوانە گیران ئەوسا شێخ سەعید کاروباری گرتەدەست).

بێجگە لەمە وەکو حەسرەتیان باسیکردوە پەیڕەویکردنی شەریعەت بۆ مەبەستی سەرگرتنی سەربەخۆیی کوردستان بووە، لەبەرئەوە چۆن دەبێ ئەم دروشمە وا لێکبدرێتەوە کە تەنها بۆ مەبەستی هێنانەوەی خەلافەت بووە لەکاتێکدا شۆڕشگێڕەکان مەبەستی سەرەکیان لەبەرپاکردنی شۆڕشەکەیان دەستگیربوونی سەربەخۆیی کورد بووە لەناو خاکی خۆیاندا و کورد تەنها هەر لەدوای خەلافەت هەڵوەشانەوە شۆڕشی نەکردووە بەڵکو دەمێك بوو لەزەمانی خەلیفەکانی پێشووتریشدا بۆ دەستگیربوونی مافی کورد دژی خەلیفە و سوڵتان

شۆڕشیان کردوە (مەبەستی شۆڕشەکانی بەدرخان پاشا و یەزدان شێر و شێخ عوبەیدولاّ بووە)، بۆیە ئەمەی پیرانیش بەئەڵقەیەکی ئەو زنجیرە لێکنەپچڕاوە دەژمێردرێت کە هەموویان وەك یەك بۆ ئازادی و سەربەخۆیی کورد تێکۆشابوون ئیتر نازانم لەبەرچی دەبێ ئەمەی ئەمجارەیان بەڕووداوێکی سەیر تەماشابکرێت.

حەسرەتیان لەباسەکەیدا لەسەرینەڕوا و دەڵێت: هەرچۆنێك لێکبدرێتەوە دەتوانم بڵێم کورد قەت دەمارگیر و کەللەڕەق نەبووە بۆ ئاین و لەناو کورددا ئاینی ئیسلام گەلێك لکی لێبووەتەوە و ئەمانەی ئەم شۆڕشەیان کردووە لەکوردە سونیەکان بوون. لەڕاستیدا کورد زۆر باش لەوە گەیشتبوو هیچ سوڵتان و خەلیفەیەکی عوسمانی ڕۆژێك لەڕۆژان بایەخی نەداوە بەکورد و لەڕاستیشدا ئەم شۆڕشەی بۆ ئەوە نەکردبوو کە دەسەلاّت بدرێتەوە بەخەلیفەیەکی تازە بەڵکو بەرزکردنەوەی دروشمی ئایین بۆئەوە بووە پیاوە ئاینیەکان ببن بەلایەنگری شۆڕش و هاوکاریبکەن لەشۆڕشدا بۆ سەربەخۆیی کورد.

کورد دەمێك بوو لەلایەن سوڵتان و خەلیفەکانی عوسمانیەوە بێبەشکرابوون و ڕێگەی بلاّوبوونەوەی خوێندەواری و ڕۆشنبیری و زانیاریان لەدانیشتوانی کورد گرتبوو؛ بۆیە ڕۆشنبیرەکانی کورد لەسەرکردایەتی شۆڕشدا وەکو کارێکی تەکتیکی هەستی ئاینیان کردبوو بەدروشمێك بۆئەوەی شانبەشانی هەستی نەتەوایەتی لەشۆڕشەکەیاندا کە ئەمەش بۆ تورکەکان دەستینەئەدا و بەهەموو شێوەیەك ناوی شۆڕش و شۆڕشگێڕەکانیان بەوە دەزڕاند کە شۆڕشەکەیان بریتیە لەبزوتنەوەیەکی کۆنەپەرستانەی دوور لەڕێبازی شارستانیەتی.

پرۆفیسۆر حەسرەتیان لەلاپەڕە (١٢٣)ی کتێبەکەیدا بەرپەرچی ئەوانەی داوەتەوە کە بلاّویانکردبوەوە شۆڕشەکەی پیران بەهاندانی بێگانە بووە بەتایبەتی ئینگلیز و بۆ نمونە باسێکی ڕەشید پاشای جێگری سەرۆکی حیزبی (تقدم)ی تورکی هێناوەتەوە (بەرلەمە باسی سەرۆکەکەیان لەزۆر شوێندا کراوە کە ناوی قەرەبەکر پاشا بووە) کە وتویەتی: دەربارەی ئەوەی گوایا ئەم ڕاپەڕینە بەپیلانی بێگانە بووە شتێکە من بڕوای پێناکەم چونکە (غنج) و (موش) کە شۆڕش لەهەردووکیانسدا بەرپابووبوو دوو شوێنی زۆر دوورن لەسنوور (مەبەستی سنووری تورکیا و عێراقە کە ئەوسا عێراق لەژێر سایەی بەریتانیادا بووە) لەبەرئەوە ئەگەر ڕاپەڕیوەکان لەبێگانەوە یارمەتیان بۆ بهاتایە دەبوایە هیچ نەبێ بەرلەو دوو شوێنە شۆڕشەکە لەشوێنەکانی نزیك سنوورەوە دەستپێبکردایە.

سەرچاوەی حەسرەتیان بۆ ئەمە بریتیە لەلاپەڕە (٢)ی کتێبی (B.Gemel Sait isyani).

حەسرەتیان دەڵێ: گەلێ بەڵگەی تریش هەیە ڕوونیدەکەنەوە شۆڕشەکە بەهۆی بێگانەوە نەبووە بەڵکو هۆی ناوخۆ پاڵی بەشۆڕشگێڕەکانەوە نابوو بەو ڕاپەڕینە هەڵسن. هەروەکو پەیامنێری ڕۆژنامەی (وقت)ی تورکی کە (ناشد حقی) بووە، کە ئاگای لەدادگاکردنەکانی ئیستقلال بووە لەدیاربەکر، نامەیەکی لەدیاربەکرەوە ناردوە بۆ ڕۆژنامەکە باسی وتاری نوێنەری گشتی دیفاعی کردووە لەدادگاکەدا کە ڕوویکردۆتە سەرۆکی دادگا و وتویەتی: (هۆی دەستپێکردنی ئەم شۆڕشەی لەم دواییەدا بڵاوبۆتەوە لەویلایەتەکانی ڕۆژهەڵاتی خاکی پیرۆزی تورکیادا هیچ جیاوازیەکی نیە لەگەڵ ڕاپەڕین و شۆڕشەکانی بۆسنە و هەرسکدا، ئەوەی کوردیش هەوڵی بۆ داوە بریتیە لەهەمان ئەو ئامانج و مەبەستەی ئەوان و ئەوانەش کە بوون بەهۆی جیابوونەوەی سوریا و فەلەستین).

حەسرەتیان لەلاپەڕە (١٢٤)دا وتویەتی: بەو جۆرە دەزگاکانی حکومەتی تورک خۆیان دانیان بەنیوەی ڕاستیەکاندا ناوە کە شۆڕشەکە نە پیلانی بێگانە و نە بەهاندانی بێگانە بووە و بگرە لەدەرەوەی کوردستانی تورکیاش نە لەشێخ مەحمود و نە لەسمکۆ یارمەتی نەگەیشتووە بەشۆڕش و سەرباری ئەمە لەناو عەشیرەتەکانی کوردی باکوردا هی وا هەبووە دژی شۆڕشەکەی کورد بووە و لایەنگری حکومەت بووە وەکو عەشیرەتی (لۆلان) و (هورمیك) و هەندێ لەکوردەکانی دەرسیم و کوردی هەندێ ناوچەی تر کە هۆی ئەمەش جیاوازی مەزهەب بووە لەناو کوردەکاندا بەتایبەتی ئەوانەی دەرسیم باوەڕیان بەوە نەبووە شۆڕشەکە بەسەرکردایەتی شێخ سەعید سەردەکەوێت و ئەگەر سەریشبکەوتایە لەگەڵیاندا تووشی کێشە دەبوون (وەکو لەزۆر شوێندا باسکراوە ماکی ئەو دوبەرەکی و ناکۆکیە لەکاتی دروستبونی سوارەی حەمیدیەوە پەیدابووبوو کە تورکەکان ئەو هێزەیان دژی عەلەویەکان بەکاردەهێنا).

بەداخەوە لێرەدا کورتبینی کوردی ئەو ڕۆژانە دەرکەوتوە کە ناوچەی دەرسیم لەگەڵ شۆڕشدا نەبوون و نەیاندەزانی لەدوای پانکردنەوەی شۆڕشەکەی پیران تورك بەردەبێتە وێزەی خۆیان هەروەکو لەباسی شۆڕشی دوهەمی دەرسیمدا لەبەرگی سێهەمدا ڕووندەبێتەوە.

پرۆفیسۆر حەسرەتیان لەلاپەڕە (١٢٥)ی کتێبەکەیدا دەستی خستۆتە سەر زامەکانی ئەو شێرپەنجەی ناکۆکی و نارێکیەی حاڵی کوردی کاولکردبوو، وتویەتی: یەکێك لەکارەساتەکانی شۆڕشەکانی کورد بریتی بووە لەنەبوونی تەبایی و هاوکاریکردن لەنێوان سەرکردەکانی کورددا کە زۆربەیان دوای سوود و بەرژەوەندی خۆی کەوتبوو، بەوپێیە بزوتنەوەکانی کورد بریتی بوون لەچەند ڕاپەڕینێکی پچڕپچڕی ناوبەناو کە هەموو جارێك بەئاسانی ئەو بزوتنەوانە لەناوبران، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا شۆڕشەکەی شێخ سەعید بەشۆڕشێکی جەماوەری دەژمێردرێت چونکە ژمارەیەکی زۆری دانیشتوانی ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵات بەشداریان تیاداکردبوو بەجوتیار و کۆچەر و نوێنەری بۆرجوازی، بازرگان و شێخ و ئاغا و ڕۆشنبیران و دانیشتوانی ناو شارەکان و ئەفسەری سوپایی و هەتا ڕادەیەك حەماڵە کوردەکانی ئەستەمبوڵیش بەشدارییان کردبوو، ئەگەرچی بەشداربوەکان تەنها هەر هەستی نەتەوایەتی پاڵی پێوەنەنابوون بەڵکو هی واشیان هەبووە بۆ مسۆگەرکردنی سوودی خۆی بەشداریکردبوو لەگەڵ ئەوەشدا ئەو سوودە تایبەتیانە ڕێگەی لەهەندێکیان نەگرتبوو قارەمانانە گیانی خۆی پێشکەش بکات لەپێناوی سەربەخۆیی کوردستاندا.

لەدوای ئەو سەرنج و ڕەخنانەی پرۆفیسۆر حەسرەتیان، دەچینە سەر باسێکی تری دووروودرێژ کە بریتیە لەسەرنج و ڕەخنەکانی ڕۆبەرت ئولسون کە لەلاپەڕە (١٥٣)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٨٤ باسیکردوە کە وتویەتی: ڕاپەڕینەکەی شێخ سەعید بەگەورەترین بزوتنەوە و ڕاپەڕینی کورد دەژمێردرێت کە کۆمەڵی ئازادی ڕۆڵێکی گەورەی هەبووە لەئامادەکردنی شۆڕش و دەستپێکردنی. ڕۆشنبیران و ئەفسەرانی کورد لەناو سوپادا بەشداربوون و پێویستە ڕۆڵی ئەمانە جیابکرێتەوە لەڕۆڵی ئەوانەی پیاوی دنیایی نەبوون وەکو شێخ سەعید و شێخەکانی تر.

هەرچەند شێواز و ڕێبازی شۆڕشەکە بریتی بوو لەبزوتنەوەیەکی نەتەوایەتی بەڵام ئەو پروپاگەندانەی دژی شۆڕشەکە بڵاودەکرایەوە وایان پیشاندەدا شۆڕشێکی ئاینی بووە، بەڵام هی واش هەبووە وەکو (بەهجەت جەمال) و (مەتین تۆکەر—Metin Toker) بزوتنەوەکەیان بەڕاپەڕینێکی ئاینی کۆنەپەرستانە لەقەڵەمداوە و وایان بڵاوکردۆتەوە شۆڕشگێڕەکان دژی ئەو گۆڕانکاریانە بوون کە لەساڵی (١٩٢٢) بەدواوە دەستپێکردبوو، بەتایبەتی دوای هەڵوەشانەوەی خەلافەت لە ١٩٢٤/٣/٣دا، هەرچەند هەندێ لەشارەزایانی تورك لەدواییدا بەو

بۆچـونەی پێشـوویاندا چـوونەوە و بزوتنەوەکـەی کوردیـان بەبزوتنەوەیـەکی نەتەوایەتی باسکردوە، بەڵام وتویانە لەژێر پەردەی ئاینـدا بووە چونکە ئەوانە بۆیـان روونبـووەوە شـێخ سـەعید ئەگەرچـی پیـاوێکی ئـاینی بـووە بـەڵام هـەر لەسەرەتاوە ناسیۆنالیستێکی سەرگەرم بووە.

دەربارەی ئەو پیاچونەوەی رۆبەرت ئۆلسون باسیکردوە، لەبەرگی سێهەمدا لەباسی شۆڕشی دەرسیمدا ئاماژە بۆ کتێبەکەی دکتۆر عەزیز شەمزینی ئەکەین دەربارەی شۆڕشی دەرسیم کە باسی ڕاپۆرتێکی (عابدین عوسمان-ئوسمان) کە ڕێبەرێکی تورکی ناسراو بووە لەپشکنەرێتی گشتیدا کە بەئاشکرا دانی بەوەشدا نـاوە کـە شـێخ سـەعیدیش لـە شۆڕشـەکەی پیرانـدا ڕێبـازی ناسیۆنالیسـتی گرتبووەبەر کە ئەم دانپیانانەی لەڕۆژنامەی (تان)ی تورکیدا بڵاوکراوەتەوە.

رۆبـەرت ئۆلسـون لەباسـەکەیدا لەسـەریئەڕوا و ئـەڵێت: شـارەزایان لەسـاڵانی شەسـتەکان و حەفتاکانـدا لـەناو ئـەو زانایانـەدا زانایـانی کۆمەڵایـەتی (Social)ی ڕۆژهـەڵات و ڕۆژئاوا هـەموو لـەوەدا یەکیانگرتۆتـەوە کـە ناسیۆنالیستی لەگـەڵ هەسـتی ئاینیـدا پێکـەوە نـاگونجێن بۆیـە لـەوەی شـێخ سـەعیدا ئـەو ڕاسـتیە بەتەواوەتی ڕوونبووەتەوە. بەڵام (مارتن ڤان برونسون) بەپێچەوانەی ئەو زانایانە وای بۆچـووە کـە تەقـەلاکانی شـێخ سـەعید کـە مرۆڤێکـی ئـاینی بـووە لەگـەڵ مەبەسـتەکانی ئازادیـدا هـەردووکیان بـۆ یـەك مەبەسـت بـووە کـە بریتـی بـووە لـەپێکهێنانی حکومـەتێکی کـوردی و شـێخ سـەعید بـاوەڕێکی بـەهێزی هـەبووە بەناسیۆنالیستی و شێخ سەعید تاکە کەسیش نەبووە کە دژی هەڵوەشـانەوەی خەلافەت بووە و هەندێ لەئەندامانی کۆمەڵی ئازادیش هەڵوەشانەوەی خەلافەتیان پێناخۆش بووە (لەڕاستیدا بەهەزاران ڕۆشنبیری تورکیش کە هەندێکیان ئاینیش نەبوون هەر دژی هەڵوەشانەوەی خەلافەت بوون).

ڕۆبەرت ئۆلسون لەباسەکەیدا دەڵێت: شۆڕشی شێخ سەعید بەقۆناغێکی تازە دەژمێردرێت لەمێژووی میللەتی کورددا کە لەلایەن ڕێکخراوێکی سیاسیەوە براوە بەڕێوە (مەبەسـتی کۆمـەڵی ئازادیـە) بـەڵام بەداخـەوە ئەنـدامانی ئـەو کۆمەڵـە بەرلەوەی کاتی دەستپێکردنی شۆڕش دەستپێبکات خالید بەگ جبران و یوسـف ضـیاء بـەگ گـیران و شۆڕشـەکە لەشـارەزایی و لێهـاتوویی ئـەو دوانـە بێبەشـکرا. ڕۆبەرت ئۆلسون لێرەدا بەراوردی ناسیۆنالیستی شۆڕشەکەی پیران و ئەو شەڕە

گەورەیەی (زیلان–Zylan) هەردووکیانی وەك یەك حساب کردووە کە ئەمەی دوایی لەشۆڕشی ئاگریداغدا کرابوو (لەبەرگی سێهەمدا باسیدەکەین).

ڕۆبەرت ئولسون ڕەخنەی لەخاوەن زەویوزارەکانی دیاریەکر گرتووە کە هاوکاریان نەکردبوو لەشۆڕشدا و بەڵکو لایەنگری حکومەت بوون بەتایبەتی لەوکاتەدا کە هێزەکەی شێخ سەعید ئابلۆقەی شارەکەیان دابوو، هیچ کەسێك لەوانە بەدەم بانگەواز و هاواری شۆڕشگێڕەکانەوە نەچووبوون و تورکە کەمالیەکان ماوەیەك بوو پەیوەندیان لەگەڵ هەندێ ئاغا و دەرەبەگەکانی ئەو ناوچەیەدا بەهێزکردبوو. ئەوەی ڕاستی بێ سمکۆش لەشۆڕشەکەیدا لەگەڵ حکومەتی ئێران خۆی تووشی هەمان هەڵە کرد لەکاتی پەلاماردانی شاری مەهاباددا و ئەو هەڵەیەی سمکۆ زیانێکی زۆری بەشۆڕشەکەی گەیاند هەروەکو لەلاپەرە (٤٣٤)ی کتێبەکەی سمکۆدا چاپی ستۆکهۆڵم، بەدووروودرێژی باسمانکردووە.

ڕۆبەرت ئولسون لەکتێبەکەیدا ڕەخنەیەکی تری لەشۆڕشی پیران گرتووە کە بریتیە لەوەی کۆمەڵی ئازادی هەروەکو پێویست بوو نەیتوانیبوو پەیوەندی بەو هەموو کوردە ڕۆشنبیرانەوە بکات کە لەئەستەمبوڵدا بوون و نەیتوانیبوو لەکاتی خۆیدا ئەو ڕۆشنبیرانە والێبکات کە خۆیان بەلێپرسراوی شۆڕشەکە بزانن بۆئەوەی هەریەکەیان ڕۆڵی خۆی ببینێت (لەڕاستیدا وەکو ڕۆبەرت ئولسون ڕەخنەی گرتووە ئەو نیمچە پەیوەندیەش کە عەلی ڕەزای کوڕی شێخ سەعید بەشێخ عەبدولقادری شەمزینیەوە کردبووی نەگەیشتبووە ڕادەی ئەوەی شێخ سەعید بەرلەوەی تورکەکان بیگرن ئەویش لەکۆڕی شۆڕش نزیکبوایە وەکو شێخ سەعید و تورکەکان پێشوەخت شێخ عەبدولقادریان گرت و ئەگەرچی هیچ بەڵگەیەکیش بەدەستەوە نەبوو بۆ تاوانبارکردن و دادگاکردنی شێخ عەبدولقادر و هاوکارەکانی بەوەی کە بەکردەوە لەشۆڕشەکەدا بەشداربوون.

ڕۆبەرت ئولسون کێشەی نێوان عەشیرەتی (هورمیك)ی عەلەوی لەگەڵ عەشیرەتی (جبران) کە خالید بەگ یەکێك بووە لەناودارەکانی و کێشەی نێوان جوتیارانی کورد و خاوەن زەویوزارەکان و ناکۆکی نێوان زۆربەی عەشیرەتەکانی کورد لەو ڕۆژە ناسکەدا هۆی سەرەکی سەرنەکەوتنی شۆڕش بووە. ڕۆبەرت ئولسونیش وەکو پرۆفیسۆر حەسرەتیان باسی هەندێ لەنوسەرانی تورکی کردوە وەکو (مەتین تۆکەر) کە شۆڕشەکەی شێخ سەعیدیان بەشۆڕشی تاقمێکی

کەللەڕەق و سەرگەرمی ئاینی ئیسلام کە دژ بەدیموکراتی و پێشکەوتنخوازی و شارستانیەتی و بەگەلێك ناوی تر ناویبردوە و لایانوابووە بەکارهێنانی ئەو وشانەیان دەبێتە پەردەیەك بەرامبەر تاوانەکانیان و خۆیان بەپێشکەوتنخواز و دیموکراتیخواز پیشاندەدەن.

لەکۆتاییدا ڕۆبەرت ئولسون دەڵێت: لەڕاستیدا شێخ سەعید هەمیشە شەڕخواز نەبووە بەڵکو ئاشتیخواز بووە و گەلێك هەوڵی دابوو بەخۆشی کێشەی کورد لەگەڵ کاربەدەستانی حکومەتدا چارەسەربکرێت، بەڵام وادیارە تورکەکان خۆیان مەبەستیان بووە ئەو شۆڕشە دەستپێبکرێت بۆئەوەی لەلایەکەوە لەکورد بدەن و لەلایەکی ترەوە لەژێر پەردەی لێدانی کوردی یاخیبوودا نەیارەکانی خۆیان لەناو دەزگاکانی حکومەت و لەناو ئەو ڕێکخراوانەی هاوبیری کەمالیەکان نەبوون هەموویان لەناوببات بەتایبەتی هەوڵیاندابوو حیزبی جمهوری پێشکەوتنخواز کە (کازم قەرەبەکر پاشا) سەرۆکی بووە هەڵوەشێتەوە و هەموو ڕێکخراو و ڕۆژنامەکانی ئەوانەی بەئاشکرا لایەنگری خۆیان نەبن هەموویان قەدەغەبکەن.

ڕۆبەرت ئولسون لەلاپەڕە (١٥٩)ی کتێبەکەیدا ئامارژەی بۆ یاسای (Dress Law) کردووە کە لە٢٥ی نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٢٦دا دەرچووبوو بەپێی ئەوە جلوبەرگی شەعبی لەبەرکردن یاساغکرا و ئەوی لەو یاسایە لایدایە بەخائین دەژمێرا و پاشئەوەی کەمالیەکان توانیبوویان حیزبی پێشکەوتوخوازی تورك قەدەغەبکەن ئیتر بێجگە لەحیزبەکەی خۆیان (جمهوریەتی خەلق فرقەسی) بەولاوە ڕێگەیان بەبوونی هیچ حیزبێکی تر نەداوە، کە ئەم حیزبە هەتا ساڵی (١٩٥٠) درێژەیکێشا.

# سەرچاوەکانی بەرگی دووهەم

| ز | ناوی سەرچاوە | نوسەر و وەرگێڕ | شوێن و ساڵی لەچاپدانی |
|---|---|---|---|
| ١ | گۆڤاری(The Kurds) | David Macdwell | ژمارە/٣، لەندەن ١٩٨٢ |
| ٢ | اعلام الكرد | مير بصري | لەندەن-قوبرس، ١٩٩١ |
| ٣ | مێژووی ڕۆژنامەگەری | دکتۆر جەمشید حەیدەری | گۆڤاری پەیڤ، ژمارە/١٦، لەندەن ١٩٩٢ |
| ٤ | People without country | ، وەرگێڕانی (Challand)نوسینی دکتۆر ئەحمەد عوسمان | گۆڤاری نوسەری کورد، ژمارە/٤ ساڵی ١٩٨٦ |
| ٥ | ڕۆژنامەی کوردستان | دەستەی نوسەرانی گۆڤاری چوارچرا | گۆڤاری چوارچرا، ژمارە/٢، ساڵی ١٩٨٦ |
| ٦ | پەیوەندی نێوان کورد و ڕووسیا | دکتۆر کەمال عەلی | گۆڤاری چوارچرا، ژمارە/٣، ساڵی ١٩٨٦ |
| ٧ | شۆڕشی دەرسیم | وەرگێڕانی لەتورکییەوە بۆ کرمانجی ژووروو لەلایەن دکتۆر جەبار قادر بەپیتی لاتینی و وەرگێڕانی کوخی بۆ پیتی عەرەبی بەکوردی | گۆڤاری پێشەنگ، ژمارە/١٥، سوید، ساڵی ١٩٨٨ و گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە/١٢٦، ساڵی ١٩٩٠ |
| ٨ | مەسئەلەکانی کورد | و. جی. ئیلفنستن، وەرگێڕانی عەبدولقادر حیشمەت بۆ کوردی | لەبڵاوکراوەکانی دەنگی گێتی |
| ٩ | کوردستانی تورکیا بەزەمینەی مێژووییەوە | دکتۆر عیسمەت شەریف وانلی | گۆڤاری خوێندکاری کورد، پاریس، ١٩٩٠ |
| ١٠ | گۆڤاری کوردستان ١٩١٩-١٩٢٠ | فەرهاد پیرباڵ | چاپی پاریس، ١٩٩٠ |
| ١١ | چل ساڵ لەبیرەوەریی جەلادەت بەدرخان | کونی ڕەش | گۆڤاری هیوا، پاریس، ژمارە ٨، ساڵی ١٩٨٦ |
| ١٢ | البارزاني و الحركة التحررية انتفاضة بارزان الاولى ١٩٣١-١٩٣٢ | مەسعود بارزانی | چاپخانەی خەبات، ١٩٨٦ |
| ١٣ | ملاحظة تاريخية حول نشاة الحركة القومية الكردية | سیامەند ئەحمەد عوسمان | گۆڤاری (دراسات كرديه)، پاریس، ساڵی ١٩٨٤ |
| ١٤ | ڕابەری ڕۆژنامەگەری | جەمال خەزنەدار | بەغدا، ١٩٧٣ |
| ١٥ | ڕۆژنامەکانی بانگی کوردستان و ڕۆژی کوردستان ١٩٢٢-١٩٢٣ | جەمال خەزنەدار | بەغدا-١٩٧٣، ١٩٧٤ |
| ١٦ | كردستان و الاكراد | دکتۆر عەبدولرەحمان قاسملۆ | بەیروت، ١٩٧٢ |
| ١٧ | جمهورية مهاباد | ولیەم ئیگلتن-وەرگێڕانی جەرجیس فەتحولآ بۆ عەرەبی | بەیروت، ١٩٧٢ |
| ١٨ | ڕاپەڕینی کوردەکان، ساڵی ١٨٨٠ | نوسینی دکتۆر جەلیلی جەلیلی، وەرگێڕانی دکتۆر کاوس قەفتان بۆ کوردی | بەغدا، ١٩٧٨ |
| ١٩ | کێشەی کورد لەسیڤەرەوە بۆ لۆزان | دکتۆر فوئاد حەمەخورشید | گۆڤاری ڕەنگین، ژمارەکانی (٧٩، ٨٠، ٨٩)، ساڵانی ١٩٩٥، ١٩٩٦-بەغداد |
| ٢٠ | دەربارەی ڕۆژنامەی کوردستان | محەمەد مەلا کەریم | گۆڤاری ڕەنگین، ژمارە ٧٩، ١٩٩٥ |
| ٢١ | کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی | نوسینی دکتۆر جەلیلی جەلیلی، وەرگێڕانی دکتۆر کاوس قەفتان بۆ کوردی | بەغدا، ١٩٨٧ |
| ٢٢ | كردستان و الحركة القومية الكردية | جەلال تاڵەبانی | بەیروت، ١٩٧١ |
| ٢٣ | كرد و كردستان في الوثائق البريطانية | دکتۆر وليد حمدي الأعظمي | قبرص، ١٩٩٢ |
| ٢٤ | کوردستان لەساڵەکانی شەڕی جیهانیدا | دکتۆر کەمال مەزهەر | بغداد، ١٩٧٥ |

| ٢٥ | عرب و اکراد-رؤية عربية | منذر الموصلي | بيروت، ١٩٨٦ |
|---|---|---|---|
| ٢٦ | ڕۆژ کورد-ساڵی ١٩١٣ | جەمال خەزنەدار | بەغدا، ١٩٨١ |
| ٢٧ | یاداشتەکانی مێجەر نوئیل | مێجەر نوئیل | Fo.٢٧١-دوکیومێنتی ( ١٣٩٤٧( ئەرشیفی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا |
| ٢٨ | جمهوری لول تورکی | نوسینی ریچارد رالینسون، ئیرج ئەمنی کردویەتی بەفارسی | چاپی تاران، ١٣٥٦/٤/٧ی کۆچی |
| ٢٩ | کوشتاری ئەرمەنیەکان | Kak Bajalan(نوسینی کاك باجلان ( | Kurdish Time (گۆڤاری ( ژمارە/٢، ١٩٩٢، ئەمریکا |
| ٣٠ | کەمال ئەتاتورك | محەمەد محەمەد تۆفیق، ئیسماعیل فراهانی کردویەتی بەفارسی | ئێران، ساڵی ١٣١٨ی کۆچی |
| ٣١ | کوردستان و شۆڕشەکەی | نوسینی دکتۆر جەمال نەبەز و دکتۆر کوردۆ لەئەڵمانیەوە کردویەتی بەکوردی | چاپی سوید، ساڵی ١٩٨٥ |
| ٣٢ | خلاصة تاريخ كرد و كردستان | نوسینی ئەمین زەکی بەگ بەکوردی، وەرگێڕانی محەمەد عەلی عەونی بۆ عەرەبی | چاپی قاهیرە، ١٩٦١ |
| ٣٣ | گەشتەکەی (بیور) لەکوردستاندا | شوکر مستەفا لەتورکیەوە کردویەتی بەکوردی | گۆڤاری کۆڕی زانیاری-بەغدا، ژمارە/٢، ساڵی ١٩٨٣ |
| ٣٤ | کورد لای گردلیڤسکی | دکتۆر کەمال مەزهەر | گۆڤاری کۆڕی زانیاری، ژمارە/٢، ساڵی ١٩٨٣ |
| ٣٥ | عرب و اكراد-خصام او وئام | دكتور دريه محمد علي عوني | چاپی قاهیرە، ساڵی ١٩٩٣ |
| ٣٦ | کورد و مەسەلەکەی | میخائیل سیمونوڤیچ لازاریف، وەرگێڕانی دکتۆر کەمال عەلی بۆ کوردی | گۆڤاری (سوکسە)، سوید |
| ٣٧ | الأكراد شعبا و قضية | صلاح بدرالدين | بيروت، ١٩٨٧ |
| ٣٨ | مێژوو-کورد و مێژوو | دکتۆر کەمال مەزهەر | بەغدا، ١٩٨٣ |
| ٣٩ | چەند لاپەرەیەك لەمێژووی گەلی کورد | دکتۆر کەمال مەزهەر | بەغدا، ١٩٨٣ |
| ٤٠ | کۆمەڵ و ڕێکخراو و حیزبە کوردیەکان لەنیو سەدەدا | دکتۆر عەبدولسەتار تاهیر شەریف | بەرگی (١٨-١٩)ی گۆڤاری کۆڕی زانیاری، بەغدا، ١٩٨٨ |
| ١/٤٠ | الجمعيات و المنظمات و الأحزاب الكردية في نصف قرن (١٩٠٨-١٩٥٨) | دكتور عبدالستار طاهر شريف | بغداد، ١٩٨٩ |
| ٤١ | مێژووی کورد لەسەدەی نۆزدە و بیستدا | کریس کۆچرا-وەرگێڕانی محەمەد رەیانی | چاپی تاران، ١٣٦٩ی کۆچی |
| ٤٢ | جولانەوەی ڕزگاری نیشتمانی کورد | نوسینی دکتۆر عەزیز شەمزینی، وەرگێرانی بۆ کوردی (ئەسەسەرد) | چاپخانەی ئیبراهیم عەزۆ، ساڵی ١٩٨٥ |
| ٤٣ | کورد | مینۆرسکی، وەرگێڕانی بۆ عەرەبی دکتۆر مارف خەزنەدار | بەغدا، ١٩٨٤ |
| ٤٤ | الرجل الصنم-اتاترك، الجزء الأول و الثاني | ظابط تركي سابق، ترجمه الى العربية عبدالله عبد | بيروت، ١٩٩٢ |
| ٤٥ | القومية في تركيا | نوسینی پرۆفیسۆر حەسرەتیان، وەرگێڕانی بۆ عەرەبی (سیامەند سرتی) | شوێن و ساڵی چاپی لەسەر نیە |
| ٤٦ | تركيا و الشرق الأوسط | (Philip Robins) ، ترجمه الى العربية ميخائيل نجم خوري | ليماسول-قبرص، ١٩٩٣ |
| ٤٧ | العرب و الترك في العهد الدستوري العثماني ١٩٠٨-١٩١٤ | دكتور توفيق برو | دیمشق، ١٩٩١ |
| ٤٨ | الدولة العثمانية-قراءة جديدة لعوامل الانحطاط | دكتور قيس جواد العزاوي | فلوریدا، ١٩٩٤ |

| ٤٩ | كردستان تركيا بين حربين | نوسينى پرۆفيسۆر حەسرەتيان، وەرگێڕانى بۆ عەرەبى سعدالدين ملا و باقى نازى | بيروت، ١٩٨٧ |
|---|---|---|---|
| ٥٠ | بنەماڵەى شێخانى بيران | (Robert Olson) | زانكۆى كنتاكى، ١٩٨٤ |
| ٥١ | سياحەتنامەى ئەوليا چەلەبى | وەرگێڕانى سەعيد ناكام بۆ كوردى | بەغدا، ١٩٧٦ |
| ٥٢ | كرد از بيرون | حەسەن عەرەفە، وەرگێڕانى حاميد گەوهەرى | سويد، ١٩٨٥ |
| ٥٣ | جنبشهاى كرد از بيرون تا اكنون | م كاردوخ | بۆتۆبۆرى-سويد، ١٩٩٣ |
| ٥٤ | الاكراد | باسيل نيكتين، وەرگێڕانى سەلاح بەروارى | ١٩٩٣ |
| ٥٥ | نهضة الأكراد الثقافية | نوسينى دكتۆر جەليلى جەليلى-باقى نازى، وەرگێڕانى بۆ عەرەبى (د. ولاتو) | بيروت، ١٩٨٦ |
| ٥٦ | كردستان و الحركة القومية الكردية | صلاح بدرالدين | نيقوسيا، ١٩٨٣ |
| ٥٧ | في سبيل كردستان (مذكرات) | زنار سلوپى (قەدرى جەميل پاشا) | بيروت، ١٩٨٧ |
| ٥٨ | تاريخ الدولة العلية العثمانية | فريد بك المحامى | بيروت، ١٩٨١ |
| ٥٩ | جوڵانەوەى رزگاريخوازى كورد | نوسينى رادوڤان باقيچ، وەرگێڕانى مەحمود مەلا عيزەت | سويد، ١٩٨٥ |
| ٦٠ | القضية الكردية-ماضى الكرد و حاضرهم | بلەچ شيركوە (جلادت بدرخان) | بيروت، دار كاوە للنشر، ١٩٨٦ |
| ٦١ | انتفاضة ئاگرى-مذكرات | ياداشتەكانى ئيحسان نورى، وەرگێڕانى بۆ عەرەبى سەلاح بەروارى | بيروت، ١٩٩٠ |
| ٦٢ | موحازەرەيەك دەربارەى كوردستان | ژنەكەى ميجەرسۆن | لەگۆڤارى(Journal The Royal Centre) ، حوزەيرانى ١٩٣٥ |
| ٦٣ | الحركة الكردية فى الزمن الحديث و المعاصر | تأليف مجموعة من المستشرقين الروس، ترجمة الى عربية كرم السويدى | رەشنوسێكى چاپنەكراوە |
| ٦٤ | The Baning of Kurdogis Culture | نووسينى پرۆفيسۆر حەسرەتيان، وەرگێڕانى (ش. خ. محو) | ئەنيستيوتى كوردى لەپاريس |
| ٦٥ | ياداشتەكانى مامۆستا رەفيق حيلمى | رەفيق حيلمى | چاپى دووەم، بەغدا، ١٩٨٤ |
| ٦٦ | The Conflict of Tribes in Iran and Afganistan | مارتن ڤان برونسون | لەندەن، ١٩٨٣ |
| ٦٧ | بيرەوەريەكانى عەزيز يامولكى | عەبدولعەزيز يامولكى | گۆڤارى مامۆستاى كورد، سويد، ١٩٦٦ |
| ٦٨ | گەشتەكەى ريچ | وەرگێڕانى حەمەى حەمە باقى | چاپى تەوريز، ١٩٩٢ |
| ٦٩ | ياداشتەكانى ئەحمەد تەقى | ئامادەكردنى جەلال تەقى | بەغدا، ١٩٧٠ |
| ٧٠ | كورد و عەجەم | ساڵح محەمەد ئەمين (ئەوشيروان مستەفا) | ساڵى ١٩٩٢ |
| ٧١ | كورتە مێژووى بزوتنەوەى نەتەوايەتى كورد | سادق شەرەفكەندى | سويد، ١٩٩٥ |
| ٧٢ | ذكر الأكراد و اصولهم من كتابات المسلين الأوائل | دكتور احمد عثمان ابوبكر | گۆڤارى كۆڕى زانيارى، ژمارە/١٣، بەغدا، ١٩٨٥ |
| ٧٣ | شێخ و ئاغا و دەوڵەت | نوسينى مارتن ڤان برونسون، بەرگى يەكەم، وەرگێڕانى دكتۆر كوردۆ عەلى | سويد، ١٩٩٦ |
| ٧٤ | التراث الكردي في مؤلفات الأيطالية | ترجمه الى العربية (Mirello Galletti) دكتور يونس حسين | گۆڤارى كۆڕى زانيارى، ژمارە/٨، ساڵى ١٩٨١ |
| ٧٥ | شەرەفنامە | نوسينى شەرەفخانى بدليسى، هەژار لەفارسيەوە كرديەتى بەكوردى | چاپى تاران، چاپخانەى جەوهەرى، ساڵى ١٩٨١ |
| ٧٦ | رۆژنامەى كوردستان لەساڵانى ١٨٩٨- | كۆكردنەوە و لەسەرنوسينى محەمەد | دوو بەرگ، سويد |

| | ئەمین بوزئەرسەلان | ۱۹۰۲ | |
|---|---|---|---|
| چوار بەرگ، سوید | کۆکردنەوە و لەسەرنوسینی محەمەد ئەمین بوزئەرسەلان | گۆڤاری ژین | ۷۷ |
| گۆڤاری مامۆستای کورد، سوید، ۱۹۹۵ | روهات ئالاکوم | ژیانی شەریف پاشای خەندان | ۷۸ |
| سوید، ۱۹۹۱ | روهات ئالاکوم | Dı Cavkaniye swedi De Motiven Kurdi | /۷۸ ۱ |
| فلادلفیا-۱۹۲۸، چاپی دووەمی سوید-۱۹۹۵ | سریا بەدرخان | The Case of Kurdistan against Turkey | ۷۹ |
| لەندەن-سالی ۱۹۹۰، ستۆکهۆلم-۱۹۹۱ | محەمەد رەسول هاوار | بەرگی یەکەم و دووەمی کتێبەکەی شێخ مەحمودی قارەمان و دەوڵەتەکەی کوردستان | ۸۰ |
| تاران، ۱۳٦۹ی کۆچی | دفتر مطالعات سیاسی و بین الملل ایران | گزیدەی اسناد سیاسی ایران و عوسمانی در دورەی قاجاریە-جلد اول | ۸۱ |
| بیروت، ۱۹۹۳ | سعید احمد برجاوی | الأمبراطورية العثمانية | ۸۲ |
| کویت، دار الفکر العربی (مێژووی چاپی لەسەر نیيە) | دکتورة زبیدة عطا | الترك في العصور الوسطى و بيزنطة و سلاجقة الروم | ۸۳ |
| ئەمریکا، ۱۹۸۹ | Robert Olson | The Emergence of Kurdish Nationalism and Shaikh Said | ۸٤ |
| لەندەن، ۱۹۹۵ | Patrick Kinross | Ataturk The Birth of Nation | ۸٥ |
| بیروت، ۱۹۸٦ | السيد الباز العريني | المغول | ۸٦ |
| سلێمانی، ۱۹٦۰-۱۹٦۱ | ئیسماعیل حەقی شاوەیس | گۆڤارەکانی رۆژی نوێ | ۸۷ |
| مطبعة الهلال، فجالة، مصر | منشأها جرجي زيدان | مجلات الهلال خلال سنوات ۱۹۰۸-۱۹۰۹ | ۸۸ |
| چاپخانەی شفق، تەورێز، سالی ۱۳٤٦ی کۆچی | Wane. S. Vucinich (سهیل ئازەری) کردویەتی بەفارسی | The Otoman Empire | ۸۹ |
| ۱۳٦۸ی کۆچی | دکتۆر ئیرج نوبخت کردویەتی بەفارسی | تاریخی عوسمانی از تشکیلات تا فتح استمبول | ۹۰ |
| رەواندز، ۱۹۳۸ | حسێن حوزنی موکریانی | کوردستانی موکریان یا ئەتروپاتین | ۹۱ |
| چاپی یەکەم، بەغدا، ۱۹۳۷ | ئیبراهیم ئەحمەد | الاکراد و العرب | ۹۲ |
| دیمشق، ۱۹۸۷ | نوسینی پرۆفیسۆر جەلیلی جەلیل، وەرگێڕانی بۆ عەرەبی دکتور محمد عبدو النجاري | تأريخ الأمارات الكردية من الأمبراطورية العثمانية | ۹۳ |
| ستۆکهۆلم، ۱۹۸٦ | دکتۆر جەمال نەبەز | پەیوەنداریەتی کورد | ۹٤ |
| گۆڤاری (الثقافة الكردية)، ژمارە/۲، چاپی لەندەن، مەڵبەندی رۆشنبیری، ۱۹۸۸ | م. رسول هاوار | معاهدة سيفر | ۹٥ |
| گۆڤاری کۆڕی زانیاری، بەغدا | نوسینی مینۆرسکی، وەرگێڕانی دکتۆر کەمال مەزهەر | الأکراد حفيد الميديين | ۹٦ |
| سوید، ۱۹۹۲ | ئەنداز حەویزی | ئاوێستا و نامەی مەینەتی ئاینی زەردەشت بەشی یەکەم | ۹۷ |
| گۆڤاری کۆڕی زانیاری، ژمارە/۸، بەغدا، ۱۹۸۱ | شوکر مستەفا لەتورکیەوە کردویەتی بەکوردی | کوردستان لەچەند گەشتێکی رۆژئاواییەکاندا | ۹۸ |
| بەغدا، ۱۹۸٦ | محەمەد جەمیل رۆژبەیانی | مێژووی حەسەنوەیهی و عەیاری | ۹۹ |
| سوید، ۱۹۸۹ | مالمیسانج (مالمیسانژ) | رۆژنامەگەریی کورد | ۱۰۰ |
| - | نوسەری راپۆرتەکان | دوکیومێنتەکانی ئەرشیفی حکومەتی بەریتانیا | ۱۰۱ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٠٢ | خەبات (کێشە) لەڕێی کوردستاندا | پرۆفیسۆر خالفین. جەلال تەقی لەڕوسیەوە کردویەتی بەکوردی | ١٩٨٢ |
| ١٠٣ | أضواء على قضايا دولية | دکتۆر کەمال مەزهەر | بەغدا، ١٩٧٨ |
| ١٠٤ | مێژووی مۆسیقای کوردی | محەمەدی حەمە باقی | سەقز، ١٩٩٦ |
| ١٠٥ | اسلامی مردم پسند–ناسیۆنالیزمی کورد–سەربزێوی شێخ سەعید لەتورکیا ساڵی ١٩٢٥ | نوسینی مارتن ڤان برونسون و ، وەرگێڕانی (Gerard Beneck) حەسەنی قازی بۆ کورد | (Publick Record) ، لەندەن |
| ١٠٦ | بەشی سێهەمی یاداشتەکانی مامۆستا ڕەفیق حیلمی | ئامادەکردنی دکتۆرە پاکیزە ڕەفیق حیلمی | بەغدا |
| ١٠٧ | Mesopotamia and Kurdistan in disgiusc | مێجەر سۆن | چاپی لەندەن، ١٩١٢ |
| ١٠٨ | کوردستان–یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی | کۆکردنەوە و لەسەر نوسینی دکتۆر کەمال فوئاد | سلێمانی، ١٩٩٨ |
| ١٠٩ | شۆڕشی شێخ سەعید | دکتۆر عوسمان عەلی | گۆڤاری ئاڵای ئیسلام، ژمارە/١٤، ساڵی ١٩٩٨ |
| ١١٠ | باسی [illegible] و مبادئی ولسون | دکتۆر عیسمەت شەریف وانلی | گۆڤاری دیراساتی کوردی، ژمارە/٢١، بەشی عەرەبی، پاریس |
| ١١١ | بدرخانیو [illegible] بوتان | نوسینی مالمیسانژ و وەرگێڕانی شوکر مستەفا بۆ عەرەبی | اربیل، ١٩٩٨ |


**کۆتایی**

# ناوەڕۆکی بەرگی دووهەم

لاپەڕە

# زنجیرەی چاپکراوەکانی ساڵی ٢٠٠٦ی

## بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی

| ز | ناوی کتێب | ناوی نووسەر / وەرگێڕ | بابەت | جۆری چاپ |
|---|---|---|---|---|
| ٤٠٨ | هەندێ سیمای ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسیی و. | و. ئەنوەر قادر محەمەد | کۆمەڵایەتی | چاپکردن |
| ٤٠٩ | چەردەیەک لەمێژووی کورد | کەیوان ئازاد ئەنوەر | مێژوویی | چاپکردن |
| ٤١٠ | هەمەچەشنەی زانیارییەکان | عەلاء نوری بابا عەلی | زانیاری | چاپکردن |
| ٤١١ | هارمۆنی | و. توانا رەشید | مۆزیک | چاپکردن |
| ٤١٢ | نهێنییەکانی ئەلگرا | و. شەرمین محێدین | چیرۆک | چاپکردن |
| ٤١٣ | Opticl Properties Of Minerals | ئارام عوسمان | زانستی | چاپکردن |
| ٤١٤ | سایکۆلۆژیی منداڵ | سۆزان جەمال | زانستی | چاپکردن |
| ٤١٥ | گەشتە تیوارەکانی میر بەتەنیاییدا | عەتا محەمەد | رۆمان | چاپکردن |
| ٤١٦ | سێبەرەکانی میرا | زەینەب یوسفی | رۆمان | چاپکردن |
| ٤١٧ | ئازادی رۆژنامەنووسی و رۆژنامەنووس.. | بەناز کوێستانی | رۆژنامەنووسی | چاپکردن |
| ٤١٨ | اعلام كرد العراق | جمال بابان | بیبلوگرافیا | چاپکردن |
| ٤١٩ | توخمەکان | ئەسعەد قەرەداغی | زانستی | چاپکردن |
| ٤٢٠ | بەجیهانیبوون و کورد | عومەر رەسوڵ | لێکۆڵینەوە | چاپکردن |
| ٤٢١ | بەهەشتی دڵداری | میرزا محەمەد ئەمین مەنگوری | دیوانە شیعر | چاپکردن |
| ٤٢٢ | دیوانی کەژاڵ ئەحمەد | کەژاڵ ئەحمەد | دیوانە شیعر | چاپکردن |
| ٤٢٣ | جنوب كردستان في موازين السياسة الدولية | شيخ سالار حفيد | رامیاری | چاپکردن |
| ٤٢٤ | الارهاب- اركانه- اسبابه- اشكاله | همداد مجيد علي | رامیاری | چاپکردن |
| ٤٢٥ | کەشکۆڵ | محەمەد عەبدولکەریم سۆڵەیی | کەشکۆڵ | چاپکردن |
| ٤٢٦ | بیبلۆگرافیای گەنجان | شاخەوان ئەکرەم | بیبلۆگرافیا | چاپکردن |
| ٤٢٧ | رەنگدانەوەی لیبرالیزم لەباشووری کوردستان | هیوا عەزیز | رامیاری | چاپکردن |
| ٤٢٨ | الرحيل في المجهول | سلام فواز | بیرەوەری | چاپکردن |
| ٤٢٩ | گۆڤاری هەنار (٣) | ب.گ. چاپ و بڵاوکردنەوەی | گۆڤار | چاپکردن |
| ٤٣٠ | گۆڤاری هەنار (٤) | ب.گ. چاپ و بڵاوکردنەوەی | گۆڤار | چاپکردن |
| ٤٣١ | گۆڤاری هەنار (٥) | ب.گ. چاپ و بڵاوکردنەوەی | گۆڤار | چاپکردن |
| ٤٣٢ | گۆڤاری دژنشت (٣) | ب.گ کتێبخانە گشتییەکان | گۆڤار | چاپکردن |
| ٤٣٣ | هەڵسەنگاندنێکی رۆژنامەوانیانە بۆ گۆڤاری رۆژنامەوانی | رەئوف حەسەن | رۆژنامەوانی | چاپکردن |
| ٤٣٤ | ئەنیمامۆندی | فەرید زامدار | شیعر | چاپکردن |
| ٤٣٥ | گۆڤاری هەنار (٦) | ب.گ. چاپ و بڵاوکردنەوە | گۆڤار | چاپکردن |
| ٤٣٦ | داستانی شارێکی خەوخۆش | ئەحمەد سەلام | چیرۆک | چاپکردن |
| ٤٣٧ | رێگا باریکەکان | ئاوات قارەمانی | رۆمانە یادداشت | چاپکردن |
| ٤٣٨ | رێنوسی کوردی و ئاهەنگی شیعری کوردی | دلشاد مەریوانی | ئەدەبی | چاپکردن |
| ٤٣٩ | ئەلکۆزنیک | فەردین کەریم | ئەلکترۆنی | چاپکردن |
| ٤٤٠ | کورد و باکوری کوردستان... | محەمەد رەسوڵ هاوار | مێژوویی | چاپکردن |
| ٤٤١ | زەردەشت هیوای رزگاری.. | بابان سەقزی | مێژوویی | چاپکردن |
| ٤٤٢ | گۆڤاری هەنار (٧) | ب.چاپ و بڵاوکردنەوە | گۆڤار | چاپکردن |
| ٤٤٣ | کوردەکان کێن | ماهر عەبدولسەلام | مێژوویی | چاپکردن |
| ٤٤٥ | خەونی سپی | محەمەد کەریم | چیرۆک | چاپکردن |
| ٤٤٦ | بنچینە سەرەتاییەکانی زانستی رۆژنامەگەری | فوئاد مەلا رەسوڵ | رۆژنامەگەری | چاپکردن |

| ٤٤٧ | گۆرانییەکانی ماسی فرۆشێك | نەجات نوری | چیرۆك | چاپکردن |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| ٤٤٨ | گاتا | بابان سەفزی | مێژوویی | چاپکردن |
| ٤٤٩ | بەرەو ئەشکەوتی دلێران/١ | گەلاوێژ | رۆمان | چاپکردن |
| ٤٥٠ | بەرەو ئەشکەوتی دلێران/٢ | گەلاوێژ | رۆمان | چاپکردن |
| ٤٥١ | رۆمانێك لەگفتوگۆ | ئەنوەر حسێن | لێکۆڵینەوە | چاپکردن |
| ٤٥٢ | بەپێی رێنماییەکان | حەمە نوری عومەر کاکی | چیرۆك | چاپکردن |
| ٤٥٣ | گۆڤاری هەنار ژمارە /٨ | ب. چاپ‌و بلاوکردنەوە | گۆڤار | چاپکردن |
| ٤٥٤ | گۆڤاری هەنار ژمارە /٩ | ب. چاپ‌و بلاوکردنەوە | گۆڤار | چاپکردن |
| ٤٥٥ | السریە المصرفیە فی غسل الاموال | دانا حەمە باقی | نامەی ماجستێر | چاپکردن |
| ٤٥٦ | مێژووی جامی جیهانی | د. عاصی فاتح | وەرزش | چاپکردن |
| ٤٥٧ | مەسەلەی ویژدان | ئا: د. ئیحسان فوئاد | چیرۆك | چاپکردن |
| ٤٥٨ | ئەنفال‌و پارتی زانی | نوری خێڵی حەمە | بیرەوەری | چاپکردن |
| ٤٥٩ | بەهای مێژوو | عوسمان عەزیز | مێژوویی | چاپکردن |
| ٤٦٠ | وێنەکان خۆیان ئەدوێن | عەبدولخالید سابیر | مێژوویی | چاپکردن |
| ٤٦١ | گەران بەدوای شیعرو جیاوازییدا | محەمەد کوردۆ | لێکۆڵینەوە | چاپکردن |
| ٤٦٢ | گۆڤاری هەنار ژمارە /١٠ | ب. چاپ‌و بلاوکردنەوە | گۆڤار | چاپکردن |
| ٤٦٣ | ٣١ چاوپێکەوتنی فەرهاد سەنگاوی | ئا: ئازاد سەراوی | چاوپێکەوتن | چاپکردن |
| ٤٦٤ | دواین گەلا | ئەحمەد قادر سەعید | چیرۆك | چاپکردن |
| ٤٦٥ | ئەفسانەکانی میللەتانی ئاسیا | د.کاوس قەفتان | چیرۆك | چاپکردن |
| ٤٦٦ | رەشپۆشێکی جیهانی چوارەم | مستەفا سالح کەریم | چیرۆك | چاپکردن |
| ٤٦٧ | گۆڤاری هەنار ژمارە (١١) | ب. چاپ‌و بلاوکردنەوە | گۆڤار | چاپکردن |